کۆماری عێراق
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی
بووژاندنەوەی کەلەپووری ئیسلامی
- ٢٣ -

# إقتران النيرين في مجمع البحرين

## ترجمەی حەدیثەکانی موسلیم و بوخاری

دانراوی
مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی
محمد علی قەرەداغی

بەرگی چوارەم

چاپی یەکەم ١٤٠٧ ك ١٩٨٧ ز

کۆماری عێراق
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی
بووژاندنەوەی کەلەپووری ئیسلامی
- ٢٣ -

# إقتران النيرين في مجمع البحرين

ترجمەی حدیثەکانی موسلیم و بوخاری

دانراوی
مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی
محمد علی قەرەداغی

بەرگی چوارەم

چاپی یەکەم ١٤٠٧ ك ١٩٨٧ ز

الجمهورية العراقية
وزارة الاوقاف والشؤون الدينية
إحياء التراث الاسلامي
- ٢٣ -

# إقتران النيرين
# في
# مجمع البحرين

تأليف
ملا رشيد بيگ بابان

تحقيق
محمد علي القره‌داغي

الجزء الرابع

١٤٠٧هـ ١٩٨٧م

٢٠٤ عن ابي بصرة    مجمع البحرين وصية النبي صلى الله تعالى عليه وسلم باهل مصر

٢٧١/١١٤٨ عن ابي ذر [رضي الله تعالى عنه] يقول قال رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم انكم ستفتحون ارضا يذكر فيها
القيراط فاستوصوا باهلها خيرا فان لهم ذمة ورحما (حرمة) فاذا رأيت رجلين يقتتلان في
موضع لبنة فاخرج منها قال فمر بربيعة وعبد الرحمن ابني شرحبيل بن حسنة يتنازعان
في موضع لبنة فخرج منها ٩/٤٢٥ وفي رواية ستفتحون مصر وهي ارض يسمى فيها
القيراط فاذا فتحتموها فاحسنوا الى اهلها فان لهم ذمة ورحما او قال ذمة وصهرا فاذا رأيت الخ

ابو ذر رضي الله تعالى عنه ئەفەرموو پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم فەرمووی فتحی ئەرزێك ئەكەن لە روایەتە
كەی ترا فتحی مصر ئەكەن كە لەوێدا قیراطی تیایە بەوە خەرید و فروخت ئەكەن دەرحق اهلی مصر خێر توصیە
بكەن بەیەكتری چونكە ئەوان لەگەل ئێوەدا عهد و پەیمانیان و معنوییان هەیە رحمیەت لەبەینا هەیە چونكە
دایكی اسماعیل كە هاجرە علیهما السلام لەوانە لە روایەتە كەی ترا ئەفەرموو لەگەل ئەوانا پەیمانی زاوایی
خەسوو خەزووریتان هەیە چونكە دایكی ابراهیم علیه السلام كە حضرتی ماریە یە رضی الله تعالى عنها لەوانە كە چاوتان
پێ دەكەوێ پیاو كەوت كە لەسەر جێگەی خشتێك نزاعیان بوو لێی بچنە دەرێ ابو ذر رضی الله تعالى عنه ئەفەرموو
ربیعە و عبد الرحمن كوری شرحبیلم دی لەسەر جێگەی خشتێك نزاعیان كرد لێی هاتمە دەرێ.
پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم خەبەری دابەوە كە مصر فتح ئەكەن لەوێدا لەسەر جێگەی خشتێك نزاع ئەبێ عینی فەرمودەكەی
هاتە دی ئەو معجزەی گەورە صدق رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم خوار دوی منورە كان رێش كا
منوەرە لەرێوە دالە قبیلی جلدت البحر یە فافهم.

حضرا اهل عُمان بضم العين وتخفيف الثاني

٢٧٢/١١٤٩ ابو برزة [رضي الله تعالى عنه] يقول بعث رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم رجلا الى حي من
احياء العرب فسبوه وضربوه فجاء الى رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم فاخبره فقال
رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم لو ان اهل عمان (جئتهم) اتيت ماسبوك وماضربوك

٩/٤٢٦ ابو برزة رضي الله تعالى عنه ئەفەرموو پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم پیاوێكی ناردبوو بولای
عشیرەتێك لە عشائرەی عرب [كە دعوتیان بكات بۆ اسلامتی] جوێنیان پێدا و لێیان دا هاتەوە خدمت
پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم عرضی كرد پێغەمبەر صلى الله تعالى عليه وسلم فەرمووی ئەگەر بچی تایە بولای اهلی
عُمان ئەوا جوێنیان پێ نەئەدای و نە لێیان نەئەدای یعنی چونكە ئەوانە زۆر گوێگرن لە حق.

تم ولله الحمد ١٤/١٢/٩٤٠ شتەو وعليه السير والجهاد ان شاء الله تعالى
لانه من فضائله عليه الصلاة والسلام وفضائل اصحابه الكرام رضي الله تعالى عنهم اجمعين

١٠٧٣/١٩٦ ـ جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : غزونا مع النبي ـ ﷺ ـ وقد ثاب [أي : اجتمع ، أو رجع] معه ناس من المهاجرين ، حتى كثروا ، وكان من المهاجرين رجل لعّاب فكسع [ضرب] أنصاريا [سنان بن وبرة] ، فغضب الأنصاري غضبا شديدا حتى تداعوا [استغاثوا بالقبائل يستنصرون بهم على عادة الجاهلية] وقال الأنصاري : يا للأنصار ! وقال المهاجري : يا للمهاجرين ! فخرج النبي ـ ﷺ ـ فقال : ما بال دعوى أهل الجاهلية ؟ ثم قال : ما شأنهم ؟ فأُخْبِرَ بكَسعة المهاجري الأنصاريَ . قال : فقال النبي ـ ﷺ ـ : دعوها فإنها خبيثة وقال [نحو حب رمانك تقليدا للقزلجي[1] ـ رحمه الله ـ]عبدالله بن أُبي ابن سلول [لعنه الله] : أَقَدْ تداعوا علينا ؟ لئن رجعنا إلى المدينة ليخرجنَّ الأعزُّ منها الأذلَّ [يريد النبي وأصحابه ـ عليه الصلاة والسلام ، وعليهم الرضوان] فقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ألا نقتل يا رسول الله هذا الخبيث ؟ لعبدالله . فقال النبيُّ ـ ﷺ ـ : لا ، (سەكتەی لەطيفە) يتحدث الناس : إنه كان يقتل أصحابه ! ح ـ ١٥/٦ . م ـ ١٧/١٠ .

(ئەگەر لە فەضائيلی قورئانا نووسرابیّ لیّرە مەینووسن)

تەرجەمە :

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویّ : لە خزمەت پیّغەمەرا

(١) مەبەستی لە (حب رمانك) ئەوەیە کە موضاف دووجار ئیضافە ناکریّو کە شتیّکی وا رووی دا ئیضافەی یەکەم (مولغا) ئەبیّتو ، هەر لەم قسەیشەوە وەك نوکتە (عبدالله بن أبي) ی خستوّتە ئەو بابەو ، دەیەویّ بلّیّ : ئیضافەی (عەبد) بوّ لای (الله) مولغایە ؛ چونکە ئەگەر (عبدالله) بوایە مونافیق نەئەبوو عەبدی (الله) ئەبوو !

ـ ﷺ ـ غەزامان کرد ، گەلێ موهاجیر کۆبوونەوە تا زۆر بوون ، لە ناو موهاجیرانا پیاوێکی گاڵتەکەریان بوو ، بە گاڵتەوە لە ئەنصارییێکی دا ، ئەو ئەنصاری‌یە زۆر تووڕە بوو تا بە عادەتی جاهیلی‌یەت هەرکەس بۆ موعاوەنەتی قەبیلەی خۆیی بانگ‌کرد . ئەنصاری‌یەکە وتی : ئەی ئەنصاری هاوار ! موهاجیرەکە وتی : ئەی موهاجیرین هاوار ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتەدەرێ فەرمووی : ئەمە چی‌یە بە هاواری ئەهلی جاهیلی‌یەت یەکتری بە هاوارتانەوە بانگ ئەکەن ؟ پرسی : چی بوە ؟ عەرزیان‌کرد : کە موهاجیرێك لە ئەنصارییێکی داوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەم عادەتی جاهیلی‌یەتە تەرك بکەن عادەتێکی پیسە .

عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول ـ لعنه الله ـ وتی : موهاجیران وایان لێ هات کە خەڵقمان بانگەکەنە سەر ! ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە ئەوی عەزیزو غاڵبە ـ یەعنی نەفسی خەبیثی خۆی ـ ئەوی کە ذەلیلە ، یەعنی پێغەمەرو ئەصحابی کە لە دنیاو ئاخیرەتا عەزیزن ـ لە مەدینە ئەکەنە دەرێ .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) ئایا ئەو خەبیثە نەکوژین ؟ فەرمووی : خەیر مەیکوژن ؛ چونکی خەڵق ئەڵێن : محەمەد ـ ﷺ ـ ئەصحابی خۆی ئەکوژێ ! [ئەو وەختە هەرکەس بە قەومی خۆی ئەڵێ : ئەوە چۆن دینی ئەو قەبووڵ ئەکەن کە جوزئییێ حەرەکەتتان لێ صادر ببێ ئەڵێ : ئەمە موناڤیقەو بەو بەهانە سەرتان‌و ماڵتان حەڵاڵ ئەکا ، بەوە خەڵق ئەسڵەمێننەوە لە دینی ئیسلام] .

ئیبن‌و ئیسحاق لەم حەدیثە ئەوەی لێ زیاد کردوە کە : عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری‌کرد ـ ﷺ ـ : ئەمر بکە بە

عوبادی کوڕی بیشر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بیکـوژێ . فەرمـووی : خەیر خەبەر بدە کە بار بکەن ، لە ساعەتێکا باریان کرد کە لەو ساعەتەدا باریان نەکردبێ . ئوسەیدی کوڕی حـوضەیـری بە خـذمەت گـەیی ، عەرزی‌کرد : بۆچی وا لە غەیری وەختی خۆیا ئەمرت کرد بکەونە رێ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری دایێ . عەرزی‌کرد : (یا رسول) (أعز) تۆی‌و (أذل) ئەوە . ئەم حادیثەیە بە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا گەیی ـ رضي الله تعالى عنه ، ولعن أباه ـ هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی‌کرد : (یا رسول الله) بیستوومە ئیرادەت وایە کە باوکم بکوژی لەو ناماقووڵی‌یە کە فلتانوویەتی ، ئـەگەر ئیـرادەییکی وات هەیـە ئەمـرم پێ بفەرمـوو کەللەکەییت بێنمە خذمەت ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : مولایەمەتی لەگەڵ بکەو بەخۆشیی لەگەڵا رابوێرە . قسطلاني ـ ۳۷۱/۷ .

وا پێ بە خەیاڵما کە لە فەضائیلی قورئانا ئەم حەدیثەم نووسیبێ . ئەم حەدیثە بە حەدیثی قەسطەلانی‌یەکەوە فەضلی عەبدوڵلای کوڕی (ابن ابي) دەرەکەوێ .

## فضائل أنس ابن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١٠٧٤/١٩٧ ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال : دخل النبي ـ ﷺ ـ علينا ، وما هو إلا أنا ، وأمي ، وأم حرام ـ خالتي ـ فقالت أمي : يا رسول الله خويدمك ادع الله له ، قال : فدعا لي بكل خير ، وكان في آخر ما دعا لي به أن قال : أللهم أكثر ماله وولده وبارك له فيه . م ـ ٩/ ٣٩٠ .

تەرجەمە :

ئەنەس ئەفەرموێ ـ رضي الله تعالى عنه ـ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتە ماڵی ئێمە من و ، دایکم و ، پووری دایکیم ئوممو حەرام بووین ، کەسی تری لێ نەبوو . دایکم عەرزی کرد : (یا رسول الله) ئەمە خذمەتکارە بچکۆلەکەتە دۆعای بۆ بفەرموو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ هەموو دۆعا یێکی خێری بۆ کردین ، لە ئاخری ئەو دۆعایانەدا کە بۆی کردین ئەوە بوو فەرمووی : خوایا ماڵ و ئەولادی = زۆربکە = .

١٠٧٥/١٩٨ ـ وعنه قال : جاءت بي امي ـ أم أنس ـ إلى رسول الله ـ ﷺ ـ وقد أزَّرَتْني [صيره(كذا) إزارا] بنصف خمارها . وردَّتني [من ردّى ، أي جعله (كذا) رداء] بنصفه ، فقالت : يا رسول الله هذا أُنيس ابني أتيتك به يخدمك ، فادع الله له ، فقال : أللهم أكثر ماله وولده . قال أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فو الله إن مالي لكثير ؛ وإن ولدي وولد ولدي ليتعادّون على نحو المائة اليوم . وفي أخرى : وبارك له فيما أعطيته : وفي أخرى : فدعا لي رسول الله ـ ﷺ ـ ثلاث دعوات ، قد رأيت منها اثنتين في الدنيا ، وأنا أرجو الثالثة في الآخرة . م ـ ٩/ ٣٩٠

خ ـ ٩/ ١٩٠ .

تەرجەمە :

ئـەنەس ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئـەفەرمـوی : دایکم ـ دایکی ئەنەس ـ منی بردە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ نیوەی سەرپۆشەکەی خۆیی تێوەپێچام و نیـوەکـەی تـری دایـەوە بـەسـەرمـا وەك ئیـزارو ریـدا ، عەرزی کرد : (یا رسول الله) ئەمە ئەنەسۆلەیە هێناومەتە خزمەتت کە خزمەتت بکا ، دۆعای لە خزمەت خوادا بۆ بکە . فەرمووی : خوایا ماڵی بۆ زۆر بکەو بەرەکـەتی بۆ بخـەرە ئەوەوە کـە ئەیـثـەتێ . ئەنـەس فەرمووی : وەڵلاهی ماڵم زۆرە ، ئەولادو ئەولادی ئـەولادم ئەمـرۆ تا نزیکی صەد هەڵەژمێررێن .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : سێ دۆعای بۆکردم ، دوانیانم دی لە دنیادا ، ئومێدی ئەوی تریانم ـ سێیەمینیانم ـ هەیە لە ئاخیرەتا .

**١٠٧٦/١٩٩ ـ وعنه قال : أتى عليَّ رسول الله ـ ﷺ ـ وأنا ألعب مع الغلمان ، قال : فسلم علينا ، فبعثني إلى حاجة ، فأبطأت على أمي ، فلما جئت قالت : ما حبسك ؟ قلت : بعثني رسول الله ـ ﷺ ـ لحاجة ، قالت : ما حاجته ؟ قلت : إنها سرٌّ ، قالت : لا تحدثنَّ بسرِّ رسول الله ـ ﷺ ـ أحدا . قال أنس : والله لوحدَّثتُ به أحدا لحدَّثتك يـا ثابت .**

م ـ ٩/ ٣٩١ .

تەرجەمە :

ثابیتی بەنانی لە ئەنەسەوە [رضي الله تعالى عنه] ریوایەت ئەکا : لە ناو منالآنا یاریم ئەکرد پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هات بەلامانا ، ناردمی بۆ ئیحتیاجییکی خۆی ، چووم و درەنگم پێ چوو بۆ لای دایکم ، لێی پرسیم : بۆ وا درەنگت پێ چوو ؟ وتم : پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ فرمانێکی

ناردم . پرسی : ئەو فرمانە چیە ؟ وتم : سیڕە ، فەرمووی : سیڕی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لای هیچ کەس مەڵێ . ئەنـەس بە ثـابیتی فەرمـوو : وەڵڵاهی (یا ثابت) ئەگەر لای هیچ کەسێکم بوتایە پێم‌ئەوتی .

سەلام لە بوچووك کردن سوننەتە .

سیڕی ئینسان ـ با خوصووص هی پیاوی گەورە ـ نابێ ئاشکارا بکرێ .

تەودیعی سیر بە منالْ کە ئەمین بێ دروستە .

طەلەبی دۆعا لە پیاوی صالح ، ئیجابـەتی طەلـەبەکـەی ئەگـەر دۆعای دنیایی بێ دۆعای بەرەکەتیشی عەلاوەکردن . . سوونەتە .

موعجیزەی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ کە ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ماڵ و منالێکی زۆرو بە بەرەکەتی مەحفووظ بوون لە فیتنەی ئەو زەمانە ، بێ زەرەرو بێ قوصوور بوون بۆ دین و دنیا ، دەوڵەتی دنیـا مەغـرووری نەکردن .

۱۰۷۷/۲۰۰ ـ غيـلان بن جريـر قـال : قلت لأنس : أرأيت اسم الأنصار كنتم تسمّون به ، أمْ سمّاكمُ الله ؟ قال : بل سمّانا الله ـ عـز وجل ـ [قال الله ـ عـز وجل ـ : «والسـابقون الأولـون من المهاجـرين والانصار»[1] قال غيلان] : كنا ندخل على أنس فيحدثنا مناقب الأنصار ومشاهدهم ، ويقبل عليَّ أو على رجل من الأزد ، فيقول : فعل قومك يوم كذا وكذا ، كذا وكذا . ح ـ ٦/ ١٤٠ ، ن .

تەرجەمە :

غەیلانی کوڕی جەریر ئەفەرموێ : عەرزی ئەنەسم کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : خـەبەرم بـدەرێ ئیسمی ئەنصـارتان ئێـوە خـۆتـان

(۱) سوورەتی : تەوبە ، ئایەتی : ۱۰۰ .

کردووتانە بە ناو بۆ خۆتان ، یاخۆ خوا ـ عز وجل ـ ناوی ناون ئەنصار ؟ فەرمووی : خوا ناوی ناوین ئەنصار ، لە قورئانا ئایەتی (دالّ) لەسەر ئەوە زۆرە . غەیلان ئەفەرموێ : ئەچووینە خدمەت ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەحتی مەناقیبو وەقایعی ئەنصاری بۆ ئەکردین ، رووی ئەکردە من ، یا رووی ئەکردە پیاوێ لە ئەزد ـ کە جەددی ئەعلای ئەنصارە ـ ئەیفەرموو : قەومەکەت کە ئەنصارە لە فلاّنو فلاّن رۆژا ئەوەو ئەوەی کردوە .

۱۰۷۸/۲۰۱ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : كان يوم بُعاث يوما قدمه الله لرسول الله ـ ﷺ ـ ، فقدم رسول الله ـ ﷺ ـ [المدينة] وقد افترق مَلأهم ، وقتلت سَرَواتهم [أشرافهم] وجُرِحوا [وعن المستملي : وخرجوا] فقدمه الله لرسول الله ـ ﷺ ـ في دخولهم في الاسلام . ح ـ ٦/ ١٤٠ .

تەرجەمە :

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : رۆژی بوعاث [کە جێیێکە بەقەد دوو میل لە مەدینەوە دوورە لەوێدا پێنج ساڵ لە پێش هیجرەتەوە شەرێك لە بەینی ئەوسو خەزرەجا بوو . ] رۆژێکە خوا ئەو رۆژەی بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێش خستبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی چوو بۆ مەدینە ئەوسو خەزرەج گەورەو ئەشرافیان کوژرابوون ، بریندارکرابوون ، یا لە مەدینە چوویوونە دەرێ ، خوا ئەو رۆژەی بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردبوو بە (مقدمە) کە ئەنصار داخڵی دینی ئیسلام ببن [چونکی هەموو کەللەڕەقو موتەکەببیرەکانیان نەمابوو کە دەعیەیان نەبێنێ موسوڵمان بن] .

۱۰۷۹/۲۰۲ ـ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : قالت الأنصار يوم

فتح مكة ، وأعطى قريشا : والله إن هذا لهو العجب ! إن سيوفنا لتقطر من دماء قريش وغنائمُنا تُردُّ عليهم ! فبلغ ذلك النبيّ ـ ﷺ ـ فدعا الأنصار . قال : فقال : ما الذي بلغني عنكم ؟ وكانوا لايكذبون ، فقالوا : هو الذي بلغك . قال : أوَلا ترْضونَ أنْ يرجع الناس بالغنائم إلى بيوتهم ، وترجعون برسول الله ـ ﷺ ـ إلى بيوتكم . لو سلكتِ الأنصار واديا أو شعبا لسلكت وادي الأنصار أو شِعبهم . ح ـ ٦/١٤١/٣٩٩ . م ـ ٥/١٠/ن ، ت .

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ رۆژی[1] فه‌تحی مه‌ككه كه غه‌نائیمی حونه‌ینی ته‌قسیم كرد هه‌مووی دا به (مؤلفةِ القلوب)ی قوره‌یش به‌شی ئه‌نصاری لێ نه‌دا ، ئه‌نصار له ناو خۆیانا وتیان : ئه‌مه شتێكی سه‌یره ! شیره‌كانمان ئێشتا خوێنی قوره‌یشی لێ ئه‌تكێ ، كه‌چی غه‌نیمه‌ته‌كانمان ئه‌درێ به قوره‌یش ، ئه‌م قسه‌ی ئه‌نصاره به پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ گه‌ییه‌وه بانگی كردنه حوزووری خۆی . ئه‌نه‌س فه‌رمووی : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێی فه‌رموون : ئه‌و قسه‌یه چی یه كه ده‌رحه‌ق ئێوه به من گه‌ییوه ته‌وه ؟ ئه‌وانیش درۆیان نه‌ده‌كرد ، فه‌رموویان : ئه‌وه‌یه كه پێت گه‌ییوه . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : ئێوه به‌وه رازی نابن كه خه‌لْق ماڵی تالآنیی به‌رێته‌وه ماڵی خۆی ، ئێوه (رسول الله) ـ ﷺ ـ به‌رنه‌وه بۆ ماڵی خۆتان ؟ ئه‌گه‌ر ئه‌نصار بچنه بیابانێ یا ناو شاخێكه‌وه من ئه‌چمه ئه‌و ناو شاخ و بیابانه كه ئه‌نصاری چوونێ .

---

(١) مه‌به‌ست له رۆژی فه‌تحی مه‌ككه ده‌بێ سالْی لێ بگیرێ ، چونكه به‌شكردنی غه‌نائیمی حونه‌ین دوو مانگه دوای ئه‌و رۆژه بوه .

٢٠٣/ ١٠٨٠ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما كان يوم حنين اِلتقى [النبي ـ ﷺ ـ و] هوازن ، ومع النبي ـ ﷺ ـ عشرة آلاف والطلقاء [وهم الذين منَّ عليهم النبيّ ـ ﷺ ـ يوم فتح مكة ؛ فلم يأسرهم ولم يقتلهم منهم : ابو سفيان ، وابنه معاوية ، وحكيم بن حزام] فأدبروا . قال : يا معشر الأنصار ! قالوا : لبيك يا رسول الله وسعديك ، لبيك نحن بين يديك . فنزل النبي ـ ﷺ ـ فقال : أنا عبدالله ورسوله . [وفي أحمد : فأخذ كفا من تراب ، وقال : شاهت الوجوه] فانهزم المشركون . فأعطى الطلقاء والمهاجرين ، ولم يعط الأنصار شيئا فقالوا [ما في الحديث الأول] فدعاهم ، فأدخلهم في قبة ، فقال : أما ترضون أن يذهب الناس بالشاة والبعير وتذهبون برسول الله ـ ﷺ ـ ؟ [فقالوا : بلي يا رسول الله . أخرى] فقال النبي ـ ﷺ ـ : لو سلك الناس واديا وسلكت الأنصار شعبا لاخترت شعب الأنصار . ح ـ ٦/٣٩٩ . م ـ ٥/١١ .

ته‌رجه‌مه :

كه رۆژى حونه‌ين بوو پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ و هه‌وازين مولاقاتيان بوو بۆ حه‌رب پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ده هه‌زار [له موهاجيرو = ئه‌نصار= و [ئه‌و] به‌ره‌ڵڵا كراوانه كه له غه‌زاى فه‌تحى مه‌ككه‌دا پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌فوى كردن ، نه‌يكوشتن ، نه‌يكردن به ئه‌سير ، ئه‌بوسوفيان و موعاويه‌ى كوڕى و حه‌كيمى كوڕى حيزاميان له ناوا بوو] له خذمه‌تا بوو ، پشتيان هه‌ڵكردو شكان . . . . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ بانگى فه‌رموو : ئه‌ى جه‌ماعه‌تى ئه‌نصار ! جوابيان‌دايه‌وه فه‌رموويان : [لبيك يا رسول الله وسعديك ، لبيك نحن بين يديك] به‌ڵێ (يا رسول الله) له خذمه‌تتاين حازرين ، ئه‌مر بفه‌رموو له به‌رده‌ستتاين . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفى دابه‌زيى [ومتى

خۆڵی هەڵگرت‌و فەرمووی : (شاهت الوجوه) رووی کـافران قـەبیح و ناشیرین بێ] من عەبدی خواو رەسوولی خوام . موشـریکەکـان شکان [شەش‌هەزار ژن‌و منالْ ئەسیر بوون ، بیست‌و چوار هەزار وشترو چل هەزار مەڕ غەنیمە ت کرا] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو غەنیمەتە عەظیمەی بەو فیراریانەو موهاجیر بەخشی . بەشی ئەنصاری لێ نەدا . ئەنصار [لە حیکمەتی موعامەلەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەگەیین] بەعزێ قسەیان کرد [فەرموویان : لە تەنگانەدا ئێمە بانگ ئەکرێین غەنیمەتیش ئەدرێ بە غەیری ئێمە] پێغەمەر ـ ﷺ ـ بردنیە ژێر قوبەیێکەوە ، فەرمووی : بەوە رازی نابن خەڵق مەڕو وشتر بەرێ‌و ئێوە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ببەن ؟ عەرزیان‌کرد : بەڵێ (یا رسول الله) رازین .

[لەم فەرموودەی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ چە شەرەفێکی گەورەی تیایە بۆ ئەنصار ؟ . . .] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر هەموو خەڵق بچنە دەشتێکەوەو ، ئەنصار بخرێنە دووتوێی شاخێکەوە ئیختیـاری ئەو دوو توێی شاخە ئەکەم کە ئەنصاری ئەچنە = ناو = .

١٠٨١/٢٠٤ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جمع النبي ـ ﷺ ـ ناسا من الأنصار فقال : إن قريشا حديث عهد بجاهلية ومصيبة ، وإني أردت أن أجبرهم . وأتألفهم ، أما ترضون أن يرجع الناس بالدنيا وترجعون برسول الله ـ ﷺ ـ إلى بيوتكم ؟ قالوا : بلى . قال : لو سلك الناسُ واديا وسلكت الأنصار شعبا لسلكت وادي الأنصار ، أو شعب الأنصار ، [بالشك من الراوي] ح ـ ٦/٣٩٩ . ت . ن .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له دوای ئه‌وه‌ی که گله‌یی ئه‌نصاری پێگه‌یی یه‌وه کۆی‌کردنه‌وه ، فه‌رمووی : قوره‌یش نۆ موسوڵمانن ، که‌س و کاریان زۆر کوژراوه ، به ماڵی دنیا برینیان ئه‌برژێنمه‌وه ، رامیان ئه‌که‌م . . . . . به‌وه رازی نابن . . . الخ .

١٠٨٢/٢٠٥ ـ عن عبدالله بن زيد بن عاصم ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : ما أفاء الله على رسوله ـ ﷺ ـ يوم حنين قسم في الناس ، في المؤلّفة قلوبهم ، [أُناس أسلموا إِسلاما ضعيفا ، منهم أبو سفيان و . . . راجع قسط ـ ٣٩٦/٦] ولم يعط الأنصار شيئا ، فكأنهم وجَدوا إِذ لم يُصبِهم ما أصابَ الناسَ ، فخطبهم ، فقال : يا معشر الأنصار ألم أجدكُم ضلالا فهداكم الله بي ؟ وكنتم متفرقين فألّفكم الله بي ، وعالة [فقراء] فأغناكم الله بي ؟ كلما قال ـ ﷺ ـ شيئا قالوا : الله ورسوله أمنُّ . قال : ما يمنعكم أن تجيبوا رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ قال : كلما قال شيئا قالوا : الله ورسوله أمنّ . قال : لو شئتم قلتم : جئتنا كذا وكذا .

[وفي حديث أبي سعيد فقال : أما والله لوشئتم لقلتم فصدَقتم وصُدِّقتم : أتيتنا مكذَّبا فصدَّقناك ، ومخذولا فنصرناك ، وطريدا فآويناك ، وعائلا فواسيناك .

وزاد أحمد من حديث أنس : قالوا : بل المنّة لله ولرسوله .] ألا ترضون أن يذهب الناس بالشاء والبعير ، وتذهبون بالنبي ـ ﷺ ـ إلى رحالكم ؟ لولا الهجرة لكنت امرأ من الأنصار . ولو سلك الناس واديا وشعبا ، لسلكت وادي الأنصار وشعبها . والأنصار شعار [الثوب الذي يلي الجلد] والناس دثار [ما يجعل فوق الشعار] إنكم ستلقون بعدي أثرة [وبضم فسكون] . فاصبروا حتى تلقوني على الحوض . ح ـ ٣٩٦/٦ .

م ـ ٥/١٥ .

١٠٨٣/٢٠٦ ـ سميط عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : إفتتحنا مكة ، ثم إنا غزونـا حنينا . قـال : فجاء المشـركون بـأحسن صفوف رأيت . قال : فصفت الخيل ، ثم صفت المقاتلة ، ثم صفت النساء من وراء ذلك ، ثم صفت الغنم ثم صفت النعم . قال : ونحن بشر كثير قد بلغنا ستة آلاف ، وعلى مجنبة خيلنا خالد بن الوليد ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : فجعلت خيلنا تلوي خلف ظهورنا ، فلم نلبث أن انكشفت خيلنا ، وفرَّت الأعراب ، ومن يعلم من الناس ، قال : فنادى رسـول الله ـ ﷺ ـ : يا للمهـاجرين ! يـا للمهاجـرين ! ثم قال : يـا للأنصار ! يا للأنصار ! قال [سميط] : قال أنس : هذا حديث عميّة [شـديدة ، عُمّيَـة ، عمّيَة ، عمِّيَّـة . أي : سمعته من أعمـامي ، أي جماعتي وقومي] . قال : قلنا : لبيك يا رسول الله . قال : فتقدم رسول الله ـ ﷺ ـ قال : فأيم الله ! ما أتيناهم حتى هزمهم الله . قال : فقبضنا ذلك المال ، ثم انطلقنا إلى الطائف ، فحاصـرناهم أربعـين ليلة ، ثم رجعنا إلى مكة فنزلنا ، فجعل رسول الله ـ ﷺ ـ يعطي الرجل المائة من الإبل . ثم ذكر باقي الحديث . م ـ ٥/١٢ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کە خوا ـ عز وجل ـ لە غەزای حونـەینا غـەنیمەتی زۆری بەسەر پێغەمەرا ـ ﷺ ـ رژان . پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو غەنیمەتەی هەموو دا بە (مؤلفة القلوب) ؛ چونکی نابەدڵ موسوڵمان بووبوون ، بەڵکە بە طەمەعی دنیا بکەون بە تەواوەتی لە کوفر واز بهێنن . لەو غەنیمەتە هیچی نەدا بە ئەنصار . بەوە وەك مەحـزوون بین = وابوو = ؛ چـونکی ئەو

قسمەتەی بە خەڵق گەییبوو بەوان نەگەییبوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ خوطبەی بۆ خوێنن ، فەرمووی : ئەی جەماعەتی ئەنصار ! بۆ من ئێوەم وا دەست نەکەوت کە گومرا بوون و بە واسیطەی منەوە خوا هێنانیە سەر رێ ؟ بڵاو نەبوون و خوا بە واسیطەی منەوە کۆی کردنەوەو ئولفەتی خستەوە بەینتان ؟ بۆ فەقیر نەبوون و خوا بە واسیطەی منەوە دەوڵەمەندی کردن ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ هەر شتێکی بفەرموودایە ئەوان ئەیانفەرموو : خواو رەسوولی خوا منەتی زۆرترە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆ جوابم نادەنەوە ؟ ئەوان هەر ئەیانفەرموو : خوداو رەسوولی بەمنەتترن . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر هەوەستان بێنێ ئەڵێن : تۆ وا هاتی و ، وا هاتی . . . [ئەبو سەعید ئەفەرموێ : کە فەرمووی : قەسەم بە خوا هەوەستان بێنێ ئەڵێن ـ و راست ئەکەن و تەصدیقیش ئەکرێن ـ : تۆ لە وەختێکا هاتیە لای ئێمە کە قورەیش تەکذیبیان ئەکردی و ئێمە تەصدیقمان کردی . هاتی یاریەدەرت نەبوو یاریەمان دایت ، بێ جێ و رێ بووی جێ و رێمان دایێ . فەقیر بووی موعاوەنەتمان کردی . وتیان منەت هەر هی خوایەو هی رەسوولی خوایە . یەعنی ئەوی ئێمە کردوومانە بۆ تۆ لە چاو ئەوەی کە بە واسیطەی تۆوە نائیلی بووین قەطرەییێکە لە بەحرێ . کە وابێ منەت هەر هی خوایەو هی رەسوولیەتی] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ = فەرمووی = : ئێوە بەوە رازی نین کە خەڵق وشترو مەڕ بەرنەماڵەوەو ئێوە پێغەمەر بەرنە ماڵەوە ؟ ئەگەر شەرەفی هیجرەت نەبوایە من پیاوێك ئەبووم لە ئەنصار . ئەگەر ئینسان بچنە دەشتێ یا دوو تونێی شاخێ من ئەچمە ئەو دەشت و دوو تونێی شاخە کە ئەنصاری چوونێ . ئەنصار ئەو لیباسەن کە لەسەر گۆشتەوە لەبەر

ئەكرێ ، خەڵقی تر ئەو لیباسەن كە لە سەرەوە لەبەر ئەكرێ [یـەعنی ئەوان لە هەموو كەس لە من نزیكترن] ئەی ئەنصار لە دوای من تووشی ئەوە ئەبن كە خەڵقتان بەسەراتەرجیح ئەدرێ ، صەبر بكەن تا لەسەر حەوض ئێنە لام .

**تەرجەمە :**[1]

ئـەنـەس ـ رضي الله تعـالی عنـه ـ فـەرمـووی : مـەككـەمـان فەتح كرد ، لە دواییا غەزای حونەینمان كرد ، موشریكان لە حەربا كام صەف بۆ حەرب جوان بوو هێنایان ؛ سوارە صەفیان بەست ، لە دوای ئەوان ئەوانە كە شەركەر بن صەفیان بەست ، لە پشت ئەوانەوە ژنان صەفیان بەست ، لە دوای ئەوانە مەڕو بزن ، لە پشت ئەوانەوە وشترو گـاو گامێش ، ئێمـەیش خەڵقێكی زۆر بـووین گەییبـووین بە شـەش هەزار[2] ، لە مەیمەنەی خەیلەكەمانەوە خالیدی كوڕی وەلیـدی لێ بوو ـ رضي الله تعالی عنه ـ خەیلەكەمان ـ سوارەكەمان ـ ئیحاطەی پشتەوەی دابووین بۆ موحافەظە ، زۆری پێ نەچوو سوارەكانمان شكان و ئەعراب فیراریان كرد ، لەگەڵ ئەوانەی كە مەعلوومن .

---

(١) دانـەر ـ خ ـ حەدیثـەكانی (١٠٨٢/٢٠٥ و ١٠٨٣/٢٠٦)ی بـە یەكـەوە نووسی و دوایی بەرو دوا تەرجەمـەكەیانی نووسیـوە . ئەمـە تەرجـەمەی حەدیثی (١٠٨٣/٢٠٦)یە .

(٢) لە حەدیثی : (١٠٨٠/٢٠٣)دا فەرمووی : دە هەزار لە موهاجیرو ئەنصارو ئازادكراوەكانی مەكە لە خزمەت پێغەمەرا ـ د ـ بوون . لێرەدا تەنها شەش هەزاری فەرموو . ئەوەیشی زانراوێ ئەوەیە دە هەزارەكـە راستە . دەبێ راویی مەبەستی لای خۆیان ، یان ئەو بەشەی سوپاكە بێت كە ئەوی تێدا بوە . یان هەڵەیە لە راوییەوە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بانگی فەرموو ئەی موهاجیرین ! ئەی ئەنصار ! دووجار بانگی فەرموون . سومەیط ئەفەرموێ : ئەنەس فەرمووی : ئەم حەدیثە حەدیثی قەومەکانمە ، یەعنی وا دەرەکەوێ خۆی حازر نەبووبێ لە هەموویا ، لە خزمانی بیستبێ . ئەنەس فەرمووی : وتمان : لە خزمەتتاین (یا رسول الله) پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێشکەوت : ئەنەس فەرمووی : نەچووینە طەرەفی دوشمنەکە تا خوا هەمووی شکانن . ئەو ماڵیاتەمان بەتاڵان گرت ، لە دواییا چووین بۆ طائیف چل رۆژ موحاصەرەمان داو ، گەراینەوە بۆ مەککەو دابەزین ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە تەنها پیاوێك صەد وشتری ئەدایێ . . . الخ .

١٠٨٤/٢٠٧ ـ عن رافع بن خديج ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : أعطى رسول الله ـ ﷺ ـ [من غنائم حنين] أبا سفيان بن حرب ، وصفوان ابن أمية ، وعيينة بن حصن ، والأقرع بن حابس ، [وعلقمة بن عُلاثة . م في أخرى] كل إنسان منهم مائة من الأبل . وأعطى عباس بن مرداس دون ذلك فقال عباس بن مرداس :

أتجعل نهبي ونهب العبيـ ... د بين عيينة والأقرع
فما كان بدر ولا حابس ... يفوقان مرداس في المجمع
وما كنت دون امرئ منهما ... ومن يخفض اليوم لا يرفع

قال : فأتم له رسول الله ـ ﷺ ـ مائة . م ـ ١٣/٥ .

تەرجەمە :

رافیعی کوڕی خەدیجە ـ خوایان لێ رازی بێ ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەقسیمی غەنیمەتی حونەینی فەرموو ، بە ئەبو سوفیانو ، بە صەفوانی کوڕی ئومەییەو ، عویەینەی کوڕی حیصنو ، ئەقرەعی کوڕی حابیسو ، عەلقەمەی کوڕی عولاثەی صەدوشتر ، صەد وشتر عەطا

فەرموو . بە عەباسی کوڕی مەرداسی لەوان کەمتر دا . عەباسی کوڕی مەرداس ئەم شیعرانەی عەرزی پێغەمـەر کرد ـ ﷺ ـ کـە تەرجـەمەی وایە :

تالآنی من و (عەبید)ی ئەسپم
لە سایەی خواو تۆ بوە بە کەسبم
لەوە عویەینەو ئەقرەعی حابیس
بەشیان زیاتر بێ و عەباس ناقیص
مەرداسی باوکم لە باوکی ئەوان
بۆچی کەمترە لە ناو پاڵەوان ؟
خۆ خۆیشم لەوان کەمتریم نی‌یە
ئیتر بەسەرما تەرجیحیان چی‌یە ؟
کە ئیمرۆ کەسێ سەری کەوتە ئەرز
مەحاڵە ئیتر بیکاتەوە بەرز

کە عەباس ئەم شیعرانەی عەرزی پێغەمەر کرد ـ ﷺ ـ پێغەمەر ﷺ ـ صەد وشتریشی بۆ ئەو تەواو کرد .

دروستە بۆ ئینسان مەدحی خۆی بکا کە خۆفی ببێ کە لە خەڵق بە کەمتر ئەناسرێ . سوننەتە بهێنرێتە مەرتەبەی خۆی .

۱۰۸۵/۲۰۸ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنـه قال قـدم علينا عبدالرحمن بن عوف ، وآخى رسول الله ـ ﷺ ـ بينه وبين سعد بن الربيع ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ وكـان كثير المـال . فقال سعـد : قد علمت الأنصار أني من أكثرها مالا ، سأقسم مالي بيني وبينك شطرين ، ولي إمرأتان ، فانظر أعجبهما اليك فأطلقها ، حتى إذا حلّت تزوجتها ! فقال عبدالرحمن : بارك الله لك في أهلك [ومالك] أين سوقكم ؟ فدلُّوه على

سوق بني قَيْنُقاع [فما انقلب . اخرى] فلم يرجع يومئذ حتى أفضل شيئا من سمن واَقِط ، فلم يلبث اِلا يسيرا حتى جاء رسول الله ـ ﷺ ـ وعليه وَضر [لطخ] من صفرة [أي صفرة خلوق . والخلوق : طيب يصنع من زعفران ونحوه] فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : مهيم ؟ [أخبرني ما هذا ؟] قال : تزوجت امرأة من الأنصار . فقال : ما سقت فيها ؟ قال : وزن نواة من ذهب ، أو نواة من ذهب . فقال : اَوْلِمْ ولو بشاة . ح ـ ٦/١٤٤ ، ٢٢٦ . وفي البيع ، والوليمة .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە هیجرەتا عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هات بۆ مەدینە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە بەینی ئەوو سەعدی کوڕی رەبیعا ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەستە برایەتی پێ گرتن . سەعد ماڵی زۆر بوو ، بە عەبدورەحمانی فەرموو : ئەنصار ئەزانن کە لە هەموویان دەوڵەمەنترم ، ماڵەکەم تەقسیم ئەکەم لە بەینی من و تۆدا بە نیوەیی . دوو ژنیشم هەیە تێیان فکرە کامیانت لا باشتر پێ بۆت تەڵاق بدەم ، کە عیددەی چوو مارەی بکە !

عەبدورەحمان فەرمووی : خوا بەرەکەت بخاتە ماڵ و منالتەوە ، بازارتان لە کوێیە ؟ بازاری قانیقاعیان پێ نیشان دا ، تەشریفی چوو ، نەگەڕایەوە تا بەعزێ کەشك و رۆنی قازانج کرد . ئەوەندەی پێ نەچوو تا هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆنی خۆشی عەطری لێ ئەهات . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : [دیارە شتێکت کردوە وا بۆنی خۆشت لێ پێ] چی یە ؟ عەرزی کرد : ژنێکم لە ئەنصار هێناوە . فەرمووی : چیت کردوە بە مارەیی ؟ عەرزی کرد : بە قەد دەنکی خورمایێ لە ئاڵتوون ، یا

فەرمووی : دەنکێ ئاڵتوونم کردوە بە مارەیی ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ
= فەرمووی = : با مەڕێکیش بێ بۆی بکە بە چێشتی شایی .

برادەری دینیی ئەبێ فەرقی لەگەڵ نەفسی خۆی نەکرێ ، هیچ شتێکی لێ دریغ نەکرێ ، ئەویش بۆ ئەوی تر ئەبێ وابێ .

ئینسان بێ زەروورەت باری خۆی نەخاتە سەر برای دینیی .

ئینسان سوننەتە تا پێی بکرێ لە کەسبی خۆی بخوا .

کاسبی سوننەتە .

قازانج دروستە .

ئینسانی (مقتدر) سوننەتە ژن بێنێ ، شایی بۆ بکا ، عەطرو مەطر لە خۆی هەڵسوێ .

عەقدی (اخوة) لە شیعاری پێغەمەرە ـ ﷺ ـ .

١٠٨٦/٢٠٩ ـ عن جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : فينا نزلت : «إذ همَّتْ طائفتان منكم أن تفشلا ، والله وليهما»[1] بنو سلمة ، وبنو حارثة . وما نحب أنها لم تنزل ؛ لقول الله : «والله وليهما» م ـ ٤١٢/٩ . ح ـ ٢٨٥/٦ . واللفظ لمسلم .

تەرجەمە :

جابیر = کوڕی عەبدوڵلا = ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەم ئایەتەی ئالی عیمران کە مەعنای وایە : «کە دوو طائیفە لە ئێوە قەصدیان وا بوو کە بترسن و هەڕاکەن ، خوا دۆستی ئەو دوو طائیفەیەو سەرداریانە»[2] ئەو دوو طائیفە بەنو سەلەمەو ، بەنو حاریثەیە . حەزمان

(١) سوورەتی : (آل عمران) ئایەتی (١٢٢)

(٢) دانەر ـ خ ـ مانای (نزلت فينا)ی لەبیر چوە . دەبوو بینووسیایە : ـ دوای سەرداریانە ـ «لە ئێمەدا هاتە خوارەوە» .

نەئەکرد کە نازڵ نەبوویایە ؛ چونکی ئەوەی تیایە کە خوا دۆستی ئەوانەو سەرداریانە . ئەگەر چە ئەوەی تیایە کە ئێمە قەصدی فیرارمان کرد . ئەمما چونکی نەمانهێنایە جێ خوا ئەم ئایەتەی نازڵکرد کە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوە کە بەوە موئاخەذەمان ناکاو بوویشە بە (محب)و سەردارمان .

لە غەزای ئوحودا پێغەمەر ـ ﷺ ـ هەزار کەسی لە خذمەتا چوو ، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی = کوڕی = سەلوول لە ڕێ لەگەڵ سێیەکی لەشکرەکەدا گەڕانەوە ، وتیان : بۆ بە خۆڕایی خۆمان بدەین بەکوژ . بەنو سەلەمە لە خەزرەجو ، بەنو حاریثە لە ئەوس ، ئەوانیش تەمایان بوو شوێن ئەو مونافیقە بکەونو بگەڕێنەوە . خوا لەوە حیفظی کردنو ئەباتیان کرد . موشریکان ئەو ڕۆژە سێ هەزار بوون .

١٠٨٧/٢١٠ ـ عن زيد بن أرقم ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : اللهم اغفر للأنصار ، ولأبناء الأنصار ، وأبناء أبناء الأنصار . م ـ ٤١٢/٩ .

تەرجەمە :

زەیدی کوڕی ئەرقەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوایا لە ئەنصار خۆش ببی ، لە کوڕانی ئەنصاریش خۆش ببی ، لە ئەبنای ئەبنای ئەنصاریش خۆش ببی .

١٠٨٨/٢١١ ـ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ حدَّث أن رسول الله ـ ﷺ ـ إستغفر للأنصار ، وأحسبه قال : وللذراري الأنصار . ولموالي الأنصار . لا أشك فيه . م ـ ٤١٢/٩ .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ

ئیستیغفـاری بۆ ئـەنصار کـرد . ئیسحاقی کـوڕی عەبـدوڵلای کـوڕی ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : وا بزانم کـە ئەنـەس فەرمووی : کە ئیستیغفاری بۆ ذوڕڕییەتی ئەنصاریش کرد . فەرمووی : بۆ مەوالی ی ئەنصاریشی کرد ، لەوەدا شکم نی یە . خوڵاصە ئیسحاق سێ شت لە ئەنەسی مامیەوە ریوایەت ئەکا ، لە یەکێکیانا کە ذوڕڕییەتە شکی هەیە ، لە دوانیانا شکی نیە کە ئەنەس ریوایەتی کردوە .

**۱۰۸۹/۲۱۲ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعـالى عنه ـ قـال : قالت الأنصار [للنبي ـ ﷺ ـ أخرى] : أقسم بيننا وبينهم النخل ، قال : لا ، قال [الأنصار للمهاجرين] : تكفونا المؤنة وتَشْرَ كونا [ومن الافعال ، وبضمير جمع الغائب . منه] في التمر قالوا [أي المهاجـرون] : سمعنا وأطـعنـا . ح ـ ٦/١٤٤ . ح ـ ١٦٨/٤ . وفـيـه : بيـنـنـا وبـين إخواننا . ن .**

**تەرجەمە :**

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەنصار عەرزی پێغەمەریان کرد : دارخورماکانمان لە بەینی ئێمەو موهاجیرینا بەش بکە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ [حەزی نەکـرد کە دارخـورماکـانیان لـە دەست بچێتە دەرێ] فەرمووی : خـەیر بـەشی ناکـەم . ئەنصـار ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بە موهاجیرەکانیان فەرموو : کە وابێ بەخێوکردنەکەیمان لە کۆڵ بخەن و لە خورماکەیا شەریکمان بن ! مـوهاجیـرەکان فـەرموویـان : بەسەرچاو . (سمعا وطاعة) بیستمان و ئیطاعەتان ئەکەین .

**۱۰۹۰/۲۱۳ ـ عن أنس ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ قـال : رأى النبي ـ ﷺ ـ النساء والصبيان مقبلين قال [عبدالعزيز] : حسبت أنه قال : من**

عُرس [وفي النكاح : من عُرس . بلا شـك] فقام النبي ـ ﷺ ـ ممثـلا [متصبا قائما] ، [وفي النكاح : ممتنا] فقال : اللهم أنتم من أحب الناس اِليّ . قالها ثلاث مرات . ح ـ ٦/١٤٥ . م ـ ٩/٤١٢ ، ليس فيه ثلاث مرات .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ چاوی کەوت بە چەند ژن و منالێ لە شایی ئەگەڕانەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە بەریان هەڵسا ، بە پێوە تەشریفی راوەستا ، فەرمووی : خوایا [یەعنی شـاهید بـە] ئەی ئـەنصار ئێـوە لەوانـەن کە لـە هەمـوو کەسم لـە لا خۆشەویسترن . سێ جاری وا فەرموو . لە موسلیما سێ جاری تیا نی یە .

١٠٩١/٢١٤ ـ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قـال : جاءت امرأة من الأنصار إلى رسول الله ـ ﷺ ـ ومعها صبي لها ، فكلمها رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : والذي نفسي بيده ! اِنكم أحبُ الناس الِيَّ مرتين . ح ـ ٦/١٤٥ . م ـ ٩/٤١٣ . ن . ليس فيه الصبي .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ژنێ لە ئەنصار هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ منالێکی لەگەڵ بوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ قسەی لەگەڵ فەرموو ، لە دواییا فەرمووی : قەسەم بەو ذاتەی کە نەفسم وا لە قەبضەی قودرەتیا ! ئێوە خۆشەویسترینی خەڵقن لە لای من . دووجار وای فەرموو . لە موسلیما بەحثی لە منالْ تیا نی یە .

١٠٩٢/٢١٥ ـ عن زيـد بن أرقم ـ رضي الله تعـالى عنــه ـ قـالت الأنصار : يا رسول الله لكل نبي أتباع ، وإنا قد اتبعناك ، فادع الله أن يجعل أتباعنا منا ، فدعابها ، [قال عمرو بن مرة] فنميت ذلك إلى ابن أبي

لیلی ، قال قد زعم زید ذلك . ح ـ ٦/١٤٥ .

تەرجەمە :

زەیدی کوڕی ئەرقەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەنصار عەرزی پێغەمەریان کرد ـ ﷺ ـ : کە هەر پێغەمەرێ تەبەعەی هەیە ، ئێمەیش تەبەعەی تۆین ، لە خـوا ـ عز وجـل ـ طەلـەب بفەرمـوو کە تەبەعەی ئێمەیش ، یەعنی سوێن خوارو عەبدو ئازادکراوی ئێمەیش لە ئێمە بن [یەعنی ئەوانیش ئەنصار بن ، پەیرەوی ئێمە کەن ، موعاوەنەتی دین بکەن ، ئەو شەرەفی بۆ ئێمە هەیە بۆ ئەوانیش ببێ] عەمری کوڕی مـوڕە ئەڵێ : ئـەم قسەی زەیـدەم بۆ ئیبن و ئـەبو لـەیـلا گێـڕایـەوە ، فەرمووی : زەید وا ئەڵێ .

١٠٩٣/٢١٦ ـ عن أسید بن حُضیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنَّ رجلا من الأنصار قال : یا رسول الله ألا تستعملني كما استعملت فلانا ؟ قال : ستلقـون بعـدي أثْـرة ، فـاصبـروا حتى تلقـوني عـلى الحـوض . ح ـ ٦/١٤٨ . م ـ ٩/٤١٣ ، م ـ ٨/٤٤ ، ن ، ت .

تەرجەمە :

ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمـووی : پیاوێ لە ئەنصار عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : (یا رسول الله) بۆ وەك فلان کەست لەسەر وەظیفە تەعیین فەرموە منیش بۆ بۆ وەظیفەیێ تەعیین ناکەی ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئێوە دوای من گەلێ کەس تووش ئەبن کە تەرجیحی غەیرتان بەسەرا بدەن ، ئەو وەختە صەبر بکەن تا لەسەر حەوضی کەوثەر بە من ئەگەن .

[(یا سیدي) حەوزی کەوثەر لای تۆیە ، رەنگە ئەم حەدیثەیشی تیا بێ (فانظر)] .

١٠٩٤/٢١٧ ـ عن يحي بن سعيد الأنصاري سمع أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ حين خرج معه إلى الوليد [بن عبدالملك بن مروان . . . . وكان أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قد توجه من البصرة حين آذاه الحجاج إلى دمشق يشكوه فأنصفه منه] قال : دعا النبي ـ ﷺ ـ الانصار الى أن يقطع لهم البحرين ، فقالوا : لا اِلاّ أن تقطع لاخواننا المهاجرين مثلها . قال : أمّا لا ، فاصبروا حتى تلقوني [على الحوض] فإنه سيصيبكم بعدي أُثرة . ح ـ ١٤٨/٦ . ح ـ ٣٢٥/٥ .

تەرجەمە :

ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی لە بەصرە ئەبێ ، حەججاج ئەذیەتی ئەدا ، ئەویش تەشریفی لە بەصرەوە هەڵەستێ ئەچێ بۆشام ، لای وەلید شکاتی حەججاجی لە لا ئەکا ، لەو سەفەرەدا یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاریی لە خدمەت ئەنەسا ئەبێ ، یەحیا ئەفەرموێ : ئەنەس فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەنصاری بانگ‌کردە خذمەت خۆی کە (بەحرەین) یان بۆ ببڕێتەوەو قەیدی کا لەسەریان ، عەرزیان‌کرد :(یا رسول الله) تا بۆ برادەرە موهاجیرینەکانیشمان ئەوەندەیان بۆ نەبڕیتەوە بۆ ئێمەی مەبڕەرەوە ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە هەر ئیبا ئەکەن‌و ناتانەوێ صەبر کەن تا لەسەر حەوز ئەگەنەوە بە من ؛ چونکی دوای من ئەگەنە ئەو زەمانە کە خەڵق بەسەر ئێوەدا تەرجیح ئەدرێ .

١٠٩٥/٢١٨ ـ عن أبي أُسيد الساعدي ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ : خير دور الأنصار بنو النجار [من الخزرج] ثم بنو عبد الأشهل [من الاوس] ثم بنو الحرث بن الخزرج [من الاوس] ثم بنو ساعدة [من الخزرج] وفي كل دور الأنصار خير . فقال سعد : ما أُري

النبي ـ ﷺ ـ إلا قد فضل علينا ، فقيل : قد فضلكم على كثير .
ح ـ ١٤٦/٦ ، ١٤٧ عن أبي حميد . م ـ ٤١٤/٩ ، ١٥ . عن أبي هريرة . ت . ن .

تەرجەمە :

ئەبو ئوسەیدی ساعیدیی ، ئەبو حەمیدی ساعیدیی ، ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بە بەعزێ فەرقی لەفظیی ریوایەت ئەکەن کە : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چاکترینی مالآنی ئەنصار بەنونەججارە لە خەزرەج ، لە دوای ئەوان بەنوعەبدولئەشهەلە لە ئەوس ، لە دوای ئەوان بەنولحەرثی کوڕی خەزرەجی بچکۆلەیە لە ئەوس ، لە دوای ئەوان بەنوساعیدەیە لە خەزرەج . هەموو مالآنی ئەنصار خێریان تیا هەیە . سەعدی کوڕی عوببادە لەوە رقی هەلسا فەرمووی : وا ئەزانم پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەفضیلی خەلقی داوە بەسەر ئێمەدا . تەمای بوو بچێتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لەو خوصووصەوە قسەی لە خزمەتا بکا ، پێیانوت : بۆ ئەوە چۆن لە خزمەتیا قسە ئەکەی ؟ ئەوەندەت بەس نی یە کە ئێوە لەو چوارەن کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناوی بردوون ؟ ئەوانی کە ناوی نەبردوون گەلێ زۆرترن . کە وابێ ئێوە بەسەر گەلێ خەلقی ترا تەرجیح دراون .

# أم سليم

١٠٩٦/٢١٩ - عن أنس [رضي الله تعالى عنه] عن النبي - ﷺ - قال : دخلت الجنة فسمعت خشفة ، فقلت : من هذا ؟ قالوا : هذه العميصاء بنت ملحان ، أم أنس بن مالك . م - ٩/٣٣٦ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : چوومە بەهەشتەوە خشپەیێکم بیست ، پرسیم : ئەوە کێیە ؟ وتیان : عومەیصایە کچی مەلحان ، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە .

١٠٩٧/٢٢٠ - عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال : كان النبي - ﷺ - لايدخل على أحد من النساء إلاّ على أزواجه ، إلاّ أُم سليم ، فإنه كان يدخل عليها . فقيل له في ذلك . فقال : إنِي أرْحمها ، قتل أخوها معي . م - ٩/٣٦٥ . ح - ٥/٦٤ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - عادەتی وابوو غەیری ئەزواجی طاهیرات لای هیچ ژنێ نەئەچوو ، فەقەط تەشریفی ئەچوە لای ئوممسولەیم . لێیان پرسی ، فەرمووی : بەزەییم پیا یێ حەرامی برای لە وەقعەی بیری مەعوونەدا کوژرا لەگەڵ منا . [یەعنی لەگەڵ ئەمرو ئیطاعەی منا ؛ چونکی پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی نەچوو بۆ بیئری مەعوونە (سهلە) کە ئوممو سولەیمەو دایکی ئەنەسەو ئوممو حەرامی خوشکی - رضي الله تعالى عنهم - پووری پێغەمەر بوون - ﷺ - مەحرەمی بوون یا لە شیرەوە یا لە نەسەبەوە ؛ بۆیە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی ئەچوە ماڵیان . ئەگەرچی خەڵوەتی ئەو لەگەڵ (أجنبیە) دا دروست بوە ؛ چونکی (لاینطق - أي ولا

يفعل ـ عن الهوى) هەموو حاڵ و حەرەكەو قسەفەرموونی هەمووی لە ژێر نەظارەتی خوادا بوە . ]

لەم حەدیثەدا ئیشارەتە بەمە كە خەڵوەت لـەگەڵ (أجنبیـە) ـ با هەردوكیان لە صوڵەحا بن ـ حەرامە ؛ چونكی جێی توهمەتە .

[مەسئەلەی رابیعەی عەدەوی‌یەو حەسەنی بەصریی ـ رحمهما الله ـ نابێ بە دەلیل ؛ چونكی ئەوە لە عولوومی باطینی‌یە ، ئێمە تێی ناگەین] .

دروستە خەڵوەت لەگەڵ مەحرەما .

رەحمەت و تەواضوع و تەلطیفی فەلاكەت زەدە سوننەتە .

(استثنا) لە (مستثنى) دروستە (نووي)

**١٠٩٨/٢٢١ ـ عن جابر بن عبدالله [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : أُريتُ الجنة فرأيت امرأة أبي طلحة . ثم سمعت خشخشة أمامي فإذا بلال . م ـ ٣٦٦/٩ .**

**تەرجەمە :**

جابير ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : بەهەشتم پێ نیشان درا ، ژنی ئەبو طەلحەم دی ، لە دواییا خشەخشێكم هاتەگوێ ، كەچی بیلال بوو .

**١٠٩٩/٢٢٢ ـ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال : مات ابن لأبي طلحة [رضي الله تعالى عنه] فقالت لأهلها : لا تحدثوا أبا طلحة بابنه حتى أكون أنا أُحدِّثُه . قال : فجاء فقرَّبت إليه عشاء ، فأكل وشرب ، فقال : ثم تصنعت له أحسن ما كانت تصنع قبل ذلك ، فوقع بها ، فلما رأت أنه قد شبع ، وأصاب منها قالت : يا أبا طلحة أرأيتَ لو أن قوما أعاروا عاريتهم أهل بيت فطلبوا عاريتهم ، أَلَهُمْ أن يمنعوهم ؟ قال : لا . قالت : فاحتسب ابنك . قال : فغضب وقال : تركتيني حتى**

تلطخت ثم أخبرتيني بابني ! فانطلق حتى أتى رسول الله - ﷺ - فأخبره بما كان . فقال رسول الله - ﷺ - : بارك الله لكما في غابر ليلتكما . قال : فحملت . قال : فكان رسول الله - ﷺ - في سفر وهي معه ، وكان رسول الله - ﷺ - إذا أتى المدينة من سفر لايطرقها طروقا ، فدنوا من المدينة ، فضربها المخاض ، فاحتبس عليها أبو طلحة ، وانطلق رسول الله - ﷺ - قال : يقول أبو طلحة : انك لتعلم يارب اَنه يعجبني أن اَخرج مع رسولك - ﷺ - إذا خرج ، وأدخل معه اِذا دخل ، وقد احتبست بما ترى . قال : تقول أم سليم : يا أبا طلحة ما اَجِد الذي كنت اَجِد ، إنطلق فانطلقنا ، قال : وضربها المخاض حين قدما ، فولدت غلاما ، فقالت اُمي : يا أنس لايرضعه أحد حتى تغدو به على رسول الله - ﷺ - .

فلما أصبح إحتملته ، فانطلقت به إلى رسول الله - ﷺ - . قال : فصادفته ومعه ميسم ، فلما رآني قال : لعل أم سليم ولدت . قلت : نعم . فوضع الميسم . قال : وجئت به فوضعته في حِجره ، ودعا رسول الله - ﷺ - بعجوة من عجوة المدينة ، فلاكها في فيه حتى ذابت ، ثم قذفها في فيِّ الصبي ، فجعل الصبيُّ يتلمَّظها . قال : فقال رسول الله - ﷺ - : انظروا إلى حِبِّ الأنصار التمر . قال : مسح وجهه وسماه عبدالله . م - ٩/٣٦٦ .

تەرجەمە :

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کوڕێکی ئەبوطەلحە کە لە ئومموسولەیم بوو مرد ، ئومموسولەیم - رضي الله تعالى عنها - بە کەس و کارەکەی فەرموو : خەبەر مەدەن بە ئەبو طەلحە کە کورەکەی مردوە تا خۆم خەبەری ئەدەمێ . ئەبوطەلحە هاتەوە ، ئومموسولەیم

شێوی بۆ دانا ، خواردی و خواردی یەوە . لەوە پێش ئومموسولەیم چۆن خۆیی ئەرازانەوە بۆ ئەبو طەلحە لەوە جوانتر خۆیی بـۆ جوان کـرد ، تا ئەبوطەلحە لەگەڵی دروست بوو . ئوممو سولەیم کە زانی ئەبو طەلحە تێری خواردو لەویش ئیحتیاجی ژن ومێردیی هێنـایە جێ فـەرمووی : ئـەی ئەبوطەلحە خەبەرم بدەرێ : کە قەومێ شتێکیان بە ئەمانەت لای ئەهل و بەیتێ داناو لە دواییدا ئەو ئەمانەتەیان لێ ویستنەوە ئایا بۆیان هەیـە کە ئەمانـەتەکـەی نەدەنـەوە ؟ فـەرمـووی : خـەیـر . ئـوممو سـولـەیم پێی فەرموو : کە وابێ وابزانە کورەکەی تۆیش ئەو ئەمانەتەیە . [یەعنی صاحیبەکەی بردی یەوە بۆ خۆی کە خوایە ـ عز وجل ـ] . ئەبوطـەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ لەوە رقي هەڵسا ، فەرمووی : وازت لێ هێنام تا خۆمم پیس کردو لە دواییدا خەبەرت دامێ کە کورەکەم مردوە !

هەڵسا تەشریفی چـوو بۆ خـزمەت پێغـەمەر ـ ﷺ ـ خـەبەری موعامەلەی ئوممو سولەیمی عەرزکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوا ئەو شەوی رابوردوەتان بۆ موبارەك بکا . ئەنەس فەرمووی : کە دایکی بەوە حامیلە بوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە دوای ئەوە تەشریفی بۆ سەفەرێ چوو . ئوممو سولەیمیش لەو سەفەرەدا لەگەڵ ئەبو طولحە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ لە خزمەت پێغەمەرا بوو ـ ﷺ ـ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ عادەتی وابوو کە تەشریفی لە سەفەرێ عەودەتی بفەرموودایەوە بۆ مەدینە لە پڕ بە بێ خەبەر تەشریفی نەدەچوە ماڵێ . لە مەدینە نزیك بوونەوە ، ئوممو سولـەیم ژانی پیاهـات ، ئەبـوطەلحـەی لەسەر بەند بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی موبارەکی رۆیی بۆ مەدینە . ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : یارەبی خۆ تۆ بۆ خـۆت ئەزانی کە وام لە لا خۆشە کە هەر وەختێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لە

مەدینە بچێتە دەرێ منیش لە خزمەتیا بچمە دەرێ . کە ئەو تەشریفی داخڵی مەدینە ببێ منیش لە خزمەتیا داخڵی مەدینە ببم [یەعنی هیچ لێی جوێ نەبمەوە] ئێستەیش بە واسیطەی ئەوەوە کە تۆ ئەیبینی من لێرە حەبس بووم و لە خزمەتیا نەچوومەوە . ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : کە ئەبو طەلحە ئەم موناجاتەی کرد ئوممو سولەیم وتی : (یا ابو طلحه) ئەو ژانەی کە پیاما هات نەم ما ، هەڵسە بکەوەرە رێ . هەردوکیان کەوتنە رێ ، لەو وەختەدا کە گەیینە مەدینە ژانی پیاهات و کوڕێکی بوو ، فەرمووی : ئەی ئەنەس هیچ کەس شیر نەدا بەم کوڕە تا سبەینێ ئەیبەیتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - کە رۆژ بۆوە کوڕەکەم هەڵگرت بردمە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - .

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لە وەختێکا تەصادوفی پێغەمەرم کرد - ﷺ - کە ئەوی داغی حەیوانی پێ ئەکرێ بە دەستی موبارەکیەوە بوو حەیوانی پێ داغ ئەفەرموو . کە چاوی پێم کەوت فەرمووی : وا بزانم ئوممو سولەیم منالی بوە . عەرزم کرد : بەڵێ . پێغەمەر - ﷺ - داغەکەی دانا ، کوڕەکەم برد لە باوەشی موبارەکیا دام نا . پێغەمەر - ﷺ - عەجوەی طەلەب کرد [کە چاکترینی خورمای مەدینەیە بردمانە خزمەتی و] جوی تا لە دەمی موبارەکیا توایەوە ، لە دواییا خستیە دەمی منالەکەوە ، منالەکە ملچەملچ دەستی کرد بە مژینی خورماکە . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : تەماشا بکەن ئەنصار چەندە حەز لە خورما ئەکەن ! ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - دەستی موبارەکی هێنا بە سەر و چاوی منالەکەدا و ناوی نا عەبدوڵلا .

ئەمجا تەماشای فەضیلەتی ئوممو سولەیم بکەین : لەگەڵ ئەمەدا

خۆی لەو وەختەدا جگەرپارەی وەفاتی کردبو چەندەی صەبر کرد تا ئەبوطەلحەی بە هەموو ئارەزووی خۆی نەگەیان خەبەری نەدایێ ؟ بە چە نەوعێ (تسلي) ئەبوطەلحەی دا : کە صاحیب ئەمانەت ئەمانەتی خۆیی بردۆتەوە حەقی ئەوەت نی‌یە لەبەرت گران بێ ؟ بەوە نائیلی دۆعاو بەرەکەتی پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ .

دۆعاکەی لای خوا قەبووڵ بوو ، هەر ئەو شەوە حامیلە بوو ، کوڕێکی عومردرێژی صاحیبی ئەولادی زۆری بوو ، ئەو کورەیشی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە تفی موبارەکی خۆی گۆشی کرد ، ئەووەڵ طەعامی ئەوە بوو ، ئوممووسولەیم ـ رضي الله تعالی عنها ـ نەیهێشت شیری کەسی بلدرێتێ تا نەبرێتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

ئەبو طەلحە ـ رضي الله تعالی عنه ـ چەندە مولازیمی پێغەمەر بوە ـ ﷺ ـ ؟ بە تەمەننای ئەو لە حوزووری خوادا ـ عز وجل ـ بۆ خاتری ئەمە کە لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێ نەمێنێ خوا ـ عز وجل ـ چۆن ژانی ئوممووسولەیمی بردە دواوە تا گەیینە مەدینە ؟ ئەم خاریقی عادەتە کەرامەتە بۆ ئەبوطەلحەو موعجیزەیە بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

خۆجوانکردنی ژن بۆ مێردی سوننەتە ؛ چونکی ئەوە بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەیی و تەقریری فەرموون .

لە پێش شیردان بە منداڵ بەخورماگۆشکردنی سوننەتە .

تەسەللی ئەهل و عەیال بە ئەحسەنی وەجهـ سوننەتە .

داغکردنی حەیوان بۆ نیشانە سوننەتە .

تەقدیمی (اهم) لە (مهم) سوننەتە .

دۆعاکردن بۆ فەلاکەت زەدە سوونەتە .

زانینی ماڵ و منداڵ بە موعامەلەی ژن ومێرد ـ بەو شەرتە لە جێیێکی

ترا بن ـ بەئسی نی یە .

۲۲۳/ ۱۱۰۰ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما كان يوم أُحد إِنهزم الناس عن النبي ـ ﷺ ـ وأبو طلحة بين يدي النبي ـ ﷺ ـ مجوِّبٌ به عليه بحجفة له [أي مترس به بترس] وكان أبو طلحة رجلا راميا شديد القدِّ [وتر القوس] يكسر يومئذ قوسين أو ثلاثا ، وكان الرجل يمر ومعه الجعبة من النَّبل فيقول ـ ﷺ ـ : أنثرها لأبي طلحة ، فأشرف النبي ـ ﷺ ـ ينظر إلى القوم ، فيقول أبو طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا نبي الله بأبي أنت وأمي لاتشرف يصيبك سهم من سهام القوم نحري دون نحرك ! ولقد رأيت عائشة بنت أبي بكر وأم سليم ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وإنهما لمشمرتان أرى خدم سوقهما [خلخال ساقيهما] تنقزان القُرب على متونهما تفرغانه في أفواه القوم ، ثم ترجعان فتملآنها ثم تجيئان فتفرغانها في أفواه القوم . ولقد وقع السيف من يدي أبي طلحة إِما مرَّتين وإِمَّا ثلاثا [من النعاس .م] ح ـ ٦/١٥٦ . م . ٧/٤٦٥ . في الجهاد ، وفي غزوة أُحد .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : كە رۆژی ئوحود بوو خەڵق شكان پێغەمەریان ـ ﷺ ـ بە تەنها بەجێ هێشت [غەیری ئەبوبەكرو عومەرو عەلی و طەلحەو ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە بەردەمی پێغەمەرا بوو ـ ﷺ ـ قەڵغانێكی كردبوو بە سوپەر بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ تیرانداز بوو ژێی كەوانەكەی زۆر توند بوو ، ئەو رۆژە سێ قەوسی شكان .

پیاو بەوێدا رائەبوردن تیركەشی پڕ لە تیریان پێ بوو پێغەمەر

ـ ﷺ ـ ئه‌مری پێ ئه‌فه‌رموون : تیرکه‌شه‌کانتان بۆ ئه‌بوطه‌لحه هه‌ڵبرێژن . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ خۆی به‌رزکرده‌وه ته‌ماشای موجاهیده‌کانی ئه‌کرد ، ئه‌بو طه‌لحه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌یفه‌رموو : (یا رسول الله) باوکو دایکم به صه‌ده‌قه‌ت بێ خۆت به‌رز مه‌که‌ره‌وه مه‌بادا تیرێکی دوشمنه‌کانت لێ‌که‌وێ ، سنگی من قه‌ڵغانی سنگی تۆیه له پێشته‌وه‌یه !
ئه‌نه‌س ئه‌فه‌رموێ : حه‌زره‌تی عائیشه‌و ئومم‌وسوله‌یم دی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قولیان لێ هه‌ڵکردبوو خڵخاڵه‌ی پێیانیم ئه‌بینی ، کونه‌یان له‌سه‌ر پشت بوو ئه‌یانکرده ناوده‌می قه‌ومه‌که‌وه ، له دواییدا ئه‌گه‌ڕانه‌وه‌و کونه‌کانیان پڕه‌کرده‌وه ئه‌هاتنه‌وه‌و ئه‌یانکرده ده‌می غه‌زایی یه‌کانه‌وه .
ئه‌و رۆژه له به‌ر وه‌نه‌وز چاوم پێکه‌وت دوو ده‌فعه یا سێ ده‌فعه شیر له ده‌ست ئه‌بوطه‌لحه که‌وته‌خوارێ .

١١٠١/٢٢٤ ـ عن أنس قال : دعا النبي ـ ﷺ ـ الأنصار خاصة ، فقال : هل فيكم أحد من غيركم ؟ قالوا : لا إلا ابن أخت لنا [نعمان بن المقرن . أحمد] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ابن أخت القوم منهم .
ح ـ ١٣/٦ . م ـ ١٠/٥ . ن . ت .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : [كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ قسه‌ی ئه‌نصاری پێگه‌یی یه‌وه له غه‌زای حونه‌ینا .] پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به خوصووصی ئه‌نصاری بانگ‌کرد ، فه‌رمووی : هیچ غه‌یره‌تان له ناوایه ؟ عه‌رزیان‌کرد : خه‌یر ته‌نها خوشکه‌زایێکمان لایه . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : خوشکه‌زای قه‌وم له‌و قه‌ومه‌یه . (وباقي الحديث كما سبق في فضائل الانصار) .

١١٠٢/٢٢٥ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : قال رسول

الله ـ ﷺ ـ وهـو في مجلس عظيم من المسلمـين : أُحـدِّثكم بخـير دور الأنصار . قالوا : نعم يا رسول الله ـ ﷺ ـ قال رسول الله ـ ﷺ ـ : بنو عبد الأشهل . قالوا : ثم من يا رسول الله ؟ قـال : ثم بنو النجـار . قالوا : ثم من يا رسول الله ؟ قال : ثم بنو الحرث بن الخزرج . قالوا : ثم من يا رسول الله ؟ قال : ثم بنو ساعدة . قالوا : ثم من يا رسول الله ؟ قال : ثم في كل دور الأنصار خير . فقام سعد بن عبادة مغضبا فقال : اَنحنُ آخر الأربع ؟ حين سمى رسول الله ـ ﷺ ـ دارهم ، فأراد كلام رسول الله ـ ﷺ ـ فقال له رجال من قومه : إجلس ! ألا ترضى اَنْ سمى رسول الله ـ ﷺ ـ داركم في الأربع الدور التي سمى ؟ فمن تُرك فلم يسم أكثر ممن سمي . فانتهى سعد بن عبادة عن كـلام رسول الله ـ ﷺ ـ م ـ ٩/٤١٥ .

وفي حديث أبي اسيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ تقديم بني النجار على بني عبد الأشهل . وفيه : وبلغ ذلك سعد بن عبادة فوجد في نفسه ، وقال : خُلِّفنا فكنّـا آخر الأربـع ! اَسرِجـوا لي حماري آتي رسـول الله ـ ﷺ ـ . فكلمه ابن أخيه سهل فقال : اَتـذهب لترد عـلى رسول الله ـ ﷺ ـ ورسول الله ـ ﷺ ـ أعلمُ ؟ اَوَليس حسبُك اَن تكون رابع أربع ؟ فـرجع ، وقـال : الله ورسـولـه أعلمُ . واَمـر بحمـاره فحـلّ عنـه . م ـ ٩/٤١٤ .

مەعنای مەقصوود رابورد[1] ، نە قەسطەلانی و نە نەوەویی ـ رحمهما

---

(١) مەبەستی لە (مەعنای مەقصوود رابورد) حەدیثی (١٠٩٥/٢١٨)ە ، وەك ئەم حەدیثە وایەو لەوێ تەرجەمەکەی نووسیوە . ماموّستا مەلا سەلامیش هیچی بۆ (تەوفیق)ەکە نەکردوە .

الله ـ قسەیان لە تەقدیمی بەنی نەججارو بەنی (عبد الأشهل) نەکردوە . مەلا سەلام ـ سلمه الله ـ قسەی لێ بکاو تەوفیق لە بەینیانا بکا . (وفقه الله) .

١١٠٣/٢٢٦ ـ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : خرجت مع جرير بن عبدالله البجلي ـ رضي الله تعالى عنه ـ في سفر ، فكان يخدمني ، فقلت له : لا تفعل . فقال : إني قد رأيت الأنصار تصنع برسول الله ـ ﷺ ـ شيئا آليت أن لا اَصحب أحدا منهم إلا خدمته . زاد ابن المثنى وابن بشار في حديثهما : وكان جرير أكبر من أنس . قال ابن بشار : أسنُّ من اَنس . م ـ ٩/٤١٥ .

تەرجەمە :

ئەنەسی کوڕی مالیك ئەفەرموێ : لەگەڵ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ی بۆ سەفەرێ چوومە دەرێ ، جەریر خذمەتی ئەکردم ، پێم‌وت : وا مەکە . فەرمووی : ئەنصارم دی شتێکی گەورەیان ئەکرد بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ سوێندم‌خوارد : کە رەفیقایەتی هیچ ئەنصارییێ ناکەم ئیللا ئەبێ هەر خذمەتی بکەم . (ابن المثنى) ئەفەرموێ : جەریر لە ئەنەس گەورەتر بوو . ئیبن‌و بەششار ئەفەرموێ : جەریر لە ئەنەس بە عومرتر بوو .

گلی خوش‌بوی درحمام روزی[1] . . . الخ

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەساڵ خذمەتی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ .

(١) ئەمە بەشێکە لە چەند شیعرێکی شێخی سەعدی وا لە خوارەوە ئەو دواکەی دەنووسین :

رسید از دست محبوبی بدستم
بدو گفتم کە : مشکی یا عبیری ؟
کە از بوی دلاویز تو مستم

# أبو دجانة ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١١٠٤/٢٢٧ ـ عن أنس ـ رضي الله تعالىٰ عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ أخذ سيفا يوم أُحد ، فقال : من يأخذ مني هذا ؟ فبسطوا أيديهم كل إنسان منهم يقول : أنا ، أنا . قال : فمن يأخذه بحقه ؟ فأحجم القوم ، فقال سماك بن خرشنة ـ أبو دجانة ـ ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أنا آخذه بحقه . قال : فأخذه ففلق به هام المشركين م ـ ٩/٣٧٧ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ شیرێکی گرت بە دەستەوە لە رۆژی ئوحـودا ، فەرمووی : کێ ئەم شیرەم لێ وەرەگرێ ؟ هەموو دەستیان بۆ درێژ کرد ، هەموو ئەیانوت : من من . [ئەوەم هاتەوە فکر : مورووییێکی زەردو ، سوورو ، سەوزو ، شینم هەڵدا . کێ ئەیگرێتەوە بۆ خۆی . . من ، من][1] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کێ بـەو شەرتـە وەری‌ئەگـرێ کە حەقی بەجێ بێنێ ؟ خەڵق هەموو بێدەنـگ بوون . سـەماکی کـوڕی خەرەشە ـ کە ئەبو دوجانەیە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : من بەو شەرتە کە حەقی بەجێ‌بێنم وەری ئەگرم . ئەنـەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : [پێغەمەر ـ ﷺ ـ شیرەکەی دا بە ئەبو دوجانە] ئەویش وەری‌گرت و کەللەی موشریکانی پێ لەت کرد .

---

بگفتا : من گولی ناچیز بودم
ولیکن مدتی با گول نشستم
جمال همنشین در من أثر کرد
وگر نه همان خاکم که هستم

(١) ئەمە وەك جۆرە یاری‌یەکی کۆن بێت وایە ، گەلێکم پرسی هیچم دەربارەی دەست نەکەوت .

## فضائل عبدالله بن عمرو بن حرام ـ والد جابر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ

١١٠٥/٢٢٨ ـ جابر بن عبدالله [رضي الله تعالى عنهما] يقول : لما كان يوم أُحد جيئ بـأبي مسجىً ، وقد مُثِّل به ، قـال : فأردت أن أرفـع الثوب ، فنهاني قومي ، فرفعه رسول الله ـ ﷺ ـ أو أمر به فرُفِعَ ، فسمع صوت باكية أو صائحة ، فقال : من هذه ؟ فقالوا : بنت عمرو ، أو أخت عمرو ، فقال : ولِمَ تبكي ؟ فما زالت الملائكة تظله بأجنحتها حتى رفع ! م ـ ٣٧٨/٩ .

وعنه قال : أُصيبَ أبي يـوم أُحد ، فجعلت أكشف الثـوب عن وجهه وأبكي ، وجعلوا ينهوني ، ورسول الله ـ ﷺ ـ لاينهاني ، قال : وجعلت فاطمة بنت عمرو تبكيه ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : تبكيه أو لا تبكيـه ، فـما زالت المـلائكـة تـظله بـأجنحتهـا حتى رفعتمـوه ! . م ـ ٣٧٨/٩ .

تەرجەمە :

جابیری کوری عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرمـوێ : باوکم لە رۆژی ئوحودا شەهیدکرا ، لووت و ، لێوو ، گوێیان کردبوو ، بە سەرداپۆشراویی هێنرایە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ سەترەکەم لەسەر لاداو گریام ، قەومەکەم نەهیان لێ کردم ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ نـەهی لێ نـەدەکردم . فـاطیمەی کچی عـەمر بـۆی ئەگـریا ، پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆی بگریی یا بۆی نەگریی تا هەڵتان گرت [لەو جێیەی کە لێی شەهید کرابوو] مەلائیکە بە باڵیان هەر سێبەریان بۆ ئەکرد !

گریان بۆ مردوو دروستە بە شەرتی خۆی . پێغەمەر ـ ﷺ ـ مەنعی

جابیری نەکرد . بە تەعریض مەنعی فاطیمەی کرد ؛ چونکی ئـەو بە دەنگی بەرز ئەگریا .

مەلائیکە سێبەر ئەکا بۆ شەهید تا لە مـەعرەکـە هەڵـەگیررێ .

عەیبی دنیایی مردوو شاردنەوە سونتەتە .

## فضائل جُلَيْبيب - رضي الله تعالى عنه -

١١٠٧/٢٣٠ - عن أبي برزة - رضي الله تعالى عنه - أن النبيّ - ﷺ - كان في مغزى له ، فأفاء الله عليه ، فقال لأصحابه : هل تفقدون من أحد ؟ قالوا : نعم ، فلانا ، وفلانا ، وفلانا . ثم قال : هل تفقدون من أحد ؟ قالوا : لا . قال : لكني اَفقِد جليبيا ، فاطلبوه ، فطُلِب في القتلى ، فوجدوه إلى جنب سبعة قد قتلهم ، ثم قتلوه . فأتى النبيُّ - ﷺ - فوقف عليه . فقال : قتل سبعة ثم قتلوه ! هذا مني وأنا منه ، هذا مني وأنا منه . قال : فوضعه على ساعده ليس له سرير اِلاّ ساعدي النبي - ﷺ - . قال : فحفر له ووضع في قبره ، ولم يذكر غسلا . م - ٩/٣٧٩ .

تەرجەمە :

ئەبوبەرزە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی لە غەزاییَکا بوو [ناوی نەبراوە لە نەوەویدا] خوا تالآنی زۆری بەسەر پێغەمەرا - ﷺ - باراند ، لە ئەصحابی کیرامی پرسی : هیچ کەستان لیَ کەم بۆتەوە ؟ عەرزیان کرد : بەلیَ فلآن‌و ، فلآن‌و ، فلآن . لە دواییدا فەرمووی : هیچ کەستان لیَ ون‌بوە ؟ عەرزیان کرد : خەیر . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەمما من (جلیبیب)م لیَ ون بوە . بچن بۆی بگەڕێن . تەشریفیان چوو لە ناو مەقتولەکانا بۆی گەڕان ، دۆزییانەوە ، لە تەنیشت حەوت کەسەوە راکشابوو . [کە خەبەریان دا بە پێغەمەر - ﷺ -] پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی چوو بەسەر جولەییبەوە راوەستاو فەرمووی : حەوت کەسی کوشتووەو لە دواییا شەهیدیان کردوە . فەرمووی : ئەمە لە منەو من لەوم ، ئەمە لە منەو من لەوم .

ئه‌بوبه‌رزه ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ جوله‌یبیبی له‌سه‌ر هه‌ردوو بازووی موباره‌كی دانا ته‌ختنه‌بوو كه له سه‌ری دابنرێ غه‌یری ساعیدی سیمینی موباره‌كی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ .
ئه‌بوبه‌رزه فه‌رمووی : قه‌بریان بۆ هه‌ڵكه‌ندو نایانه ناو قه‌بره‌كه‌یه‌وه .
ئه‌بوبه‌رزه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌وه‌ی ذیكر نه‌كردوه كه شۆراوه یان نا .

شه‌هید نوێژی له‌سه‌ر ناكرێ . ناشۆررێ . به جلی به‌ریه‌وه دفن ئه‌كرێ .

سكووت له مه‌عره‌ضی به‌یانا حه‌صر ئه‌گه‌یێنێ كه هه‌ر دفن ئه‌كرێو هیچی تر .

له حه‌ربا (تفقد)ی ئۆردوو لازمه .

مه‌دحو ته‌رغیبی پیاوی ئازا سوننه‌ته .

١١٠٨/٢٣١ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : خرج رسول الله ـ ﷺ ـ وعليه ملحفة منعطفا ، [متعطفا] [مرتديا] بها على منكبيه ، وعليه عصابة دسماء [سوداء] حتى جلس على المنبر ، فحمد الله وأثنى عليه ، ثم قال : أما بعد : أيها الناس ، فإن الناس يكثرون ، وتقل الأنصار حتى يكونوا كالملح في الطعام . فمن وُلِّيَ منكم أمرا يضر فيه أحدا أو ينفعه فليقبل من محسنهم ويتجاوز عن مسيئهم .
ح ـ ١٥١/٦ ت . ن . م ـ ٤١٣/٩ مختصرا .

ته‌رجه‌مه :

ئیبنو عه‌باس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ [له مه‌ره‌ضی وه‌فاتیا] ته‌شریفی هاته‌ده‌رێ به‌رماڵێكی دابوو به‌سه‌ر شانیا مێزه‌رێكی ره‌شی به‌سه‌ره‌وه به‌ستبوو، له‌به‌ر

ناساغی یەکەی ، هات تا تەشریفی لەسەر مینبەر دانیشت . حەمدو ئەنای خوای کرد ، لە دواییدا فەرمووی : ئەی ئینسانان خەڵق تا ییْن زۆر ئەبن [چونکە لە هەر چوار طەرەفەوە خەڵق ییْن ئیسلام ئەبن] ئەنصار کەم ئەبن [بەنیسبەت خەڵقەوە] تا وایان لیْ یێ وەك خوێی ناوچیْشتیان لیْ بیْ [یەعنی کەمە بن و تامی خەڵق خۆشە کەن] هەرکەسیْ لە ئیْوە ئەی موهاجیرین ـ ئیشیْکی وای پیْ سپیْررا کە بتوانیْ زەرەرو نەفع بە خەڵق بگەییْنیْ ـ لە ئەنصار ـ لەوانەیان کە چاك بن چاکەکەیان لیْ قەبووڵ بکەن . تەجاوز لە خراپەی خراپەکانیان بکەن . یەعنی عەفویان بکەن .

١١٠٩/٢٣٢ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : إن رجلا [هو نفسه] أتى النبي ـ ﷺ ـ [قال : أتى رجل رسول الله] ـ ﷺ ـ فقال : يا رسول الله أصابني الجهد . فأرْسل إلى نسائه ، فلم يجد عندهن شيئا ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ألا رجل يُضَيِّف هذا الليلة يرحمه الله ؟ فقام رجل من الأنصار [يقال له : أبو طلحة . م] فقال : أنا يا رسول الله . فذهب به إلى أهله ، فقال لامرأته : [أكرمي ضيف رسول الله ـ ﷺ ـ فقالت : ما عندنا اِلاّ قوت صبياني ، فقال : هيئ طعامك ، وأصبحي سراجك ، ونومي صبيانك اِذا أرادوا عشاء . فهيأت طعامها واصبحت سراجها ، ونومت صبيانها . ثم قامت كأنها تصلح سراجها ، فأطفأته ، فجعلا يريانه أنهما يأكلان ، فباتا طاويين . فلما أصبح غدا إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : ضحك الله الليلة ، أو عجب من فعالكما . فأنزل الله : ﴿ويؤثرون على أنفسهم ـ ولو كان بهم خصاصة ـ ومن يوق شح نفسه فأولئك هم المفلحون﴾[1] ح ـ ٦/١٤٩ . ت ، ن .] ضيف رسول الله

(١) سوورەتی : حەشر . ئایەتی : (٩)

ـ ﷺ ـ لا تدخريه [لاتمسكي عنه] شيئا . قالت : والله ما عندي إلا قوتَ الصبيـة ، قال : فـإذا أراد الصبية العشـاء فنوميهم ، وتعـالي فـأطفئ السراج ، ونطوي بطوننا الليلة ، ففعلت ثم غدا الرجل على رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : لقد عجب الله ـ عز وجل ـ من فلان وفلانة ! فأنزل الله ـ عـز وجل ـ : ﴿ويؤثـرون على أنفسهم ولـو كـان بهم خصـاصـة﴾ ح ـ ٣٦١/٧ . ح ـ ١٤٩/٦ . م ـ ٣٣٦/٨ .

**تەرجەمە :**

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمـوێ : پیاوێ ـ کـە ئەبوهورەیرە خۆی بوە ـ ئەچێتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی ئەکا : (یا رسول الله) برسیمە ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردیە لای ئەزواجی طاهیرات هیچی لەلایان دەست نەکەوت کە بیدا بە ئەبوهورەیرە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کێ ئیمشەو ئەمە ئەکا بە میوانی خۆی و خوا مەرحەمەتی پێ بکا ؟ پیاوێ لە ئەنصاری ، ئەبوطەلحە ناو ، هەڵسا عەرزی کرد : (یا رسول الله) من . پیاوەکە ئەبوهورەیرەی بردە ماڵەوە ، بە ژنەکەی فەرموو : ئەمە میوانی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ ئیکـرامی میوانی پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بگـرە ، هیچیان لێ پاشەکەوت مەکە . ژنەکەی پێی وت : وەڵڵاهی غەیری شێوی مناڵەکان نەبێ هیچی ترمان نی یە . ئەمری پێکرد : چرا داگیرسێنە ، طەعامەکەت حازر بکە ، مناڵەکان داوای شێویان کرد بیان نوێنە ، لە دواییـا چراکـە بکـووژێنـەرەوە . . . ژنـەکـەی وای کـرد . ئـەوانیش خـۆیـان لای میوانەکەیان وا دایە قەڵەم کە نانی لەگەڵ ئەخۆن ، نەیشیان ئەخوارد . ئەو شەوە هەموویان بێ شێو سەریان نایەوە !

صبحەینێ ئەبوطەلحـە چوە خـزمەت پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێی فـەرموو : ئیمشـەو خوا عـەجایبی لـە ئیشی ئێوە مـا ! یـا

فەرمووی : بە ئیشی ئێوە پێکەنی . خوا ئەم ئایەتەی نازڵکرد لە مەدحی ئەنصارا کە مەعنای وایە : «ئەنصار ـ ئەگەر چی خۆیشیان برسی و موحتاج بن ـ خەڵقی تر بەسەر خۆیانا تەرجیح ئەدەن ، خۆیان تەحەمولی ئەو برسێتی و ئیحتیاجی یە ئەکەن . هەرکەسێ لە خیسسەتی نەفسی مەحفوظ بێ ئەوانە ـ ئەوانەن کە فەلاحیان بوە» .

تەرجیحی موحتاج بەسەر خۆیا سوننەتە .

باوك بۆی هەیە نەفەقەی ماڵ و منـاڵ بدا بە ئینسانی موحتاج .

ئیکرامی موسافیر سوننەتە .

خوا ـ عز وجل ـ بە هیچ (متـأثـر) نابێ ، تا بە واسیطەی تەعەججوبەوە پێ بکەنێ . هەر شتێ لە ئایەتاو لە ئەحادیثا دەلالەت بکا لەسەر صیفەتێ کە مەحاڵ بێ بۆ خوا ـ عز وجل ـ وەك : رەحمەت ، تەعەججوب ، پێکەنین ، . . . موراد لەو صیفەتە مەبدەئی ئەو صیفەتە نی یە ، بەڵکو ئەو غایەتەیە کە لەو صیفەتەوە پەیدا ئەبێ ، کەسێ بەزەیی بە یەکێکا بێ چاکەی لەگەڵ ئەکا ، کەسێ تەعەججوبی لە ئیشێ بمێنێ چاك تەحسینی ئەکا ، بە پێی ئەوە موکافاتی ئەداتەوە . ئەگەر ئەو ئیشە ئیشێکی خراپ بێ تەقبیحی ئەکا ، ئیرادەی موجازاتی بێ موجازاتی ئەدا .

ئینسان خۆی موعاوەنەتی کەسێکی پێ بکرێ خۆی بیکا ، پێی نەکرێ شەفاعەتی لای خەڵق بۆ بکا .

ئیطاعەی ئەمری مەشرووعی مێرد لەسەر ژن فەرزە .

۲۳۳/ ۱۱۱۰ ـ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : مرَّ أبو بكر والعباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بمجلس من مجالس الأنصار ـ وهم

يبكون - فقال : ما يبكيكم ؟ قالوا : ذكرنا مجلس النبي - ﷺ - منا ، فدخل أحدهما على النبي - ﷺ - فأخبره بذلك . قال : فخرج النبي - ﷺ - قد عصب على رأسه حاشية برد . قال : فصعد المنبر - ولم يصعد بعد ذلك اليوم - فحمد الله وأثنى عليه . ثم قال : أوصيكم بالأنصار ؛ فإنهم كَرِشِي وعَيْبتي ، وقد قضوا الذي عليهم ، وبقي الذي لهم . فاقبلوا من محسِنهم ، وتجاوزوا عن مسيئهم . ح - ٦/ ١٥٠ . ن .

تەرجەمە :

ئەنەسی بنی مالیك - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : ئەبوبەكرو عەبباس - رضي الله تعالى عنهما - بە لای مەجلیسێكی ئەنصارا تەشریفیان رابورد ، ئەنصار ئەگریان ، لێی پرسین : بۆچی ئەگرین ؟ عەرزیان كرد : ئەو مەجلیسەمان فكركردەوە كە پێغەمەر - ﷺ - لە ناومانا تەشریفی دائەنیشت [ئەترسین بەم ناساغی یە وەفات بكا ، ئەو مەجلیسە ون بكەین] عەبباس ، یا ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنهما - تەشریفی چوە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - . . ئەو قسەی ئەنصارەیان خەبەردا بە پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هاتەدەرەوە ، سەری موبارەكی پێچابوو بە كەناری بوردێ ، تەشریفی سەركەوتە سەر مینبەر ، دوای ئەو دەفعەیە ئیتر تەشریفی نەچوە سەر مینبەر ، حەمدو ئەنای خوای كرد ، لە دواییدا فەرمووی : ئەنصارتان پێ تەوصیە ئەكەم ؛ چونكی ئەنصاری چیكڵدانەی منن ، یەعنی قووتی منن ، خورجی سیرو مەتاعی نەفیسی منن . ئەو وەظیفەی لەسەریان بوو بەجێیان هێنا ، ئەو موكافاتەیان ماوە كە لازمە پێیان عەطا بكرێ ، چاكەی چاكیان قەبووڵ بكەن ، لە خراپەی خراپیان ببوورن .

ئەسەف بۆ فەوتی ئەهلی فەضل مەشرووعە ، بە پێی دەرەجەی

فەضیلەتەکەی .

تەوصیەی ئەهلی فەضل بە ئەربابی ئیقتیدار سونەتە . ریعایەتی حەقیان سوننەتە .

١١١١/٢٣٤ ـ البراء [بن عازب] ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : أُهدِيتْ للنبي ـ ﷺ ـ حلَّةٌ [جبة من سندس ، وكان ينهى عن الحرير . م] حرير [أهداها له أكيدر دومة . م] فجعل أصحابه يَمَسُّونها ، ويَعجَبون من لينها . فقال : أتعجبون من لين هذه ؟ [والذي نفس محمد بيده ! مسلم] لمناديل سعد بن معاذ [في الجنة . أخرى] خير منها أو ألينُ . ح ـ ١٥٢/٦ . م ـ ٣٧٦/٩ . [فيه وفي سعد بن عبادة قال الشاعر :

فإن يسلم السعدان يصبح محمد
بمكة لا يخشى خلاف المخالف

تەرجەمە :

بەرائی کوری عازیب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : (اکیدر)ی (دومة) جبەیێکی سوندوسی بە هەدیەیە نارد بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو وەختانەیشا نەهی لە ئاوریشم ئەکرد . ئەصحابی کیرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ دەستیان لێ ئەداو تەعەجوبیان لە جوانیو نەرمیی ئەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عەجایەبتان لە نەرمیی ئەمە لێ ئەمێنێ ؟ قەسەم بەوەی کە نەفسی محەمەدی بە دەستە ! مەندیلی سەعدی بنی مەعاذ لە بەهەشتا لەمە چاکترە . یا فەرمووی : لەمە نەرمترە .

لە مەدحی ئەم دوو سەعدەدا شاعیر ئەم بەیتەی وتوە ، کە مەعناکەی ئەمەیە :

موسوڵمان بن ئەگەر ئەم سەعدو ئەو سەعد

نەبێ باکی لە موشریك قەط محەمەد
- ﷺ ، ورضي عنهما -

١١١٢/٢٣٥ - عن جابر - رضي الله تعالى عنه - : سمعت النبيَّ - ﷺ - يقول : إهتز العرش لموت سعد بن معاذ . وعن الأعمش بالواسطة عن جابر - رضي الله تعالى عنه - مثله ، وفيه : فقال رجل لجابر : فإن البراء يقول : إهتز السرير . فقال : كان بين هذين الحيَّين ضغائن . سمعت النبيَّ - ﷺ - يقول : إهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ ! ح - ١٥٢/٦ . م - ٣٧٥/٩ . جه .

تەرجەمە :

جابیر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لە پێغەمەرم بیست - ﷺ - ئەیفەرموو : عەرش بە مردنی سەعدی کوڕی مەعاذ هاتەلەرزین . پیاوێ عەرزی جابیری کرد : کە بەراء ئەفەرموێ : موراد لە عەرش تابووتەکەیەتی ، یەعنی تابووتەکەی لە بەر دەستاو دەست هاتە لەرزین . جابیر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : بەراء لە (خزرج)ە . سەعد لە (ئەوس)ە ، لە بەینی ئەو دوو قەبیلەدا عەداوەت هەیە ، یەعنی بۆیە بەراء وای وتوە . من لە پێغەمەرم بیست - ﷺ - ئەیفەرموو : عەرشی رەحمان هاتە لەرزین لە بەر مەوتی سەعدی کوڕی مەعاذ ! کە وابێ موراد لە عەرش تابووت نی یە .

زۆر دوورە لە بەرائەوە - رضي الله تعالى عنه - کە لە زەمانی جاهیلییەتا لە بەینی قەومی ئەوو سەعدا عەداوەتێکی قەدیمە بووبێ بێنێ ئەو عەداوەتە بکا بە سەبەبی ئەوە بە مەخصووصی مەعنای ئەو حەدیثە واضیحە بگۆڕێ ؛ چونکی بەراء - رضي الله تعالى عنه - لە فوضەلای صەحابە بوە ، واقیف بوە بە دەرەجەو حورمەتی سەعد لە خدمەت

پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ به‌ نه‌صی قورئان عه‌داوه‌تی پێشوویشیان موبده‌ل بوه‌ به‌ حوببو (اخوة)ی ئیسلامی . (في آل عمران)[1] .

مه‌عنای عه‌رشی كه‌ به‌ تابووت لێداوه‌ته‌وه‌ به‌ ئیجتیهاد بوه‌ ، ئه‌و حه‌دیثه‌ی كه‌ به‌ له‌فظی (عرش الرحمن) ریوایه‌تكراوه‌ پێی نه‌گه‌ییوه‌ .

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وای تێگه‌ییوه‌ كه‌ به‌راء له‌ رقی سه‌عد وای فه‌رموه‌ ؛ بۆیه‌ جابیر به‌ له‌فظی (عرش الرحمن) نوصره‌تی سه‌عدی داوه‌ ـ رضي الله تعالى عنهم ، أجمعين ـ .

١١١٣/٢٣٦ ـ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن أُناسـا [وهم بنو قريظة] نزلوا [من قلعتهم بخيبر بعد أن حاصرهم النبي ـ ﷺ ـ خمسا وعشرين ليلة ، وقذف الله في قلوبهم الرعب . قسطلاني] على حكم سعد بن معاذ ، فأرسل إليه [النبي ـ ﷺ ـ وكان رُمي في غزوة الخندق بسهم قطع منه الأكحل . قسطلاني] فجاء على حمار فلما بلغ قريبـا من المسجد [الذي أعدَّه النبي ـ ﷺ ـ هناك للصلاة أيام المحاصرة . قسط] قال النبي ـ ﷺ ـ : قوموا إلى خيركم ، أو سيدكم ! فقال : يا سعد إن هؤلاء نزلوا على حكمك . قال : فإني أحكم فيهم أن تُقْتل مقاتلتهم ، وتسبى ذراريهم . قـال : حكمتَ بحكم الله ، أو بحكم الملك . [عز وجل] ح ـ ١٥٣/٦ . ٣١٧ . م ـ ٣٧٩/٧ .

ته‌رجه‌مه‌ :

ئه‌بو سـه‌عیدی خـدریی ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئه‌فـه‌رموێ : به‌عزێ له‌ خه‌ڵق كه‌ یه‌هوودی به‌نی‌قوره‌یظه‌یه‌ [له‌ دوای ئه‌مه‌ كه‌ بیستو

(١) ده‌بێ مه‌به‌ستی ئایه‌تی : «واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا . . » بێت.

پێنج رۆژ پێغەمەر ـ ﷺ ـ موحاصەرەی دان و خوا ترسی خستە دڵیانەوە] لەسەر حوکمی سەعدی کوڕی مەعاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە قەڵاکەیان هاتنەخوارێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردی بە شوێن سەعدا [سەعدیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە غەزای خەندەقا تیرێك درابو لە رەگی رۆحی ، لەبەر ئەوە نەچووبو بۆ بەنی قورەیظە] تەشریفی سواری گۆیدرێژێ بووبو هات بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی نزیك بوەوە لەو جێگەیەی [کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ حازری کردبوو بۆ نوێژ لە موددەی موحاصەرەدا] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەڵسن بچن بۆ لای چاکترینی ئێوە ، وە یا فەرمووی : بۆ لای سەییدو گەورەی خۆتان . ئەمجا پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : یا سەعد ئەمانە لەسەر حوکمی تۆ لە قەڵاکەیان هاتوونە خوارێ . [یەعنی بە حوکمی تۆ رازین ؛ حوکم بە عەفویان بکەی یا بە ئیعدامیان ئەڵێی چی ؟] فەرمووی : من حوکم ئەکەم بەوە ئەوانەی کە ئیقتیداری حەربیان هەیە بیانکوژی ، ماڵو مناڵەکانیشیان بکەی بە ئەسیر . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بە حوکمی خوا حوکمت کرد . یا فەرمووی : بە حوکمی پادشا کە خوایە ـ عز وجل ـ حوکمت کرد .

## مناقب عبدالله بن سلام - رضي الله تعالى عنه -

١١١٤/٢٣٧ - سعد بن أبي وقاص - رضي الله تعالى عنه - قال : ما سمعت النبي - ﷺ - يقول لأحد يمشي على الأرض إنه من أهل الجنة إلا لعبد الله بن سلام . قال : وفيه نزلت هذه الآية : ﴿وشهد شاهد من بني إسرائيل . . . الآية﴾[1] قال [عبدالله بن يوسف التنيسي] : لا أدري قال مالك الآية أو في الحديث . ح - ١٥٨/٦ . م - ٣٩١/٩ .

تەرجەمە :

سەعدی بنی ئەبی وەقاص - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : بۆ غەیری عەبدوڵلای بنی سەلام لە پێغەمەرم نەبیستوە - ﷺ - دەرحەق کەسێ کە ئەمرۆ بەسەر ئەرزەوە بگەڕێ فەرمووبێتی کە لە ئەهلی بەهەشتە . ئەم ئایەتە کە مەعنای وایە : کە شاهیدێ لە بەنی ئیسرائیل شەهادەتی داوە بە میثلی قورئان کە لە طەرەف خواوەیە . . . (الآیة) . . دەرحەق ئەو نازڵ بو . (أحقاف) لە حدیثەکەدا ئەوەی تێدایە کە عەبدوڵلا وتی : نازانم مالیك خۆی ئایەتەکەی خوێندەوە یاهەر لە حەدیثەکەدایە .

١١١٥/٢٣٨ - عن قيس بن عباد [رحمه الله . قتله الحجاج صبرا] قال : كنت جالسا في مسجد المدينة فدخل رجل على وجهه أثر الخشوع ، فقالوا : هـذا رجل من أهـل الجنة ، فصلى ركعتين تجوز فيهما ، ثم خرج ، وتبعته فقلت : إنك حين دخلت المسجد قالوا : هذا رجل من أهل الجنة . قال : والله ما ينبغي لأحد أن يقول ما لايعلم . وسأحدِّثك لم ذاك : رأيت رؤيا على عهد النبي - ﷺ - فقصصتها عليه . ورأيت كأني

---

(١) بڕوانە : سوورەتی ئەحقاف . ئایەتی : ١٠ .

في روضة ، ذكر من سعتها وخضرتها ، وسْطَها عمود من حديد أسفله في الأرض وأعلاه في السماء ، في أعلاه عروة ، فقيل له : ارْقَهُ ، قلت : لا أستطيع ، فأرقاني مِنْصَف [وصيف ، أخرى] ح ـ ١٠/١٣٥ ، ١٣٧ ، ن . جه . [خادم ، صغير] فرفع ثيابي من خلفي ، فرقِيت حتى كنت في أعلاه ، فأخذت بالعروة ، فقيل لي : إستمسك فاستيقظت وإنها لفي يدي ! فقصصتها على النبي ـ ﷺ ـ قال : تلك الروضة الاسلام ، وذلك العمود عمود الاسلام ، وتلك العروة الوثقى ، فأنت على الاسلام حتى تموت . وذاك الرجل عبدالله بن سلام . ح ـ ٦/١٥٩ . م ـ ٩/٣٩٢ .

تەرجەمە :

قەیسی کوڕی عوبباد ئەفەرموێ : لە مزگەوتی مەدینەدا دانیشتبووم ، پیاوێ هات ، عەلامەتی خوشووعی لە ڕووا دیار بوو ، وتیان : ئەمە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشت . دوو ڕەکعەت نوێژی بە خەفیفەوە کرد ، لە دواییدا تەشریفی چوە دەرێ ، شوێنی کەوتم عەرزم کرد : کە تۆ تەشریفت هاتە مزگەوت وتیان : ئەمە پیاوێکە لە ئەهلی بەهەشت . فەرمووی : وەڵڵاهی لایەق نی‌یە بۆ کەسێ عیلمی بە شتێك نەبێ‌و بیلێ . خەبەرت دەدەمێ کە سەبەبی ئەوە چیە : لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ خەوێکم‌دی ، عەرزی پێغەمەرم کرد ـ ﷺ ـ : لە خەوما وام دی وەکوو لە ناو باغێکی گەورەدا بووم ، باسی گەورەیی‌و سەوزێتی ئەو باغەی کرد ، لە ناوەڕاستیدا کۆڵەکەیێکی ئاسنی تیابوو ، بنی لە ئەرز بوو سەری لە ئاسمان بوو ، لای سەروویەوە قوڵفەیێ بوو ، پێیان وتم : سەرکەوە ، وتم : ناتوانم ، غولامێ هات لە پشتەوە لیباسەکەی هەڵگرتم‌و تا سەری سەرەوە سەرکەوتم ، تا حەڵقەکەم گرت ، وتیان : دەست مەحکەم بگرە . خەبەر بوومەوەو حەڵقەکە لە

دەستـما بوو ! عـەرزی پێغەمـەرم کرد ـ ﷺ ـ فـەرمووی : ئـەو بـاغـە ئیسلامە ، ئەو کۆڵەکەیە کۆڵـەکەی ئیسـلامە ، ئـەو حەڵقـەیە (عـروة الوثقى) یە . تۆ لەسەر ئیسلامی تا ئەمری . قەیس ئەفەرموێ : ئەو پیاوە (ابن السلام) بوو .

**١١١٦/٢٣٩ ـ عن أبي موسى الأشعري [رضي الله تعالى عنه] قال : أتيت المدينة فلقيت عبدالله بن سلام [رضي الله تعالى عنه] فقال : ألا تجيئ فأطعمك سويقا وتمرا وتدخل في بيت [دخله النبي ـ ﷺ ـ] ؟ ثم قال : إنك بأرض الربا بها فاش . إذا كان لك على رجل حقٌّ فأهدى إليك حِمْل تِبْن ، أو حمل شعير ، أو حمل قتٍّ [نوع من علف الدواب] فلا تأخذه فإنه ربا . ح ـ ٦/١٦٠ .**

**تەرجەمە :**

ئەبو مووسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : چوومە مەدینە بە عەبدوڵلای کوڕی سەلام گەییم ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : بۆ نایێی قاوت و خورمات بدەمێ بیخۆی ، بچیە ماڵێك کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چووبێتە ئەو ماڵە ؟ لە دواییدا عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی فەرمووم : تۆ لە مەملەکەتێکی (کە عێراقە] ریبا لەو مەملەکەتەدا زۆرە ، حەقێکت بەسەر کەسێکەوە بێ ئەو کەسە بارێ کا ، یا بارێ جۆ ، یا بارێ دارووجانت[1] بۆ بێنێ لێی وەرمەگرە ؛ چونکە ئەوە سوودە .

لەم حەدیثـەدا فەضیلەتی عـەبدوڵـلای ـ رضي الله تعالى عنـە ـ

---

(١) دانەر ـ خ ـ مانای (قت)ی بە دارووجان لێدایەوە ، بەلاّم رەنگە مەبەست لە (قت) وێنجە بێ .

ئەوەندە تیا هەیە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوەتە ماڵیان .

ئەوەی تیایە کە زۆر بەتەقوا بوە حەقی لای یەکێ بووبێ لە موددەی قەرزداریی ئەو کەسەدا هیچی لێ قەبووڵ نەکردوە .

١١١٧/٢٤٠ ـ عن خَرَشة بن الحر . . قال : كنت جالسا في حلقة في مسجد المدينة ، قال : وفيها شيخٌ حسن الهيئة وهو عبدالله بن سلام ]رضي الله تعالى عنه] قال : فجعل يحدثهم حديثا حسنا . قال : فلما قام قال القوم : من سرَّهُ أن ينظر إلى رجل من أهل الجنة فلينظر إلى هذا .

قال : فقلت : والله لَأتْبعنَّه فلأعلمنَّ مكان بيته ! قال : فتبعته ، فانطلق حتى كاد أن يخرج من المدينة ، ثم دخل منزله ، قال : فاستأذنت عليه ، فأذِن لي ، فقال : ما حاجتك يا ابن أخي ؟ قال : فقلت له : سمعت القوم يقول لك ـ لَمَّا قمت ـ : من سرَّهُ أن ينظر إلى رجل من أهل الجنة فلينظر إلى هذا . فأعجبني أن أكون معك . قال : الله أعلم بأهل الجنة ، وسأحدِّثك مم قالوا ذاك : إني بينما أنا نائم إذ أتاني رجل ، فقال لي : قم ، فأخذ بيدي ، فانطلقت معه . قال : فإذا أنا بجوادٍّ عن شمالي ، قال : فأخذت لآخذ فيها ، فقال لي : لا تأخذ فيها فإنها طرق أصحاب الشمال ، قال : وإذا جوادُّ منهج [من أكرم ، أو فتح ، أي : طريق مستقيم أو واضح ] على يميني ، فقال لي : خذ ههنا ، قال : فاتي بِي جبلا ، فقال لي : إصعد . قال : فجعلت إذا أردت أن أصعد خَرِرتُ على إستي . قال : حتى فعلت ذلك مرارا . قال : ثم إنطلق بي حتى أتى بي عمودا رأسه في السماء وأسفله في الأرض في أعلاه حلقة ، فقال لي : إصعد فوق هذا . قال : قلت : كيف أصعد ورأسه في السماء ؟ ! قال : فأخذ بيدي فزجل بي [رمى بي] قال : فإذا أنا متعلق بالحلقة . قال : ثم

ضرب العمود ، فخرً . قال : وبقيت متعلقا بالحلقة حتى أصبحت . قال : فأتيت النبيَّ ـ ﷺ ـ فقصصتها عليه . قال : أما الطرق التي رأيت عن يسارك فهي طرق أصحاب الشمال . قال : وأما الطرق التي رأيت عن يمينك فهي طرق أصحاب اليمين . وأما الجبل فهو منزل الشهداء ، ولن تناله ! وأمَّا العمود فهو عمود الاسلام ، وأمَّا العروة فهي عروة الاسلام ولن تزال متمسكا بها حتى تموت . م ـ ٣٩٣/٩ .

(ئەمە ئەحواڵی مەرەکەبەکەم و کاغەذەکەمە)[1]

تەرجەمە :

مەثالی ئەم حەدیثەیش عەینی مەثالی حەدیثەکەی قەیسە ، ئەوەندەی زیادە کە خەرەشە شوێن عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەکەوێ تا نزیك ئەبێ کە لە مەدینە بچێتە دەرێ ، ئیذن ئەخوازێ ئیذنی ئەدەن ، ئەچێتە خذمەت عەبدوڵلا ، قسەی ئەو جەماعەتەی عەرز ئەکا کە وتوویانە : کەسێ حەزەکا پیاوێکی بەهەشتیی ببینێ تەماشای ئەم پیاوە بکا . ئەفەرموێ : کوڕی برای خۆم خوا ئەزانێ کە بەهەشتیی کێیە . سەبەبی قسەی ئەو جەماعەتە ئەوەیە :

خەوێکم بینی لە خەوما دیم کە پیاوێ هاتەلام ، وتی : هەڵسە ، دەستی گرتم لەگەڵی رۆییم ، لای چەپمەوە گەلێ جادەم دی ، تەمام بوو پیا برۆم ، وتی : بەوێدا مەڕۆ ، ئەو جادانە رێی ئەصحابی شیمالە : کە نامەی ئەعمالیان لە لای چەپەوە ئەدرێتە دەستی چەپ . تێفکریم لای

(١) دانەر ـ خ ـ گەلێ جار گلەیی لە بێکاغەزو مەرەکەبیی دەکات و دەڵێت : لە ئەستەمووڵا بەو کاغەزت دەست نەکەوێ ! لێرەیشدا لە دامێنی لاپەڕەیەکەوە لە کاغەزی بۆرو چڵکن و کۆن و ـ جگە لەمانەیش مەرەکەب بڵاودەکاتەوە ـ دەڵێ : ئەمە ئەحواڵی . . .

ده‌سته راستمه‌وه گه‌لێ جاده‌ی ئاشكاراو واضیحم دی ، پێی وتم : لێره‌وه برۆ . تووشی شاخێ بووم ، ته‌مام بوو كه سه‌ركه‌وم كه‌وتم ، تا چه‌ند ده‌فعه به‌و نه‌وعه . له دواییدا بردمیه لای كۆڵه‌كه‌یێ بنی له ئه‌رزاو سه‌ری له ئاسمان لای سه‌رووییه‌وه حه‌لقه‌یێ بوو ، پێی وتم : سه‌ركه‌وه ، وتم : چۆن سه‌ركه‌وم بنی له ئه‌رزاو سه‌ری له ئاسمانه ؟ ! فه‌رمووی : ده‌ستی گرتم و هه‌ڵی دام ، كه تێفكریم ده‌ستم به حه‌ڵقه‌كه‌وه بوو ، له دوایدا به كۆڵه‌كه‌كه‌یا ماڵی و خستی ، ده‌ستم به حه‌ڵقه‌كه‌وه مایه‌وه‌و پێوه هه‌ڵاوه‌سرام . تا سبه‌ینێ .

كه‌خه‌به‌ربوومه‌وه چوومه خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌رزم كرد . فه‌رمووی : ئه‌و رێگه‌یانه‌ی كه لای چه‌په‌وه بوون رێی ئه‌صحابی شیماله . ئه‌و رێگه‌یانه‌ی كه لای راسته‌وه بوون رێگه‌ی ئه‌صحابی یه‌مینه [وه‌ك له خه‌وه‌كه‌یا پێیان وتوه] ئه‌مما ئه‌و شاخه‌یش مه‌نزڵی شه‌هیدانه تۆ نایگه‌یتێ .

باقیه‌كه‌ی وه‌ك حه‌دیثه‌كه‌ی قه‌یسه .

ئه‌گونجێ ئه‌و خادیمه له پشته‌وه لیباسه‌كه‌ی هه‌ڵدابێته‌وه‌و ده‌ستیشی گرتبێ و هه‌ڵی دابێ . له حه‌دیثی قه‌یسا جل هه‌ڵدانه‌وه‌ی ، له حه‌دیثی خه‌ره‌شه‌دا ده‌ستگرتنی ذیكر كردوه .

# اسلام عبدالله بن سلام - رضي الله تعالى عنه -

مرَّ في حديث الهجرة نبذة منه

١١١٨/٢٤١ - أنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - أن عبدالله بن سلام - رضي الله تعالى عنه - بلغه مقدم النبي - ﷺ - المدينة فأتاه يسأله عن أشياء ؛ فقال : إني سائلك عن ثلاث لا يعملهن إلا نبيٌّ : ما أول أشراط الساعة ؟ وما أول طعام يأكله أهل الجنة ؟ وما بال الولد ينزع إلى أبيه أو إلى أمه ؟ فقال : أخبرني جبريل آنفا . قال ابن سلام ذاك عدو اليهود من الملائكة . قال : أمَّا أول أشراط الساعة : فنار تحشرهم من المشرق إلى المغرب . وأمَّا أول طعام يأكله أهل الجنة فزيادة كبد الحوت . وأمّا الولد فإذا سبق ماء الرجل ماء المرأة نزع الولد . وإذا سبق ماء المرأة ماء الرجل نزعت الولد .

قال : أشهد أن لا إله الله وأنك رسول الله . قال : يا رسول الله إن اليهود قوم بُهُت [جمع بهيت ، كقضيب وقضب . قسطلاني] فاسألهم عنيٍّ قبل أن يعلموا بإسلامي . فجاءت اليهودُ فقال النبيّ - ﷺ - : أي رجل عبدالله بن سلام فيكم ؟ قالوا : خيرنا وابن خيرنا ، وأفضلنا وابن أفضلنا . فقال النبي - ﷺ - : أرأيتم إن أسلم عبدالله بن سلام ؟ قالوا : أعاذه الله من ذلك ! فأعاد عليهم ، فقالوا مثل ذلك . فخرج إليهم عبدالله فقال : أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله . قالوا : شرُّنا وابن شرِّنا ! وتنقصوه . قال : هذا كنت أخاف يا رسول الله .

ح - ٦/٢٢٧ .

تەرجەمە :

کە خەبەری گەیینی پێغەمەر - ﷺ - . . . بە مەدینە گەیی بە

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ـ رضي الله تعالى عنه ـ هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەعزێ شتی لێ پرسی ؛ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : سێ شتت لێ ئەپرسم کە غەیری پێغەمەر هیچ کەس نایانزانێ : ئەووەلی ئەشراطی ساعەت چیە ؟ ئەووەڵ طەعامێ کە بەهەشتی ی ئەیخوا چیە ؟ بۆچ مناڵ بەعزێکیان ئەچنەوە سەر باوکیان و بەعزێکیان ئەچنەوە سەر دایکیان ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : زۆر نی یە کە جیبریل خەبەری دامێ . عەبدوڵڵا وتی : جیبریل لە ناو مەلائیکەدا دوشمنی جوولەکەیە .

[سەبەبی نوزوولی ئەم ئایەتە : ﴿من كان عدوًا لجبريل[1] . . . البقرة﴾]

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەووەڵ ئەشراطی ساعەت ئاگرێکە خەڵق لە مەشریقەوە سەوق ئەکا بۆ مەغریب [یەعنی ئەووەڵ ئەشراطی گەورە ؛ گینا تا ئێستە گەلێ لە ئەشراط رابوردوە] ئەووەڵ طەعامێ کە ئەهلی بەهەشت ئەیخوا پارچەگۆشتێکی زیادەیە کە بە جگەری نەهەنگەوەیە . لە موعامەلەی ژن و مێردیدا ئەگەر لە پێشا پیاو ئینزالی ببێ مناڵەکە ئەکێشێتە سەر خۆی ، ئەگەر ژنەکە لە پێشا ئینزالی ببێ مناڵەکە ئەکێشێتە سەر خۆی .

عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (أشهد أن لا إله الا الله وأنك رسول الله . یا رسول الله) جوولەکە میللەتێکی ئیفتیراکەرن ، لە پێش ئەمەدا کە بزانن من موسوڵمان بووم ئەحواڵی منیان لێ بپرسە . یەهودیی هاتنە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی پرسین : عەبدوڵڵای کوڕی سەلام لەناو ئێوەدا چۆن پیاوێکە ؟ عەرزیان کرد :

(١) البقرة/ ئایەتی : ٩٧ .

سەییدی ئێمەیەو کوڕی سەییدی ئێمەیە ، چاترینی ئێمەیەو کوڕی چاترینی ئێمەیە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ . . فەرمووی : ئەگەر عەبدوڵڵای کوڕی سەلام موسوڵمان بووبێ ئەڵێن چی ؟ عەرزیان کرد : خوا لەوەی پەنا بدا کە موسوڵمان ببێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو سوئالەی دوو سێ جار بۆ تیکرارکردنەوە ، ئەوانیش هەر ئەو جوابەیان عەرزکرد . ئەو وەختە عەبدوڵڵا هاتەدەرێ لایان وتی : (أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله) ئەو وەختە جوولەکەکان وتیان : خراپمانەو کوڕی خراپمانەو ، تەنقیصی عەبدوڵڵایان کرد ! عەبدوڵڵا عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : من لەمە ئەترسام .

## فضائل حسان بن ثابت ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١١١٩/٢٤٢ ـ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ مرَّ بحسان ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهو ينشد الشعر في المسجد ، فلحظ إليه ، فقال : قد كنت أنشد وفيه من هو خير منك ! ثم إلتفت إلى أبي هريرة فقال : أُنشِدكَ الله [توخوا] أسمعتَ رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : أجب عنيِّ ، أللّهم أيده بروح القدس ؟ قال : أللّهم نعم . م ـ ٣١٤/٩ . [أنشد قرأ الشعر ، نشد إستحلف] ح ـ ٢٥٩/٥ . ح ـ ٤٣٥/١ عن أبي سلمة بن عبدالرحمن بن عوف .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌یره ئه‌فه‌رموێ : عومه‌ر به لای حه‌سانا رابورد له مزگه‌وتی پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ شیعری ئه‌خوێنه‌وه . ئیمامی عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ به گۆشه‌ی چاو ته‌ماشای حه‌سانی کرد [كأنه ئینکاری ئه‌وه‌ی ئه‌کرد که له مزگه‌وتی پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ شیعر بخوێنرێته‌وه] حه‌سان ـ رضي الله تعالى عنه ـ عه‌رزی‌کرد : من شیعرم تیاخوێندوٚته‌وه‌و له تۆ چاکتری تیا بوو که پێغه‌مه‌ره ـ ﷺ ـ له دواییدا حه‌سان رووی‌کرده ئه‌بوهوره‌یره ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فه‌رمووی : توخوا تۆ له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ت بیستوه که ئه‌یفه‌رموو : له باتی من جوابی کوففار بده‌ره‌وه ، خوایا (روح القدس) بکه به پشتیوانی ؟ ئه‌بوهوره‌یره فه‌رمووی : خوایا به‌ڵێ . [وه‌کوو جاف ئه‌ڵێن : خوا به‌ردت لێ بارێ !]

[دروسته له مزگه‌وتا شیعری موباح بخوێنرێته‌وه .

سوننه‌ته ئه‌گه‌ر ئه‌و شیعره مه‌دحی ئیسلام‌و ئه‌هلی فه‌ضلی تیا بێ ، یا له ذه‌می کافرانا بێ ، یا ته‌شویقی موسوڵمانانی تیا بێ له‌سه‌ر حه‌ربی

کافران .

سوننەتە دۆعاکردن بۆ صاحیبی ئەو نەوعە شیعرانە .

دروستە طەلەبی ئینتیقام لە کافران و ئەهلی باطیل . نووي] .

۱۱۲۰/۲٤۳ ـ براء بن عازب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول لحسان بن ثابت ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أهُجهم ، أوهاجهم وجبريل معك . م ـ ۳۹٥/۹ .

تەرجەمە :

بەرائی کوڕی عازیب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە حەسانی ئەفەرموو : هەجوی کافران بکە ، جیبریل ـ عليه السلام ـ ت لەگەڵە .

۱۱۲۱/۲٤٤ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : قال حسان : يا رسول الله ائذن لي في أبي سفيان [بن الحرث بن عبدالمطلب ، وهو ابن عم النبي ـ ﷺ ـ وكان يؤذي النبي ـ ﷺ ـ والمسلمين ، ثم أسلم وحسن إسلامه . نووي] قال : كيف بقرابتي منه ؟ قال : والذي أكرمك لأسُلنَّك منهم كما تسل الشعرة من الخمير ، [العجين . أخرى] فقال حسان :

وإن سنام المجد من آل هاشم
بنوبنت مخزوم ووالدك العبد

قصيدته هذه . م ـ ۳۹٦/۹

[وبعد البيت :

ومن ولدت أبناء زهرة منهمو
كرام ، ولم يقرب عجائزك المجد

نووي]

تەرجەمە :

عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : حەسان ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : ئیـذنم بدە کـە هەجـوی ئەبوسوفیانی کوڕی حەرثی مامت بکەم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی چی ئەکەی لە خزمایەتی من بەو ؟ حەسان عەرزیکرد : قەسەم بەو ذاتەی کە ئیکرامی تۆی گرتوە ! تۆ لەو قەومە وا یێنمە دەرەوە وەك موو لە هەویر بێنرێتە دەرەوە ، یەعنی ئەو هەجوە هیچی بە تۆوە نانووسێ .

حەسان ئەو قەصیدەیە فەرموو کە دوو بەیتی لێ نوسراوە ، مەعنای وایە :

هـەرەژووررووی گەورەیی لـە ناو ئـالی هاشمـایـە کـوڕی کچی مەخزوومن ، باوکی تۆ بەندەزادە ؛ چونکە دایکی حەرثی مامی پێغەمەر ـ ﷺ ـ (سمية)یە سومەییە کچی (موهب) مەوهیب غولامی ئـەولادی عەبدی مەنافە ، دایکی ئەبو سوفیـانیش وابوە . یـەعنی ئەبـوسوفیـان خۆیو باوکی کە ئەولادی عەبدن . فەقەط کچی مەخزووم کە فاطیمەی کچی عەمری کوڕی عائیذی کوڕی عیمرانی کوڕی مـەخزوومـە . . . دایکی عەبدوڵلای باوکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوطالیبو زوبەیرە .

ئەم زوبەیرە ئەبێ مامی پێغەمەر بووبێ ـ ﷺ ـ زوبـەیری کـوڕی عەوام نییە ؛ چونکی دایکی ئەو (صفیە)ی کچی (عبدالمطلب)ە .

چونکی قەصیدەکە تەواو نییە مەعنای بەیتەکەی دواییم نەزانی . عەیب نییە ، ئەوە عەیبە کە بە غەلەط مەعنای لێبدەمەوە .

یـەعنی بەنی هـاشم زۆرن ، تۆیش لـەوانی فەقـەط شەجـەرەی گەورەیی تۆ رەگێکی لە ئەرزی پیسایە . هی پێغـەمەر ـ ﷺ ـ چـە لە طەرەف دایکەوە چە لە طەرەف باوکەوە لە نەقص (منزه)ە .

١١٢٢/٢٤٥ ـ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : اهجوا قريشا ؛ فإنه أشد عليها من رشق بالنبل . فأرسل إلى ابن رواحة فقال : أهجهم ، فهجاهم فلم يرض ، فأرسل إلى كعب بن مالك . ثم أرسل إلى حسان بن ثابت ، فلما دخل عليه قال حسان : قد آن لكم أن ترسلوا إلى هذا الأسد الضارب بذنبه . ثم أدلع لسانه ، فجعل يحركه . فقال : والذي بعثك بالحق ! لأفرينهم بلساني فري الأديم .

فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لا تعجل فإن أبا بكر أعلم قريش بأنسابها ، وإن لي فيهم نسبا ، حتى يلخص لك نسبي ، فأتاه حسان ، فقال : يا رسول الله قد لخص لي نسبك والذي بعثك بالحق ! لأسلنّك منهم كما تسل الشعرة من العجين . قالت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ : فسمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول لحسان : إن روح القدس لايزال يؤيدك ما نافحت عن الله ورسوله . وقالت : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : هجاهم حسان فشفى واشتفى . قال حسان ـ ـ رضي الله تعالى عنه ـ :

هجوتَ محمدا فأجبت عنه
وعند الله في ذاك الجزاء
هجوت محمدا برًّا تقيا
رسول الله شيمته الوفاء
فإن أبي ووالده وعرضي
لعرض محمد منكم وقاء
ثكلت بنيتي إن لم تروها
تثير النقع من كنفي كداء

يبارين الأعنة مصعدات
على اكتافها الأسل الظماء
تظل جيادنا متمطرات
تلطمهن بالخمر النساء
فإن أعرضتموا عنا اعتمرنا
وكان الفتح وانكشف الغطاء
وإلا فاصبر والضراب يوم
يعز الله فيه من يشاء
وقال الله : قد أرسلت عبدا
يقول الحق ليس به خفاء
وقال الله : قد يسرت جندا
هم الأنصار عرضتها اللقاء
لنا في كل يوم من معد :
سباب ، أو قتال ، أو هجاء
فمن يهجو رسول الله منكم
ويمدحه وينصره سواء
وجبريل رسول الله فينا
وروح القدس ليس له كفاء

(مماثل) م ـ ٣٩٧/٩

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەجوی قورەیش بکەن ؛ چونکی هەجوکردنیان لە لا لە تیرەبارانکردنیان بەشیددەتترە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردیە لای

عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە ؛ ئەمری پێ فەرموو : هەجویان بکە . هەجوی کردن پێی رازی نەبوو . ناردیە لای کەعبی کوڕی مالیك ئەویش وا . لە دواییدا ناردیە لای حەسانی کوڕی ثابیت . کە حەسان هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی‌کرد : وەختی ئەوە هات کە بنێرن بۆ لای ئەم شێرە کە لە رقا کلکی لە ئەرز ئەدا . لە دواییدا زمانی دەرکێشا ، ئەی‌بزوان ، وتی : قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە ! بە زمانم شڕو وڕیان ئەکەم وەکوو پێست پارچەپارچە ئەکرێ ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عەجەلە مەکە ئەبوبەکر لە هەموو کەس چاکتر نەسەبی قورەیش ئەزانێ ، منیش لە ناو قورەیشا نەسەبم هەیە ، صەبر کە تا ئەو نەسەبی منتان بۆ خوڵاصە بکا . حەسان عەرزی‌کرد : (یا رسول الله) نەسەبت بۆم خوڵاصە کراوە ، قەسەم بەوەی تۆی بە حەق رەوانەکردوە ! تۆ لە قورەیش یێنمە دەرێ وەك موو لە هەویر دەربکێشرێ هیچ هەویراوی نەبێ .

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیست بە حەسانی ئەفەرموو : تا تۆ مودافەعەی خواو رەسوولی خوا بکەی جیبریل تەئییدت ئەکا . حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیست ئەیفەرموو : حەسان هەجوی موشریکانی کردو شیفای موسوڵمانانی داو خۆیشی لە قەهری موشریکان شیفایاب بوو . حەسان خیطاب بەو کەسەی کە هەجوی پێغەمەری ـ ﷺ ـ کردبوو فەرمووی :

ئەکەی هەجوی محەمەد بۆ جەوابت
ئەوابم زۆرە لای خوا تۆ عەذابت
رەسوولی خوایە گەورەو زۆر بە تەقوا

وەفا خولقی ئەوە لای خەڵق و لای خوا
بە تەحقیق باوك و باپیرم لەگەڵ عیرض
ویقایەی عیرضی یە وەك شیرو وەك گورز[1]
نەمێنم من ئەگەر ئێوە نەبینن
لە هەردوو رووی گەرا تۆز هەڵنەسێنن
ئەوانەی سواری شانیان بوون ئەوانە
وەکو : درکی لەش ، رم و ، تیرو کەوانە(!)
بە خوێنی کافران تینوون وەکوو شێر
ئەکەن دوشمن لە مەیدانا سەرەوژێر
ئەبارن ئەسپەکانمان میثلی باران
بە مشکیی تۆزی ئەسرن گوڵەنداران
ئەگەر ئێوە لە ئێمە واز بهێنن
کە ئەصحابی کیرام عومرە بهێنن
لە بەینا پەردەی شك هەڵئەگیرێ
ئەبێ فەتحێ کە خوا بۆمان ئەنێرێ
ئەگەر نایکەن صەبرکەن کێ بەفیز بێ
ذەلیل بێ لای خوا غەیری عەزیز بێ
خوا فەرموویەتی : ناردوومە عەبدێ
کە حەق گۆیەو درۆ نازانێ گەردێ

(1) لێرەدا دانەر ـ خ ـ نووسیویە : «لە کوردی‌یا : ز ، ذ ، ض ، ظ ، یەکێکن» . خوالێخۆشبوو ماموٚستا مەلا سەلامیش لە دوایەوە نووسیویە : «لە کوردی‌یا هەمووی بە ز ئەخوێنرێتەوە» .

خوا فەرمووی : کە ناردم لەشکرێ بۆت
ئەکا کافر کەلەپچە پێیشی ناو کۆت
هەموو رۆژێ هەیە بۆمان لە لای مەعد :
شەڕەجوێن ، یا هەجو ، یا خو شەڕەبەرد
لە ئێوە کێ (رسول اللہ) ئەکا هەجو
وە یا مەدحی بکا یا یاری‌یەی ئەو
یەکێکە ، جوبرەئیلمان وا لە ناوا
رەسوول‌و رۆحی قودسەو کەس نی‌یە وا

*       *       *

رجام وایە من لای مەلاسەلام
تەرجەمەی بکا بە شیعری بەتام
ئەم شیعرە بێ تامانەم کاتە دەرێ
یاخوا کوڕو خۆی‌و باوکی نەمرێ[1]

(١) دانەر لە سەرەتای ئەم لاپەڕەیشەوە نووسیویە : «رجام وایە لە خزمەت مەلا سەلاما ئەم شیعرانە بە شیعر تەرجەمە بکا . کاغەذەکەم فەرقی ئەمدیوو ئەودیوی نەماوە» .
دیارە مامۆستا مەلا سەلام لێرەیشدا رجاکەی نەگرتوەو ، شیعرەکانی وەك خۆیان هێشتوەتەوە .
بە پێویستی دەزانم لێرەدا ئەوەیش تۆمار بکەم کە لەدەورو بەری نووسینی ئەم شوێنەدا مامۆستا مەلاسەلام پاش تەمەنێکی پیرۆزو کۆتایی یەکی نەختێك سەخت بە هۆی کوێربوونی‌یەوە لە دوادوایی تەمەنیدا . . لە رۆژی ١٩٨٤/٨/٢٥دا کۆچی دوایی کردو ، بۆ یەکجاری چاوی لێك ناو ئەم جیهانەی بەجێ هێشت .

## فضل أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١١٢٣/٢٤٦ ـ قال : لما قدمت على النبي ـ ﷺ ـ قلت في الطريق :

يـا ليلة من طـولها وعنـائهـا على أنها من دارة الكفـر نجت

وأبَقَ غلام لي في الطريق . فلما قدمت على النبي ـ ﷺ ـ فبايعته ، فبينا أنا عنده إذ طلع الغلام ، فقال لي النبي ـ ﷺ ـ : يا أبا هريرة هذا غلامك ، فقلت : هو لوجه الله فأعتقته . ح ـ ٦/٤٢٨ .

تەرجەمە :

کە هاتمە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە رێ وتم : ئـەی شەو چـە دوورو درێژ ی‌و بە زەحمەتی ! (مع مافیه) ئەم شەوە منی لە (دار الکفر) نەجات داوە . غولامێکیشم بوو لە رێدا رای‌کرد . کە چوومە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ و موبایەعەم لە خزمەتا کرد لەو وەختانەدا کە لە خزمەت پێغەمەرا بووم ـ ﷺ ـ ئەوەندەم زانی غولامەکەم دەرکەوت ، پێغەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (یا أبا هریرة) ئەمە غـولامەکـەتە ، ئـەبوهـورەیرە فەرمووی : وتم : لە رێی خوادا بێ‌و ئازادم کرد .

ئەمە موعجیزەیە بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە بێ ئەمە غولامەکەی دیبێ‌و زانیبێتی کە لێی ون‌بوە خـەبەری دا بـە ئەبـوهورەیـرە . فەضیلەتـە بۆ ئەبوهورەیرەیش کە تێگەیی غولامەکەی هەڕای نەکردبـوو لە خـۆیەوە هاتەوە ئازادی کرد .

ئەبوهورەیرە دوای ئەم حادیثەیە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناوی ناوە (ابـو هریرة) . (تأمل یا عبدالسلام) .

١١٢٤/٢٤٧ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت أدعو أُمِّي

إلى الاسلام ، وهي مشركة ، فدعوتها يوما . فـأسمعتني في رسول الله ـ ﷺ ـ ما أكره . فأتيت رسول الله ـ ﷺ ـ وأنا أبكي ، قلت : يا رسول الله ـ ﷺ ـ إني كنت أدعو أمي إلى الاسلام فتأبى عليَّ ، فدعوتها اليوم ، فأسمعتني فيك ما أكره ، فادع الله ن يهدي أم أبي هريرة ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : أللهم اهد أم أبي هريرة ، فخرجت مستبشرا بدعوة نبي الله ـ ﷺ ـ فلما جئت فصرت إلى الباب فإذا هو مجاف [مغلق] فسَمِعَتْ أمي خَشَفَ قدمي ، فقالت : مكانك يا أبا هريرة ، وسمعتُ خضخضة الماء [شلّپه شلّپی] ، قال : فاغتسلَتْ ولبسَتْ درعها ، وعجلت عن خمارها ففتحت الباب ، ثم قالت : يا أبا هريرة أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا [رسول الله] عبده ورسوله .

قال : فرجعت إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فأتيته وأنا أبكي من الفرح . قال : قلت : يا رسول الله أبشر قد استجاب الله دعوتك وهدى أم أبي هريرة ، فحمد الله وأثنى عليه ، وقال خيرا . قال : قلت : يا رسول الله أدع الله أن يحببني أنا وأمي إلى عبادك المؤمنين ويحببهم إلينا ، قال : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : اللّهم حبب عبيدك هذا ـ يعني أبا هريرة ـ وأمه إلى عبادك المؤمنين ، وحبب إليهم المؤمنين . فما خلق مؤمن يسمع بي ولا يراني إلا أحبَّني م ـ ٩/ ٤٠٠ .

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : دایکم موشریك بوو ، دەعوەتم ئەکرد بۆ ئیسلامەتی ، رۆژێ دەعوەتم کرد ، قسەیێکی وای دەرحەق پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێ بیستم کە لام ناخۆش بوو .

بەگریانەوە چوومە خزمەت پێغـەمەر ـ ﷺ ـ عـەرزم کرد : (یـا رسول الله) من هەموو وەختێ دایکم دەعوەت ئەکرد بۆ موسوڵمانەتی = بە

قسەی نەدەکردم = ئیمرۆیش دەعوەتم کرد قسەیێکی دەرحەق تۆ خستە گوێمەوە کە پێم ناخۆش بوو ، لە خوا ـ عز وجل ـ طەڵەب بکە کە هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرە بدا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوایا دایکی ئەبوهورەیرە هیدایەت بدە . بە واسیطەی دۆعای پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ بە دڵخۆشیی لە خذمەتی چوومەدەرێ ، کە گەییمە ماڵەوەو لە دەرگاکەوە نزیك بوومەوە کەچی دەرگاکە داخرابوو ، دایکم خشپەی پێی بیستم فەرمووی : ئەی ئەبوهورەیرە لە جێی خۆت بوەستە . گوێم لە شڵپەشڵپی ئاو بوو غوسڵی کرد ، کراسەکەی لەبەرکرد ، عەجەلەی کرد ، سەرپۆشەکەی نەدا بە سەریاو دەرگاکەی کردەوە ، لە دواییدا فەرمووی : (یا أبو هریرة أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله) .

گەرامەوە بۆ خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە خۆشییانا ئەگریام و چوومە خذمەتی ، عەرزم کرد : (یا رسول الله) موژدە بێ خوا دۆعاکەی قەبووڵ کردی ، هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرەی دا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەمدو ثەنای خوای کرد ، قسەی خێری فەرموو . عەرزم کرد : (یا رسول الله) لە خذمەت خوادا دۆعا بکە کە خۆم و دایکم لای عەبدی موئمینی خۆی خۆشەویست بکا ، ئەوانیشی بە ئێمە خۆش بوێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوایا ئەم عەبدانی خۆتە کە ئەبو هورەیرەو دایکی یەتی بە عیبادی موئمینی خۆتت خۆش بوێ ، لای ئەوانیش عیبادی موئمینی خۆت خۆشەویست بکە . ئێستە هیچ موسوڵمانێ ـ نی یە کە ناوی من ببیێ یا بمبینێ و منی خۆش نەوێ .

چە موعجیزەییکی گەورەیە بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە دەزبەجێ ئەوی لە خوای طەڵەب کرد خوا ـ عز وجل ـ عەینی ئەوەی بۆ کرد ؟

چە فەضیلەتێکی گەورەیە بۆ ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە بە طەڵەبی ئەو خۆی و دایکی نائیل بوون بەو دۆعای خێری پێغەمەرە ـ ﷺ ـ کە ئێستە لە مەشریق و مەغریبا باوەڕم نی یە کەسێ ببێ کە ناوی نەزانێ ، کە ناوی برا نەڵێ ـ رضي الله تعالى عنه ـ . لەو رۆژەوە تا رۆژی قیامەت ناوی موبارەکی لە کوتوبی ئیسلاماو ، لە ئەلسینەی موسوڵمانانا بەخێر پایەدارو باقی یە ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

. لە دوای حوصوولی نیعمەت حەمدو ئەنای خوا لازمە .

رێی چاکە بە خەڵق نیشاندان ـ با خوصووص بە خزم و ئەحباب ـ سوننەتە .

دۆعای خێر بۆ موسوڵمانان سوننەتە .

خوا منیش و مەلا حسەینیش و کەس و کارو خزم و خوێشمان لەگەڵ هەموو ئەهلی ئیسلاما لە ئافەتی دنیاو ئاخیرەت مەحفووظ بکا .
(آمين بجاه خاتم النبيين ـ عليه صلاة الله وسلامه إلى يوم الدين آمين ـ)

خوایا وەك ئەم مەرەکەبە بەم کاغەزەدا بڵاوئەبێتەوە ئەمدیوو ئەودیوی ئەیچێژێ بەو نەوعە دڵ و رۆحی من و مەلا حسەین و خۆشەویست و ئەحبابمان نووری ئیمان و موسوڵمانەتی بچێژێ (آمين) .

لە ئەستامبوولا بەو کاغەزو مەرەکەبت دەست نەکەوی ! چە شتێکی عەجایبە ! ؟

**١١٢٥/٢٤٨ ـ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : يقولون : إن أبا هريرة قد أكثر ، والله الموعد . ويقولون : ما بال المهاجرين والأنصار لا يتحدثون مثل أحاديثه ؟ وسأخبركم عن ذلك . إن إخواني من الأنصار كان يشغلهم عمل أرضيهم . وإن إخواني من المهاجرين كان يشغلهم الصفق بالأسواق ، وكنت ألزم رسول الله ـ ﷺ ـ على ملء بطني ؛ فأشهد**

إذا غابوا ، وأحفظ إذا نسوا . ولقد قال رسول الله ـ ﷺ ـ يوما : أيكم يبسط ثوبه فيأخذ من حديثي هذا ثم يجمعه إلى صدره ، فإنه لم ينس شيئا سمعه ؟ فبسطت بردة علي حتى فرغ من حديثه ، ثم جمعتها إلى صدري فما نسيت بعد ذلك اليوم شيئا حدثني به ، ولولا آيتان أنزلهما الله في كتابه ما حدثت شيئا أبدا . ﴿إن الذين يكتمون ما أنزلنا من البينات والهدى[1] . . . إلى آخر الآيتين﴾ م ـ ٤٠١/٩ . ح ـ ٢٠٦/١ في حديثين بفرق ما ، يحتمل أني كتبته في العلم أيضا[2] .

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : خەڵق ئەڵێن : کە ئەبو هورەیرە ریوایەتی حەدیثی زۆرکرد . وەعدەی منو ئەوان لە حوزووری خوادا بێ ! ئەڵێن : بۆچی موهاجیرو ئەنصار بە قەد ئەو حەدیث ریوایەت = ناکەن = ؟ خەبەرتان بدەمێ کە بۆچ وایە ؟ : برادەرانی ئەنصاریم ئیشو کاری ئەرازییان ئەوانی مەشغوول ئەکرد . برادەرانی موهاجیرینم خریدو فرۆختیان لە بازارا ئەوانی مەشغوول ئەکرد .[3] من بە نانەزگیی لازمی پێغەمەر بووم ـ ﷺ ـ ، کە ئەوان غائیب بوونایە من لە خذمەتیا حازر ئەبووم ، کە لە فکریان بچوایەوە من حیفظم ئەکرد . رۆژێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کێ لیباسی خۆی رائەخا گوێ لە قسەی من ئەگرێ لە پاشا لیباسەکەی کۆئەکاتەوە بەسنگیەوە ئەو کەسە هەرچی لە من ببێ ئیتر لە فکری ناچێتەوە ؟ من

(١) سوورەتی بەقەرە ، ئایەتی : ١٥٩ .
(٢) نعم قد سبق في باب العلم في الحديث المرقم ٦٨/٤٠٨ .
(٣) لە هەردوو جێگەکەدا بگوترێ (مەشغوولی ئەکردن) باشترە .

بەرماڵێکم بەکۆڵەوە بوو رام‌خست تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ، لە حەدیثەکەی بۆوە ، لە دواییا بەرماڵەکەم کۆکردەوەو بە سنگمەوە گرت . لە دوای ئەو رۆژە هیچ شتێکم لە فکر نەچوٚتەوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ قسەی بۆ کردووم .

ئەگەر لە قورئانا دوو ئایەت نەبوایە قەط قسەم لە حەدیث نەدەکرد . ئەو دوو ئایەتە لە صەحیفەی سێیەمی جزووی دوەمی (البقرە) دایە ـ مەعنای وایە : بە تەحقیق ئەو کەسانەی کە کەتمی ئەو (بینات)و هیدایەتە ئەکەن کە ئێمە نازڵمان کردوە لە دوای ئەوە کە بەیانی کردوە لە قورئانا بۆ خەڵق . . بیشارنەوەو بە خەڵقی نەڵێن ، ئەو کەسانە خوا لەعنەتیان لێ‌ئەکاو لەعنەتکەری تریش ـ کە مەلائیکەو ئینسانن ـ لەعنەتیان لێ‌ئەکەن . فەقەط ئەوانەی کە توٚبە بکەن لە کەتمی ئایەت‌و ئیصلاحی حاڵی خوٚیان بکەن‌و بەیانی ئایاتی خوا بکەن بوٚ ئەوانە کە نایزانن . . ئەو تەوبەکارانە من تەوبەیان لێ قەبووڵ ئەکەم ؛ چونکی من تەوبە قەبووڵ ئەکەم‌و رەحم بەخەڵق ئەکەم .

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم ئایەتەی (تشمیلی !) حەدیثیش کردوە . نەظیری ئەم ئایەتە لە قورئانا زوٚرە .

## فضائل حاطب بن بلتعة ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١١٢٦/٢٤٩ ـ علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : بعثني رسول الله ـ ﷺ ـ أنا والزبير والمقداد ـ رضي الله تعالى عنهم ـ قال : إنطلقوا حتى تأتوا روضة خاخ [على إثني عشر ميلا من المدينة ، بينها وبين مكة] فإن بها ظعينة [المرأة في الهودج ، اسمها سارة] ومعها كتاب فخذوه منها ، فانطلقنا تعادى [تجري] بنا خيلنا ، حتى انتهينا إلى الروضة ، فإذا نحن بالظعينة ، فقلنا : أخرجي الكتاب ! فقالت : ما معي من كتاب . فقلنا : لتخرجنَّ الكتاب أو لتلقينَّ الثياب ، فأخْرجتهُ من عقاصها . فأتينا به رسول الله ـ ﷺ ـ فإذا فيه : من حاطب بن أبي بلتعة إلى ناس من المشركين من أهل مكة [هم صفوان بن أمية ، وسهل بن عمرو ، وعكرمة بن أبي جهل] يخبرهم ببعض أمر رسول الله ـ ﷺ ـ [ولفظه ـ كما في تفسير يحى بن سلام ـ : أما بعد : يا معشر قريش فإن رسول الله ـ ﷺ ـ جاءكم بجيش كالليل ، يسير كالسيل ، فوالله لو جاءكم وحده لنصره الله وأنجز له وعده ، فانظروا لأنفسكم ، والسلام . قسطلاني]

فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : يا حاطب ما هذا ؟ قال : يا رسول الله لا تعجل عليَّ ، إني كنت إمرأً ملصقاً في قريش ، ولم أكن من أنفسها ، وكان من معك من المهاجرين لهم قرابات بمكة يحمون بها أهليهم وأموالهم ، فأحببت إذا فاتني ذلك من النسب فيهم أن أتخذ عندهم يداً يحمون بها قرابتي ، وما فعلت كفرا ، ولا ارتدادا ، ولا رضا بالكفر بعد الاسلام ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لقد صدقكم .

فقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا رسول الله دعني أضرب عنق هذا المنافق . فقال : إنه شهد بدرا . وما يدريك لعل الله أن يكون قد

اطلع على أهل بدر فقال : إعملوا ماشئتم فقد غفرت لكم ؟ [فأنزل الله ـ عز وجل ـ : ﴿يا أيها الذين آمنوا لاتتخذوا عدوي وعدوكم أولياء . م﴾[1] فدمعت عينا عمر ، وقال : الله ورسوله أعلم . خ آخر] ح ـ ٥/١٢٦ . ح ـ ٦/٢٤٦ بفرق يسير ، وفيه : أبو مرثد بدل المقداد . وفيه : كلنا فارس . وفيه فالتمسنا فلم نَرَ كتابا ، فقلنا : ما كذب رسول الله ـ ﷺ ـ لتخرجن الكتاب ، أو لنجردنكِ ! فلما رأت الجدَّ أهوت إلى حجزتها [أي معقد إزارها] وهي محتجزة بكساء فأخرجته . والباقي هو الباقي .

**ته‌رجه‌مه :**

ئیمامی عه‌لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ منو ، زوبه‌یرو ، میقدادی ـ له ریوایه‌ته‌كه‌ی ترا ئه‌فه‌رموێ : منو ، زوبه‌یرو ، ئه‌بو مه‌رثه‌دی ـ نارد ، فه‌رمووی : تا ره‌وضـه‌ی خاخ بچن ـ كه باخێكه له به‌ینی مه‌ككه‌و مه‌دینه‌دا ـ له‌وێ ژنێ هـه‌یه كـاغه‌ذێكی پێیـه ، كاغـه‌ذه‌كـه‌ی لێ‌بستێنن . ئێمـه‌یش كـه‌وتێنـه ڕێ‌و ، هـه‌مـوو سواربووین ، ئه‌سپه‌كانمان ئه‌یان‌ڕفانین ، تا گه‌یینه باغه‌كه ، ژنه‌كه‌ی لێ بوو . پێمان‌وت : كاغه‌ذه‌كه‌ت ده‌رێنه ! وتی : هیچ كاغه‌ذم پێ نی‌یه ، پشكنیمـان نه‌مـان‌دۆزی‌یه‌وه . وتمـان : پێغه‌مـه‌ر ـ ﷺ ـ بـه خـۆڕایی نه‌یفه‌رموه . یا كاغه‌ذه‌كه ده‌رێنه ، یا رووتت ئه‌كه‌ینه‌وه ، كاغه‌ذه‌كه‌ی له ناو پرچیا ـ له ریوایه‌ته‌كه‌ی ترا له ناو پزووی ده‌رپێكه‌یا ـ هێنـایه ده‌رێ بردمان بۆ خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ .

له پشتی نووسرابوو : له حاطه‌بی كوڕی ئه‌بوبه‌لته‌عه‌وه بۆ به‌عزێ

(١) الممتحنة/١

لە کوففاری قورەیش . [لە ناویا نووسرابوو : (أما بعد) : ئەی قەومی قورەیش پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە لەشکرێکی وەك شەو زۆری دنیاگیرەوە[1] بۆتان بێ . وەك لافاو ئەڕۆن وەڵلاهی ئەگەر بە تەنهایش تەشریفی بێ خوا یاریەی ئەداو ئەو وەعدەی کە پێیداوە بەجێی یێنێ . کەوابێ دیقەت لە خۆتان بکەن . والسلام] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی حاطەب ئەمە چیە ؟ عەرزیکرد : (یا رسول الله) عەجەلەم لێمەکە ، من پیاوێ بووم لە قورەیش نەبووم ، لە لاوە پێیانەوە لکابووم . ئەو موهاجیرانەی کە لە خزمەتتان خزم و کەس و کاریان هەیە لە مەککەدا ، بە واسیطەی ئەوانەوە ماڵ و منالیان موحافەظە ئەکەن لە ظوڵمی موشریکان . من کە لە ناو قورەیشا مەحرووم لە خزمایەتیی کە ماڵ و منالی ئەوێمی پێ موحافەظە بکەم ، حەزم کرد کە چاکەو منەتێکم بەسەریانەوە ببێ ، بە واسیطەی ئەوەوە کەس و کارم کە لەوێدا ماونەوە لەشەڕی ئەوان مەحفووظ بێ . ئەو کاغەذەم کە = بۆ = نووسیون بۆییکم نەنووسیوە کە کافر بم ، بۆییکم نەنووسیوە کە مورتەد بووبم ، بۆییکم نەنوسیوە کە لە دوای ئەمە کە موسوڵمان بووم بە کوفر رازیی بم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : حاطەب قسەیێکی راستی پێ وتن .

[لە مەثالی کاغەذەکەیشی دەرەکەوێ کە موسوڵمانە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ هیچ لەشکریشی نەبێ ، تەنها نەفسی خۆی بێ خوا نەصرەتی ئەدا بەسەریاناو ئیشی ریسالەتی بۆ ئەچێتە سەر . لەمەدا بەڵکو تەهدیدی موشریکەکانی تیایەو (ضمنا) دەعوەتیان ئەکاتە سەر ئیسلامەتی] .

(١) لە دەسخەتەکەدا (دنیاگیر) بوو .

حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ [یا ئەبێ گوێی لەوە نەبووبێ کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ شەهادەتی لەسەر راستیی حاطەب داوە لە ئیعتیذارەکەدا ، یاخۆ هەر بەوەندە کە حاطەب موشریکەکانی خەبەردار کردوە لە لای وابوە دروستە کوشتنی و ناوبردنی بە مونافیق ؛ بۆیە] فەرمووی :.(یا رسول الله) وازم لێ بێنە کە لە گەردنی ئەم مونافیقە بدەم .

[موراد لە مونافیق مونافیقی کوفر نییە ، بەڵکو نیفاقی خیانەتە]

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خەیر ، حاطەب حازری غەزای بەدر بوە ، بە چە مەعلووم کە خوا ـ عز وجل ـ طولووعی نەکردوە بەسەر ئەهلی بەدراو پێی نەفەرموون : هەرچیتان هەوەسە بیکەن من لێتان خۆش بووم ؟ ! ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاوی ئاوی کردو فەرمووی : خواو رەسوولی خوا لە هەموو کەسێ عالمترن .

[خوا ـ عز وجل ـ ئەم ئایەتی سوورەتی (ممتحنە)ی نازڵ فەرموو کە مەعنای وایە : ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە دوشمنی من و دوشمنی خۆتان مەگرن بە دۆست ، مەوەددەت و مەحەببەتی خۆتانیان پێ مەبەخشن ، کەچی ئەوان کافر بوون بەو حەقەی کە لە طەرەف خواوە بۆ ئێوە هاتوەو ، چونکی ئێوە ئیمانتان هێناوە بە خواو رەببی خۆتان ، ئێوەو رەسوولی خوایان لە مەککە ئەکردە دەرێ . ئەگەر ئێوە بۆ غەزا لە رێی خواداو طەلەبی رەزای خوا هاتوونە دەرێ مەیانکەن بە دۆست و بە دزییەوە ئیظهاری مەحەببەتیان لەگەڵ بکەن ، خوا عیلمی هەیە بەوەی کە ئیخفای ئەکەن و بەوەی کە ئیعلانی ئەکەن ، هەرکەسێ لە ئێوە کافران بگرێ بە دۆست بە تەحقیق ئەو کەسە رێگەی راستی ونکردوە ، ئەگەر ئەوان ظەفەرتان پێ ببەن دەستان ئەکێشنێ کە بتانکوژن ، بە جوێن و قسەی ناخۆش زمان درێژیتان لەگەلا ئەکەن] .

لەم حەدیثەدا[1] سێ ئیشکال هەیە :

١ ـ ئیختیلافی دوو حەدیث ؛ لە یەکێکیانا ئەبومەرثەدو ، لەیەکێکیانا میقدادی ناردوە .

٢ ـ طەلەبی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە حاطەب بکوژێ . ئەم دوو ئیشکالە دەفع کرا .

٣ ـ لە حەدیثێکیانا کاغەذەکەیان لە ناو پرچیا هێنایە دەرێ ، لە یەکێکیانا لەسەر پزووی دەرپێکەیی هێنایە دەرێ . نە لە قەسطەلانیدا نە لە شەرحی موسلیمی نەوەوی‌یا نەمدۆزی‌یەوە . ئەگونجێ لە پێشا لە ناو پرچیا بووبێ ، لەو وەختەدا کە پشکنیویانە لە ناو پرچی هێنابێتە دەرێو خستوویێتیە ناو سەر پزووی دەرپێکەیەوە ، لە دواییدا لەوێی هێنابێتە دەرێ . بەعزێ لەو ئەواتەی کە تەشریفیان حازر بوە لەو وەختەدا دیویەتی کە لە پرچی هێناوەتە دەرێ . بەعزێکیان ئەوەی نەدیوە هەر ئاگای لەوە بوە کە لە پزووی دەرپێکەیی دەرهێنابێ ؛ بۆیە بە دوو نەوع ریوایەت کراوە .

وە نی‌یە راویی حەدیثەکەیش هەر حەزرەتی عەلی بێ ـ رضي الله تعالى عنه ـ تا ئیختیلاف لە لەفظی ئەوا بێ . چەند ئەصحابێکی تریش کە تەشریفیان مەوجوود بوە ریوایەتیان کردوە . (والله أعلم) .

موعجیزەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و فەضلی حاطەب ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەم حەدیثانەدا ظاهیرە .

سووئی ظەن چاك نی‌یە .

(١) لە دەسخەتەکەدا (لەم حەدیثە) بوو .

غەیری خوا کەس کەس بە تەواویی ناناسێ .

عوذری مەعقوول مەقبوولە .

دۆستایەتی لەگەڵ کوففارا دروست نی‌یە ، ئەمما لە حینی حاجەتا صوڵحیان لەگەڵ ئەکرێ .

سیڕڕی ئیسلام فاشکردن کەبیرەیە ، مووجیبی عەذابی دنیاو ئاخیرەتە .

پشکنینی ژنی نامەحرەم ـ حەتا رووتکردنەوەی ـ بە قەدەر ئیحتیاجی و لەبەر ضەروورەت لە سوننەتەو تا دەرەجەی فەرزی هەیە .

جاسووس کوشتن دروستە . تەعزیری لازمە .

(تأني) لە ئیشا سوننەتە .

خەتای ئەهلی فەضل بە فەضیلەتەکەی ئەبەخشرێ .

۱۱۲۷/۲۵۰ ـ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن عبداً لحاطب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ جاء رسول الله ـ ﷺ ـ يشكو حاطبا ؛ فقال : يا رسول الله ليدخلنّ حاطبٌ النار . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : كذبت ، لا يدخلها ؛ فإنه شهد بدرا والحديبية . م ـ ۹/٤۰٤ .

تەرجەمە :

عەبدێکی حاطەب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ شکاتی لە حاطەب کرد ؛ عەرزی‌کرد : (یا رسول الله) بە تەحقیق حاطەب ئەچێتە جەهەننەمەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : درۆت‌کرد . حاطەب ناچێتە ناو ئاگرەوە ؛ چونکی حازری غەزای بەدرو (حديبية) بوە .

لەمەدا بە صەراحەت شەهادەتی بۆ حاطەب تیایە کە ناچێتە جەهەننەمەوە . (ضمنا) شەهادەتی تیایە کە ئەچێتە بەهەشتەوە .

کـەسێ غەیبـەتی کەسێك بکـا بە درۆخستنـەوەو مـەنعکـردنی سوننەتە .

مەدحی موسوڵمانان لەحینی حاجەتا بە ئەعمالی صالیحە سوننەتە .

بە بێ لوزووم مووجیبی غوروورە ، (إن شاء الله) لە (رقاق)١ بێ .

**١١٢٨/٢٥١ - أم مبشر - رضي الله تعالى عنها - سمعت النبي - ﷺ - يقول عند حفصة - رضي الله تعالى عنها - : لا يدخل النار - إن شاء الله تعالى - من أصحاب الشجرة أحد ، الذين بايعوا تحتها . قالت : بلى يا رسول الله . فانتهرها [فـ] قالت حفصة - رضي الله تعالى عنها - ﴿وإن منكم إلا واردها﴾[1] فقال النبي - ﷺ - : قد قال الله - عز وجل - : ﴿ثم نُنَجِّي الذين اتقوا ، ونذر الظالمين فيها جثيا﴾[2] م - ٩/ ٤٠٤ .**

**تەرجەمە :**

(أم مبشر) - رضي الله تعالى عنها - لە پێغەمەر - ﷺ - ی بیست لە لای حەفصە - رضي الله تعالى عنها - ئەیفەرموو : (إن شاء الله) هیـچ کەس لە ئەصحابی شەجەرە کە لە ژێریا بەیعەتیان لە خزمەت پێغەمەرا کرد - ﷺ - ناچنە ناو ئاگری جەهەننەمەوە . حەفصە - رضي الله تعالى عنها - [بۆ خاتری ئەمە لە سەبەبەکەی بگا نەك لە وەجهی ئیعتیراضەوە] فەرمووی : بەڵێ (یا رسول الله) ئەیچێ . پێغەمەر - ﷺ - لێی تـوورە بوو ، حەزرەتی حەفصە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : هیچ کەس لە ئێوە نی‌یە کە نەچێتە ناو ئاگری جەهەننەمەوە [یەعنی خوا لەو ئایەتەدا بۆچ وا ئەفەرموێ ؟] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خوا - عز وجل - لە

(١) مريم/ ٧١
(٢) مريم/ ٧٢

دوای ئەو ئایەتەوە فەرموویەتی : لە دوای ئەوە کە چوونە ناویەوە نەجاتی ئەوانە ئەدەین = کە تـەقوایـان کردوەو خـۆیان پـاراستوە = لـە چوونـە ناویەوەو ، ئەوانەی کە زاڵمن لە جەهەننەما تەرك ئەکەین لە ناویا بەچۆکا بێن .

[یەعنی موراد لە چوونەناوی ئەوەیە کە هەموو کەس بەسەر پردی صیراطا رائەبوورێ ؛ ئەهلی تەقوا نەجاتی ئەبێ‌و ناکەوێتە نـاوی . زاڵم ئەکەونە ناوی . وەك لە ئەحادیثی ئەحواڵی ئاخیرەتا رابورد . ]

ئەم حەدیثە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەمە کە موناظەرە بۆ تێگەییشتنی حەق‌و ئیزالەی شوبهەو ، سوئال‌و جواب دروستە ، مەقصوودی حەفصە ـ رضي الله تعالى عنها ـ وابوا . مەقصوودی رەدی فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەبوە . نووي]

## فضائل الأشعريين ـ رضي الله تعالى عنهم ـ

١١٢٩/٢٥٢ - عن أبي موسى [الأشعري] ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت عند النبي ـ ﷺ ـ وهو نازل بالجِعْرانة [وبكسر العين وتشديد الراء] بين مكة والمدينة ، ومعه بلال ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأتى النبي ـ ﷺ ـ أعرابي ، فقال : ألا تُنْجِز لي ما وعدتني [من غنيمة حنين] ؟ فقال [عليه الصلاة والسلام] : أَبْشِر . فقال : قد أكثرت عليَّ من أَبْشِر ! فأقبل [عليه الصلاة والسلام] على أبي موسى وبلال ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كهيئة الغضبان ، فقال : ردَّ البشرى . فأقبِلا أنتما ، قالا : قبلنا . ثم دعا بقدح فيه ماء ، فغسل يديه ووجهه فيه ، ومج فيه ، ثم قال : إشربا منه وأفرغا على وجوهكما ونحوركما وأبشرا . فأخذا القدح ففعلا ، فنادت أم سلمة [أم المؤمنين ـ رضي الله تعالى عنها ـ] من وراء الستر : أفْضِلا لأُمكما ، فأفضلا لها طائفة . ح ـ ٣٩٥/٦ . م ـ ٤٠٥/٩ .

تەرجەمە :

ئەبو مووسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا بووم ـ ﷺ ـ تەشریفی لە جیعرانەدا دابەزیبوو ـ کە لە بەینی مەککەو مەدینەدایە ، بیلالیشی لە خزمەتا بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرەبێکی بەرِرانی هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد : بۆچ ئەوەی کە وەعدەت پێدام کە لە غەنیمەتی حونەین بمدەیتێ بەجێی ناهێنی ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : موژدە بێ لە تۆ . عەرەبەکە وتی : زۆرت موژدە داومێ ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە رقەوە رووی‌کردە ئەبوموساو بیلال ـ رضي الله تعالى عنهما ـ و فەرمووی : ئەم عەرەبە موژدەکەی رەدکردەوە ئێوە قەبووڵی بکەن . ئەبوموساو بیلال ـ رضي الله تعالى

عنهما - فەرموویان : (یا رسول الله) ئێمە قەبـووڵمان کـرد . لە دواییـدا پێغەمەر - ﷺ - قەدەحێکی طەلـەب کرد کـە ئاوی تیـا بوو ، دەستو دەمـوچـاوی مـوبـارەکی پێ شتو لـە دەمی وەرداو کـردیـیەوە نـاو قەدەحەکە ، فەرمـووی : لێی بخۆنـەوەو بیکەن بـە دەمو چاوو سـەر سنگتاناو موژدە بێ لە ئێوە . بیلال و ئەبوموسا - رضي الله تعالى عنهما - قەدەحەکەیان لە دەستی موبارەکی پێغەمەر - ﷺ - وەرگرتو ئەوەیان کە پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێکردن . . کرد . (ام سلمە)ی دایکمان - رضي الله تعالى عنها - لە پشتی پەردەوە بانگی کردن : بەشی دایکیشتان بهێڵنەوە لەوەی کە لە قەدەحەکەتانایە . ئەوانیش بەعزێکیان بۆ پێشتەوە .

ئەم حەدیثە فەضیلەتی ئەبوموساو ، بیلالو ، (ام سلمە)ی تیایە - رضي الله تعالى عنهم - .

ئەو عەرەبە بەرڕانییە چە بەرەکەتێکی گەورەی لە کیس خۆی داوە !

٢٥٣/ ١١٣٠ - عن أبي موسى - رضي الله تعالى عنه - قال : لما فرغ النبي - ﷺ - من حنين بعث أبا عامر على جيش إلى أوطاس فلقي دُرَيْدَ بن الصمة ، فقُتِلَ دريد ، وهزم الله أصحابه . قال أبو موسى وبعثني مع أبي عامر [رضي الله تعالى عنهما ، عمه] فرُمي أبو عامر - رضي الله تعالى عنه - في ركبته رماه جشمي ، فأثبته في ركبته ،[1] فانتهيت إليه [فقلت : يا عم من رماك ؟] فأشار إلى أبي موسى فقال : ذاك قاتلي الذي رماني ، فقصدت له ، فلحقته ، فلما رآني ولّى ، فاتبعته ، وجعلت أقول له : الا

(١) دانەر - خ - «رماه جشمي ، فأثبته في ركبته»ی لەبیر چوو بوو ، نووسیمانو مانایشمان کرد .

تستحي ؟ ألا تثبت ؟ [ألست من العرب ؟ مسلم] فكف ، فاختلفنا ضربتين بالسيف ، فقتلته ، ثم قلت لأبي عامر : قتل الله صاحبك . قال : فأنزِع هذا السهم ، فنزعته فنزا منه الماء ، قال : يا ابن أخي أقرِئ النبيَّ ـ ﷺ ـ السلام وقل له : إستغفر لي ، واستخْلَفَني أبو عامر على الناس ، فمكثت يسيرا ، ثم مات ـ رضي الله تعالى عنه ـ [ثم قاتلهم أبو موسى ـ رضي الله تعالى عنه ـ حتى فتح الله عليه] .

فرجعت فدخلت على النبي ـ ﷺ ـ في بيته على سرير مُرْمَل [أو بفتحتين وتشديد الميم الثانية] و[ما . ظ] عليه فراش قد أثر رمال السرير في ظهره وجنبيه ، فأخبرته بخبرنا وخبر أبي عامر ، وقال : قل له ـ ﷺ ـ إستغفر لي ، فدعا بماء فتوضأ ، ثم رفع يديه ، فقال : اللهم اغفر لعُبَيدٍ أبي عامر . ورأيت بياض إبطيه . ثم قال : اللهم اجعله يوم القيامة فوق كثير من خلقك من الناس . فقلت : ولي ، فاستغفر ، فقال : اللهم اغفر لعبد الله بن قيس ذنبَهُ وأدْخله يوم القيامة مدخلا كريما . قال أبو بردة : إحداهما لأبي عامر والأخرى لأبي موسى . ح ـ ٦/٣٩٢ . م ـ ٩/٤٠٥ بفرق ما ، لفظي .

تەرجەمە :

ئەبو مووسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە غەزای حونەین بۆوە ئەبوعامیری مامی کرد بە سەرکردەی لەشکرێك ، ناردی بۆ (ئەوطاس) گەیی بە دورەیدی کوڕی (صمة)، دورەید کوژرا ، لەشکرەکەی شکا. ئەبو مووسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : منی لەگەڵ ئەبوعامیری مامما نارد ، ئەبوعامیر تیرێکیان دا لە ئەژنۆی کابرایەکی جەشمیی تیرەکەی لێدا ، چووم

بەلایەوە ، لێم‌پرسی : مامە کێ ئەم تیـرەی لێدایت ؟ ئیشـارەتی کردو فەرمووی : ئەوە قاتیلی منە کە تیری لێدام . بۆی چووم‌و پێیگەییم ، کە چـاوی پێمکـەوت پشتی هـەڵکـردو هـەڕای‌کـرد ، شـوێنی کـەوتم ، پێم‌ئەوت : حەیا ناکەی هەڕا ئەکەی ؟ بۆ ناوەستی لە حەربا ؟ [بۆ تۆ عەرەب نیت ؟ م] کە وام‌وت وەستا ، شیرمان بۆ یەکتر داهێناو من ئەوم کوشت .

لە دواییدا بە ئەبوعامیرم وت : رەفیقەکەتم کوشت . فەرمووی : ئەم تیرەم لە ئەژنۆ دەرێنە . تیرەکەم لە ئەژنۆی دەرهێنا لە جێی تیرەکە ئاوی لێ هات . پێی فەرمووم : ئەی کوڕی برای خۆم لە منەوە سەلام لە پێغەمەر کە ـ ﷺ ـ عەرزی بکە ئیستیغفارم بۆ بکا . منی لە جێی خۆی کرد بە سەرکردە [شەرم لەگەڵ کردن‌و شکانمن] نەختێ وەستام ئەبوعامیر وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

گەڕامەوە چوومە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لـە ماڵـەوە بوو ، لەسەر تەختێ بوو بە پووش‌وپەن چنرابوو ، هیچ فەرشی لەسەر نەبوو . شـریتی تەختـەکە لـە پشت‌و تەنیشتی مـوبارەکی جێی خـۆی کردبووەوە . خەبەری خـۆمان‌و ئـەبوعـامیرم عـەرزکرد کـە ئەبـوعامـیر پێی فەرمووم عەرزی پێغەمەر بکە ـ ﷺ ـ کە ئیستیغفارم بۆ بکە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئاوی طەڵەب فەرمـوو ، دەزنوێـژی شت ، لە دواییدا دەستی موبارەکی هەڵبری ، فەرمووی : خوایا لە عوبەید ـ کە ئەبوعامیرە ـ خۆش ببەو ، چاوم کەوت بە سپیانی[1] بن باخەڵی شەریفی . لـە دواییا فـەرمووی : خـوایا لـە رۆژی قیامـەتا بیخـەرە ژوور گـەلێ

(١) لەم شوێنانەدا (سپیایی) دەوترێ نەك (سپیانی) .

مەخلووقی خۆت لە ئینسان . عەرزم‌کرد : بۆ منیش ئیستیغفار بکە . فەرمووی : خوایا لە عەبدوڵڵای کوڕی قەیس خۆش ببە ، لە گوناهی ببوورە ، ڕۆژی قیامەت بیخەرە جێیێکی موبارەکەوە . ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەم دۆعایە یەکێکیان بۆ ئەبوعامیرە ، ئەوی تریان بۆ ئەبوموسایە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ .

١١٣١/٢٥٤ ـ وعنه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إني لأعرف أصوات رفقة الأشعريين بالقرآن حين يدخلون بالليل ، وأعرف منازلهم من أصواتهم بالقرآن بالليل ، وإن كنت لم أرَ منازلهم حين نزلوا بالنهار ومنهم حكيم [صفة أو علم لرجل . نووي] إذا لقي الخيل ، أو قال العدو ، قال لهم : إن أصحابي يأمرونكم أن تنظروهم [مثل «أنظرونا نقتبس من نوركم»[1] . قسطلاني ، ونووي] ، [اي تنتظروهم] . م/٩/٤٠٧ . ح ـ ٦/٣٥٩ .

تەرجەمە :

ئەبوموسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : بە قورئان دەنگی ڕێبواری ئەشعەریی ئەناسمەوە کە ئەچنە ماڵێ بەشەو ، لە شەوا کە قورئان ئەخوێنن بە دەنگیان مەنزڵەکانیان ئەزانم ، ئەگەر چی بە ڕۆژا کە مەنزڵ ئەگرن مەنزڵەکانیانم نەدیبێ . لە ناو ئەوانا یەکێکی حەکیم ناو هەیە ، یا پیاوێکی عاقڵ هەیە کە تووشی لەشکری سوارە ببێ ، یا فەرمووی : تووشی دوشمن ببێ پێیان ئەڵێ : کە ڕەفیقەکانم ئەمرتان پێ ئەکەن کە

(١) الحديد/١٢ .

مونتەظیریان ببن [یەعنی تا حەربتان لەگەڵا بکەن ، یەعنی شەجیعن لە دوشمن ناترسن قورئان خوێنن ، فەرقی شەوو رۆژو رێو بان ناکەن] .

بەشەو بەرێوە قورئان خوێندن دروستە .

دەنگ هەڵبرین بە قورئان دروستە بەو شەرتە نوێژو خەو لە خەڵق تێك نەدا ، بەڵکو سوننەتیشە .

**١١٣٢/٢٥٥ ـ وعنـه ـ رضي الله تعالى عنـه ـ قال : قـال رسول الله ـ ﷺ ـ إن الأشعريين إذا أرملوا في الغزو [أي : فني طعامهم] أو قـلَّ طعام عيالهم بالمدينة جمعوا ما كان عندهم في ثوب واحد ثم اقتسموه بينهم في إنـاء واحـد ، بـالسـويـة ؛ فهم مني وأنـا منهم . م ـ ٤٠٧/٩ . ح ـ ٢٧٣/٦ .**

**تەرجەمە :**

ئەبوموساى ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەفەرموێ : کە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : کـە قەومی ئـەشعەریی کـە لـە غـەزادا خۆراکیان نەما ـ یەعنی هی بەعزێکیان ـ یا لە مەدینەدا طەعامی عەیالیان کەم بۆوە . . . ئەو طەعامانەی کە لە لایان ماوە هەمووی لە ناو جلێکا کۆ ئەکەنەوە ، لە دواییدا بە قاپێ بە موساوات لە بەینی خۆیانـا تەقسیمی ئەکەن . [لە صیفاتی فاضیلەی بەشەرییەتا] ئەوان لە خوڵقی منان و من لە خوڵقی ئەوانام .

لەم حەدیثەدا مەدحیان ئەکا لە ئەخلاقی حەسەنەدا بە : سەخا ، بە خزم دۆست ، بە صیلەی رەحم ، بە زوهدو قەناعەت . . .

لە حەدیثەکەی پێشوودا مەدحیان ئەکـا بە : شـەجاعـەت ، بە تەقوا ، بە عیبادەت .

# فضائل جعفر وأسماء بنت عميس وأهل سفينتهم
- رضي الله تعالى عنهم -

١١٣٣/٢٥٦ عن أبي موسى - رضي الله تعالى عنه - قال : بلغنا مخرج النبي - ﷺ - ونحن باليمن ، فخرجنا مهاجرين إليه ، أنا وأخوان لي ، أنا أصغرهم ، أحدهما أبو بردة [عامر بن قيس] والآخر أبو رهم . إما قال : بضع ، وإما قال : ثلاثة وخمسين ، أو إثنين وخمسين رجلا من قومي ، فركبنا سفينة ، فألقتنا سفينتنا إلى النجاشي بالحبشة ، فوافقنا جعفر بن أبي طالب - رضي الله تعالى عنه - ، وأصحابه عنده ، فقال جعفر : إن رسول الله - ﷺ - بعثنا ههنا ، وأمرنا بالاقامة فأقيموا معنا . قال مسلم:فأقمنا معه حتى قدمنا جميعا ، فوافقنا النبي [رسول الله . م] - ﷺ - حين إفتتح خيبر ، فأسهم لنا ، أو قال : أعطانا منها ، وما قسم لأحد غاب عن فتح خيبر منها شيئا إلا لمن شهد معه ، إلا لاصحاب سفينتنا مع جعفر وأصحابه ، قسم لهم معهم . [ح/٥/٢٠٩] .

قال : فكان اناس من الناس يقولون لنا - يعني لأهل السفينة - : سبقناكم بالهجرة . ودخلت أسماء بنت عميس [زوجة جعفر] ، وهي ممن قدم معنا ، على حفصة - رضي الله تعالى عنها وعنهم - زوج النبي - ﷺ - زائرة ، وقد كانت هاجرت إلى النجاشي فيمن هاجر . فدخل عمر على حفصة ، وأسماء عندها - رضي الله تعالى عنهم - فقال عمر - حين رأى أسماء - : من هذه ؟ قالت : أسماء بنت عميس . قال عمر : الحبشية هذه ، البحرية هذه . قالت أسماء : نعم . قال : سبقناكم بالهجرة ؛ فنحن أحق برسول الله - ﷺ - منكم . فغضبت ، وقالت ، كلا والله ! كنتم مع رسول الله - ﷺ - يطعم جائعكم ، ويعظ جاهلكم . وكنا في

دار أو أرض البعداء البغضاء بالحبشة . وذلك في الله وفي رسوله . وأيم الله لا أطعم طعاما ، ولا أشرب شرابا حتى أذكر ما قلت لرسول الله - ﷺ - ونحن كنا نؤذى ونخاف ، وسأذكر ذلك للنبي - ﷺ - وأساله ، والله لا أكذب ، ولا أزيغ ، ولا أزيد على ذلك .

قال : فلما جاء النبي - ﷺ - قالت : يا نبي الله إن عمر قال كذا وكذا . قال : فما قلت له ؟ قالت : قلت له كذا وكذا . قال [عليه الصلاة والسلام] : ليس بأحق بي منكم ، وله ولأصحابه هجرة واحدة ولكم أنتم أهل السفينة هجرتان ! قالت : فلقد رأيت أبا موسى وأصحاب السفينة يأتوني أرسالا [أفواجا] يسألوني عن هذا الحديث ، ما من الدنيا شيءٌ هم به أفرح ولا أعظم مما قال لهم النبي - ﷺ - .

قال أبو بردة [بن أبي موسى - رضي الله تعالى عنه -] : قالت أسماء : فلقد رأيت أبا موسى وإنه ليستعيد هذا الحديث مني .

ح/٣٥٨/٦ . م/٩/٤١٠ .

تەرجەمە :

ئەبوموساى ئەشعەريى - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : كە خەبەرى خورووجى پێغەمەرمان پێگەيى - ﷺ - ئێمە لە يەمەن بووين بە هيجرەت چووينە خزمەتى ، من لەگەڵ دوو براما ، من بچووكيان بووم ، يەكێكيان ئەبو بوردە بوو ، ئەوى تريان ئەبوروهم بوو . ئەبوموسا يا فەرمووى : پەنجاو ئەوەندە ، يا فەرمووى : پەنجاوسێ ، يا پەنجاو دووكەس لە قەومەكەم لە سوارى سەفينەيێكا بووين ، سەفينەكەمان ئێمەى هاويتە لاى نەجاشيى لە حەبەشەستان ، تووشى جەعفەرى كوڕى ئەبوطاليب بووين ، ئەصحابى لە خزمەتيا بوو - رضي

الله تعالی عنهم ـ جەعفەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ : ئێمەی ناردە ئێرەو ئەمری پێکردین کە لێرەدا ئیقامەت بکەین ، ئێوەیش لەگەڵ ئێمە بەند ببن ، لەگەڵ ئەو لەوێدا ماینەوە تا هەموو بەیەکەوە هاتینە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەصادوفی پێغەمەرمان کرد ـ ﷺ ـ کە فەتحی خەیبەری ئەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە غەنیمەتی خەیبەر بەشی داین . بە ئەصحابی سەفینەنەبێ بەشی هیچ کەسی نەدا غەیری ئەوانەی کە لە حینی فەتحا لە خزمەتیا بوون .

بەعزێ خەڵق بە ئەهلی سەفینەیان ئەووت : ئێمە لە هیجرەتا لە ئێوە پێشکەوتین .

ئەسمای کچی عومەیس ـ کە حەرەمی جەعفەر بوو ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەویش لەوانە بوو کە لەگەڵ ئێمە ، کە ئەصحابی سەفینە بووین ، هاتبوو بۆ مەدینە ، زیارەتی حەزرەتی حەفصەی حەرەمی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ،ورضي عنها ـ عومەریش هاتە خزمەت حەفصەو ئەسمای = لە = خزمەتا بوو ـ رضي الله تعالی عنهم ـ پرسی : ئەمە کێیە ؟ عەرزیان کرد : کە ئەسمایە . فەرمووی : ئەسمای حەبەشیی ، ئەسمای بەحریی . ئەسما عەرزی کرد : بەڵێ . عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ پێی فەرموو : لە هیجرەتا ئێمە لە ئێوە پێشکەوتین . کە وابێ ئێمە لە ئێوە نزیکترین بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ . ئەسما لەوە رقی هەڵسا ، فەرمووی : حاشا ؛ ئێوە لە خز مەت پێغەمەرا بوون ـ ﷺ ـ برسیتانی تێرئەکرد ، وەعظی بۆ نەزانتان دادەدا . ئێمە لە دیارێکی ، یا فەرمووی : لە ئەرزێکی دوورا بووین ، لە ئەرزێکی مەبغووضا بووین لە حەبەشستان . ئەوە بۆ خواو بۆ پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ . قەسەم بە خوا ! نە ئەخۆم نە ئەخۆمەوە تا ئەوی بە منت وت عەرزی پێغەمەری ئەکەم

ـ ﷺ ـ ؛ ئێمە ئەذیەت ئەدراین ئەترساین . ئەوەی کە تۆ وتت ئەبێ عەرزی پێغەمەری بکەم ـ ﷺ ـ . لێی ئەپرسم ، وەڵڵاهی هیچ درۆی تیا ناکەم . لە حەق لانادەم ، لێی زیاد ناکەم .

کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتەوە ، ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ عەرزی کرد : (یا نبي الله) عومەر واو وای پێ وتم . فەرمووی : تۆ چیت بەو وت ؟ وتی : ئەوەو ئەوەم پێ وت . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەو لە ئێوە بە من نزیکتر نی یە . بۆ ئەوو بۆ ئەصحابی تەنها هیجرەتێ هەیە ، بۆ ئێوە ـ ئەی ئەصحابی سەفینە ـ دوو هیجرەتتان هەیە : یەکێکی بۆ ئەرزی حەبەشە ، یەکێکی بۆ لای من !

ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : ئەبوموو‌ساو ئەصحابی سەفینەم وا دی فەوج ، فەوج [یەعنی کۆمەڵ ، کۆمەڵ] ئەهاتنە لام ئەم حەدیثەیان لێ ئەپرسیم . هیچ شتێ نەبوو لە دنیادا لایان خۆشتر بێ یا لایان گەورەتر بێ لەوەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەقی فەرموون . ئەبوبوردە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : کە ئەسما فەرمووی : ئەبوموو‌سام وا دی کە ئەم حەدیثەی پێ تیکرار ئەکردمەوە[1] . ـ رضي الله تعالى عنهم أجمعين ـ .

---

(١) دەبوو دانەر بینووسیایە : ئەم حەدیثەی لە منەوە تیکرار ئەکردەوە .

# فەضائیلی جەریری بنی عەبدوڵڵای بەجەلی
# - رضي الله تعالى عنه -

[أسلم - رضي الله تعالى عنه - قبل وفاته - عليه الصلاة والسلام - بقليل ، وقال - عليه الصلاة والسلام - في حجة الوداع : إستنصت الناس ، وكان حسن الصورة . قال عمر بن الخطاب - رضي الله تعالى عنه - : جرير يوسف هذه الأمة ، وهو سيد قومه .

وفي الطبراني : أنه لما دخل على النبي - ﷺ - أكرمه وبسط له رداءه ، وقال : إذا أتاكم كريم قوم فأكرموه . وتوفي - رضي الله تعالى عنه - بعيد الخمسين من الهجرة . قسطلاني . ٦/١٦٣] .

١١٣٤/٢٥٧ عن بيان عن قيس [بن حازم] قال سمعته يقول قال جرير بن عبد الله - رضي الله تعالى عنه - : ما حجبني رسول الله - ﷺ - منذ أسلمت ، ولا رآني إلا ضحك . ح - ٦/١٦٣ .

تەرجەمە :

قەیسی کوڕی حازم - رحمه الله - ئەفەرموێ : جەریری کوڕی عەبدوڵڵا - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لەو وەختەوە کە موسوڵمان بووم پێغەمەر - ﷺ - قەط مەنعی نەکردم لەچوونە حوضووری ، قەط چاوی پێم نەکەوتوە کە بە روومەوە پێ نەکەنیبێ .

[جەریر - رضي الله تعالى عنه - بە قەد سێ مانگ لە پێش وەفاتی سەییدی کائیناتا - عليه الصلاة والسلام - موسوڵمان بوو ، لە حەججی ویداعا پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێ فەرموو : کە خەڵق بێدەنگ بکا تا گوێیان لە خوطبەی پێغەمەر بێ - ﷺ - .

جەریر - رضي الله تعالى عنه - پیاوێکی جوان و بەشەوکەت بوە .

ئيمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرموويەتی : كە جەرير يوسفی ئەم ئوممەتەيە . جەرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ گەورەی قـەومی خۆی بوە .

لە طەبەرانيدايە : كە جەرير چوو بۆ خـذمەت پێغـەمەر ـ ﷺ ـ ئيكرامی گرت بەرماڵەكەی خۆيی بۆ راخست‌و فەرمووی : كە كەريمی قەومێكتان هاتە لا ئيكرامی بگرن . جەرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە تەئريخی نەختێ دوای پەنجای هيجرەت وەفاتی كرد ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ] .

١١٣٥/٢٥٨ عن جرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال لي رسول الله ـ ﷺ ـ : ألا تريحني من ذي الخلصة ؟ فقلت : بلى . فانـطلقت في خمسين ومائة فارس من احمس [بوزن أحمر] وكـانوا أصحـاب خيل ، وكنت لاأثبت على الخيل . فذكرت ذلك للنبي ـ ﷺ ـ ، فضرب يده على صدري حتى رأيت أثر يده في صدري . فقال : اللهم ثبته [على الخيل] واجعله هاديا مهديا . قال : فما وقعت عن فرس بعد .

قال : وكان ذو الخلصة بيتا باليمن لخثعم وبجيلة[إسم امرأة نسبت القبيلة إليها] فيه نُصُب يُعبـد يقال لـه : الكعبة [اليمـانية ، والكعبـة الشامية . أخرى . خ] [سميت يمانية ؛ لأنها في اليمن ، وشامية باعتبار أن بابها كان مقابلا للشام . قسطلاني] . قال قيس : فـأتاهـا فحرقهـا بالنار ، وكسرها . قال : ولما قدم جرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ اليمن كان بها رجل يستقسم بالأزلام . فقيل له : إن رسول رسول الله ـ ﷺ ـ ههنا فإن قدر عليك ضرب عنقك . قال : فبينما هو يضرب بها إذ وقف عليه جرير ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : لتكسرنها ولتشهد أن لا إله إلا الله أو لأضربن عنقك . قال : فكسرها وشهد ، ثم بعث جرير رجلا من

**أحمس ، يكنى أبا أرطاة ، إلى النبي ـ ﷺ ـ يبشره بذلك . فلما أتى النبي ـ ﷺ ـ قال : يا رسول الله والذي بعثك بالحق ! ما جئت حتى تركتها كأنها جمل أجرب . قال : فبرَّك النبي ـ ﷺ ـ على خيل أحمس ورجالها خمس مرات . ح/٦/٤٠٩ ، م/٩/٣٨٧ .**

**تەرجەمە :**

قەیسی کوڕی حازم لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی ریوایەت ئەکا ، جەریر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ فەرمووم : بۆچی دڵم رەحەت ناکەی لە (ذو الخلصة) ؟ عەرزم کرد : بەڵێ رەحەتت ئەکەم . بە صەدو پەنجا سواری ئەحمەسەوە چووم . ئەحمەس عەشیرەتێکی صاحیب وڵاغی بەرزەن . منیش خۆم بەسەر ئەسپەوە نەئەگرت . ئەوەم عەرزی پێغەمەر کرد ـ ﷺ ـ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستێکی ماڵی بەسەر سنگما تا جێی دەستی موبارەکی پێغەمەرم دی ـ ﷺ ـ لە سنگما . فەرمووی : خوایا لەسەر وڵاغ ثابتو مەحکەمی بکەو بیشی کە بە هیدایەتدەرو هیدایەتدراو .

جەریر فەرمووی : لە دوای ئەوە هیچ لەسەر وڵاخ نەکەوتوومە خوارێ .

(ذو الخلصة) خانوویێ بوو لە یەمەن هی عەشیرەتی خەثعەمو بوجەیلە بوو ، بتی زۆری تیا بوو عیبادەتی بۆ ئەکرا . جەریر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوو بۆ ئەو جێگەیە کە ئەو خانوەی لێبوو بە ئاگر خانوەکەی سووتانو تێکی شکان .

قەیس فەرمووی : کە جەریر گەیی یە یەمەن پیاوێکی تیا بوو ، تەفەئولی بە ئەزلام ئەکرد . پێیان وت : رەسوولی (رسول الله) ـ ﷺ ـ تەشریفی لێرەیە ، دەستی بەسەرتا بیێ لە گەردنت ئەدا . لەو وەختەدا کە

ئه‌و پیاوه به ئه‌زلام فالّی ئه‌گرته‌وه جه‌ریر ـ رضي الله تعالی عنه ـ به‌سه‌ریه‌وه حازر وه‌ستا ئه‌مری پێ فه‌رموو : ئه‌بێ ئه‌م ئه‌زلامه بشکێنی و شه‌هاده‌تیش بێنی به (لا إله الا الله) گینا له گه‌ردنت ئه‌ده‌م . ئه‌و پیاوه ئه‌زلامه‌که‌ی شکان و شه‌هاده‌تی هێنا . له دواییدا جه‌ریر ـ رضي الله تعالی عنه ـ پیاوێکی له ئه‌حمه‌س نارده خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ناوی ئه‌بوئه‌رطاة بوو که موژده بدا به پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پیاوه‌که گه‌یی یه خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ، عه‌رزی‌کرد : (یا رسول الله) قه‌سه‌م به‌و ذاته‌ی که تۆی به حه‌ق ره‌وانه‌کردۆته سه‌ر خه‌ڵق ! تا وه‌ك وشتری گه‌ر ئه‌و خانوه‌م به‌جێ نه‌هێشت نه‌هاتمه خزمه‌ت تۆ . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ تا پێنج ده‌فعه دۆعای به‌ره‌که‌تی کرد بۆ خه‌یلی ئه‌حمه‌س و بۆ پیاویان .

سێ موعجیزه‌ی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ی تیایه :

١ ـ جه‌ریر که شله‌په‌ته بوو به ده‌ستپیادانی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ده‌زبه‌جێ شیفایاب بوو .

٢ ـ به به‌ره‌که‌تی دۆعای ئه‌و خوا هیدایه‌تی داو گه‌لێ خه‌ڵقیشی موسوڵمان کرد .

٣ ـ مووه‌فه‌ق بوو به‌سه‌ر ته‌خریبی ئه‌و بتخانه‌دا به بێ کولفه‌ت .

ئه‌م موعجیزانه‌یش هه‌رسێکی فه‌ضیله‌تن بۆ جه‌ریر ـ رضي الله تعالی عنه ـ .

## حذيفة بن يمان العبسي
## - رضي الله تعالى عنه -

١١٣٦/٢٥٩ عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت : لما كان يوم أحد هزم المشركون هزيمة بينة ، فصاح إبليس : أي عباد الله أخراكم ! فرجعت أولاهم على أخراهم ، فاجتلدت [أي : فاقتتلت] أخراهم . فنظر حذيفة ، فإذا هو بأبيه ، فنادى : أي عباد الله أبي ، أبي ! فقالت : فوالله ما احتجزوا [أي : ما انفصلوا] حتى قتلوه . فقال حذيفة : غفر الله لكم . [قال هشام] : قال أبي [عروة] : فوالله ما زالت في حذيفة منها [من هذه الكلمة] بقية خير [دعاء واستغفار لقاتل أبيه] حتى لقي الله - تعالى عز وجل - . ح/٦/١٦٤ . ح/٦/٢٨٩ .

ته‌رجه‌مه :

عایشه - رضي الله تعالى عنها - فه‌رمووی : که غه‌زای ئوحود بوو موشریك به شكانیكی ئاشكارا شكان . ئیبلیس - لعنه الله - بانگێكی قایمی كرد : ئه‌ی (عباد الله) ئاگاتان له دواوه بێ ! ئه‌وانه كه له پێشه‌وه بوون گه‌ڕانه‌وه سه‌ر دوایی یه‌كه‌یان ، هی دواوه‌یش له‌گه‌ڵ هی پێشه‌وه‌یان ، ده‌ستیان كرد به شه‌ڕكردن [یه‌عنی به‌ره‌و دوای له‌شكری ئیسلام كه‌وتنه شه‌ڕكردن له‌گه‌ڵ یه‌كتری] .

حوذه‌یفه - رضي الله تعالى عنه - ته‌ماشای كرد (یه‌مان)ی باوكی یان گرتۆته ناو خۆیانه‌وه خه‌ریكن بیكوژن . حوذه‌یفه - رضي الله تعالى عنه - بانگی كردن : ئه‌ی (عباد الله) ئه‌وه باوكمه مه‌یكوژن . حه‌زره‌تی عایشه - رضي الله تعالى عنها - فه‌رمووی : وه‌ڵلاهی به‌و بانگی حوذه‌یفه‌یه

وازیان لە باوکی نەهێنا تا کوشتیان . ئەو وەختە حوذەیفە فەرمووی ؛ خوا لێتان خۆش ببێ .

عورووە ـ کە راویی حەدیثەکەیە ـ ئەفەرموێ : وەڵڵاهی لە حوذەیفەدا تا وەفاتی کرد ئەو دوعای مەغفیرەتەی بۆ قاتڵی باوکی تەرك نەکرد . هەر دوعای خێرو مەغفیرەتی بۆ ئەکردن .

فەضیلەتێکی گەورەیە بۆ حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە بە دەوام دوعای مەغفیرەتی ئەکرد بۆ قاتیلی باوکی ، لە موقتەضای بەشەرییەت وازی هێنا ، کە بە عادەت ئەبو کینی لێیان بەدڵەوە بگرتایە .

# فضائل أويس القرني

- رضي الله تعالى عنه -

١١٣٧/٢٦٠ عن اسير بن جابر أن أهل الكوفة وفدوا إلى عمر - رضي الله تعالى عنه - وفيهم رجل ممن كان يسخر بأويس ، فقال عمر : هل ههنا أحد من القرنيين ؟ فجاء ذلك الرجل ، فقال عمر - رضي الله تعالى عنه - : إن رسول الله - ﷺ - قد قال : إن رجلا يأتيكم من اليمن يقال له : أويس ، لايدع باليمن غير أم له ، قد كان به بياض ، فدعا الله فأذهبه عنه إلا موضع الدينار أو الدرهم ، فمن لقيه منكم فليستغفر لكم . م/٩/٤٣٣ .

وفي أخرى عن عمر - رضي الله تعالى عنه - : سمعت رسول الله - ﷺ - يقول : إن خير التابعين رجل يقال له : أويس ، وله والدة ، وكان به بياض ، فمروه فليستغفر لكم . م/٩/٤٣٤ .

تەرجەمە :

ئوسەیری کوڕی جابیر ئەفەرموێ : ئەهلی کووفە هاتنە خزمەت ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - پیاوێکیان تیابوو کە ئیستیهزاو گاڵتەی بە ئوەیسی قەرەنی ئەکرد . عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : کەستان تیایە لە خەڵقی قەرەن ؟ ئەو پیاوە چوە خزمەت ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : پیاوێ لە یەمەن بێتە لای ئێوە ئوەیسی پێ ئەڵێن ، لە یەمەنا غەیری دایکی کەس بەجێ نایێڵێ ، بەڵەکی یێکی پێوە بو ، لە خوای طەڵەب کرد ، خوا ئەو بەڵەکی یەی لەسەر لابرد ، هەر بە قەد دیناری یا درهەمێکی ماوە ، هەرکەسێ لە ئێوە تووشی ببێ طەڵەبی لێ بکا کە

ئيستيغفارى بۆ بكا .

لـە ريوايـەتەكـەى ترا ئيمـامى عومـەر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ فەرمووى : لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بيست : كە چاكترينى هەموو تـابيعين پياوێكە پێى ئەڵێن : ئوەيس دايكێكى هەيە ، بەڵەكى يێكى پێوەيە ، پێى بڵێن : كە ئيستيغفارتان بۆ بكا .

١١٣٨/٢٦١ عن اسير بن جابر قال : كان عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ إذا أتى عليه إمداد أهل اليمن سألهم : أفيكم أويس بن عامر ؟ حتى أتى على أويس ، فقال : أنت أويس بن عامر ؟ قال : نعم . قال : من مراد ، ثم من قرن ؟ قال : نعم . قال : فكان بـك برص فبرأت منه إلا موضع درهم ؟ قال : نعم . قال : لك والدة ؟ قال : نعم . قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : يأتي عليكم أويس بن عامر مع إمداد أهل اليمن ، من مراد ، ثم من قرن . كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم . له والدة هو بها بر ، لو أقسم على الله لأبره . فإن استطعت أن يستغفر لك فافعل ، فاستغفر لي ، فاستغفر له .

فقال له عمر : أين تريد ؟ قال : الكوفة . قال : ألا أكتب لك إلى عاملها ؟ قال : أكون في غبراء الناس أحب الي .

قال : فلما كان من العام المقبل حج رجل من أشرافهم ، فوافق عمر ، فسأل عن أويس . فقال : تركتـه رث البيت ، قليل المتـاع . قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : يأتي عليكم أويس بن عامر مع إمداد من أهل اليمن من مراد ، ثم من قرن ، كان به برص فبرأ منه إلا موضع درهم . له والدة هـو بها بـر ، لو أقسم عـلى الله لابره ! فـإن استطعت أن يستغفر لك فافعل . فأتى أويسـا ، فقال : إستغفـر لي ، فقال : أنت أحدث عهدا بسفر صالح ، فـاستغفر لي . قـال : لقيت

عمر ؟ قال : نعم . فاستغفر له . ففطن له الناس ، فانطلق على وجهه . قال اسير : وكسوته بردة ، فكان كلما رآه إنسان قال : من أين لأويس هذه البردة ؟ م/٩٠/ ٤٣٤ .

تەرجەمە :

ئوسەیری کوڕی جابیر ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە یەمەنەوە مەدەدی بۆ بهاتایە لێی ئەپرسین : ئوەیستان لەناوایە ؟ تا هاتە سەر ئوەیس ـ رضي الله تعالى عنه ـ لێی پرسی : تۆ ئوەیسی کوڕی عامیری ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : لە مواردی لە دوای = ئەوە = لە قەرەنی ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : بەڵەکیت پێوە بوو چاك بوویتەوەو جێی درهەمێ نەبێ پێتەوە ما ؟ فەرمووی : بەڵێ . فەرمووی : دایکت هەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە پێغەمەرم بیست ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : لەگەڵ مەدەدی ئەهلی یەمەن ئوەیسی کوڕی عامیرتان یێتە لا لە قەبیلەی موراده ، لە دوای ئەو لە قەبیلەی قەرەنە . بەڵەکی یێکی پێوە بوو چاك بۆوە بە قەد جێی درهەمێ نەبێ هیچی پێوە نەما ، دایکێکی هەیە لە ئەمرو ئیطاعەی ئەو دایکەیایە ، ئەگەر سوێن لەسەر خوا بخوا ، یەعنی = بڵێ = یارەببی وەڵلاهی ئەبێ ئەو ئیشە بکەی خوا سوێنەکەی ناخاو ئەو شتەی کە سوێنی لەسەر خواردوە بۆی ئەکا . ئەگەر ئەتوانی و دەستت ببێ کە طەڵەبی ئەوەی لێ بکەی کە ئیستیغفارت بۆ بکا طەڵەبی لێ بکە [ئێستە ئەمەوێ کە ئیستیغفارم بۆ بکەی] ئیستیغفارم بۆبکە . ئوەیس ئیستیغفاری بۆ کرد .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لێی پرسی : لە کوێت تەمایە کە ئیقامەتی لێ بکەی ؟ عەرزی کرد : لە کووفە . فەرمووی : با

بۆت بنووسمە لای عامیلی کووفە . عەرزی‌کرد : ئەوەم لە لا خۆشترە کە لە ناو ئینسانی ضەعیف‌و فەقیرو بێ دەستەڵاتا بم .

ئوسەیر ـ رحمە اللە ـ فەرمووی : ساڵی دوایی پیاوێ لە ئەشـرافی کووفە حەجی کرد ، بە حەزرەتی ئیمامی عومەر ـ رضي اللە تعالی عنە ـ مولاقاتی کرد ، ئیمامی عومەر ـ رضي اللە تعالی عنە ـ ئەحواڵی ئوەیسی ـ رحمە اللە تعالی ـ لێ‌پرسی . عەرزی‌کـرد : وام بەجێ هێشت کـە لە خانوویێکی خراپایە ، مەتاعی کەمە . ئیمامی عومەر ـ رضي اللە تعالی عنە ـ ئەو فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی بۆ ئەویش ریوایەت‌کرد .

ئەو پیاوە کە گەڕایەوە چوە خذمەت ئوەیس طەڵەبی ئیستیغفاری کرد . فەرمووی : تۆ تازە سەفەرێکی صاڵحت کردوە ئیستیغفار بۆ من بکە . ئوەیس ـ رحمە اللە ـ لەو پیاوەی پرسی : مولاقاتت لەگەڵ عومەرا کردوە ـ رضي اللە تعالی عنە ـ ؟ عەرزی‌کرد : بەڵێ . ئوەیس ـ رحمە اللە ـ ئیستیغفاری بۆ کرد . لە دوایی یا خەڵق بە ئەحواڵی ئوەیسیان زانی ـ رحمە اللە ـ . ئوەیس ـ رحمە اللە ـ سەری خۆیی هەڵگرت‌و رۆیی . [یـەعنی ئیحتیرازی لە شوهرەت‌کرد] ئوسەیر ـ رحمە اللە ـ فەرمووی : جبەیێکم دایێ و پێم‌پۆشی ، هەرکەسێ کە چاوی پێ ئەکەوت ئەیوت : عەجەبا ئوەیس ئەم بوردەی لە کوێ بوو ؟ !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ چەند ساڵ لە پێشەوە خەبەری داوە بە ئیمـامی عومەر کە ئوەیس ـ رحمە اللە ـ لەگەڵ ئەوانەی بۆ غەزا مەدەدی لەشکری ئیسلام ئەدەن لەگەڵ مەدەدی ئەهلی یەمەنا ئەچێ بۆ حیجاز . . عەینی فەرموودەکەی واقیع بوو لە خەلافەتی حەزرەتی عومەرا ـ رضي اللە تعالی عنە ـ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ شەهادەتی داوە کە ئوەیس ـ رحمه الله ـ دۆعا بـۆ هەرکەسێ بکاو هەرچی لە خوا طەڵەب بکا خوا بۆی ئەکا . ئەمری بە ئەصحاب و هەرکەسێ کە بە ئوەیس بگا فەرموە کە طەڵەبی دۆعای خێری لێ بکا . خەبەری داوە بەوە کە ئوەیس ئەفضەلی تابیعینە .

گەورە با (متقي)ش بێ سوننەتە طەڵەبی دۆعای خێر بکا لەوەی لە خوار خۆیەوەیە لە دەرەجەدا .

خۆلاصە : مەسئەلەی عومەرو وەیس ئەشوبهێ بە مـەسئەلـەی حەزرەتی مووساو خضر ـ علیهما الصلاة والسلام ، ورضي عنهما ـ .

# أيام الجاهلية

بوخاری ـ رحمه الله ـ ئەم بەحثانەی لە فەضائیلا ذیکرکردوه .

١١٣٩/٢٦٢ عن قيس بن أبي حازم ـ رحمه الله ـ قال : دخل أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ على امرأة من أحمس [قبيلة من بجيلة] يقال لها : زينب ؛ فرآها لاتتكلم ، فقال : ما لها لاتتكلم ؟ قالوا : حجت مصمتة ، قال لها : تكلمي فإن هذا لايحل ، هذا من عمل الجاهلية فتكلمت .

[وعند الاسماعيلي : إن المرأة قالت له : كان بيننا وبين قومك في الجاهلية شر ، فحلفت إن الله عافاني من ذلك أن لا أكلم أحدا حتى أحج . فقال : إن الاسلام يهدم ذلك]

فقالت : من أنت ؟ قال : امرؤ من المهاجرين . قالت : أي المهاجرين ؟ قال : من قريش . قالت : من أي قريش أنت ؟ قال : إنك لسؤل ؛ أنا أبو بكر . قالت : ما بقاؤنا على هذا الأمر الصالح الذي جاء الله به بعد الجاهلية ؟ قال : بقاؤكم عليه ما استقامت بكم أئمتكم . قالت : وما الأئمة ؟ قال : أما كان لقومك رؤس وأشراف يأمرونهم فيطيعونهم ؟ قالت : بلى . قال : فهم أولائك على الناس . ح/١٦٨/٦ .

تەرجەمە :

قەیسی کوڕی ئەبو حازم ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوە لای ژنێ لە ئەحمەس ، ناوی زەینەب بوو . چاوی پێکەوت قسەی نەدەکرد ، پرسی : بۆچی قسە ناکا ؟ عەرزیان کرد : کە بە بێ ئەمە قسە بکا حەج ئەکا .

ئەمری پێ فەرموو : کە قسە بکە ئەو نەذرە حەڵاڵ نیە ، لە عەمەلی جاهیلیەتە . ئەمجا دەستی کرد بە قسەکردن .

[ئیسماعیلی ئەفەرموێ : ژنەکە جوابی دایەوە : کە لە بەینی ئێمەو قەومی تۆدا شەڕێ بوو ، سوێنم خوارد : ئەگەر خوا لەم بەڵایە سەلامەتم بکا تا حەج نەکەم قسە نەکەم ! حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئیسلامەتی ئەو نەوعە نەذرو سوێندانەی هەڵگرتوە]

زەینەب لە حەزرەتی صەدیقی پرسی ـ رضي الله تعالى عنه ـ : تۆ کێی ؟ فەرمووی : پیاوێکم لە موهاجیران . عەرزی کرد : لە کام موهاجیر؟ فەرمووی : لە موهاجیری قورەیش . عەرزی کرد : لە کام قورەیش ؟ فەرمووی : تۆ زۆر ئەپرسی ! من ئەبوبەکرم . عەرزی کرد : تا کەی لەسەر ئەم ئەمرە خێرە ئەمێنینەوە کە خوا ـ عز وجل ـ لە دوای جاهیلیەت بۆی هێناوین ؟ فەرمووی : تا ئیمامەکانتان بە رێی راستا بتانبا بەڕێوە لەسەری ئەمێننەوە . عەرزی کرد : ئیمام چیە ؟ فەرمووی : بۆ قەومەکەی تۆ پیاوی گەورەو بە قودرەتی تیا نەبوە کە ئەمریان پێ بکا ئەوانیش بەگوێی بکەن ؟ عەرزی کرد : بەڵێ تیایانا بوە ، فەرمووی : ئیمامیش ئەوانەن کە بەسەر خەڵقا ئەمرو نەهی ئەکەن .

حەیف ئەو ئیمامانەی کە خەڵق بەرێی راستا بەڕێوە ببەن هەر سی ساڵ لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەوامی کرد ، لە دوای ئەوە هەموو بوون بە درندە (إلا قليلا منهم) .

٢٦٣/١١٤٠ سعيد بن المسيب عن أبيه عن جده [حزن ـ رضي الله تعالى عنهما ، ورحمه الله] . قال : جاء سيل في الجاهلية ، فكسا ما بين الجبلين ، قال سفيان [بن عيينة] ويقول [عمرو بن دينار] إن هذا

الحديث لهِ شأن [أي قصة طويلة]

فايدەی ئەم ئەثەرە چيه ؟ (قصه) طەويلەكەيش ذيكر نەكراوە . نەفسی سەيل هەموو ساڵێ ئەبێ . حەتتا پار چەند شاری ئەنادۆڵی وێران كرد(١) !

١١٤١/٢٦٤ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : أسلمت إمرأة سوداء لبعض العرب ، وكان لها حفش في المسجد [بيت صغير فيه] قالت : فكانت تأتينا ، فتحدث عندنا ، فإذا فرغت من حديثها قالت :

ويوم الوشاح من تعاجيب ربنا

ألا إنه من بلدة الكفر أنجاني

فلما أكثرت ، قالت لها عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ : وما يوم الوشاح ؟ قالت : خرجت جويرية لبعض أهلي وعليها وشاح ، [ما يقدُّ من الجلد ، ويرصع بالجواهر ، وتشده المرأة بين عاتقيها وكشحيها] من أدم ، فسقط منها ، فانحطت عليه الحديا ، وهي تحسبه لحما . فأخذت ، فاتهموني به ، فعذبوني حتى بلغ من أمرهم أنهم طلبوا في قبلي ! فبيناهم حولي وأنا في كربي ، إذ أقبلت الحديا حتى وازت برؤسنا ثم ألقته ، فأخذوه ، فقلت لهم : هذا الذي اتهمتموني به ، وأنا منه بريئة . ح/٦/١٧٠ . ح/١/٤٢٦ . وفيه : فالتمسوه ، فلم يجدوه ، قالت : فاتهموني به ، قالت فطفقوا ، يفتشون حتى فتشوا قبلها .

(١) دانەر ـ خ ـ تەرجەمەی (ئەثەر)ەكەی نەنووسی ، ئەمە تەرجەمەكەيەتی : سەعيدی كوڕی موسەييەب لە باپيريەوە دەگێڕێتەوە كە فەرموويەتی : لە سەردەمی جاهيليەتا لافاوێك هات نێوانی دوو كێوی داپۆشی . سوفيان وتی : عەمری كوڕی دينار ئەڵێ : ئەم قسەيە بەسەرهاتێكی درێژی هەيە .

**ته‌رجه‌مه :**

عائیشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئه‌فه‌رموێ : ژنێكی ره‌شی جاریه‌ی به‌عزێ له‌ عه‌ره‌ب موسوڵمان بوو ، له‌ مزگه‌وتی نه‌به‌وی‌یا ـ علیه الصلاة والسلام ـ هۆده‌یێكی بچكۆلانه‌ی بوو ، له‌وێدا ئه‌بوو ، جارجارێ ئه‌هاته‌ لامان ، قسه‌ی ئه‌كرد ، كه‌ له‌ قسه‌كه‌ی ئه‌بۆوه‌ ئه‌م به‌یته‌ی ئه‌خوێنه‌وه‌ :

رۆژی حه‌مایه‌ڵ له‌ شتانی عه‌جیبی خوایه . خه‌به‌رتـان بده‌مێ ! خوا له‌ شاری كوفر ـ كه‌ مه‌ككه‌ بوو له‌و زه‌مانه‌دا ـ نه‌جاتی دام .

هه‌موو جارێ ئه‌م به‌یته‌ی ئه‌خوێنه‌وه‌ ، كه‌ خوێننه‌وه‌ی به‌یته‌كـه‌ی زۆركرد حه‌زره‌تی عائیشه‌ ـ رضي الله تعالى عنها ـ لێی پـرسی : رۆژی ویشـاح چیه‌ ؟ وتی : رۆژێ كچێكی بچكـۆلانه‌ی بـه‌عزێ ئـاغاكـانم [تازه‌بووك بوو] حه‌مایه‌لێكی له‌ ملا بـوو له‌ [مێشنێكی(!)] [سـوور ، به‌جه‌واهێر رازێنرابووه‌وه‌ ، چوو غوسڵ بكا ، جله‌كانی داكه‌ن ، ئه‌ویشی دانا ، یا] لێی كه‌وت . كۆللاره‌یێ وای زانی كه‌ گۆشته‌ رفانی . وایان زانی كه‌ من بردوومه‌ ، عه‌ذابیان دام ، بۆی گه‌ڕان ، تاكو فه‌رجیشم گه‌ڕان ! ئێشتـا ئه‌وان لـه‌ ده‌ورو پشتم بوون ، منیش لـه‌ غه‌می خـۆما بـووم ، ئـه‌وه‌ندم زانی كـۆللاره‌كـه‌ هـات تـا لـه‌ عـاستی سـه‌رمـان وه‌ستـا ، حه‌مایه‌له‌كه‌ی فرێدایه‌ خوارێ‌و هه‌ڵیان‌گرت . وتم : ئـه‌وه‌یه‌ كـه‌ ئێوه‌ بوهتانتان به‌ من ئه‌كردو منیش لێی به‌ری بووم .

[له‌ دوای ئه‌و حادیثه‌یه‌ هات موسوڵمان بوو ، خذمه‌تی مه‌سجیدی ئه‌كرد ، تا له‌وێدا وه‌فاتی كرد . ـ رضي الله تعالى عنها ـ ]

**١١٤٢/٢٦٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ أصدق كلمة قالها الشاعر كلمة لبيد [رضي الله تعالى عنه ـ أسلم مع قومه بنو جعفر] :**

ألا كل شيْ ما خلا الله باطلٌ
[وكل نعيم لا محالة زائل
ذهب الذين يعاش في أكنافهم
وبقيت في خلف كجلد الأجرب .[1]
فقالت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ : يرحم الله لبيدا كيف لو أدرك زماننا هذا ؟ ! وقال له عمر ابن الخطاب : أنشدني شيئا من شعرك ! فقال : ما كنت لأقول شعرا بعد أن علمني الله البقرة وآل عمران . وتوفي في خلافة عثمان ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن مائة وأربعين سنة . وهو القائل :
ولقد سئمت من الحياة وطولها
وسؤال هذا الناس : كيف لبيد ؟]
وكاد أمية بن أبي الصلت أن يسلم . ح/٦/١٧١ ـ. م/في الشعر . ت ، جه .

تەرجەمە :

ئەبوهورەيرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : راسترینی ئەو قسانەی کە شاعیر وتوویەتی ئەوەیە کە لەبید وتوویەتی کە مەعنای وایە :
درۆیە هەموو شت بە غەیری خوا
هەموو نیعمەتێ رائەبووریۆ و ئەڕوا

(١) ئەم بەیتەی دوەم پەیوەندیی بە بەیتی یەکەمەوە نی یەو کێش و قافیەیشیان جیایە ، ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتەکەی دواییدا پەیوەندییان بە باسەکەوە هەیەو قەسطەلانی نووسیوێ .

حەزرەتی عائیشە کە ئەو شیعرەی لەبیدی خوێنەوە ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە مەعنای وەهایە :

ئەوانەی خەڵق لە ژێر سایەی ژیاون
هەموو رۆییون و ئێستە نەماون

یاخۆ : ئەوانەی لە سایەی ئەوانا خەڵق ئەژین
هەموو رۆییون و دوای ئەوان دەرکەزین
ئەوانەی دوای ئەوان ماون هەموو گەڕ
لە حەق دوورن ، هەموو کوێرن هەموو کەڕ

فەرمووی : ئەگەر لەبید بمایە تا ئێستەکە ئەیوت چی ؟

حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ = بە لەبیدی = فەرموو : بۆچی لە شیعری خۆت نەختێکمان بۆ ناخوێنیەوە ؟ فەرمووی : دوای ئەوەی کە خوا ـ عز وجل ـ سوورەتی (البقرة)و (ئالی عیمران)ی فێرکردم حەز ناکەم کە شیعر بخوێنمەوە .

صەدو چل ساڵی عومر بوو ، لە خەلافەتی ئیمامی عوثمانا وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ .

نزیك بـوو کە ئـومەییـەی کوڕی صـەلت موسـوڵمان بێ ، [لـە جاهیلیەتا عیبادەتی ئەکرد ئیمانی بە ئاخیرەت بوو گەیی بە وەقتی بەعثەتا ئەمما موسوڵمان نەبوو] .

## القسامة في الجاهلية

١١٤٣/٢٦٦ عن عكرمة عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - قال : إن أول قسامة كانت في الجاهلية لفينا - بني هاشم - ؛ كان رجل من بني هاشم [عمرو بن علقمة بن المطلب] إستأجره رجل من قريش [خداش بن عبدالله بن أبي قيس العامري] من فخذ أخرى فانطلق معه في إبله فمر رجل به من بني هاشم قد انقطعت عروة جوالقه ، فقال : أغثني بعقال أشد به عروة جوالقي لا تنفر الابل ، فأعطاه عقالا ، فشد به عروة جوالقه ، فلما نزلوا عقلت الابل إلا بعيرا واحدا . فقال الذي استأجره : ما شأن هذا البعير لم يعقل من بين الابل ؟ قال : ليس له عقال . قال : فأين عقاله ؟ [فاخبره بما فعله . كما في أخرى] . قال : فحذفه بعصا كان فيها أجله .

فمر به رجل من أهل اليمن ، فقال : أتشهد الموسم ؟ قال : ما أشهده ، وربما شهدته . قال : هل أنت مبلغ عني رسالة مرة من الدهر ؟ قال : نعم . قال : فكنت إذا أنت شهدت الموسم فناد : يا آل قريش . فإذا أجابوك فناد يا آل بني هاشم . فإن أجابوك ، فاسأل عن أبي طالب ، فأخبره أن فلانا قتلني في عقال . ومات المستأجر .

فلما قدم الذي استأجره أتاه أبو طالب ، فقال : ما فعل صاحبنا ؟ قال : مرض ، فأحسنت القيام عليه ، فوليت دفنه ، قال : قد كان أهل ذاك منك . فمكث حينا ، ثم إن الرجل الذي أوصى إليه أن يبلغ عنه وافى الموسم . فقال : يا آل قريش . قالوا : هذه قريش . قال : يا آل بني هاشم . قالوا : هذه بنو هاشم . قال : أين أبو طالب ؟ قالوا : هذا أبو طالب . قال : أمرني فلان أن ابلغك رسالة ان فلانا قتله في عقال ،

فأتاه أبو طالب ، فقال : إختر منا إحدى ثلاث : إن شئت أن تؤدي مائة من الابل ، فإنك قتلت صاحبنا ، وإن شئت حلف خمسون من قومك أنك لم تقتله ، فإن أبيت قتلناك به . فأتى قومه ، فقالوا : نحلف . فأتته امرأة من بني هاشم [زينب أخت المقتول] كانت تحت رجل منهم قد ولدت له [حويطبا] فقالت : يا أبا طالب أحب أن تجيز ابني هذا برجل من الخمسين ولا تصبر يمينه حيث تصبر الأيمان [بين الركن والمقام] ففعل . فأتاه رجل منهم ، فقال : يا أبا طالب أردت خمسين رجلا أن يحلفوا مكان مائة من الابل ، يصيب كل رجل بعيران ، هذان بعيران فاقبلهما عني ولا تصبر يميني حيث تصبر الأيمان ، فقبلهما ، وجاء ثمانية وأربعون [فحلفوا بين الركن والمقام] .

قال ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - : فوالذي نفسي بيده ما حال الحول ومن الثمانية والأربعين عين تطرف . ح/٦/١٧٣ .

[وابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - ولد بعد ذلك بزمان طويل .]

تەرجەمە :

ئیبن و عەباس - رضي الله تعالى عنهما - فەرمووی : ئەوەڵ قەسامەتێ کە لە زەمانی جاهیلیەتا بوو لە ئێمەدا بوو کە بەنی‌هاشمین ، پیاوێ لە بەنی هاشم کە عەمری کوڕی عەلقەمەی کوڕی (مطلب) بوو ، پیاوێ لە فیرقەیێکی تری قورەیش کە ناوی خیداش بوو بەکرێی گرت لەگەڵیا ، لەگەڵ وشترەکانیا چوو بۆ شام . لە رێ پیاوێکی لە بەنی‌هاشم پێگەیی ، قوڵفی جەواڵەکەی بچڕابوو ، پێی وت : فریام کەوە عەقاڵێکم بدەرێ کە قوڵفی جەواڵەکەمی پێ قائیم کەمەوە تا وشترەکەم نەسڵەمێتەوە . ئەشکێڵێکی دایە ، قوڵفی جەواڵەکەی پێ بەستەوە ، کە

باریان خست وشترەکانی ئەشکێڵ کرد ، یەکێکی بێ ئەشکێڵ مایەوە ، ئەوی بەکرێی گرتبوو لێی پرسی : ئەو وشترە بۆچ ئەشکێڵ نەکراوە ، وتی : عەقالی نی یە . وتی : ئەی عەقالەکەی چی لێ هاتوە ؟ خەبەری دایە . عەصایێکی بەدەستەوە بوو بۆی هاویت ، ئەجەلی بەوەوە بوو [ئەو لەوێ مایەوە ، خیداش باری کردو رۆیی] .

پیاوێ لە ئەهلی یەمەن بەوێدا رابـورد عەمـر پێی وت : حازری مەوسیم ئەبی یان نا ؟ وتی : حازری نابم ، فەقەط زۆر جـار حازری ئەبم . = عەمر بە کابرای رێبـواری یەمـەنی وت = : رۆژێ لە رۆژان خەبەرێ لە منەوە ئەگەیێنی ؟ وتی : بەڵێ ئەیگـەیێنم . وتی : حازری مەوسیم [یەعنی حـەج]بووی بـانگ بکـە : ئەی ئـالی قورەیش ، کـە جوابیان دایتەوە بانگ‌کە : ئەی ئالی بەنی‌هاشم . کە جوابیـان دایتەوە ئەبوطالیبیان لێ بپرسە ، خەبەری بدەرێ کە : فڵان ـ یەعنی خیداش ـ لەسەر عەقالێ منی کوشت .

بەکری گێراوەکە مرد ئەوی کە بەکرێی گرتبوو ـ یەعنی خیداش ـ کە چووەوە مەکە ئەبوطالیب چوە لای لێی پرسی : رەفیقەکەمان چی لێ هات ؟ وتی : نەخۆش کەوت ، زۆر چاك بەسەریەوە وەستام ، مردو دفنم کرد . ئەبوطالیب وتی : ئەهل بوە بۆ ئەو موعامەلەی کە لەگەڵت کردوە . موددەیێکی پێ چوو ئەو پیاوە کە عەمر وەصیەتەکەی لە لا کرد کە خەبەری بدا بە قـەومەکـەی چوو بـۆ حەج ، بـانگی کرد : ئـەی ئالی قورەیش ! وتیان : ئەمە قـورەیشە . بـانگی کرد : ئـەی ئالی هـاشم ! وتیان : ئەمە ئالی هاشمە . وتی : ئەبوطالیب لەکوێیە ؟ وتیان : ئەمـە ئەبوطالیبە . وتی : فڵان ـ یەعنی عەمر ـ ئەمری پێ کردووم کە خەبەری ئەوەت بدەمێ کە فڵانەکەس خیداش کوشتویەتی .

ئـەبوطـالیب چـوە لای خیـداش لێی پـرسی ، ئینکـاری کـرد . پێی وت : لە بەینی سێ شتا موخەییەر بە : یا صەد وشتر (دیە)ی عەمر بدە ، یا پەنجا کەس لە قەومەکەت سوێن بخۆن کە تۆ نەتکـوشتوە . ئەگەر یەکێ لەم دوانەت نەکرد لە خوێنی عەمرا ئەتکوژینەوە . خیداش چوو بە قەومەکەی خۆیی وت ، قەومەکەی وتیان : سوێن ئەخۆین . ژنێ لە بەنیهاشم ناوی زەینەب بوو ، خوشکی مەقتولەکە بوو ، ژنی پیاوێ بوو لە قەومی قاتیلەکە ، کوڕێکی لێی بووبوو ناوی (حـویطب) بوو ، چوو بە ئەبوطالیبی وت : وا حەزەکەم کە (حویطب) لە سوێندان عەفو بکەی بە پیاوێکی تر لە پەنجاکەو [مەعنای ئەمەمە نەزانی ، وەك نووسراوە مەعنام لێدایەوە تەصحیحی بکەن][1] سوێنی لەسەر تەغلیظ مەکە لەو جێیەی کـە سوێنی (مغلظ)ەی لێ ئـەخورێ یـەعنی لە بـەینی (روکن)و (مەقام)ا . ئەبوطالیب رجاکەی قەبووڵکرد ، یەکێکی تر هات پێی وت : تۆ لە باتی صەد وشتر پەنجاکەس سوێن ئەدەی ، هەر پیاوی دوو وشتری بەرەکەوێ ، ئەمە دوو وشتر لێم قەبووڵ بکەو لەو جێگەیەی کـە سوێنی تیـا قورس ئـەکرێ سـوێندم لـەسـەر گـران مـەکـە . دوو

(١) وا بزانم ماناکەی زۆر گران نییەو ، بەرو دوای قسەکان یەك بخرێ ماناکەی بەم شێوە دەرەکەوێ : «ژنەکە هاتە لایی و وتی : وا بزانـە ئەم کـوڕی منە یەکێکە لەو پەنجا کەسـەی کە سـوێنیان دەدەیی و ـ رەنگیشـە هەر لـە ناو هۆزەکەدا بە یەکێك لە پەنجاکـەیان دانـابێ و ، دایکەکـەی دەسپێشکەریی کردبێ و زوو فریای کەوتبێ ـ بەڵام لە بەر خزمایەتی من لەگەڵ خۆتانا کوڕەکەم ببەخشەو سوێنی مەدە . کابرایش تکاکەی گـرت و کوڕەکـەیی بەخشی .» بەڵگەی ئەم مانایش ئەوەیە کە دوایی هـەر (٤٨) کەسی سـوێن دا ، واتە کوڕەکەی ئەو یەکێکیان و ، کابرای خاوەنی دوو وشتریش ئەوی دیکەیان .

وشترەکەیشی لەو قەبووڵ کرد ، چل و هەشت کەس مانەوە ، لە بەینی روکن و مەقاما سوێنیان خوارد .

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنە ـ فەرمووی : ساڵی تێوەرنەسووڕایەوە لەو چل و هەشت کەسە یەکێکیان نەمایەوە کە چاو بترووکێنێ . بەوە خیداش لە خوێنی مەقتوولەکە بەریی بوو ، فەقەط قەومەکەیشی بە قڕ دا ، میراتیان هەموو بە (حویطب) برا .

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنە ـ لەو وەختەدا ئاگای لە هاتنەدنیایش نەبوە ، ئەمە لە پێش بیعثەتا بوە ، ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنە ـ سێ ساڵ لە پێش هیجرەتا تەشریفی هاتۆتە دنیاوە ؛ چونکی صەحابی یەو ئەمەیش شتێك نی یە بە عەقڵ بزانرێ ، ظاهیر وایە کە لە پێغەمەری بیستبێ ـ ﷺ ـ .

ئەم قەسامەتە حوکمی لە ئیسلامەتیشا باقی یە . (كما يأتي ـ إن شاء الله تعالى ـ في الدية) .

**١١٤٤/٢٦٧ عن عمرو بن ميمون [رحمه الله ، مخضرم ، اسلم زمن النبي ـ ﷺ ـ ولم يره] قال : رأيت في الجاهلية قردة إجتمع عليها قردة قد زنت ، فرجموها ، فرجمتها معهم . ح/٦/١٧٥ .**

**تەرجەمە :**

عەمری کوری مەیموون [رحمه الله ـ (مخضرم)ە[1] ، لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ موسوڵمان بوە ، ئەمما پێغەمەری ـ ﷺ ـ نەدیوە] ئەفەرموێ : لە زەمانی جاهیلیەتا مەیموونێکم دی زینای کردبوو ،

(١) (مخضرم) بە کەسێك دەوترێ دوو چەرخ و سەردەمی جیای دیبێ ، واتە ئەم عەمرە سەردەمی جاهیلیەت و ئیسلامەتی دیوە .

مەیموونی تری لێ کۆبوویەوە رەجمیان کرد ، منیش لەگەڵ ئەوانا رەجمم کرد .

[ئیسماعیلی وای لێ ریوایەت ئەکا کە عەمر وتی : من لە یەمەن بووم ، لە ناو گەلەیێ مەری خۆمانا بووم ، لەسەر جێیەکی بەرز بووم ، مەیموونێکی نێرو مەیموونێکی مێ هاتن ، مەیموونە مێیەکە دەستی کرد بە سەرین بۆ مەیموونە نێرەکە ، مەیموونە نێرەکە نوست ، مەیموونێکی لەو بچووکتر هات دەستی مەیموونە مێیەکەی گوشی ، مەیموونە مێیەکە بە هێواش دەستی لە ژێر سەری جووتەکەی هێنایەدەرێ ، شوێن مەیموونەکەی تر کەوت ، چاوم لێبو کە لەگەڵیا دروست بوو . لە دواییدا گەڕایەوە ، لەو وەختەدا کە خەریك بوو دەستی بخاتەوە ژێر سەری مێردەکەی خۆی ، مێردەکەی راپەڕیو خەبەری بۆوە ، بۆنی کرد بە مەیموونە مێیەکەوە بە دەنگێکی بەرز نەڕەیێکی کرد . مەیموونی تری لێ کۆبوەوە ، مەیموونە نێرەکە ئەی‌نەڕان‌و ئیشارەتی مەیموونە مێیەکەی ئەکرد . مەیموونەکان بەراستەو چەپەدا بڵاوەیان لێ‌کرد . لە دواییدا مەیموونەکەیان[1] دۆزی‌یەوەو هێنایان من ناسیمەوە . چاڵێکیان بۆ هەڵکەن نایانە ناوی‌و رەجمیان کرد . عەمر ئەڵێ : لە غەیری بەنی ئادەما رەجم دی . قسطلاني . ٦/١٧٦] .

(١) دیارە مەبەست ئەوەیە بۆ مەیموونە نێرەکە گەڕاون کە کەتنەکەی کردو رۆیی ، واتە ئەوەی رەجم کراوە مەیموونە نێرە زیناکەرەکە بوە .

# مؤاخاة النبي = بين أصحابه =

- عليه الصلاة والسلام ، وعليهم الرضوان -

١١٤٥/٢٦٨ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - آخى بين أبي عبيدة الجراح وبين أبي طلحة . - رضي الله تعالى عنهما - . م/٩/٤٢٣ .

تەرجەمە :

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئـەفەرمـوێ : پێغەمـەر - ﷺ - دەستەبرايەتيى گرت بە ئەبـوعوبـەيدەی کـوڕی جەڕاح و ئـەبوطـەلحە - رضي الله تعالى عنهما - .

دەستەبرايەتی لە بەينی موسـوڵمانـانا سـوننەتـە ، خێريـان خێرو شەڕيان شەڕ . ئەمما هەيهات ! ئێمە خێرمان لـە زەرەری برای دينيـدا ئەوێ ، با ئەو زەرەرەيش هيچ فايدەی بۆ ئێمە تيا نەبێ .

١١٤٦/٢٦٩ عاصم الأحول قال : قيل لأنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - : بلغك أن رسول الله - ﷺ - قال لا حلف في الاسلام ؟ فقال أنس - رضي الله تعالى عنه - : قد حالف رسول الله - ﷺ - بين قريش والأنصار في داره . م/٩/٤٢٣ . ح/٤/١٤٤ . وفي أخرى : في داري التي بالمدينة .

تەرجەمە :

لە ئەنەسيان پرسی - رضي الله تعالى عنه - : ئايا گەييوە بە تۆ کە پێغەمەر - ﷺ - فەرموويەتی : کە لە ئيسلامەتيدا سوێنخواريی نی‌يـە ؟ [يەعنی سوێن بخۆن بۆ يەکتری کە دۆستی دۆستی يەکتری بن و دوشمنی دوشمنی يەکتری بن ؛ لە زەرەرو نەفعا شەريك بن] ئەنەس - رضي الله

تعالى عنه ـ فـەرمووی : پێغـەمەر ـ ﷺ ـ لـە خانـووی خۆیـا ! یەعنی ئەنەس ـ سوێنی بە موهاجیرو ئەنصـار خوارد . لـە ریوایـەتەکـەی ترا ئەفەرموێ : لەو خانووی منەدا کە لە مەدینەیە .

هیچ سوێن خواردن و دەستەبرایەتیش لە بەینا نەبێ لە ئیمانا رابورد کە موسوڵمان برای موسوڵمانە .

موسوڵمان نابێ بە موسوڵمان تـا چی بۆ خـۆی ئەوێ ئـەوەیشی بۆ موسوڵمانی تر بوێ .

نیسبەتی ئیسلام لە نیسبەتی نەسەب بەقووەتترە .

١١٤٧/٢٧٠ عن جبير بن مطعم ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لاحلف في الاسلام ، وأيما حلف كان في الجاهلية لم يزده الاسلام إلا شدة . م/٩/٤٢٣ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە ئیسلامەتیدا سوێن خواریی نی یە .
هەر سوێنێ کە لە جاهیلیەتا بوە ئیسلامەتی بە قوەتتری ئەکا .

ظاهیر وایە مەعنای ئەوە کە سوێن لە ئیسلامەتیدا نی یە وابێ . پێی ناوێ بە قەرینەی ئاخری حەدیثەکە ؛ چونکی واجبـە لەسـەر هەمـوو موسوڵمان کە موعاوەنەتی موحتاج بە موعاوەنەت بکا .

## وصية النبي - ﷺ - بأهل مصر

١١٤٨/٢٧١ عن أبي بصرة عن أبي ذر - رضي الله تعالى عنه - يقول : قال رسول الله - ﷺ - : إنكم ستفتحون أرضا يذكر فيها القيراط ، فاستوصوا بأهلها خيرا ؛ فإن لهم ذمة [حرمة] ورحما ، فإذا رأيت رجلين يقتتلان في موضع لبنة فاخرج منها ، قال : فمر بربيعة وعبدالرحمن ابني شرحبيل بن حسنة يتنازعان في موضع لبنة فخرج منها . م/٩/٤٣٥ .
وفي رواية : ستفتحون مصر وهي أرض يسمى فيها القيراط ، فاذا فتحتموها فأحسنوا إلى أهلها ؛ فإن لهم ذمة ورحما ، أو قال : ذمة وصهرا . فإذا رأيت . . . الخ .

تەرجەمە :

ئەبوذەڕ - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : فەتحی ئەرزێك ئەكەن ، لە ریوایەتەكەی ترا : فەتحی میصر ئەكەن ، كە لەوێدا قیراطی تیایە ، بەوە خریدو فرۆخت ئەكەن ، دەرحەق ئەهلی میصر خێر تەوصی یە بكەن بە یەكتریی ؛ چونكی ئەوان لەگەڵ ئێوەدا عەهدو پەیمانیان - مەعنەوی یان(!) - هەیە ، رەحمی یەت لە بەینتانا هەیە . [چونكی دایكی ئیسماعیل كە هاجەرە - علیهما السلام - لەوانە] . لە ریوایەتەكەی ترا ئەفەرموێ : لەگەڵ ئەوانا پەیمان و زاوایی و خەسوو و خەزووریتان هەیە ؛ چونكی دایكی ئیبراهیم - علیه السلام - كە حەزرەتی ماری یەیە - رضي الله تعالى عنها - لەوانە . كە چاوتان بە دوو پیاو كەوت كە لەسەر جێگە خشتێ نیزاعیان بوو لێی بچنە دەرێ .
ئەبوذەڕ - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : رەبیعەو عەبدورەحمانی كوڕی شەرەحبیلم دی لەسەر جێگەخشتێ نیزاعیان كرد لێی

هاتمەدەرێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری دا بەمە کە میصر فەتح ئەکرێ ، لەوێدا لەسەر جێگەخشتێ نیزاع ئەبێ . . عەینی فەرموودەکەی هاتەدی .

دوو موعجیزەی گەورە . (صدق رسول الله ـ ﷺ ـ) .

خوا رووی (منور)ەکان رەش کا . (منور) لێرەدا لە قەبیلی (جلدت البعیر)[1] یە (فافهم) .

(١) (جلدت البعیر) : یانی وشترەکەم کەوڵکرد ، نەك کەوڵم بۆ کرد-دانەرمەبەستی ئەوەیە (منور)ەکان نا مونەووەرن !

# فضل أهل عمان

١١٤٩/٢٧٢ أبو برزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : بعث رسول الله ـ ﷺ ـ رجلا إلى حي من أحياء العرب ، فسبوه وضربوه . فجاء إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فأخبره ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لو أن أهل عمان أتيت ما سبوك وما ضربوك . م/٩/٤٣٦ .

تەرجەمە :

ئەبوبەرزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ پیاوێکی نارد بۆ لای عەشیرەتێ لە عەشائیری عەرەب [کە دەعوەتیان بکاتە سەر ئیسلامەتی] . جوێنیان پێداو لێیان دا ، هاتەوە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر بچوویتایە بۆ لای ئەهلی عومان نە جوێنیان پێ ئەدای نە لێیان ئەدای . یەعنی چونکی دڵنەرمن گوێگرن لە حەق .

تم ولله الحمد .

١٤/١٢/٩٤٠ شەممە .

ويليه السير والجهاد ـ إن شاء الله تعالى ـ لأنه من فضائله ـ عليه الصلاة والسلام ـ وفضائل أصحابه الكرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ أجمعين .

﴿إن الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة ؛ يقاتلون في سبيله فيَقتلون ويُقتلون ، وعدا عليه حقاً في التوراة والانجيل والقرآن ، ومن أوفى بعهده من الله ؟ فاستبشروا ببيعكم الذي بايعتم به . [وذلك هو الفوز العظيم . التائبون العابدون الحامدون السائحون الراكعون الساجدون الآمرون بالمعروف والناهون عن المنكر والحافظون لحدود الله] . وبشر المؤمنين﴾[1] براءة ، جزء : ١١ . ص ٣ . خ/٥/٣٠ .

قال ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - : الحدود : الطاعة . ح/٥/٣٠ .

ته رجه مه :

له شه وی عه قه به دا كه ئه نصار له مه وسیمی حه جا ته شریفیان ئه چێته خذمه ت پێغه مه ر - ﷺ - كه ته شریفی هیجره ت بكا بۆ مه دینه عه بدوڵلای كوڕی ره واحه - رضي الله تعالى عنه - عه رزی پێغه مه ر ئه كا - ﷺ - (یا رسول الله) : بۆ خوای خۆت چیمان له سه ر شه رط ئه كه ی ، بۆ خۆیشت چیمان له سه ر شه رط ئه كه ی بیكه . پێغه مه ر - ﷺ - فه رمووی : بۆ خوا ئه وه تان له سه ر شه رط ئه كه م كه باوه ڕی پێ بكه ن ، هیچ شتێكی نه كه ن به شه ریك . بۆ خۆیشم ئه وه تان له سه ر شه رط ئه كه م كه ماڵ و رۆحی خۆتان له چی موحافه ظه ئه كه ن منیش له وه موحافه ظه بكه ن . ئه نصار - رضي الله تعالى عنهم - عه رزیان كرد : (یا رسول الله) كه ئێمه ئه وه مان كرد چ ئه جرێكمان بۆ ئه بێ ؟ فه رمووی :

(١) التوبة ١٢ .

به‌هه‌شت . عه‌رزیان‌کرد : ئه‌م به‌یعه به‌یعیّکی به قـازانجه ، نـه لیّی په‌شیمان ئه‌بینه‌وه‌و نه طه‌ڵه‌بی ئه‌وه‌یش ئه‌که‌ین که تۆ په‌شیمان ببیه‌وه . ئه‌و وه‌خته ئه‌م ئایه‌ته نازل بوو . (قسطلاني بلا ذكر المأخذ) .

**ته‌رجه‌مه‌ی ئه‌م ئایه‌ته وایه :**

به ته‌حقیق خوا ـ عز وجل ـ به موقابیلی ئه‌مه که به‌هه‌شتیـان پیّ عه‌طا بفه‌رمویّ ماڵ‌و رۆحی موئمینانی له موئمینان کری ؛ ئه‌و موسوڵمانانه له ریّی خوادا کافر ئه‌کوژن[1] ، خۆیان ئه‌کوژریّن ، ئه‌و وه‌عده‌ی که خوا داویه‌تی به غه‌زایی وه‌عده‌ییّکی ثابیته له‌سه‌ر خوا ـ عز وجل ـ له ته‌وراتا ، له ئینجیلا ، له قورئانا . خوا قه‌راری داوه ، خولفی تیا نی‌یه ، کیّ هه‌یه که له خوا ـ عز وجل ـ وه‌عده‌به‌جیّهیّنه‌رتر بیّ ؟ که وابیّ به‌و به‌یعه‌ی که خوا له‌گـه‌ل ئیّوه‌یـا کردوه دڵخـۆش ببن ، ئه‌و بـه‌یعه قـازانجیّکی زۆر گه‌وره‌یه . ئه‌و موسوڵمانانه‌ی که خوا ـ عز وجل ـ ئه‌و به‌یعـه‌ی له‌گـه‌ڵ کردوون ئه‌و که‌سانه‌ن که تۆبه‌یان له هه‌موو گوناه کردوه که عیباده‌تی خوا ئه‌که‌ن ، که حه‌مدی خوا ئه‌که‌ن ، که به‌رۆژوو ئـه‌بن [یه‌عنی صـه‌بر ئه‌که‌ن له‌سه‌ر طاعات ، صه‌بر ئه‌که‌ن له شتی حه‌رام‌و مه‌کرووهـ ، هیچ موخاله‌فه‌ی ئه‌مر و نه‌هی خواو پیّغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ناکه‌ن ، به‌وه سه‌یاحه‌ت ئه‌که‌ن له مه‌له‌کووتی ئـه‌رزو ئاسمـانا رۆژبـه‌رۆژ ساعـه‌ت‌به‌ساعه‌ت ده‌ره‌جه‌یان ته‌ره‌قی ئه‌کا] روکووع ئه‌به‌ن ، سوجده ئه‌به‌ن [یه‌عنی نویّژی حه‌قیقی ئه‌که‌ن] ئه‌مر به چاکه ئه‌که‌ن ، نه‌هی له خراپه ئه‌که‌ن [یه‌عنی له

(١) دانه‌ر ـ خ ـ لیّره‌دا مانای (يقاتلون)ی له‌بیرچوه‌و تۆزیّك ماناکه‌یشی ره‌سا نی‌یه ؛ به‌م جۆره باشتر ده‌بیّ : «خوا گیان‌و ماڵی موسوڵمانانی لیّ کریون به‌مه که جه‌نگ بکه‌ن لـه ریّگه‌ی خـوادا جا لـه کافـران ده‌کوژن‌و لـه‌خۆیـان ده‌کوژریّ‌و . . . ئه‌نجام‌و پاداشی مامه‌ڵه‌یش به‌ڵیّنی به‌هه‌شته » .

دوای ئەمە کە خۆیان (تکامل)یان کرد ڕێگەی چاکەو خراپە بە ئینسان نیشان ئەدەن] حودوودێ کە خوا ئەمری پێ فەرموە لە دائیرەی ئەو سەرحەدو سنوورەدا حەرەکەت ئەکەن ، لەو خەتە ناچنەدەرێ ، ئەوانە مونمینن موژدە بدە بە هەموو مونمینان [بە ئەجرێکی عەظیم کە هەر عیلمی خوا ئیحاطەی گەورەیی ئەو ئەجرە ئەدا] .

[سیرەت : بە رەوشتو ئەخلاق ئەڵێن ، فوقەهاو (محدث)و عولەمای دینی هەموو ئیصطیلاحیان لەسەر ئەمەیە کە بۆ ئەبوابی جیهاد ئەڵێن : (سیر) چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە غەزاکانیا چە ئەحواڵێکی بوە ئەبوابی جیهاد لەو ئەحواڵانەی ئیستیخراج کراوە . جیهاد : بە زەحمەتکێشانو ماندوویەتیی ئەڵێن ، جیهادی بەدەنیو جیهادی نەفسی زەحمەتو مەشەقەتی زۆری تیایە .

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : حودوودی خوا ئیطاعەی خوایە ؛ چونکی خوا کە ئیطاعەی کرا ئەبێ ئینسان لە ئەمرو نەهیی نەچێتەدەرێ .

**١/ ١١٥٠ أبو سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قيل : يا رسول الله أي الناس أفضل ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : مؤمن يجاهد في سبيل الله بنفسه وماله ، قالوا : ثم من ؟ قال : مؤمن في شعب من الشعاب يتقي الله ويدع الناس من شره . ح/٥/٣٣ . م/٨/٩٣ ، د ، جه .**

**تەرجەمە :**

لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان پرسی : (یا رسول الله) چاکترینی خەڵق کێیە ؟ فەرمووی : موسوڵمانێکە کە لە ڕێی خوادا بە نەفسیو بە ماڵی موجاهەدە بکا . عەرزیان کرد : دوای ئەو ئەفضەل کێیە ؟ فەرمووی :

پیاوێکه که له ناو دووتوێی شاخێ له شاخانا ته‌قوای خوا بکا ، واز له خه‌ڵق بێنێ‌و شه‌ڕیان پێنه‌گه‌یێنێ .

**١١٥١/٢ أبو هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : سمعت رسول الله - ﷺ - يقول : مثل المجاهد في سبيل الله - والله أعلم بمن يجاهد في سبيله - كمثل الصائم القائم ، وتوكل الله [تكفل] للمجاهد في سبيله بأن يتوفاه أن يدخله الجنة ، أو يرجعه سالما مع أجر أو غنيمة ، [مع أجر] ح/٥/٣٣ . ن .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بوهوره‌یره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له پێغه‌مه‌رم - ﷺ - بیست ئه‌یفه‌رموو : ئه‌وی له رێی خوادا جیهاد بکا - خوا هه‌ر خۆی عیلمی هه‌یه به‌وه‌ی که له رێی خوادا موجاهه‌ده ئه‌کا ؛ چونکی هه‌ر ئه‌و عیلمی هه‌یه به نییه‌تی - مه‌ثه‌لی ئه‌و که‌سه وه‌کوو مه‌ثه‌لی ئه‌و که‌سه‌یه که به ده‌وام به‌ڕۆژوو بێ‌و هیچ ئیفطار نه‌کاته‌وه ، به شه‌و له نوێژا رابوه‌ستێ‌و هیچ نه‌نوێ . خوا - عز وجل - بوه به که‌فیل بۆ ئه‌و که‌سه‌ی که له رێی خوادا شه‌ڕ بکا که بیمرێنێ‌و بیخاته به‌هه‌شت یا له‌گه‌ڵ ئه‌جر به سه‌لامه‌تی بیگێڕێته‌وه بۆ جێی خۆی یا غه‌نیمه‌تی بداتێ له‌گه‌ڵ ئه‌جرا .

**١١٥٢/٣ أبو هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : جاء رجل إلى رسول الله - ﷺ - فقال : دلني على عمل يعدل الجهاد . قال : لا أجده . قال : هل تستطيع إذا خرج المجاهد أن تدخل مسجدك فتقوم ولا تفتر ، وتصوم ولا تفطر ؟ قال : ومن يستطيع ذلك ؟ قال أبو هريرة [موقوفا عليه هنا ، ومرفوعا في أخرى] إن فرس المجاهد ليستن في طِوَله فيكتب له حسنات ! ح/٥/٣٢ . ن .**

**ته رجه مه :**

پياوێ هاته خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - عه‌رزی‌کرد : (يا رسول الله) عه‌مه‌لێکم پێ نیشان بده که له‌گه‌ڵ غه‌زادا له ثه‌وابا به‌رابه‌ر بێ ؟ فه‌رمووی : نایدۆزمه‌وه . پێی فه‌رموو : ئایا ئه‌توانی که غه‌زایی چوه ده‌رێ بۆ غه‌زا تۆیش بچیته مزگه‌وتی خۆته‌وه له نوێژا رابوه‌ستیو هیچ سستێتی نه‌که‌ی ، به‌رۆژوو ببیو هیچ ئیفطار نه‌که‌یته‌وه ؟ عه‌رزی‌کرد : کێ ئه‌وه ئه‌توانێ ؟ ئه‌بوهوره‌یره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : ئه‌سپی غه‌زایی له‌و گوریسه‌دا که بۆی درێژ ئه‌کرێ له چایه‌را که بله‌وه‌رێ به ده‌وری خۆیا غار ئه‌کا ئه‌و غاره بۆ ئه‌و غه‌زایی یه به حه‌سه‌نات ئه‌نووسرێ .

١١٥٣/٤ عن أنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - يقول : كان رسول الله - ﷺ - يدخل على أم حرام بنت ملحان [وهي أخت أم سليم] فتطعمه ،وكانت أم حرام تحت عبادة بن صامت - رضي الله تعالى عنه - فدخل عليها رسول الله - ﷺ - فأطعمته ، وجعلت تفلي رأسه [وكانت منه ذات محرم ؛ لأن أم عبدالمطلب من بني النجار] فنام رسول الله - ﷺ - ثم إستيقظ وهو يضحك ، قالت : فقلت : وما يضحكك يا رسول الله ؟ قال : ناس من أمتي عرضوا علي غزاة في سبيل الله يركبون ثبج هذا البحر [محركا وسطه] ملوكا على الأسرة ، او مثل الملوك على الأسرة . - شك إسحاق - قالت : فقلت : يا رسول الله أدع الله أن يجعلني منهم ، فدعا لها رسول الله - ﷺ - ثم وضع رأسه ، ثم إستيقظ وهو يضحك ، فقلت : وما يضحكك يا رسول الله ؟ قال : ناس من أمتي عرضوا علي غزاة في سبيل الله - كما قال في الأول - قالت : فقلت : يا رسول الله أدع الله أن يجعلني منهم . قال : أنت من الأولين ، [فخرجت مع زوجها عبادة بن

الصامت غازيا أول ما ركب المسلمون البحر مع معاوية [في خلافة عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ] فلما انصرفوا من غزوهم قافلين فنزلوا الشام فضربت إليها دابة لتركبها ، فصرعتها فماتت . ح/٥/٤٠ . د ، ث ، ن . م ـ ٨/١٢٠ ح/ ـ ٥ ٨٠ ، ٨٨ . ] فركبت البحر في زمن معاوية بن أبي سفيان [أميرا من طرف عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ] فصرعت عن دابتها حين خرجت من البحر فهلكت. ح/٥/٣٤ .

٥/١١٥٤ عمير بن الأسود العنسي [من كبار التابعين] أتى عبادة بن الصامت ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهو نازل في ساحل حمص ، وهو في بناء له ومعه أم حرام ـ رضي الله تعالى عنها ـ قال عمير : فحدثتنا أم حرام أنها سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : أول جيش من أمتي يغزون البحر [هو جيش معاوية أميرا من طرف عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ] قد أوجبوا [المغفرة والرحمة] قالت أم حرام : يا رسول الله أنا فيهم ؟ قال : أنت فيهم .

ثم قال النبي ـ ﷺ ـ أول جيش من أمتي يغزون مدينة قيصر [يعني القسطنطينية ، وهو جند يزيد لعنه الله] مغفور لهم ، فقلت : أنا فيهم يا رسول الله ؟ قال : لا . [وفي ذلك الجند جماعة من سادات الصحابة ؛ كابن عباس ؛ وابن عمر ، وابن الزبير ، وأبي أيوب الانصاري ، ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] ح/٥/١٠٠ .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ زۆر ته‌شريفى ئه‌چوو بۆ لاى (أم حرام)ى پوورى ئه‌نه‌سى كورى ماليك ـ رضي الله تعالى عنهما ـ له‌وێ ته‌شريفى ئه‌نوست . (أم حرام) ـ رضي الله تعالى عنها ـ طه‌عامى ئه‌دا به پێغه‌مه‌ر

ـ ﷺ ـ عافێتی ئەکرد . دەفعەیێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە لای ، طەعامی دایێ خواردی . تەشریفی نوست . (أم حرام) سەری موبارەکی ئەدۆزیی . لە دواییدا پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری بۆوە پێ ئەکەنی ، (أم حرام) فەرمووی : عەرزم کرد : (یا رسول الله) بۆچ پێ ئەکەنی ؟ فەرمووی : بەعزێ ئینسانم لە ئوممەتی من پێ نیشان درا سواری ناوەڕاستی ئەم بەحرە ئەبن ، هەموو پادشان لەسەر تەخت دانیشتوون ، یا فەرمووی : وەك پادشان لەسەر تەختن . أم حرام ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : عەرزم کرد : (یا رسول الله) دۆعا بفەرموو کە خوا بمکا بە یەکێ لەوانە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوایا بیکە بە یەکێ لەوانە .

دووبارە پێغەمەر ـ ﷺ ـ سەری نایەوە لە دواییدا خەبەری بۆوە پێ ئەکەنی . عەرزم کرد : (یا رسول الله) بۆچ پێئەکەنی ؟ فەرمووی : بەعزێ ئینسان لە ئوممەتی من پێ نیشانم دران غەزا ئەکەن لە ڕێی خوادا . وەك ئەوەڵ جار چۆنی فەرموو ئەم جارەیش وای فەرمو . (أم حرام) فەرمووی : عەرزم کرد : (یا رسول الله) لە خوا طەڵەب کە کە بمکا بە یەکێ لەوانە. پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تۆ لەوانەی کە سواری بەحر ئەبن .

(أم حرام) لە زەمانی موعاویەی = کوڕی = ئەبوسوفیانا [کە لە طەرەفی ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ وە بە ئەمیری نێررا بۆ غەزای قوبروص لەگەڵ عوبادەی مێردی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەو سەرەوە کە گەڕانەوە بۆ شام حەیوانیان بۆ هێنا = کە سواری بێ = لە حەیوانەکە کەوتەخوارێ وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالى عنها ـ . [. . . .]

٦/١١٥٥ عن بريدة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان رسـول الله ـ ﷺ ـ إذا أمَّر أميرا على جيش أو سرية أوصاه في خاصته بتقوى الله ـ عز وجل ـ ومن معه من المسلمين خيرا ، ثم قال : أغزوا بسم الله في سبيل الله ، قاتلوا من كفر بالله ، أغزوا ولا تغلوا ، ولا تغدروا ، ولا تمثلوا ، ولا تقتلوا وليدا ، وإذا لقيت عدوك من المشـركين فـادعهم الى ثلاث خصال ، أو خلال ، فأيهن ما أجابوك فاقبل منهم وكف عنهم :

١ ـ ثم [زائد أو للترتيب الذكري] أدعهم إلى الاسلام ؛ فإن اجابوك فـاقبـل منهم ، وكف عنهم ، ثم [بعـد أن أسلمـوا] أدعهم إلى التحول من دارهم إلى دار المهاجرين ؛ وأخبرهم أنهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين وعليهم ما على المهاجرين ؛ فإن أبوا أن يتحولوا منها فأخبر أنهم يكونون أعراب المسلمين ، يجري عليهم حكم الله الـذي يجري عـلى المؤمنين ، ولا يكـون لهم في الغنيمة والفيئ شيً إلا أن يجاهدوا مع المسلمين .

٢ ـ فإن هم أبوا فسلهم الجـزيـة ؛ فـإن هم أجابـوك فاقبـل منهم ، وكف عنهـم .

٣ ـ فإن هم أبوا فاستعن بالله وقـاتلهم . وإذا حاصـرت أهل حصن فأرادوك أن تجعل لهم ذمة الله وذمة نبيـه [أي عهدهمـا] فلا تجعـل لهم ذمـة الله ولا ذمة نبيـه ،ولكن إجعل لهم ذمتك وذمة أصحابك ، فإنكم أن تخفر ذممكم وذمم أصحابكم أهون أن تخفـروا ذمة الله وذمة رسوله . [أخفرت : نقضت ، خفرت : وقيت . نووي] وإذا حاصرت أهل حصن فأرادوك أن تنزلهم على حكم الله فـلا تنزلهم على حكم الله ، ولكن أنزلهم على حكمك ، فإنك لا تدري أتصيب حكم الله فيهم أو لا ؟ م/٧/ ٣١٠ .

**تەرجەمە :**

بورەیدە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ یەکێکی بکردایە بە ئەمیری لەشکرێ یـا بە گـەورەی دەستەیـە کە لـە لەشکرەکەی جویئەکاتەوەو بە شـەو ئەیـان نێرێ بـۆ جێگەیێ . . بـۆ خوصووصی خۆی . . ئەمری پێ ئەفەرموو کە : تەقوای خوا بکا ، بۆ خوصووصی (معیة)[1] ەکەی ئەمری بەخەیری پێ ئەفەرموو ، لە دواییدا ئەیفەرموو : بە موعاوەنەتی ئیسمی خوا غەزا بکەن ، بۆخوا شەر بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە ئیمانیان بە خوا نییەو کافرن غەزا بکەن ، لە پێش تەقسیما لە غەنیمەت هیچ لامەدەن بۆ خۆتان ، غەدر مەکەن ، یەعنی عەهد هەڵمەوەشێنن ، لووت و گوێ مـەکەن ، منـاڵ مەکـوژن ، کە تووشی دوشمنی موشریك ببی دەعوەتیان بکەرە سەر سێ شت ، لـەو سێ شتە هەرکامێکیان لێ قـەبووڵ کـردی تۆیش لێیـان قەبـووڵ بکەو دەستیان مەکێشەرێ ، ئەو سێ شتە ئەوەیە :

(أولا) : دەعوتیان بکەرە سەر موسوڵمانەتی ، بۆ ئەوە ئیجابەتیان کردی لێیان قەبووڵ بکەو دەخڵیان مەکە . ئەگەر ئیسلامەتیان قـەبووڵ کـرد بانگیان کەرە سەر ئەوە کە لە داری کوفر نەقڵ بکەن بۆ ناو موهاجیرین ، خەبەریان بدەرێ کە ئەوەیان کرد لە خێرو نەفعا وەك موهاجیر ئەبن . ئەگەر ئەوەیان قەبووڵ نـەکرد خـەبەریـان بدەرێ کـە ببن بە عـەرەبی بادی‌یەنشینی موسوڵمانان ؛ ئەو ئەحکامەی بەسەر موسوڵمـانانـا ئەکـرێ بەسەر ئەوانیشا بکرێ لە غەنیمەتاو لە فەیئا ، یەعنی لەوەدا کـە بە بێ قووەتی سیلاح دەست موسوڵمانان ئەکەوێ هیچ بەشیان نەبێ ، مـەگەر

(١) (معیة) ئەوانەی کە لەگەڵیان ، واتە سەربازەکانی .

ئاوشانی موسوڵمانانی تر شەڕ لەگەڵ کافرانا بکەن ، ئەوە ئەو وەختە بەشیان ئەدرێتێ .
دوەم : ئەگەر ئیسلامەتیان قەبووڵ نەکرد داوای سەرانەیان لێ بکـە ، ئەگەر قەبووڵیان کرد لێیان قەبووڵ بکەو وازیان لێ بێنە .
سێیەم : ئەگەر ئەوەیشیان نەکرد لە خـوا موعـاوەنەت طـەڵەب بکـەو شەڕیان لەگەڵ بکە .

کە ئەهلی قەلایێکت موحاصەرە دا ئەهلەکەی طەڵەبی ئەوەیان لێ کردی کە بە عەهدی خواو رەسووڵی خوا عەهدیان لەگـەڵ بکەی بـەو نەوعە عەهدیان لەگەڵ مەکە ، بە عەهدی خۆت و رەفیقەکانت عەهدیان لەگەڵ بکـە ؛ چونکی وا ئـەبێ کە بـەعزێ نـاکەسـانیان ئـەو عەهـدە هەڵئەوەشێنن،هەڵوەشانی عەهـدی تۆو رەفیقـەکانت ئـەهوەنتـرە لەوە کەعەهدی خوا هەڵبوەشێنرێ . کە قەلایێکت موحاصەرەکرد ئەوەت لێ طەڵەب بکەن کە لەسەر حوکمی خوا لە قەلاکە بێنەخوارێ ـ مەیکە ، ئەمما لەسەر حوکمی خۆت بیانهێنەرە خوارێ ؛ چونکی تۆ نازانی لـە حوکمی خوادا ئیصابەتت کردوە یان نا !

یەعنی ئەوەڵەن ئیسلامەتیان لێ طەڵەب بکە کە قـەبووڵیـان کرد شـەڕیان لـەگەڵ مـەکە ، فـەقەط طـەڵەبی هیجـرەتیان لێ بکـە ، کە هیجرەتیان کرد لە حوقووقا وەك موسوڵمانی تر ئەبن ، ئەگەر هیجرەتیان نەکرد ببن بە ئەعرابی موسوڵمانان ؛ لە نەفعیان بێبەش ئەبن .
٢ ـ ئەگەر موسوڵمان نەبوون داوای سەرانەیان لێ بکە .[1]
٣ ـ ئەگەر سەرانەیان نەدا ئەمجا حەربیان لەگەڵ بکە .

(١) لێرەدا دوویات بوونەوە هەیە .

**فه‌وائيدى ئه‌م حه‌ديثه :**

١ ـ غه‌در ، يه‌عنى عه‌هدشكانن حه‌رامه .

٢ ـ له‌ پێش ته‌قسيما له‌ غه‌نيمه‌ت ماڵ‌هه‌ڵگرتن حه‌رامه .

٣ ـ منالْ‌كوشتن حه‌رامه ، ئه‌مما ئه‌گه‌ر شه‌ڕ بكه‌ن دروسته .

٤ ـ (موثله) يه‌عنى لووت‌و لێوو گوێ‌برين مه‌كرووهه .

٥ ـ ته‌وصيه‌ى ئيمام به‌ ئومه‌راى له‌شكر به‌ ته‌قواو به‌ حوسنى موعامه‌له‌ له‌گه‌ڵ ئه‌فرادى له‌شكرا سوننه‌ته . له‌ حه‌ربا چى لازم بێ سوننه‌ته پێنيشانيان بدا . (من نووي) .

١١٥٦/٧ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ زوج النبي ـ ﷺ ـ أنها قالت : خرج رسول الله ـ ﷺ ـ قبل بدر فلما كان بحرة الوبرة [موضع على نحو من أربعة أميال من المدينة] أدركه رجل قد كان يذكر منه جرأة ونجدة ، ففرح أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ حين رأوه ، فلما أدركه قال لرسول الله ـ ﷺ ـ : جئت لاتبعك وأصيب معك . قال رسول الله ـ ﷺ ـ : تؤمن بالله ورسوله ؟ قال : لا . قال : فارجع فلن أستعين بمشرك ! قالت : ثم مضى حتى إذا كنا بالشجرة أدركه الرجل فقال له كما قال أول مرة ، فقال له النبي [رسول الله] ـ ﷺ ـ كما قال أول مرة . قال : فارجع فلن أستعين بمشرك . قال : ثم رجع فأدركه بالبيداء فقال له كما قال أول مرة : تؤمن بالله ورسوله : قال : نعم . فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : فانطلق . م/٧/٤٧٦ .

**ته‌رجه‌مه :**

حه‌زره‌تى عائيشه‌ى حه‌ره‌مى پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ورضي عنها ـ ئه‌فه‌رموێ : كه‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفى برد بۆ به‌در كه‌ گه‌يى يه‌ شاخى (وه‌بره) ـ كه‌ چوار ميله‌ له‌ مه‌دينه‌وه‌ ـ پياوێكى مه‌شهوور به‌ ئازايى به‌

خدمەتی گەیی ، ئەصحابی کیرام ـ رضي الله تعالی عنهم ـ کە چاویان پێکەوت زۆر دڵخۆش بوون . ئەو پیاوە عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : کە هاتوومە خدمەتت تابیعی تۆ بم و لە خدمەتتا ئیستیفادەی غەنیمەتیش بکەم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : ئیمانت بە خواو پێغەمەری هەیە ؟ عەرزی‌کرد : نەء . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە وابێ بگەڕێرەوە من قەت لە موشریك موعاوەنەت طەڵەب ناکەم . پیاوەکە رۆیی تا ئێمە گەیینە لای (شجرة) [جێگەیێکە دارێکی لێیە] . دوویارە ئەو پیاوە بە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەیی وەك ئەوەڵجار کە عەرزی‌کرد دووبارە عەرزی‌کردەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەك لە ئەوەڵەوە جوابی دایەوە ـ جوابی دایەوە . فەرمووی : بگەڕێرەوە من لە موشریك موعاوەنەت طەڵەب ناکەم ، گەڕایەوە ، جاری سێیەم لە بەیدا بە خدمەتی گەیی‌یەوە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەك ئەوەڵجار فەرمووی : بڕوات هەیە بە خواو رەسوولی ؟ عەرزی‌کرد : بەڵێ : فەرمووی : کە وابێ لەگەڵمان بێ .

[لە حەدیثێکی ترا هەیە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە صەفوانی کوڕی ئومەییە ـ لە پێش موسوڵمان بوونیا ـ موعاوەنەتی طەڵەب کرد .

ئیمامی شافیعیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : ئەگەر موشریك صاحیب رەئی بێ دەرحەق موسوڵمانان ئیحتیاجیش ببێ بە موعاوەنەتی ـ موعاوەنەتی لێ طەڵەب ئەکرێ . وەك (إستعانە)بە صەفوان ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەگەر وا نەبێ ئیستیعانە لە موشریك کەراهەتی هەیە ، وەك لەم حەدیثەدایە .

شافیعیی و ئەبوحەنیفە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموون : کە کافر ئیذن‌درا کە لە حەربا لەگەڵ موسوڵمان بێ و موقابیل بە کوففار حەربی کرد . . وەك موسوڵمان بەشی نادرێتێ ، مەحروومیش ناکرێ ، کەمێکی

ئەدرێتێ .

زوهری و ئەوزاعی - رحمهما الله - ئەفەرموون : چی ئـەدرێ بە موسوڵمان بەوانیش ئەدرێ . جومهوور لەسەر مەذهەبی شافیعی و ئـەبو حەنیفەن . نووي] .

ئـەسەف بـۆ ئەوانـەی کە نـاویـان ئیسـلامـە ، بـە ئـەحکـامی شەرعی یەی موطەهھەرە ئەڵێن : ئەحکامی ئیبتیدائی و خستوویانـەتە پشتگوێوە !

**١١٥٧/٨ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - : من آمن بالله وبرسوله وأقام الصلاة وصام رمضان كان حقا على الله أن يدخله الجنة ، جاهد في سبيل الله أو جلس في أرضه التي ولد فيها . فقالوا : يا رسول الله أفلا نبشر الناس ؟ قال : إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيل الله ، ما بين الدرجتين كما بين السماء والأرض ، فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس ، فإنه أوسط الجنة [أي أفضلها] وأعلى الجنة أراه قال وفوقه عرش الرحمان ، ومنه تفجر أنهار الجنة . قال محمد بن فليح عن أبيه : وفوقه عرش الرحمان [بدون شك] ح/٥/٣٦ ، ت . ح/١٠/٣٨٥ .**

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هـەرکەسێ ئیمـان بێنێ بە خـواو پێغەمـەریۆ نوێـژ بکاو رەمەزان بەرۆژوو بێ [بە وەعدو کەرەم و فەضلی خوا] حەقە لەسەر خوا کە بیخاتە بەهەشتەوە ، حەزەکا لە رێی خوادا غەزا بکا یا لەو ئەرزە کە تێیا بەوەلەد بوە دانیشێ . عەرزیان کرد : (یا رسول الله) موژدە نەدەین بە خەڵق ؟ فەرمووی : لە بەهەشتا صەد دەرەجە هەیـە کە خـوا حازری

كردوە بۆ غەزايى لە ڕێی خوادا ، مابەينی هەر دوو دەرەجەيێكی وەكوو مابەينی ئەرزو ئاسمانە . كە بەهەشت لە خوا طەڵەب بكەن فيردەوسی لێ طەڵەب بكەن كە ناوەڕاستو چاكترينی بەهەشتەو بەرەوژوورترينی بەهەشتە .

يەحيای كوڕی صاڵح ، كە شێخی بوخاری‌يە ، ئەفەرموێ : وا ظەن ئەبەم كە فولەيح فەرمووی : لە ژوور فيردەوسەوە عەرشی رەحمانە . محەمەدی كوڕی فولەيح ئەفەرموێ : كە فولەيح فەرمووی : لە ژوور فيردەوسەوە عەرشی رەحمانە . محەمەد شەكی نەبوە لەو لەفظەدا ، يەعنی ئینسان با بە مەحضی ئیمانو نوێژ و رۆژوو بچێتە بەهەشتەوە ناگاتە دەرەجەی موجاهيد .

١١٥٨/٩ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لغدوة في سبيل الله أو روحة خير من الدنيا وما فيها . ح/٥/٣٧ . وعن سهل بن سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ بلفظ (أفضل) بدل (خير) ح ـ ٥/٣٧ . م ـ ٨/٨٤ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەيانیێ يا ئێوارێیێ[1] لە ڕێی خوا ئەوابی لە دنياو لە ئەوی لە دنيادايە چاكترە .

١١٥٩/١٠ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لقاب قوس في الجنة خير مما تطلع عليه الشمس وتغرب . وقال : لغدوة أو روحة في سبيل الله خير مما تطلع عليه الشمس وتغرب .

(١) دەبوو دانەر لێرەدا بيفەرموايە : چوونێ يا هاتنەوەيێ ، يا چوونێكی ئێوارەيێ يا بەيانیێ لە ڕێی خودا بۆغەزا . . .

ح/٥/٣٧ . م/٨/٨٥ عن أبي أيوب ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : میقداری قه‌وسێ له به‌هه‌شت چاکتره له‌وه‌ی که رۆژی له‌سه‌ر هه‌ڵبێ و رۆژی له‌سه‌ر ئاوا ئه‌بێ . به‌یانیێ یا ئێواریێ له رێی خوادا له‌وه چاکتره که رۆژی له‌سه‌ر هه‌ڵبێ و له‌سه‌ری ئاوا ئه‌بێ .

١١/١١٦٠ عن حميد [الطويل] قال : سمعت أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : ما من عبد يموت له عند الله خير يسره أن يرجع إلى الدنيا ، وأن له الدنيا وما فيها ، إلا الشهيد لما يرى من فضل الشهادة ، فإنه يسره أن يرجع الى الدنيا فيقتل مرة أخرى .[عشر مرات لما يرى من الكرامة . ح ـ ٥/٣٨ . م ـ /٨١] .

وسمعت أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لروحة في سبيل الله أو غدوة خير من الدنيا وما فيها ، ولقاب قوس أحدكم من الجنة ، أو موضع قيد ، يعني سوطه ، خير من الدنيا وما فيها . ولو أن امرأة من أهل الجنة اطلعت أهل الأرض لأضاءت ما بينهما ولملأته ريحا ، ولنصيفها [أي : خمارها] على رأسها خير من الدنيا وما فيها . ح/٥/٣٨ .

[وعن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : خلقت الحور العين من أصابع رجليها إلى ركبتيها من الزعفران ، ومن ركبتيها إلى ثديها من المسك الاذفر ، ومن ثديها الى عنقها من العنبر الأشهب ، ومن عنقها من الكافور الأبيض .

وعند الطبراني من حديث أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ مرفوعا

للنبي ـ ﷺ ـ عن جبريل : لو أن بعض بنانها بـدا لقلب ضوؤه ضـوء الشمس والقمر ! ولو أن طاقة من شعرها بدت لملأت ما بين المشـرق والمغرب من طيب ريحها الحديث : قسطلاني ٥/ ٣٩ . ]

**ته‌رجه‌مه :**

حه‌مید ـ رحمه الله ـ ئه‌فه‌رموێ : له ئه‌نه‌سی کوڕی مالیکم بیست ـ رضي الله تعالى عنه ـ له پێغه‌مه‌ره‌وه ـ ﷺ ـ ریوایه‌تی ئه‌فه‌رموو : که پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : غه‌یری شه‌هید هیچ عه‌بدێ نی‌یه بمرێت و له خذمه‌ت خوادا ئه‌وابێکی بێ و حه‌زکا بێته‌وه دنیا ، به‌و شه‌رته که دنیاو مافیهای دنیای ببێ ، فه‌قه‌ط شه‌هیـد مه‌منـوون ئه‌بێ کـه بێته‌وه دنیـاو ده‌فعه‌یێکی تر بکـوژرێ ؛ چونکی چـاوی ئه‌کـه‌وێ به‌وه کـه فه‌ضـلی شه‌هیدیی چه‌نده زۆره . له ریواته‌که‌ی ترا : ده ده‌فعه بکوژرێ ، له‌به‌ر ئه‌و که‌رامه‌ته‌ی که ئه‌یبینێ .

حه‌مید ئه‌فه‌رموێ : که له ئه‌نه‌سی کوڕی مالیکم بیست ـ رضي الله تعالى عنه ـ له پێغه‌مـه‌ره‌وه ـ ﷺ ـ ریوایـه‌ت ئه‌کـا ـ عليه الصـلاة والسلام ـ که فه‌رمووی : به‌یانییێ یا ئێوارێیێ له رێی خوادا غه‌زاکردن له دنیاو مافیها چاکتره . جێێ که‌وانێکی یه‌کێ له ئێوه له به‌هه‌شت ، یا فه‌رمووی : جێی قه‌مچییێکی یه‌کێ لـه ئێوه لـه به‌هـه‌شت له دنیـاو له مـافیهای چاکتره ! ئه‌گه‌ر ژنێ له ئه‌هلی به‌هه‌شت خۆی ده‌ربخا بۆ ئـه‌هلی ئـه‌رز مابه‌ینی ئه‌رزو ئاسمان رووناك ئه‌کاته‌وه ، پڕی ئه‌کا لـه بۆنی خـۆش ، سه‌رپۆشی سه‌ری چاکتره له دنیاو مافیها .

له قه‌سـطه‌لانیدا لـه ئیبن و عه‌بـاسه‌وه ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ ریوایه‌ت ئه‌کا که فه‌رموویه‌تی : که (حور العين) له په‌نجه‌ی پێیـه‌وه تا

ئەژنۆی لە زەعفەران ، لە ئەژنۆیەوە تا مەمکی لە میسکی خالیص ، لە مەمکیەوە تا ملی لە عەنبەری رەش و سپی ، کە سپێتی یەکەی لە رەشێتی یەکەی زیاتر بێ ، لە ملیەوە لە کافووری سپی دروست کراوە .

یەعنی وەك ژنی دنیا لە گڵ دروست نەکراوە .

طەبەرانی ـ رحمه الله ـ لە حەدیثی ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەوە بە مەرفووعیی لە پێغەمەرەوە ، ئەویش لە جیبریلەوە ـ عليهما الصلاة والسلام ـ ریوایەت ئەکا : ئەگەر بەعزێ پەنجەی (حور العين) دەربکەوێ رووناکی ی ئەو لە رووناکیی مانگ و رۆژ بەشەوقتر ئەبێ ، ئەگەر تەنها موویێکی دەربکەوێ بۆنی خۆشی مابەینی مەشریق و مەغریب پڕ ئەکا ! قسطلاني] .

١١٦١/١٢ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قيل للنبي ـ ﷺ ـ : ما يعدل الجهاد في سبيل الله ؟ قال : لاتستطيعوه . قال : فأعادوا عليه مرتين أو ثلاثا ، كل ذلك يقول : لاتستطيعوه ، قال في الثالثة : مثل المجاهد في سبيل الله كمثل الصائم القائم القانت [المطيع العامل] بآيات الله لا يفتر من صيام ولا صلاة حتى يرجع المجاهد في سبيل الله تعالى . م/٨/٨٢ .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : عەرزی پێغەمەر ـ ﷺ ـ کرا : کە چە عەمەلێ بە قەد غەزا لە رێی خوادا ئەجری هەیە ؟ فەرمووی : ناتوانن بیکەن . دوو جار یا سێ جار ئەو سوئالەی عەرزکرا ، لە هەموو جارێکا ئەیفەرموو : ناتوانن بیکەن . لە دەفعەی سێیەما فەرمووی : مەثەلی ئەوەی کە لە رێی خوادا غەزا بکا وەك مەثەلی

ئەو كەسەيە كە بەرۆژووبێو لە نوێژا بێ ، موطيعی ئەمرو نەهی خوا بێ ، نە لە نوێژا نە لە رۆژووا سستی نەكا تا ئەو كەسەی كە لە رێی خوادا چوە بۆ غەزا ئەگەڕێتەوە .

چونكی ئەوی كە ئەچێ بـۆ غەزا نـوستنی ، خواردنی ، ذەوقو صەفاكردنی ، رۆیینی ، دانیشتنی ، هەر دەقیقەو ثانێكی . . . بە غەزا حسێبە . ئەوی كە عیبادەت بكا ئەویش ئەبێ بە دەوام لە عیبادەتا بێ تا ئەو بێتەوە لەگەڵ ئەمەدا ئەم لە ماڵی خۆیا بە بێ ترس دانیشتوە ، ئەو بە دەوام لە مەعرەضی هیلاك بوونایە . ئەمجا بزانە غەزا لـە رێی خوادا چـەندە گەورەیە كە لە ئەفضەلی ئەعمال گەورەترە] .

١١٦٢/١٣ نعمان بن بشير ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت عند منبر رسول الله ـ ﷺ ـ فقال رجل : مـا أبالي أن لا أعمـل عملا بعـد الاسلام إلا أن أسقي الحاج . وقال آخر : ما أبالي أن أعمل عملا بعد الاسلام إلا أن أعمر المسجد الحرام . وقال آخر : الجهاد في سبيل الله أفضـل مما قلتم ، فـزجرهم عمـر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ . وقـال : لاترفعوا أصواتكم عند منبر رسول الله ـ ﷺ ـ وهو يوم الجمعة ، ولكن إذا صليت الجمعـة دخلت فـأستفتيـه فيـما اختلفتم فيـه ، فـأنـزل الله ـ تعالى ـ : ﴿أجعلتم سقاية الحاج وعمارة المسجد الحرام كمن آمن بالله واليوم الآخر ؟ . . الآية إلى آخرها . [وجاهد في سبيل الله ؟ لايستوون عند الله ، والله لايهدي القوم الظالمين﴾[1] براءة ص : ٣] م/٨/٨٣ .

تەرجەمە :

نوعمانی كوڕی بەشیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمـووی : لای

(١) التوبة /١٩

مینبەری پێغەمەرەوە بووم ـ ﷺ ـ پیاوێ وتی : لە دوای موسوڵمانەتی باکم نی‌یە کە هیچ ئیشێکی خەیر نەکەم غەیری ئەوە کە ئاو بدەم بە حاجی‌یان . یەکێکی تر وتی : لە دوای ئیسلامەتی هیچ بە تەنگەوە نیم کە هیچ ئیشێکی تر نەکەم غەیری ئەمە کە (مسجد الحرام) ئاوا بکەم [یەعنی تیا بم] یەکێکی تر وتی : لە ڕێی خوادا غەزاکردن خێری لەوە زیاترە کە ئێوە وتتان . حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ مەنعی کردن ، فەرمووی : لای مینبەری پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ دەنگ بەرز مەکەنەوە . ئەو ڕۆژە ڕۆژی جومعە بوو ، فەرمووی : کە نوێژی جوومعەم کرد ئەچمە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی ئەپرسم لەوەی ئیختیلافتان تیاکردوە .

[دوای جومعە چوە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو ئیختیلافەی عەرزکرد] ئەو ئایەتی سوورەتی بەرائەتە نازڵ بوو : «چۆن ئێوە ئاوبەحاجیان = دان = و ئیعماری مەسجیدی حەرام لە ئەوابا بەرابەر ئەکەن بە ئیمان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت و بە غەزا لە ڕێی خوادا ؟ ئەوی ئاو بدا بە حاجیان و ئیعماری مەسجیدی حەرام بکا بەرابەر ئەگرن لە ئەجرا لەگەڵ موسوڵمانان و غەزایی لە خزمەت خوادا ؟ قەت نە ئەو ئیشانە نە ئەهلی ئەو ئیشانە بەرابەر نابن لە ئەوابا . خوا قەومێ کە زوڵم لە نەفسی خۆی بکات و لەسەر ئەو زوڵمە ئیصرار بکا قەت هیدایەتی نادا بۆ ڕێی صەواب . یەعنی (والله أعلم) کافرو موشریکیش ئاو ئەدەن بە حاجی‌یان و ئیعماری مەسجیدی حەرام ئەکەن ، ئەگەر مەحضی ئەوە موجیبی ئەواب و ئەجر ئەبێ ، زاڵمیش کە ئەوەی کرد ئەبێ ئەجری ببێ ، حاڵ وایە خوا هیدایەتی ئەوانەی نەداوە بۆ ئیشی خێر نایشی دا ، کە وابێ دوای ئیمان غەزا بۆ ئیعلای (کلمة الله) لە هەموو عەمەلێ ئەفضەلترە .

ئيمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ چەندە حورمەتی پێغەمەری ـ عليه الصلاة والسلام ـ لە لا بوە ، حەتتا لە لای مينبەرەكەيشيەوە دەنگ هەڵبڕينی لە لا خيلافی ئاداب بوە ! ـ رضي الله تعالی عنه ـ .

١١٦٣/١٤ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : يا أبا سعيد من رضي بالله ربا ، وبالاسلام دينا ، وبمحمد ـ ﷺ ـ نبيا وجبت له الجنة . فعجب لها أبو سعيد . فقال : أعدها علي يا رسول الله ، ففعل ، ثم قال : وأخرى يرفع بها العبد مائة درجة في الجنة ما بين كل درجتين كما بين السماء والأرض . قال : وما هي يا رسول الله ؟ قال : الجهاد في سبيل الله ، الجهاد في سبيل الله ، الجهاد في سبيل الله . م/٨/٨٥ .

**تەرجەمە :**

ئەبو سەعيدی خدری ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی ئەبوسەعيد هەركەسێ بە خوايەتيی خوا رازی بێ‌و ، بە دينێتی ئيسلام رازی بێ‌و ، بە پێغەمەرێتی محەمەد ـ ﷺ ـ رازی بێ جەننەت بۆ ئەو كەسە واجب ئەبێ . ئەبوسەعيد ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەم فەرموودەی پێغەمەرەی ـ ﷺ ـ لە لا عەجايب‌و خۆش بوو ، عەرزیكرد : (يا رسول الله) بۆم تيكرار بكەرەوە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆی تيكرار فەرموەوە ، لە دواييدا فەرمووی : شتێكی تريش هەيە كە بەوە صەد دەرەجە عەبد بەرز ئەكاتەوە مابەينی هەر دوو دەرەجەی بە قەد بەينی ئەرزو ئاسمانە ، عەرزیكرد : ئەوە چيە (يا رسول الله) ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ سێ دەفعە فەرمووی : ئەوە غەزاكردنە لە رێی خوادا .

١١٦٤/١٥ حدث أبو موسى الاشعري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رجلا أعرابيا أتى النبي ـ ﷺ ـ فقال :ـ يارسول الله الرجل يقاتل للمغنم ، والرجل يقاتل ليذكر ، والرجل يقاتل ليرى مكانه . . . . فمن في سبيل الله ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : من قاتل لتكون كلمة الله أعلى فهو في سبيل الله .

م/١١٠/٨ . ح/٤٦/٥ ، وفي أخرى : يقاتل شجاعة ، ويقاتل حمية ؛ ويقاتل رياء . . . أي ذلك في سبيل الله ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله . وفي أخرى يقاتل غضبا .

م/ ١١١/٨ ، ح/٢١٣/١ ،ح ـ ٤٦/٥ . ذكره البخاري في الخمس والتوحيد والعلم .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بو مووساى ئه‌شعه‌رى ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پیاوێ [كه ناوى لاحیقى كوڕى عومه‌یره‌یه ـ رضي الله تعالى عنه ـ] هاته خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌رزى كرد : یارسول الله به‌عزێ پیاو بۆ غه‌نیمه‌ت ، به‌عزێ بۆ شوهره‌ت ، به‌عزێ بۆ ئه‌وه‌ى كه ده‌ره‌جه‌ى ئازایى ببینرێ . . . شه‌ڕ ئه‌كا ، كه وابێ كێ له ڕێى خوادا غه‌زا ئه‌كا ؟ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووى : ئه‌و كه‌سه شه‌ڕ بۆیه بكا كه هه‌ر (كلمة الله) كه (لا إله الا الله) یه سه‌ركه‌وێ و هیچ مه‌قصوودى ترى نه‌بێ ئه‌و كه‌سه له ڕێى خوادا شه‌ڕ ئه‌كا .

له عیباده‌تا ئیخلاص نه‌بێ ئه‌و عیباده‌ته مه‌ردوودو نامه‌قبووله .

(من يصرع في سبيل الله فمات فهو منهم ، وقول الله ـ تعالى ـ :

﴿ ومن يخرج من بيته مهاجرا الى الله ورسوله ثم يدركه الموت فقد وقع

أجره على الله ﴾[1] وقع : وجب . ح/٥/٤٠ نساء جزء ٥ ، ٩٣ من القرآن .

هه‌ركه‌سێ له رێی خوادا بمرێ با نه‌يشكوژرێ ئه‌و كه‌سه له موجاهيدينه . خوا ـ عز وجل ـ ئه‌فه‌رموێ : هه‌ركه‌سێ له ماڵی خۆی بچێته ده‌رێ بۆیێ كه هيجره‌ت بكا بۆ لای خواو ره‌سوولی خوا له دواييدا ئه‌جه‌لی تووش ببێ و بمرێ ئه‌جری ئه‌و كه‌سه له سه‌ر خوا واجب ئه‌بێ .

[ضه‌مره ـ رضي الله تعالى عنه ـ له مه‌ككه‌دا موقيم بوو كه ئه‌م ئايه‌ته‌ی بيست كه ئه‌فه‌رموێ : بۆ ئه‌رزی خوا واسيع نی‌يه كه هيجره‌تی تيا بكه‌ن و خۆتان و دينتان له كافران موحافه‌ظه بكه‌ن ؟ له‌و وه‌خته‌دا نه‌خۆش بوو به ماڵ و مناڵه‌كه‌ی وت : له مه‌ككه‌م به‌رنه‌ده‌رێ بۆ طه‌ره‌فی مه‌دينه ، بردیانه ده‌رێ ، له رێگه‌دا وه‌فاتی كرد ئه‌و وه‌خته ئه‌و ئايه‌ته‌كه‌ی پێشوو نازڵ بوو . (قسطلاني عن رواية الطبراني) .

**١١٦٥/١٦ عن جندب [بن عبدالله بن] سفيان [ رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـ ﷺ ـ كان في بعض المشاهد [قيل : في غزوة أحد] وقد دَمِيت ، أي : جرحت أصبعه فقال :**

**هل أنت إلا أصبع دميت ؟**

**و [لكنه] في سبيل الله مالقيت**

ح/٥/٤١ . ت ، ن .

**ته‌رجه‌مه :**

جوندوبی كوڕی سوفيان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له به‌عزێ له‌و غه‌زايانه‌دا كه (بالذات) ته‌شريفی تياحازر

(١) النساء/١٠٠ .

بوە ، وا ئەڵێن کە غەزای ئوحود بوە ، پەنجەیێکی موبارەکی بـریندار بووبوو ، خیطاب بە پەنجە موبارەکەکەی فەرمووی : تۆ چیت ؟ هەر پەنجەیێ نیتو بریندار بووی ؟ ئەوەندە هەیە کە ئەوی بە تۆ گەییوە لە رێی خوادا پێتگەییوە . یەعنی ئەجرت هەیەو هەدەر نیت .

١١٦٦/١٧ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال : غاب عمي أنس بن النضر عن قتال بدر ، فقال : يا رسول الله غبت عن أول قتال قاتلت المشركين ، لان الله أشهدني قتال المشركين ليرين الله ما أصنع . فلما كان يوم أحد وانكشف المسلمون ، قال : أللهم إني أعتذر إليك مما صنع هؤلاء ، يعني أصحابه ، وأبرأ إليك مما صنع هؤلاء ، يعني المشركين . ثم تقدم ، فاستقبله سعد بن معاذ [- رضي الله تعالى عنه - منهزما] فقال : يا سعد بن معاذ الجنة ورب النضر ! إني أجد ريحها من دون أحد ، قال سعد : فما استطعت يا رسول الله ما صنع . قال أنس : فوجدنا به بضعا وثمانين من : ضـربة بـالسيف ، أو طعنة بـرمح ، أو رميـة بسهم . ووجدناه ، قد قتل وقد مثل به المشركون ، فما عرفه أحد إلا أخته ببنانه !

قال أنس - رضي الله تعالى عنه - : كنا نرى ، أو نظن أن هذه الآية نزلت فيه وفي أشباهه : ﴿من المؤمنـين رجال صـدقوا مـا عاهـدوا الله عليه . . . إلى آخر الآية - فمنهم من قضى نحبه ، ومنهم من ينتظر ، وما بدلوا تبديلا﴾[1] أحزاب ، آخر صحيفة الجزء الحادي عشر . وقال : إن أخته ، وهي تسمى الربيع كسرت ثنية إمرأة [فطلبوا الأرش ، وطلبوا العفو ، فأبوا ؛ فأتوا النبي - ﷺ - ح/٤/٤٠٩ . ن ، د ، جه] فـأمر

(١) الأحزاب / ٢٣

رسول الله ـ ﷺ ـ بالقصاص ، فقال أنس : يا رسول الله والذي بعثك بالحق لاتكسر ثنيتها ، فرضوا بالأرش ، وتركوا القصاص ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : إن من عباد الله من لو أقسم على الله لابره ح/٥/٤٣ . وإلى قصة الربيع م/٨/١٠٩ . وقصة الربيع وحدها ح/٤/٤٠٩ . وفي مواضع أخرى .

**ته‌رجه‌مه :**

ئـه‌نه‌سی كـوڕی ماليـك ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئه‌فـه‌رموێ : ئه‌نه‌سی مامم كه ئه‌نه‌سی كوڕی نه‌ضره ـ رضي الله تعالى عنه ـ له غه‌زای به‌درا حازر نه‌بوو ، عه‌رزی پێغه‌مه‌ری كرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) له ئه‌ووه‌ڵ غه‌زايێكا كه له‌گه‌ڵ موشريكانتا كرد من غائيب بووم ، ئه‌گه‌ر خوا من حازری غه‌زای موشريكان بكا ، خـوا ئه‌وه‌تـان پێ نيشان ئـه‌دا كه ئه‌يكه‌م . كه رۆژی ئوحـود بوو مـوسوڵمـانان شكـان ، ئه‌نـه‌سی مامم فه‌رمووی : يارەببی ئيعتيذار ئه‌كه‌م له حوزوورتا له‌وه‌ی كه موسوڵمانان كرديان ، به‌رييشم له خدمه‌تتا له‌وه كه موشـريكان كـرديان ، ئـه‌وه‌ی فه‌رموو له دواييدا پێكه‌وت بۆ طه‌ره‌فی كافران ، له رێدا سه‌عدی كوڕی مه‌عاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی بـه‌ره‌وپير هـات . فه‌رمـووی : ئه‌ی سه‌عدی كوڕی مه‌عاذ قه‌سه‌م به ره‌ببی نه‌ضری باوكم ! بۆ بـه‌هه‌شت ئه‌چم بۆنی به‌هه‌شت ئه‌كه‌م له به‌رده‌می ئوحوده‌وه !

سه‌عدی كوڕی مه‌عاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ [كه له شوجعـانی ئه‌نصار بوو] عه‌رزی پێغه‌مه‌ری كرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) ئه‌و ئيقدام و شه‌جاعه‌ته‌ی كه ئه‌و كردی به من نه‌كرا .

ئه‌نه‌سی كوڕی ماليك ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : هه‌شتاو ئه‌وه‌نده برينه‌مان پێوه دی كه به شير ، يا به رم ، يا به تيرلێی كرابوو ، به

شەهیدکراویی دۆزیمانەوە لووت‌و لێـوو گوێ کـرابوو ، خـوشکەکـەی نەبێ ، کە روبەیعە ، کەس نەیناسی یەوە . ئەنەس فەرمووی : ظەنمان وایە کە ئەو ئایەتی سوورەی ئەحزابە کە ئەفەرموێ : بەعزێ لە موئمینان ئەو وەعدەی کە بە خوایان دابوو ـ عز وجل ـ بەجێیان هێناو کـردیان ، بەعزێ لەوانە لە پێش ئەمەدا کە موکافاتی دنیایی پێ عەطا بکرێ ئەجەلی مەوعوودی برانەوە ، بەعزێکیشیان مونتەظیری ئەو موکافاتەیە ، هیچیان ئەو وەعدەیانْ تەبدیل نەکرد . ئەم ئایەتە دەرحەق ئەوو ئەمثالی نازڵ بوە [تا ئێرەی ئەم حەدیثە لە موسلیمیشا هەیە] .

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : روبەیعی خوشکی ئەنەسی مامم ـ رضي الله تعالى عنها ـ ددانی ژنە ئەنصارییێکی شکان ، بە خوێندان‌و بە عەفو طەڵەبی ئەوەیان لێ‌کردن کە واز لە قیصاص بێنن ، رازیی نەبوون ، هاتنە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری بە قیصاص فەرموو ، ئەنەسی مـامم ـ رضي الله تعالى عنـه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : قەسەم بەو ذاتە کە تۆی بەحەق رەوانەی سەر خـەڵق کردوە ! ددانی روبـەیع نـاشکێنێ [فەرمـووی : حـوکمی خـوا قیصاصە] کە ئەو ئەو سوێنەی خوارد بە ئومێدی ئەوە کە خوا ـ عز وجل ـ خەصمەکانی بە ئەرش[1] یا بە عەفو رازیی بکا ، خەصمەکانی بە ئەرش رازیی بوون‌و وازیان لە قیصاص هێنـا . ئەو وەختـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ بەعزێ عەبدی هەیە ئەگەر سوێن بخۆن لەسەر خوا کە شتێکیان بۆ بکا خوا سوێنەکەیان ناخاو ئەو شتەیـان بۆ ئەکا .

(١) ئەرش : بەو ئەندازە ماڵ یا پارە دەوترێ کە لە باتیی ئەندامێکی شکاو یا بڕراو دەدرێ بە بریندارەکە .

لەم حەديثانەدا چ فەضلێكى گەورەى تيايە بۆ ئەنەسى مامى ئەنەس - رضي الله تعالى عنهما - ؟ !

١١٦٧/١٨ براء - رضي الله تعالى عنه - يقول : أتى النبي - ﷺ - رجل مقنع [مغطى وجهه] بالحديد ، فقال : يا رسول الله أقاتل وأسلم ، قال : أسلم ثم قاتل . فأسلم ثم قاتل فقتل . فقال رسول الله - ﷺ - : عمل قليلا وأجر كثيرا . ح/٥/٤٥ . م/٨/١٠٥ . بلفظ : جاء رجل من بني النبيث إلى النبي - ﷺ - فقال : أشهد أن لا إله إلا الله وأنك عبده ورسوله ، ثم تقدم فقاتل حتى قتل . فقال النبي - ﷺ - : عمل هذا يسيرا وأجر كثيرا . م/٨/١٠٥ .

تەرجەمە :

بەراى كورى عازيب - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پياوێ هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - سەرو چاوى بە ئاسن داپۆشرابوو عەرزى پێغەمەرى كرد - ﷺ - : (يا رسول الله) شەڕ ئەكەم و موسوڵمان ئەبم . پێى فەرموو : موسوڵمان ببەو لە دواييدا حەرب بكە . موسوڵمان بوو ، ئەمجا چوو بۆ حەرب حەربى كرد هەتا شەهيد كرا .

لە ريوايەتەكەى موسليما ئەفەرموێ : پياوێ لە بەنى نەبيث هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزى كرد : كە شەهادەت ئەدەم بەوە كە غەيرى خوا هيچ مەعبوودى بە حەق نىيەو ، بەوەيش كە تۆ عەبدو رەسوولى ئەوى ، لە دواييدا پێشكەوت و شەڕى كرد هەتا شەهيدكرا . لە ئاخرى هەردوو ريوايەتەكەدا بەراء - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووى : ئەمە عەمەلێكى كەمى كردو ئەجرێكى زۆرى پێ عەطا كرا .

[ئيبن و ئيسحاق به ئيسناديْكى صه‌حيح له ئه‌بوهوره‌يره‌وه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ريوايه‌ت = ئه‌كا = كه به له‌غه‌ز ئه‌يفه‌رموو : خه‌به‌رم بده‌نێ له پياوێ كه ئه‌چێته به‌هه‌شته‌وه‌و هيچ نوێژی نه‌كردبێ ! له دواييدا ئه‌يفه‌رموو : ئه‌و پياوه عه‌مری كوڕی ثابيتی ئه‌نصاری‌يه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسطلاني] .

١١٦٨/١٩ عن أبي قتادة ـ رضي الله تعالى عنه ـ يحدث عن رسول الله ـ ﷺ ـ أنه قام فيهم ، فذكر لهم أن الجهاد في سبيل الله والايمان بالله أفضل الأعمال ، فقام رجل فقال : يا رسول الله أرأيت إن قتلت في سبيل الله تكفر عني خطاياى ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : نعم إن قتلت في سبيل الله وأنت صابر ، محتسب ، مقبل غير مدبر . ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ : كيف قلت ؟ قال : أرأيت إن قتلت في سبيل الله أتكفر عني خطاياى ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : نعم وأنت صابر ، محتسب ، مقبل غير مدبر إلا الدين ! فإن جبريل ـ عليه السلام ـ قال لي ذلك . م/٨/٨٦ .

١١٦٩/٢٠ عن عبدالله بن عمرو بن العاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : يغفر للشهيد كل ذنب إلا الدين ! م/٨/٨٨ .

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بو قه‌تاده ـ رضي الله تعالى عنه ـ ريوايه‌ت له پێغه‌مه‌ره‌وه ـ ﷺ ـ ئه‌كا كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له ناو ئه‌صحابى كيراما ته‌شريفى راوه‌ستا ئه‌وه‌ى بۆ ذيكر كردن كه له رێى خوادا غه‌زاكردن‌و ئيمان به‌خوا له چاكترينى هه‌موو عه‌مه‌لێكه ، پياوێ هه‌ڵسا عه‌رزى پێغه‌مه‌رى كرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) خه‌به‌رم بده‌رێ ئه‌گه‌ر له رێى خوادا بكوژرێم هه‌موو گوناهم

بەوە عەفو ئەکرێ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ ئەگەر لە رێی خوادا بکوژرێی ، بەو شەرتە صەبر بکەی ، ئەوە بە ئیخلاصیی بکەی ، هیچ غەرەضی دنیایی تێکەڵ نەکەی ، رووت لە لەشکری دوشمن بێ و ، پشت هەڵنەکەی ، لە دواییدا فەرمووی : چیت وت ؟ عەرزیکرد : خەبەرم بدەرێ ئەگەر لە رێی خوادا بکوژرێم ئایا گوناهی پێ ئەپۆشرێ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ بەو شەرتە صەبر بکەی ، ئیخلاصت ببێ ، رووت لە دوشمن بێ ، پشت هەڵنەکەی ، غەیری قەرز هەموو گوناهێکت ئەپۆشرێ ! جیبریل ـ علیە السلام ـ ئەوەی پێ فەرمووم .

لە ریوایەتەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصا ئەفەرمێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : شەهید غەیری قەرز هەموو گوناهێکی عەفو ئەکرێ !

هیچ شتێ قەرزداریی لەسەر ئینسان لانادا ، ئەبێ : یا گەردنی ئازاد بکرێ ، یا بدرێتەوە ، یا حەقێکی بەسەر صاحیب قەرزەکەوە ببێ بری ئەوە بخرێ .

٢١/ ١١٧٠ عن مسروق قال : سألنا عبدالله [بن عمرو ، أو ابن مسعود ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] عن هذه الآية : ﴿ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا ، بل أحياء عند ربهم يرزقون﴾[1] [آل عمران ، جزء : ٤ ، ص : ١١] قال : اما انا قد سألنا عن ذلك ، فقال [يعني رسول الله ـ ﷺ ـ نووي] : أرواحهم في جوف طير خضر ، لها قناديل معلقة بالعرش ، تسرح من الجنة حيث شاءت ، ثم تأوي إلى تلك

(١) آل عمران / ١٦٩

القناديل فاطلع عليهم ربهم إطلاعة ، فقال : هل تشتهون شيئا ؟ قالوا : أي شيْ نشتهي ونحن نسرح من الجنة حيث شئنا ؟ ففعل ذلك بهم ثلاث مرات ، فلما رأوا أنهم لن يتركوا من أن يسألوا ، قالوا : يا رب نريد أن ترد أرواحنا في أجسادنا حتى نقتل في سبيلك مرة أخرى ! فلما رأى أن ليس لهم حاجة تركوا . م/٨/٨٩ .

**ته‌رجه‌مه :**

مه‌سرووق ئه‌فه‌رموێ : له عه‌بدوڵڵامان پرسی : [یا ئیبنی مه‌سعوود ، یائیبنی عه‌مری بنی عاص . هه‌ر کامێکیان بێ صه‌حابی‌یه‌و حه‌دیثه‌که‌ی پێ ئه‌بێ به مه‌رفووع . ئیختیلاف له صه‌حابی‌یا زه‌ره‌ری نی‌یه ؛ چونکی هه‌موو عه‌دلن] له‌م ئایه‌تی ئالی عیمرانه که خوا ئه‌فه‌رموێ : وا تێ مه‌گه که ئه‌وانه‌ی له ڕێی خوادا کوژراون مردوون ، به‌ڵکوو زیندوون ، له طه‌ره‌ف خواوه رزقیان ئه‌درێتێ . عه‌بدوڵڵا ئه‌فه‌رموێ : مه‌علوومت بێ که ئێمه له پێغه‌مه‌رمان پرسی - ﷺ - له مه‌عنای ئه‌م ئایه‌ته ، فه‌رمووی : ئه‌رواحی شه‌هید له به‌ر طه‌یری سه‌وزان ، ئه‌و طه‌یرانه هه‌موو ، یه‌عنی هه‌ر یه‌ك ، قه‌ندیلێکی هه‌یه به عه‌رشا هه‌ڵئاوه‌سراوه ، بۆ هه‌ر جێیێ له به‌هه‌شت هه‌وه‌سیان بێێ ئه‌چن ، ئێوارێ ئه‌چنه‌وه بۆ ئه‌و قه‌ندیلانه . خوا - عز وجل - (ظوهوورێکی) بۆ کردن فه‌رمووی : ئیشتیهای هیچتان هه‌یه ؟ عه‌رزیان‌کرد : ئاره‌زووی چیمان ببێ ؟ ئێمه بۆ هه‌موو جێیێ له به‌هه‌شت هه‌وه‌سمان بێێ ئه‌یچینێ . تا سێ ده‌فعه ئه‌و طولووعه‌ی بۆ کردن‌و ئه‌و سوئاله‌ی لێ‌کردن که زانییان وازیان لێ نایێنرێ‌و هه‌ر لێیان ئه‌پرسێ عه‌رزیان‌کرد : یاره‌ببی ئه‌وه‌مان ئه‌وێ که بکرێینه‌وه به به‌ر

به‌ده‌نه‌كانمانا تا له‌ ريى تودا بكوژريين ! كه‌ (مصرّ) بوون له‌سه‌ر ئه‌وه‌ كه‌ هيچ ئاره‌زووويان نى يه‌ وازيان لىٰ هينرا .

زاهيرى ئه‌م حه‌ديثه‌ وايه‌ كه‌ هه‌موو ئه‌نواعى شه‌هيد . . شه‌هيدى ئاخيره‌ت بىٰ ، يا شه‌هيدى دنياو ئاخيره‌ت بىٰ ؛ چونكى شه‌هيدى ئاخيره‌ت له‌گه‌ڵ شه‌هيدى مه‌عره‌كه‌دا هه‌ر ئه‌وه‌نده‌يان فه‌رقه‌ كه‌ شه‌هيدى مه‌عره‌كه‌ ناشوريّن ، نويژيان ناكرىٰ ، ئه‌مما ئايه‌ته‌كه‌ ته‌نها ده‌رحه‌ق شه‌هيدى حه‌قيقيى مه‌عره‌كه‌يه‌ ، قياسى شه‌هيدى ترى مومكينه‌ كه‌ لىٰ بكرىٰ .

دواى مردن له‌ پيش حه‌شرو نه‌شرا چوونه‌به‌هه‌شت‌و چوونه‌جه‌هه‌ننه‌م هه‌يه‌ ، ئه‌مما به‌ غه‌يرى ئه‌و نه‌وعه‌ چوونه‌ى له‌ دواى حه‌شرو حيساب ئه‌بىٰ .

جه‌ننه‌ت مه‌خلووقه‌ ، دواى مردن نيعمه‌ت‌و عه‌ذاب‌و عيقاب هه‌يه‌ ، خواردن‌و له‌ذذه‌ت هه‌يه‌ .

١١٧١/٢٢ حدث أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن أم الربيع بنت البراء [وهم صوابه : أن الربيع بنت النضر ـ رضي الله تعالى عنها ـ] وهي أم حارثة بن سراقة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أتت النبي ـ ﷺ ـ [فقالت : يا رسول الله قد عرفت منزلة حارثة مني ، فإن يكن في الجنة أصبر وأحتسب ، وان تك الأخرى ترى ما أصنع ؟ فقال : ويحك أو هبلت ؟ أو جنة واحدة هي ؟ إنها جنان . . . إلخ ح/٦/٢٤٦] فقالت : يا نبي الله ألا تحدثني عن حارثة ! وكان قتل يوم بدر ، أصابه سهم غرب [لايعلم راميه] فإن كان في الجنة صبرت ، وإن كان غير ذلك إجتهدت عليه في البكاء ، قال : يا أم حارثة إنها جنان في الجنة ، وإن ابنك أصاب

الفردوس الأعلى . [فرجعت وهي تضحك وتقول : بخ ، بخ لك يا حارثة] ح/٥/٤٦ .

ته‌رجه‌مه :

روبه‌یعی کچی نه‌ضر ، پووری ئه‌نه‌سی کوڕی مالیك ، ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كه حاریثه‌ی کوڕی به تیریکی ناکاوی له غه‌زای به‌درا شه‌هید ئه‌کرێ ئه‌چێته خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌رزی ئه‌کا : (یا رسول الله) ئه‌زانی که ده‌ره‌جه‌ی حاریثه لای من چۆن بوه ؟ یه‌عنی چه‌نده له لام عه‌زیز بوه ، خه‌به‌رم له ئه‌حوالی ئه‌و بده‌رێ ئه‌گه‌ر له به‌هه‌شتایه صه‌بر ئه‌که‌م ، ئه‌گه‌ر غه‌یری ئه‌وه بێ ئه‌زانی چی بۆ ئه‌که‌م ! هه‌تا پێم بکرێ بۆی ئه‌گریم . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : بۆ تۆ شێت بووی ، عه‌قڵت لێ تێکچوه ؟ بۆچ جه‌ننه‌ت هه‌ر جه‌ننه‌تێکه ؟ له به‌هه‌شتا چه‌ند ده‌ره‌جه هه‌یه . کوڕه‌که‌ت فیرده‌وسی ئه‌علای ده‌ست که‌وتوه . [روبه‌یع ـ رضي الله تعالى عنها ـ به پێکه‌نینه‌وه گه‌ڕایه‌وه‌و ئه‌یفه‌رموو : خۆشیی له خۆت ئه‌ی حاریثه] .

١١٧٢/٢٣ أخبر أبو عبس هو عبدالرحمن بن جبر أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : ما اغبرت قدما عبد [ساعة من نهار . أحمد] في سبيل الله فتمسه النار ! ح/٥/٤٧ . ح/٢/١٦٧ . ولفظه عن عباية بن رفاعة : قال أدركني أبو عبس ـ رضي الله تعالى عنه ـ وأنا أذهب إلى الجمعة فقال : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : من أغبرت قدماه في سبيل الله حرمه الله على النار . في الجمعة .

[عن أبي الدرداء مرفوعا : من أغبرت قدماه في سبيل الله حرم الله سائر جسده على النار . قسطلاني]

سێ حه‌دیث مه‌ئالی هه‌موویان ئه‌وه‌یه که پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ

فەرمووی : هەر کەسێ سەعاتێ لە رۆژ لە رێی خوادا پێی تۆزاویی ببێ خوا ئەو کەسە لە . . .[1] سائیری جەسەدی ئەو کەسە لەسەر ئاگری جەهەننەم حەرام ئەکا .

[لەفظی حەدیثەکە عامە ، شاملی هەموو ئیشی خێرە کە بە ئیخلاص بێ .] [ئەمما مەغروور مەبە بەوەندە !]

(١) لێرەدا کەلیمەیەکم بۆ نەخوێنرایەوە ، وەك (طەبەرانیدا) وایە .

# الغسل بعد الحرب والغبار

١١٧٣/٢٤ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ لما رجع يوم الخندق ووضع السلاح واغتسل فأتاه جبريل [عليه الصلاة والسلام] وقد عصب رأسهُ الغبارُ ، فقال : وضعت السلاح ؟ فوالله ! ما وضعته . [والله ما وضعناه ، فاخرج اليهم قال] : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : فأين ؟ قال : ههنا ، وأومأ إلى بني قُرَيظة ، قالت : فخرج رسول الله ـ ﷺ ـ ح/٥/٤٨ .

تەرجەمە :

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژی خەندەق گەڕایەوە بۆماڵێ و غوسلێ کرد جوبرەئیل ـ علیه السلام ـ تەشریفی هات ئەوەندەی تۆز لە سەرو چاو نیشتبوو وەك شتی لەسەریەوە پێچابێ وابوو ! بە پێغەمەر ـ ﷺ ـی فەرموو : بۆچ سیلاحەکەت داناوە ؟ وەڵڵاهی ئێمە دامان نەناوە ، بۆیان بچۆرەدەرێ ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆکوێ ؟ حەزرەتی جیبریل ـ علیه السلام ـ ئیشارەتی بەنی‌قورەیظەی کردو فەرمووی : بۆ ئەوێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی بۆیان چوەدەرێ .

حەزرەتی جیبریل ـ علیه السلام ـ چە ئیحتیاجی یەکی هەیە بە ولاغ سواری ببێ،بە سیلاح موحافەظەی خۆیی پێ بکا یا شەری پێ بکا ؟ ئەتوانێ کە بە دوو پەنجە ئەرز لە جێیی خۆی هەلگرێ و سەرەوژێری بکا . موسەللەح بوونی بۆ تەعلیمی عیبادە کە هەموو ئیشێ ـ دنیایی بێ یا (أخروي) ـ موحتاجە بە (تشبث) بە ئەسباب ، بێ سەبەب هیچ مومکین نابێ ؛ نە هی دنیایی نە هی ئاخیرەت ؛ چونکی (عادة

الله)وا جاري بوه ، بۆيه كه‌سێ خيلافى عاده‌تى له‌سه‌ر ده‌ست صادر ببێ ئه‌بێ به موعجيزه ، يا ئه‌بێ به كه‌رامه‌ت ، بۆچ له بيدايه‌تى ظوهوورى ئيسلاما ئيسلامه‌تى رۆژ به‌رۆژ هه‌ر له ته‌ره‌قى يا بوه له دواييدا كه وازيان له (تشبث) به ئه‌سبابى ته‌ره‌قى هێنا رۆژ به‌رۆژ ده‌ستى كرد به (تنزل) تا گه‌يى يه ئه‌م ده‌ره‌جه‌يه كه ئێسته له‌سه‌ر ئه‌رزا حوكومه‌تێكى ئيسلام نه‌ماوه كه بتوانێ موحافه‌ظه‌ى خۆى بكا له كوففار . بۆچ كوففار به‌ده‌وام له ته‌ره‌قى يان ؟ بۆچ له‌وه‌پێش موجته‌هيدى زۆر بوه‌و ، ئه‌وليـاى زۆر بوه ؟ ئێسته نه موجته‌هيدێ هه‌يه ، نه‌وه‌لى يێك ئه‌بينين ؟ چونكى بۆ دنيا ئه‌بێ (تشبث) به ئه‌سبابى دنيايى بكرێ ، بۆدين ئه‌بێ (تشبث) به ئه‌سبابى دينيى بكرێ . فه‌رقى ئينسانى ئه‌و وه‌خته‌و ئێسته چيه ؟ ئينسان تا نه‌خوێنێ نابێ به خوێنده‌وار ، تا نه‌چێته به‌ر صنعه‌تێ فێرى ئه‌و صنعه‌ته نابێ ، تا ئه‌سباب‌و ئالات‌و ئه‌ده‌واتى حه‌ربى يه‌ى نه‌بێ شه‌رى له‌گه‌ڵ كوففارا پێ ناكرێ . به : گورزو ، كه‌مه‌ندو ، تيرو ، شير . . . حه‌رب لـه‌گه‌ڵ طه‌ياره‌و تۆپ‌و (قر اليوز) ناكرێ . . . إلخ

**٢٥/١١٧٤ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : اصطبح ناس الخمر يوم أحد ثم قتلوا شهداء ، فقيل لسفيان ابن عيينة : مِنْ آخر ذلك اليوم ؟ قال : ليس هذا فيه ح/٥/٤٩ .**

**ته‌رجه‌مه :**

جابيرى كورى عه‌بدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئـه‌فه‌رمـوێ : به‌عزێ له خه‌ڵق له غه‌زاى ئوحودا به‌يانى شه‌رابيان خوارده‌وه ، له دواييدا هه‌موو به شه‌هيديى كوژران . له سوفيانى كورى عويه‌ينه‌يان پرسى : كه له ئاخرى ئه‌و رۆژه‌دا شه‌هيد بوون ؟ سوفيان فه‌رمووى : له حه‌ديثه‌كه‌دا ئه‌وه‌ى تيا نى يه .

ئەو وەختە ، باشەراب حەلاڵیش بووبێ ، چونکی ئیزالەی عەقڵی کردوون ئەبوو نەگەییینایە بەو دەرەجە عەظیمـە کە لـە ناو (أجـواف)ی طـەیری سـەوزا بن و بۆ هـەر جێیێ کە ئـارەزوویان بێنێ لـە بەهـەشتا بیچنێ و ، خوا لە قورئانا مەدحیـان بکاو ، عـەبدوڵـڵای باوکی جـابیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ تا لە مەعرەکە هەڵئەگیراوە مەلائیکە بە باڵی خۆی سێبەری بۆ بکا کە ئێشتا زگی شەرابەکەی تیا بوە .

٢٦/١١٧٥ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : قال سليمان بن داود ـ عليهما السلام ـ لأطوفن الليلة عـلى مائـة إمرأة ، أو تسع وتسعين [وفي رواية : ستين] كلهن يأتي بفارس يجاهد في سبيل الله . فقال له صاحبه [أو الملك م] : قل إن شاء الله . فلم يقل ، فلم تحمل منهن إلا أمرأة واحدة ؛ جاءت بشق رجل ، [وفي رواية : بشق غلام . وفي رواية : نصف إنسان . وهو الجسد الذي أُلْقِي على كرسيه .] والذي نفس محمد بيده ! لو قال إن شاء الله لجاهدوا في سبيل الله فرسانا أجمعون . خ/٥/٥١ ، معلقـا ، وأسنده البخـاري في ستة مواضع . ح ـ ٥/٤٠٢ . وفيه على سبعين امرأة .

[وعن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنـه كان لـه أربعمائـة إمرأة ، وستمائة سرية . وفي رواية : كان له ألف بيت من قوارير على الخشب ، فيها ثلاثمائة صريحة ، وسبعمائة سرية . قسطلاني]

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە حەزرەتی سولەیمـانی کوڕی داود ـ عليهما السلام ـ فەرمووی : ئیمشەو لەگەڵ صەد ژن ئەنووم کوللێکیان کوڕێکی سوار بە وەلەد بێنن کە هەموو بۆ خوا غەزا بکا ، ئەو مەلائیکەی کە لە مەجلیسەکەیا حازر بوو فەرمووی : بڵێ (إن شاء الله) لە فکری چوو

کە (إن شاء الله ) بڵێ . هیچیان حامیلە ، نەبوو یەکێکیان نەبێ کە نیوە ئینسانێکی بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەوەی نەفسی محەمەد لە دە ستی قودرەتیایە ! ئەگەر بیفەرمووایە (إن شاء الله) هەر صەد ژنەکەی = یەکی = کوڕێکی سو اری ئەبوو هەموو غەزایان ئەکرد بەسواریی لە رێی خوادا .

لە ریوایەتێکا شەصت ، لە ریوایەتێکا نەوەدونۆ = ، لە ریوایەتێکا هەزار . لە ریوایەتێکا هەزار خانووی لە بلوور بوە ، سێصەد ژنی حوری بوە حەوصەد جاریەی بوە .

ئینسان کە وتی ئەوە ئەکەم سوننەتە بڵێ (إن شاء الله) .

١١٧٦/٢٧ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لاهجرة بعد الفتح ، ولكن جهاد ونية ، وإذا استُنْفِرتُم فانفروا . ح/٥/٣١ ، ٥٥ . ح/٣/٢٩٦ . بأبسط مما هنا ، سيذكر ـ إن شاء الله تعالى ـ في الحج .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە رۆژی فەتحی مەککەدا فەرمووی : لە دوای فەتحی مەککە هیجرەت کردن نی یە ، ئەمما جیهادو ، نییەتی خەیرو ، ئەعمالی صالیحە هەیە . هەر وەختێ ئەمرتان پێ کرا کە بچن بۆ غەزا . . بچن .

جیهاد فەرزی کیفایەیە .

نییەتی ئیشی خێرو غەزاکردن جێی هیجرەت ئەگرێتەوە لە ئەوابا .

١١٧٧/٢٨ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـ ﷺ ـ أنه قال : من خير معاش الناس لهم رجل ممسك عنان فرسه في

سبيل الله ، يطير على متنه كلما سمع هَيْعة أو فَزْعة ، طار عليه يبتغي القتلَ والموتَ مظانَّه ، أو رجل في غنيمة في رأس شَعَفة من هذه الشَّعَف ، أو بطن وادٍ من هذه الأودية ؛ يقيم الصلاة ويؤتي الزكاة ، ويعبد ربه حتى يأتيه اليقين ، ليس من الناس إلا في خير . م/٨/٩٤ .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌فه‌رموێ : له چاكترینی ئینسانان ئه‌و كه‌سه‌یه كه له‌غاوی ئه‌سپه‌كه‌ی گرتبێ له رێی خوادا ، هه‌ر وه‌قتێ ده‌نگێكی بیست ، یا چوونه سه‌ر دوشمنێكی حیس كرد له‌سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌كه‌یه‌وه بێ بفرێ بۆ ئه‌و جێیه كه ئه‌و ده‌نگه‌ی یا ئه‌و دوشمنه‌ی لێ بێ ، بۆ ئه‌و جێیه ئه‌گه‌رێ كه ئیحتیمالی ئه‌وه‌ی هه‌یه لێی شه‌هید بێ یا لێی بمرێ ، یا پیاوێكه له ناو به‌عزێ مه‌ری خۆیا بێ له‌سه‌ر ته‌وقه‌سه‌ری شاخێ بێ له‌م شاخانه ، یا له ناو دۆلێ بێ له‌م دۆلانه ؛ نوێژ ئه‌كاو ، زه‌كات ئه‌داو ، تا ئه‌مرێ عیباده‌تی خوای خۆی ئه‌كا ، له خوصووصی ئینسانانه‌وه هه‌ر له خێرا بێ زه‌ره‌ری بۆ كه‌س نه‌بێ ، یه‌عنی ئیختیلاط نه‌كا (منزوي)[1] بێ .

١١٧٨/٢٩ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لايجتمع كافر وقاتله في النار أبدا . م/٨/٩٧ .

١١٧٩/٣٠ وعنه قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لايجتمعان في النار إجتماعا يضر أحدهما الآخر . قيل : من هم ؟ قال : مؤمن قتل كافرا ثم سَدَّدَ . م/٨/٩٧ . مشكل لم يعرفه لا النووي ولا القاضي عياض .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌یره ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : كه پێغه‌مه‌ر

(١) منزوي : گۆشه‌گیرو له خه‌ڵق دوور .

ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : قه‌ت كافرو قاتیلی موسوڵمانی له‌ جه‌هه‌ننه‌ما كۆ نابنه‌وه‌ . له‌ ریوایه‌ته‌كه‌ی ترا ئه‌فه‌رموێ : قه‌ت وا له‌ جه‌هه‌ننه‌ ما كۆ نابنه‌وه‌ كه‌ یه‌كێكیان زه‌ره‌ر بگه‌یێنێ به‌وی تریان . عه‌رزیان‌كرد : ئه‌وانه‌ كێن (یا رسول الله) ! فه‌رمووی : موسوڵمانێكه‌ كه‌ كافرێ بكوژێ ، له‌ دواییدا ئه‌و موسوڵمانه‌ له‌سه‌ر رێی حه‌ق به‌ راستێتی بمێنێ‌و گوناهی تێكه‌ڵ نه‌كا . [ئه‌مه‌ مه‌عنای مه‌تنی حه‌دیثه‌كانه‌] .

ئه‌گه‌ر ریوایه‌تی دوه‌م نه‌بێ ریوایه‌تی ئه‌وه‌ڵ مه‌عناكه‌ی ظاهیره‌ . یه‌عنی غه‌زا هه‌موو گوناه لائه‌با ؛ غه‌زایی كافر بكوژێ‌و نه‌كوژێ ناچێته‌ جه‌هه‌ننه‌مه‌وه‌ . قه‌یدی كافر كوشتن قه‌یدی ئیحتیرازیی نی‌یه‌ ، بینای له‌سه‌ر غالبه‌ . قه‌یدی (مسدد)یش كه‌ ئیستیقامه‌ته‌ له‌سه‌ر طه‌ریقی ئیسلامه‌تی دیاره‌ كه‌ شه‌رطه‌ ؛ چونكی : موسوڵمان بوون ، غه‌زا ، حه‌ج ، جومعه‌ . . . (والحاصل) هه‌رچی ببێ به‌ كه‌فاره‌تی گوناه ـ غه‌یری صه‌ومی عه‌ره‌فه‌ ـ هه‌ر گوناهی پێشی مه‌حو ئه‌كاته‌وه‌ گوناهی دوای ئه‌وانه‌ مه‌شرووطه‌ به‌ ئیستیقامه‌ت ، به‌ ته‌وبه‌ ، به‌ ئه‌سبابی سائیره‌ .

قاضی ئه‌فه‌رموێ : قه‌یدی (سدَّد) بۆ موسوڵمان نی‌یه‌ ده‌رحه‌ق كافره‌ ، مه‌عنای وایه‌ : كافرێ موسوڵمانێ بكوژێ له‌ دواییدا كافره‌كه‌یش موسوڵمان ببێ له‌سه‌ر رێی راست بمێنێ . . ئه‌و وه‌خته‌ هیچیان ناچنه‌ جه‌هه‌ننه‌م . وه‌ عه‌ینی حه‌دیثه‌كه‌ی (إن شاء الله) ئێسته‌ ئه‌ینووسم . . به‌عزێك ئه‌ڵێن : عیباره‌ته‌كه‌ به‌ سه‌هو ریوایه‌ت كراوه‌ ، صه‌وابی وایه‌ (مؤمن قتله كافر) یه‌عنی : موسوڵمانێكه‌ كه‌ كافرێ بیكوژێ‌و كافره‌كه‌یش موسوڵمان ببێ‌و ئیستیقامه‌تی ببێ . . . ئه‌مه‌ عه‌ینی مه‌عناكه‌ی قاضی‌یه‌ . مه‌عنای ئه‌وه‌ كه‌ ئه‌فه‌رموێ : ئیجتیماعیان نابێ به‌ ئیجتیماعێ كه‌ زه‌ره‌ر به‌ یه‌كتر بگه‌یێنن وایه‌ . خوا له‌ سووره‌تی (كهٰا)دا ئه‌فه‌رموێ : هیچ كه‌س

نی یە لە ئێوە کە واریدی جەهەننەم نەبێ ، ورروودی ئێوە بۆ جەهەننەم لەسەر خوا واجبە ؛[1] چونکی خوا وای تەقدیر کردووە . ئەو کافرە کە موسوڵمان ئەکوژێ‌و لە دواییدا خۆیشی موسوڵمان ئەبێ‌و ئیستیقامەتی ئەبێ . . لەو ورروودە (مستثنان) ، لەسەر پردی صیراط نیزاعیان نابێ . یەعنی بۆ تێپەڕینی پردی صیراط تەنگ بە یەکتر هەڵناچنن ، وەك لە بەینی بەعزێ موسوڵمانی ترا ئەبێ ، (والحاصل) نە ئەچنە جەهەننەم ، نە نیزاعیان ئەبێ ، دەستی یەکتر ئەگرن‌و ئەچنە بەهەشت . مەثالی کەلامی قاضی کە نەوەویی نەقڵی ئەکا . (والله أعلم) چونکی (لم يشف غليل صدري) .

١١٨٠/٣١ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : يضحك الله إلى رجلين [يرضى عنهما ، ويثيبهما ، نووي] [إن الله ليعجب من رجلين . ن] يقتل أحدهما الآخر يدخلان الجنة [قالوا : كيف ذلك يا رسول الله ؟ قال مسلم] : يقاتل هذا في سبيل الله فيُقتل ، ثم يتوب الله على القاتل [فيهديه إلى الاسلام ، ثم يجاهد في سبيل الله . م] فيشهد . ح/٥/٥٥ ـ م/٨/٩٥ . ن أحمد .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ لە دوو کەس کە یەکێکیان ئەوی تریان بکوژێ ، = لێیان = رازی ئەبێ ، ئەوابیان پێ عەطا ئەفەرموێ ، ئەیانباتە بەهەشت ! عەرزیان‌کرد : ئەوە چۆن ئەبێ (یا رسول الله) ؟ فەرمووی : موسوڵمانەکە لە ڕێی خوادا غەزا ئەکاو

(١) مەبەستی ئایەتی ﴿وإن منكم إلا واردها ، كان على ربك حتما مقضيا﴾یە . (مريم/٧١)

شه‌هيد ئه‌كرێ ، له دواييدا خوا هيدايه‌تى قاتيله‌كه‌ى ئه‌داو ته‌وبه ئه‌كاو ، بۆ خوا جيهاد ئه‌كاو شه‌هيد ئه‌كرێ .

**١١٨١/٣٢ عن أبي مسعود الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جاء رجل بناقة مخطومة [تێی‌كه باوانم خه‌زێمێ !][1] فقال : هذه في سبيل الله . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لك بها يوم القيامة سبعمائة ناقة كلها مخطومة ! [كمثل حبة أنبتت سبع سنابل][2] . م/٨/٩٨ .**

**ته‌رجه‌مه :**

پياوێ هاته خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ وشترێكى به‌له‌غاوه‌وه‌ى ته‌قديم كرد ، عه‌رزى‌كرد : (يا رسول الله) ئه‌مه له رێى خوادا بێ . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووى : به موقابيلى ئه‌مه‌وه له رۆژى قيامه‌تا حه‌وصه‌د وشترت به له‌غاوه‌وه ئه‌درێتێ .[3]

**١٩٨٢/٣٣ عن أبي مسعود الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جاء رجل إلى النبي ـ ﷺ ـ فقال : إني أُبْدِعَ بي [هلك مركوبي] فاحملني . فقال : ما عندي . فقال رجل : يا رسول الله أنا أدله على من يحمله . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : من دلَّ على خير فله مثلُ أجرِ فاعله .**

---

(١) ئه‌مه وه‌ك په‌ند وايه‌و نازانم له چيوه هاتوه .

(٢) البقرة/ ٢٦١ .

(٣) دانه‌ر ـ خ ـ له دواى حه‌ديثه عه‌ره‌بى‌يه‌كه‌وه (كمثل حبة . . .)ى نووسى‌و دوايش ماناى لێ نه‌دايه‌وه . مه‌به‌ستى ئه‌و ئايه‌ته‌ى سووره‌تى به‌قه‌ره‌يه كه ئه‌فه‌رموێ : ئه‌وانه‌ى ماڵى خۆيان له رێگه‌ى خوادا ده‌به‌خشن وه‌ك ئه‌وه وايه يه‌كێك يه‌ك ده‌نك دانه‌وێڵه بچێنێ ، ئه‌و ده‌نكه حه‌وت گوڵ برووێنێ ، هه‌ر گوڵێك صه‌د ده‌نكى تيا بێ . . . كه ده‌كاته يه‌ك به حه‌وصه‌د .

م/٨/٩٩ .
تەرجەمە :

پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد : (یا رسول الله) حەیوانی سواریم بە هیلاك چوە حەیوانێکم بدەرێ سواری ببم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هیچ حەیوانم لا نی یە . یەکێ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : (یا رسول الله) من یەکێکی پێ نیشان ئەدەم کە سواری بکا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەرکەسێ ئیشێکی خەیر بە یەکێ نیشان بدا ئەو کەسە بە قەد ئەوەی کە خێرەکە ئەکا ئەجری هەیە .

١١٨٣/٣٤ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن فتى من أسلم قال : يا رسول الله إني أريد الغزو وليس معي ما أتَجهزُ به . قال : أئت فلانا ؛ فإنه كان تجهز فمرض ، فأتاه فقال : إن رسول الله ـ ﷺ ـ يقرئك السلام ، ويقول : أعطني الذي تجهزت به . قال : يا فلانة أعطيه الذي تجهزتُ به ولا تحبسي عنه شيئا . فوالله لا تحبسي منه شيئا فيبارَكَ لـكِ فيه . م/٨/٩٩ .
تەرجەمە :

جەهێلێ لە ئەسلەم عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : (یـا رسول الله) من ئیرادەی غەزام هەیە فەقەط هیچم نی یە کە بیکەم بە تەدارەکی غەزا ، فەرمووی : بچۆرە لای فلان کەس ئەو تەدارەکی کردوە بۆ غەزاو نەخۆش کەوتوە ، ئەو پیاوە چوە لای نەخۆشەکـە پێی وت : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ سەلامت لێ ئەکا ئەفەرموێ : کە ئەوەی تەدارەکت کردوە بۆ غەزا بیدەی بە من . نەخۆشەکە بە ژنەکەی وت : ئەوی تـەدارەکم کردوە بیدەرەێ هیچی لێ مەگێـڕەوە ، وەڵڵاهی هیچی لێ نـاگێڕیتـەوەو خوا بەرەکەتت بۆ تێ بخا .

١١٨٤/٣٥ زيد بن خالد - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - قال : من جهز غازيا في سبيل الله بخير فقد غزا ، ومن خلف غازيا [في أهله . م] في سبيل الله بخير فقد غزا . ح/٥/٦٣ . م/٨/١٠٠ . د ، ت ، ن .

تەرجەمە :

زەيدى كوڕى خاليدى جوهەنى ئەفەرموێ : كە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووى : هەركەسێ تەدارەك بكا بۆ كەسێ لە رێی خوادا بچێ بـۆ غەزا ، ئەو كەسە غەزا ئەكا ،[1] بانەيشچێ بۆ غەزا ، هەركـەسێ لە دواى ئەمە كە كەسێ چوو بۆ غەزا لە باتى ئەو ئيشى ماڵ و مناڵى غازىيەكە بەجێ بێنێ و نەيێلێ بێ ئەوىيان پێوە ديارىى بدا . . . ئـەو كەسـە غـەزا ئەكا .

١١٨٥/٣٦ أبو سعيد الخدري - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - بعث بَعْثا إلى بني لَحيان من هذيل فقال : لينبعث من كل رجلين أحدهما والأجر بينهما . م/٨/١٠١ .

١١٨٦/٣٧ وعنـه أن رسول الله - ﷺ - بعث بعثـا إلى بني لحيان : ليخرج من كل رجلين رجل . ثم قال للقاعد : أيكم خَلَّفَ الخارج في أهله وماله بخير كان له نصف أجر الخارج . م/٨/١٠١ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فيرقەيێكى ناردە سەر بەنى لەحيان لە هوذەيل ، لە دواييـدا فەرمـووى : لە كـوللى دوو كـەسێ يـەكێكيـان بچێ و يـەكێ بمێنێتەوە . لە دواييدا بەوەى كە دانيشت و مايەوە فەرموو : هەركامێكتان

(١) لێرەدا بگوترێ : وەك ئەوە وايە غەزاى كردبێ ، يا پـاداشى وەك پاداشى ئەوانە وايە كە غەزا ئەكەن . . باشترە .

ده‌رحه‌ق ماڵ‌و مناڵی ئه‌وه‌ی که ئه‌چێت جێگه‌ی به‌خێر بگرێته‌وه‌و هه‌موو ئیحتیاجییێکیان به‌جێ بێنێ نیوه‌ی ئه‌جری ئه‌وی هه‌یه .

١١٨٧/٣٨ عن أبي بريدة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : حرمة نساء المجاهدين على القاعدين كحرمة أمهاتهم . وما من رجل من القاعدين يخلف رجلا من المجاهدين في أهله فيخونه فيهم إلا وقف له يوم القيامة فيأخذ من عمله ما شاء . فما ظنكم [في رغبته في أخذ حسناته والاستكثار منها في ذلك المقام] ؟ م/٨/١٠٣ .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : حورمه‌تی ژنی موجاهیدین له‌سه‌ر ئه‌وانه‌ی که ماونه‌وه وه‌کوو حورمه‌تی دایکیانه . هیچ پیاوێ نی‌یه له‌وانه‌ی که دانیشتوون‌و نه‌چوون بۆ غه‌زاو جێ‌نشینی ئه‌وانه‌ن که چوون بۆ غه‌زا ده‌رحه‌ق ماڵ‌و مناڵی که ئیشیان ببینن . . بێ ده‌رحه‌ق ماڵ‌و مناڵی خیانه‌ت بکا که له رۆژی قیامه‌تا ئه‌و خائینه بۆ ئه‌و موجاهیده رانه‌وه‌ستێ‌و به هه‌وه‌سی خۆی موجاهیده‌که له عه‌مه‌لی چاکه‌ی خائینه‌که وه‌رنه‌گرێ . ئێوه چۆنی تێ ئه‌گه‌ن ؟ وا ظه‌ن مه‌به‌ن تا مومکینی بێ له حه‌سه‌ناتی هیچی بۆ بهێڵێته‌وه !

١١٨٨/٣٩ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أتيت رسول الله ـ ﷺ ـ [سنة سبع] وهو بخيبر بعدما فتحوها ، فقلت : يا رسول الله أَسْهِم لي ، فقال بعض بني سعيد بن العاص [أَبان بن سعيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ] : لا تُسْهِم له يا رسول الله . فقال أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : هذا قاتل ابن قَوْقَل [النعمان بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ] فقال ابن سعيد بن العاص : واعجبا لوَبْر [دويبة أصغر من السنور ؛ يحل أكلها] تدلّى علينا من قدوم ضأن [جبل] يَنْعى [يعيب] عليَّ

قتل رجل مسلم أكرمه الله على يديَّ ولم يُهِني على يديه ! قال : فلا أدري أسْهم له أم لم يُسهم له . ح/٥/٥٦ . ح/٦/٣٦٠ . واعجبا لك وبر تدأدأ [هجم] ح/٦/٣٦١ .

١١٨٩/٤٠ أبو هريرة - رضي الله تعالى عنه - يخبر سعيد بن العاص ، قال : بعث رسول الله - ﷺ - أبان على سرية من المدينة قِبَل نجد . قال أبو هريرة : فقدم أبان وأصحابه على النبي - ﷺ - . بخيبر ، بعد ما افتتحها ، وإن حُزُم خيلهم لليف . قال أبو هريرة : قلت : يا رسول الله لاتقسم لهم ، قال أبان : وأنت بهذا يا وبر تحدّد من رأس ضأن [ضال . نسخة] فقال النبي - ﷺ - : يا أبان إجلس ، فلم يقسم لهم . ح/٦/٣٦١ .

قال أبو عبدالله [البخاري] الضال : [بتخفيف اللام] السدر [البري] ح/٦/٣٦١ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌يره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له سالّى حه‌وته‌مى هيجره‌تا هاتمه خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - ته‌شريفى له خه‌يبه‌ر بوو دواى فه‌تحى خه‌يبه‌ر ، عه‌رزم‌كرد : (يا رسول الله) به‌شى منيش دابنێ له‌م غه‌نيمه‌ته ، ئه‌بانى كوڕى سه‌عيدى كوڕى عاص - رضي الله تعالى عنه - عه‌رزى پێغه‌مه‌رى كرد - ﷺ - : (يا رسول الله) به‌شى بۆ دامه‌نێ ، ئه‌بوهوره‌يره عه‌رزى پێغه‌مه‌رى كرد - ﷺ - : (يا رسول الله) ئه‌مه قاتيلى ئيبن‌و قه‌وقه‌له - كه نه‌عمانى كوڕى ماليكى ئه‌نصارى‌يه - ئه‌بان وتى : عه‌جايه‌بم ئه‌مێنێ له مشكه‌كوێره‌يێ كه له شاخى قه‌دوومى ضه‌ئن هاتۆته‌خوارێ ناو ئێمه ! [كه له ئێمه نى‌يه ، له عه‌شيره‌تمان نى‌يه ، خه‌ڵقى مه‌مله‌كه‌تمان نى‌يه ، ئه‌وه‌نده قه‌درى نى‌يه كه ئيشاره‌ت بكا به

مەنع و عەطا ، قودرەتی حەربی نی یە] بەوە عەیبم لێ ئەگرێ کە موسوڵمانێکم کوشتوەو شەهید بوە ، خوا لەسەر دەستی منا ئیکرامی گرتوە . خوا ئیهانەتی منی نەکرد لەسەر دەستی ئەوا کە بە کافریی بمکوژێ . یەکێ لە روایەکان ئەفەرموێ : نازانم پێغەمەر - ﷺ - بەشی ئەبوهورەیرەی دا یا نەیدا .

لە ریوایەتەکەی ترا کە ئەبو هورەیرە - رضي الله تعالی عنه - کە خەبەر ئەدا بە سەعیدی کوڕی عاصی باوکی ئەبان - رضي الله تعالی عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - ئەبانی کرد بە سەرکردەی فیرقەیێ ناردی بۆ طەرەفی نەجد لە دوای فەتحی خەیبەر کە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی لە خەیبەرا بوو ، ئەبان و رەفیقەکانی تەشریفیان عەودەتیان کردەوە بۆ خزمەت پێغەمەر - ﷺ - دەستەجڵەوی حەیوانەکانیان لە پووشی خورما بوو ، ئەبو هورەیرە - رضي الله تعالی عنه - ئەفەرموێ :

عەرزی پێغەمەرم کرد - ﷺ - : (یا رسول الله) بەشیان مەدە لە غەنیمەتی خەیبەر . ئەبان - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : ئەی مشکەکوێرەی کە لە قوللەی شاخی ضەئن گلۆر بوویتەوە ! تۆ لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - بۆگەییویتە ئەو پایەیە کە تەدبیر بکەی بۆ پێغەمەر - ﷺ - ؟ [نە لە قەومی ئەوی نە = لە = بیلادی ئەوی] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەی ئەبان دابنیشە . بەشی نەدان .

لەم حەدیثەدا دەرەکەوێ کە ئەبو هورەیرەیش و ئەبانیش ، هەردوکیان ، عەرزی پێغەمەریان کردبێ - ﷺ - کە بەشی ئەوی تریان نەدا . ئەبوهورەیرە بەوە دەلیلی هێناوە کە ئەبان قاتیلی ئیبن و قەوقەلە ، ئەبانیش بەوە دەلیلی هێناوە کە : ئەبوهورەیرە قودرەتی حەربی نی یە ، لە

قه‌وم‌و عه‌شيره‌تى پێغه‌مه‌ر نى‌يه ـ ﷺ ـ تا ئيستيحقاقى ئه‌وه‌ى ببێ كه له غه‌نيمه‌ت به‌شى بۆ جوێ بكرێته‌وه .

ئه‌وى له حه‌ربا نه‌بێ‌و ، له (مؤلفة القلوب) نه‌بێ‌و ، لـه ئه‌هـلى خومس نه‌بێ له غه‌نيمه‌ت‌و نه‌فل حيصه‌ى نابێ .

**١١٩٠/٤١ أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قـال : كان أبـو طلحة لا يصوم على عهد رسول الله ـ ﷺ ـ من أجل الغزو ، فلما قبض النبي ـ ﷺ ـ لم أره مفطرا إلا يوم فِطْرٍ أو أضحى [أي يوما تشرع فيـه الأضحيه فتشمل أيام التشريق] ح/٥/٥٦ .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بوهوره‌يره ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : ئه‌بوطه‌لحـه‌ى باوه‌پياره‌ى ـ رضي الله تعالى عنه ـ له به‌ر غه‌زا له زه‌مانى پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ به‌رۆژوو نه‌ده‌بوو ، دواى وه‌فاتى پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ غه‌يرى رۆژى جه‌ژنى ره‌مه‌زان‌و قوربان‌و ئه‌يامى ته‌شريق نه‌مدى كه ئيفطار بكاته‌وه له هيچ رۆژێكا .

غه‌زا له رۆژووى نه‌فل خێرى زياتره . غه‌زا (لا أقـل) فه‌رضى كيفايه‌ته .

**١١٩١/٤٢ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قـال : جعل رزقي تحت ظـل رمحي ، وجعل الـذلة والصغـار [بـذل الجزية . قسطلاني] على من خالف أمري . ح/٥/٩٧ . طرف حديث رواه أحمد . وهنا معلق .**

**ته‌رجه‌مه :**

پێغـه‌مه‌ر - ﷺ - فـه‌رمووی : رزقی من خـراوه‌ته ژێـر سێبه‌ری رمه‌وه ، ذیلله‌ت و جیزیه‌دانیش له‌سه‌ر ئه‌و کـه‌سه‌یـه که مـوخالـه‌فه‌ی ئه‌مری من بکا .

## الجنة تحت بارقة السيوف

١١٩٢/٤٣ عن سالم أبي النضر مولى عمر بن عبيد الله [التيمي] وكان كاتبا [له] قال : كتب إليه عبدالله بن أبي أوفى ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : واعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف . ح/٥/٥٠ . م/٧/٣٢٢ .

١١٩٣/٤٤ وعنه أن عبدالله بن أبي أوفى ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كتب [إلى عمر بن عبيد الله] فقرأته : أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : إذا لقيتموهم فاصبروا . ح/٥/٥٩ . م/٧/٣٢٣ .

١١٩٤/٤٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن النبي ـ ﷺ ـ قال : لاتتمنوا لقاء العدو ، فإذا لقيتموهم فاصبروا . م/٧/٣٢٠ .

تەرجەمە كانیان :

١ ـ سالم ـ كە (أبو النضر) ی مەولای عومەری كوڕی عوبەیدوڵڵای تەیمی یە ، كاتبی عوبەیدوڵڵا بوە ، ئەفەرموێ : عەبدوڵڵای كوڕی ئەبوئەوفا بۆ عومەری نووسی كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : كە بەهەشت لە ژێر سێبەری شیرایە . یەعنی غەزاكردن بە سیلاح مووجیبی چوونەبەهەشتە .

٢ ـ ئەفەرموێ : عەبدوڵڵای كوڕی ئەبوئەوفا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بۆ عومەری كوڕی عوبەیدوڵڵای نووسی و خوێنمەوە كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : كە تووشی دوشمن بوون صەبر بكەن [هەڕا مەكەن] .

٣ ـ ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ

فەرمووی : تەمەنناى ئەوە مەكەن كە تووشى دوشمن ببن ، ئەگەر تووش بوون صەبر بكەن و [فيرار مەكەن] .

١١٩٥/٤٦ عن سالم أبي النضر مولى عمر بن عبيد الله ، وكان كاتبا له ، قال : كتب إليه عبدالله بن أبي أوفى - رضي الله تعالى عنهما - [حين خرج إلى الحرورية . ح/١٤٨/٥] فقرأته أن رسول الله - ﷺ - في بعض أيامه [غزواته] التي لقي فيها انتظر حتى مالت الشمس ، ثم قام في الناس (خطيبا) قال : أيها الناس لاتتمنّوا لقاء العدو وسلوا الله العافية ، فإذا لقيتموهم فاصبروا ، واعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف . ثم قال : اللهم منزل الكتاب ، ومجري السحاب ، وهازم الأحزاب ، إهـزمهم وانصرنا عليهم .

[وفي رواية الاسماعيلي في هذا الحديث من وجه آخر أنه - ﷺ - دعا - أيضا - أللهم أنت ربنا وربهم ، ونحن عبيدك ، نـواصينا ونواصيهم بيدك ، فاهزمهم وانصرنا عليهم . ح/١١٨/٥ ، ١٤٨ . م/٣٢٠/٧ .

(ئەم حەديثە (مغنى)يە لە سێ حەديثەكەى پێشەوە)

تەرجەمە :

سالمى مەولاى عومەرى كوڕى عوبەيدوڵڵا كە كاتبى عوبەيدوڵڵا بوو ئەفەرموێ : كە عومەر چوو بۆ سەر (حرورية) عەبدوڵڵاى كوڕى ئەبو ئەوفا - رضي الله تعالى عنهما - بۆ عومەرى نووسى و خوێنمەوە كە : پێغەمەر - ﷺ - لە بەعزێ غەزايا ، كە لەو غەزايەدا بە دوشمن گەيى تا وەقتى زەوال مونتەظير بوو ، دواى زەوال بە خەطيبى تەشريفى لەناومانا راوەستا فەرمووى : ئەى خەڵقينە تەمەنناى ئەمـە مەكـەن كە تـووشى عەدوو ببن لە خوا داواى صيحەت و عافيەت بكەن لە مەصايب ، ئەمما

که تووشی بوون صه‌بر بکه‌ن ، مه‌علوومتان بیّ که جه‌ننه‌ت له ژێر سێبه‌ری شیرایه له دواییدا فه‌رمووی : ئه‌ی خوایا ئه‌ی ئه‌و ذاته که قورئان و ته‌ورات و ئینجیلت ناردوه‌و ، به قودره‌تی خوّت هه‌ور پێنی و باران ئه‌بارێنی ، به ته‌نها جه‌ماعه‌تی کافران ئه‌شکێنی . [توّ ره‌ببی ئێمه‌یش و ره‌ببی ئه‌وانی ،[1] ئێمه هه‌موو عه‌بدی توّین ، ناوچاوانی ئێمه‌و ئه‌وان به ده‌ست توّیه] ئه‌حزاب بشکێنه‌و نوصره‌تمان بده به سه‌ریانا .

(١) ده‌بوو بیگوتایه : ئه‌وانیشی .

# حفر الخندق

١١٩٦/٤٧ أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : خرج رسول الله ـ ﷺ ـ إلى الخندق فإذا المهاجرون والأنصار يحفِرون في غداة باردة ، فلم يكن لهم عبيد يعملون ذلك لهم ، فلما رأى ما بهم من النَّصَب والجوع قال :

اللهم إن العيش عيش الآخرة    فاغفر للأنصار والمهاجرة

فقالوا مجيبين له :

نحن الذين بايعوا محمدا    على الجهاد ما بقينا أبدا

ح/٥/٦٠ . م/٧/٤٥١ . بفرق قليل لفظي .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفی له مه‌دينه چوه ده‌رێ بۆ خه‌نده‌ق ، كه چاوی پێكه‌وت ئه‌نصارو موهاجيرين له به‌يانيێكی زۆر ساردا خه‌نده‌قيان هه‌ڵه‌كه‌ند ، عه‌بديان نه‌بوو كه ئه‌و ئيشه‌يان بۆ بكا . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ كه چاوی كه‌وت به‌و ماندوويه‌تی‌و برسێتی‌يه كه بوويان فه‌رمووی : خوايا عه‌يش هه‌ر عه‌يشی ئاخيره‌ته ، كه وابێ له ئه‌نصارو موهاجير خۆش ببه . ئه‌نصارو موهاجير جوابيان دايه‌وه : كه : ئێمه ئه‌وانه‌ين به‌يعه‌تمان به محه‌مه‌د ـ ﷺ ـ كردوه له‌سه‌ر ئه‌مه تا ماوين هه‌ر جيهاد بكه‌ين .

١١٩٧/٤٨ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جعل المهاجرون والأنصار يحفرون الخندق حول المدينة وينقلون التراب على متونهم ويقولون :

نحن الذين بايعوا محمدا        على الجهاد ما بقينا أبدا
والنبي ـ ﷺ ـ يجيبهم ويقول :
اللهم لا خير إلا خير الآخرة [فاغفر . م] فبارك في الأنصار والمهاجرة ح/٥/٦٠ . م/٧/٤٥١ .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : موهاجیرو ئەنصار بە دەوری مەدینەدا خەندەقیان ئەدایەوە ، بە کۆڵ گڵیان ئەگوێزایەوەو ئەیانفەرموو : ئێمە ئەوانەین کە بەیعەتمان لە خذمەت محەمەدا ـ ﷺ ـ کردوە لەسەر ئەوە هەتا ماوین کە ئیسلام بین و موعاوەنەتی ئیسلام بکەین ، پێغەمەریش ـ ﷺ ـ جوابی ئەدانەوەو ئەیفەرموو : خوایا غەیری خێری ئاخیرەت هیچ خێر نی یە ، کە وابێ لە ئەنصارو موهاجیر خۆش ببەو بەرەکەتیان تێخە .

لە حەدیثەکەی پێشووا لە پێشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو ئەوان جوابیان ئەدایەوە ، لەم حەدیثەدا ئەنصارو موهاجیرین ئەیانفەرموو پێغەمەر ـ ﷺ ـ جوابی ئەدانەوە . کە وابێ لە هەردوو حەدیثەکە وا دەرەکەوێ کە هەردوو لا بۆ یەکتریان سەندبێتەوە .

بە شیعرو قەصیدەو رەجەز تەرغیب و تەشویق لەسەر ئیشی خێر سوننەتە .

لە غەزادا ئەوانە کە مەوجوود بن فەرقی گەورەو بوچووك نی یە ، هەموویان لەسەریان فەرزە هەرکەس بە قەدِ تاقەتی خۆی ئیش و فرمان بکا ، هیچ ئیشێ بۆ هیچ کەس عەیب نی یەو فەضیلەتەو ئەجری گەورەی هەیە

(إستحكام)و سپه‌رهه‌ڵكه‌ندن له‌ حينى حاجه‌تا فه‌رضه .

١١٩٨/٤٩ عن البراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : رأيت رسول الله ـ ﷺ ـ يوم الأحزاب ينقل التراب ، وقد وارى التراب بياض بطنه ، وهو يقول :

[والله . م] لولا أنت ما اهتدينا
ولا تصدقنا ، ولا صلينا
فأنزل (ن . م) السكينة علينا
وثبت الأقدام إن لاقينا
إن الأولى قد بغوا علينا
إذا أرادوا فتنة أبينا

ح/٥/٦٠ . م/٧/٤٥١ . وفيه : ويرفع بها صوته .

**ته‌رجه‌مه :**

به‌راء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : چاوم كه‌وت به‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له‌ رۆژى ئه‌حزابا گڵى ئه‌گوازته‌وه‌ ، تۆز سپێتى زگى موباره‌كى داپۆشيبو ، ئه‌يفه‌رموو : وه‌ڵڵاهى خوايا ئه‌گه‌ر تۆ نه‌بوويتايه‌ ، يه‌عنى هيدايه‌تى تۆ نه‌بوايه‌ ، ئێمه‌ رێى راستمان نه‌ده‌دۆزيه‌وه‌ ، نه‌ صه‌ده‌قه‌مان ئه‌دا ، نه‌ نوێژمان ئه‌كرد ، كه‌ وابێ سه‌كينه‌و قووه‌تى مه‌عنه‌ويمان بۆ بنێره‌ كه‌ له‌گه‌ڵ دوشمن به‌رابه‌ر وه‌ستاين ، پێمان ثابت بكه‌ نه‌شكێين ، به‌ ته‌حقيق ئه‌حزاب له‌ پێشا هاتوون داويانه‌ به‌سه‌رمانا ، كه‌ ئيراده‌ى ئه‌وه‌يان كرد كه‌ بمانخه‌نه‌ فيتنه‌ى كوفره‌وه‌ ئێمه‌ ئيبامان لێ‌كرد ، يه‌عنى له‌سه‌ر ئه‌وه‌ به‌ ناحه‌ق هاتوونه‌ سه‌رمان ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌م ره‌جه‌زه‌ ده‌نگى خۆيى لێ هه‌ڵه‌برى .

[فەوائیدی ئەم حەدیثەیش وەك حەدیثەكانی پێشوە]

١١٩٩/٥٠ أنس - رضي الله تعالى عنه - قال : رجعنا من غزوة تبوك مع النبي - ﷺ - ح/٥/٦١ .

عن أنس - رضي الله تعالى عنه - أن النبي - ﷺ - كان في غزاة [تبوك] فقال : إن أقواما بالمدينة خَلْفنا [وراءنا] ما سلكنا شِعْبا [طريقا في الجبل] ، ولا واديا إلا وهم معنا فيه [بالنية . ولأبي داود عن حماد : لقد تركتم بالمدينة أقواما ما سرتم من مسير ، ولا أنفقتم من نفقة ، ولا قطعتم واديا إلا وهم معكم فيه . قالوا : يا رسول الله وكيف يكونون معنا وهم بالمدينة ؟ قال قسطلاني] : حبسهم العذر [حبسهم المرض . م] ح/٥/٦١ . م/٨/١٢٠ . وفي رواية في مسلم : إلا شركوكم في الأجر . م/٨/١٢٠ .

تەرجەمە :

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - لە غەزایێكا بوو [لە ریوایەتەكەی ترا ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - لە غەزای تەبوك گەرامەوە] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : قەومێ لە مەدینەدا ماونەوە هیچ كەلێ نییە كە پیابڕۆین هیچ شیوێ نییە كە تیا بڕۆین ئیللا ئەوانیش ، بە واسیطەی نییەتیان ، لەو ناو شاخ و شیوەدا لەگەڵ ئێمەن ، [لە ئەجرا شەریكی ئێوەن . م] [لە ریوایەتی حەمادا ، كە ئەبوداود لێی ریوایەت ئەكا ، پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : لە مەدینەدا قەومێكتان بەجێ هێشتوە هیچ رێیێ نییە كە ئێوە پیا بڕۆن ، هیچ نەفەقەیێ نییە كە ئێوە بیكەن ، هیچ وادییێ نییە كە ئێوە بیبڕن ئیللا ئەوانیش لەگەڵ ئێوەن لە ئەجرو ئەوابا . عەرزیان كرد : ( یا رسول الله)

چۆن له‌گه‌ڵ ئێمه ئه‌بن ئه‌وان له مه‌دینه‌دان ؟ فه‌رمووی] : عوذر ئه‌وانی حه‌بس کردوه . لـه موسلیـما ئه‌فـه‌رموێ : نـه‌خۆشیی ئـه‌وانی حه‌بس کردوه . یه‌عنی گینا ئه‌هاتن .

ئینسان نییه‌تی خێرێکی ببیّ و عوذرێ ببیّ بـه مانیـع وه‌کوو ئـه‌و خێره‌ی کردبێ ئه‌وابی بۆ ئه‌نووسرێ به ته‌واویی .

**١٢٠٠/٥١ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : تضمن الله لمن خرج في سبيله ، لا يخرجه إلا جهادا في سبيلي وإيمانا وتصديقاً برسلي فهو عليّ ضامن أن أُدْخِله الجنة أو أُرجعه [من رجع أو ارجع] إلى مسكنه الذي خرجِ منه نائلا ما نال من أجر أو غنيمة ، والذي نفس محمد بيده ! ما من كَلْم يكلم في سبيل الله ـ تعالى ـ إلا جاء يوم القيامة كهيئته حين كُلِمَ ، لونه لون دم ، [والعَرْف (الريح) عرف المسك . م/٨/٧٩ .] وريحه مسك . والذي نفس محمد بيده لولا أن يشق على المسلمين ما قعدت خلاف سرية تغزو في سبيل الله أبدا ، ولكن لا أجد سعة فأحملهم ، ولا يجدون سعة ويشق عليهم أن يتخلفوا عني ، والذي نفس محمد بيده ! لوددت أن أغزو في سبيل الله فأقتل ، ثم أغزو فاقتل ، ثم أغزو فأقتل . م/٨/٧٦ . ح ـ ٤٢/٥ بأخصر ، والمعنى واحد .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بو هوره‌یره ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : خوا بوه به ضامنی ئه‌و که‌سه که له رێی خوادا بچێته ده‌رێ بۆ غه‌زا ، غه‌زا نه‌بیّ و ئیمان به من و ته‌صدیق به پێغه‌مه‌رانی من نه‌بیّ هیچ فکری تر له ماڵ نه‌یکردبێته ده‌رێ ، ضامنێتی ئه‌و که‌سه له‌سه‌ر منه : یا

بیخەمە بەهەشتەوە ئەگەر بکوژرێ ، یا بیهێنمەوە ئەو مەسکەنەی کە لێی چۆتە دەرێ لەگەڵ ئەمەدا کە ئەجریشی هەیەو غەنیمەتیشی دەستئەکەوێ . قەسەم بەوەی کە نەفسی محەمەد لە دەستی قودرەتیایە ! هیچ برینێ نییە کە لە رێی خوادا لە ئینسان ئەکرێ ئیللا کە کرا ئەو برینە لە رۆژی قیامەتا وەك ئەو ساعەتە ئەبێ کە کراوە ، رەنگی - رەنگی خوێنەو بۆنی - بۆنی میسکە ، قەسەم بەو ذاتەی کە نەفسی محەمەد لە دەستی قودرەتیایە ! ئەگەر لەسەر موسوڵمانان بەزەحمەت نەبوایە قەت لە دوای هیچ فیرقەیێ دانەئەنیشتم کە بچێتە غەزا لە رێی خوادا یەعنی لێیان پاش نەئەکەوتم ؛ لەگەڵیان ئەچووم بۆ غەزا ئەمما چی بکەم ؟ من ئیقتیداری ئەوەم نییە کە حەیوانیان بدەمێ و سواریان بکەم ، ئەوانیش ئیقتیداری ئەوەیان نییە کە خۆیان حەیوان تەدارەك بکەن و سواری ببن ، لە بەریشیان گران و ناخۆشە کە لە من پاشبکەون و نەیێن . قەسەم بەوەی نەفسی محەمەدی لە دەستایە حەزەکەم کە لە رێی خوادا غەزا بکەم و بکوژرێم ، لە دواییدا غەزا بکەم و بکوژرێم ، لە دواییدا غەزا بکەم و بکوژرێم .

لە ریوایەتی م/٨/٧٩ و ح/٥/٤٢ دا ئەفەرموێ : هەر برینێ کە لە رێی خوادا لە موسوڵمان بکرێ رۆژی قیامەت ئەو برینە وەك ئەو ساعەتە ئەبێ کە بریندارکراوە خوێنی لێ هەڵەقوڵێ و رەنگی خوێنەکەی رەنگی خوێنەو بۆنی بۆنی میسکە .

**١٢٠١/٥٢ عن موسى بن أنس [بن مالك - رضي الله تعالى عنه - ] قال - وذكر يوم اليمامة - : قال أتى أنس ثابتَ بن قيس [ابن شماس ، خطيب الأنصار - رضي الله تعالى عنهما - ] وقد حسر [كشف] عن فخذيه**

وهو يتحنط ، فقال : يا عم ما يحبسك ألاَّ تجيئ ؟ قال : الآن يا ابن أخي ، وجعل يتحنط ـ يعني من الحنوط ـ ثم جاء فجلس ، فذكر في الحديث إنكشافا [إنهزاما] من الناس فقال : هكذا عن وجوهنا [أي : إفسحوا لنا] حتى نضارب القوم ، ما هكذا كنا نفعل مع رسول الله ـ ﷺ ـ بئسما عوَّدتم أقرانكم ! ح/٥/٦٤ .

[روى الطبراني : أن ثابت بن قيس بن شماس ـ رضي الله تعالى عنه ـ جاء يوم اليمامة ـ وقد تحنط ولبِس ثوبين أبيضين تكفن فيهما ـ وقد إنهزم القوم ، فقال : اللهم إني أبرأ مما جاء به هؤلاء وأعتذر إليك مما صنع هؤلاء ، ثم قال : بئسما عودتم أقرانكم ، منذ اليوم خلوا بيننا وبينهم ساعة . فحمل فقاتل حتى قتل ، وكانت درعه قد سرقت ، فرآه رجل فيما يرى النائم ، فقال : إنها في قدر تحت أكاف بمكان كذا وكذا . فأوصاه بوصايا فوجدوا الدرع وأنفذوا وصاياه . وعند الحاكم : إنه أوصى بعتق بعض رقيقه . قسطلاني]

ته‌رجه‌مه :

مووسای كوڕی ئه‌نه‌سی كوڕی ماليك ـ رضي الله تعالى عنه ـ له باوكی يه‌وه ريوايه‌ت ئه‌كا ، ئه‌فه‌رموێ : باوكم به‌حثی له وه‌قعه‌ی رۆژی يه‌مامه كرد ، كه ئه‌نه‌سی باوكی چوه لای ثابيتی كوڕی قه‌يسی خه‌زره‌جيی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ثابيت ـ رضي الله تعالى عنه ـ رانی هه‌ڵماڵيبو حه‌نووطی به‌خۆيه‌وه ئه‌چه‌ن . فه‌رمووی : ئه‌ی مامه بۆچ دواكه‌وتيت‌و نايێی ؟ فه‌رمووی : وا هه‌ر ئێسته يێم ئه‌ی كوڕی برای خۆم ، خه‌ريك بوو حه‌نووطی به خۆيه‌وه ئه‌چه‌ن ، له دوايیدا هات‌و دانيشت . ئه‌نه‌سی باوكم ـ رضي الله تعالى عنه ـ له قسه‌كه‌يا به‌حثی

ئەوەی کرد کە خەڵق لە شکانا بوون ، ثابیت ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە روومان بەدەستی وای کرد ، یەعنی رێم بۆ بەتاڵ کەن ، تا لەگەڵ قەومەکەدا ، یەعنی دوشمنا ، بەیەکا بدەین . ئێمە لەگەڵ پێغەمەرا ـ ﷺ ـ وامان نەدەکرد چ عادەتێکی پیس و خراپە کە ئەقرانی خۆتان فێرکردوە !

[طەبەرانی ریوایەت ئەکا ئەفەرموێ : ثابیت ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە رۆژی وەقعەی یەمامەدا هات ، حەنووتی بەسەر خۆیا کردبوو ، دوو کفنی سپی پۆشیبو ، لەشکری ئیسلامیش شکابوون ، فەرمووی : خوایا من بەریم لەوانە کە ئەمانە هێناویانە ، یەعنی دوشمن ، عوذرخواهی ئەکەم بۆ ئەوەی کە ئەوانە کردیان . چ عادەتێکی پیسە لەم روەوە کە ئەقرانی خۆتانتان فێرکردوە ، ساعەتێ رێ چۆڵ کەن لە بەینی ئێمەو ئەوانا . ئەوەی فەرموو حەملەی برد ، شەڕی کرد تا شەهید کرا . زرێکەی دزرابوو ، پیاوێ لە خەوا چاوی پێکەوت ، لە خەوەکەیا پێی فەرمو : زرێکەم وا لە ناو دیزەییێکا لە ژێر کۆپانێکا لە جێیەکی واو وادایە ، بە بەعزێ شتیش وەصیەتی لای ئەو پیاوە کرد . ئەو جێی کە فەرمووبووی چوون گەڕان زرێکەیان دۆزییەوە ، وەصیەتەکەیان بەجێ هێنا . حاکم ریوایەت ئەکا کە وەصیەتی کردبوو بە ئازاد کردنی بەعزێ لە عەبدەکانی . قسطلاني .

# الخيل معقود بنواصيها الخير

١٢٠٢/٥٣ عن جرير بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : رأيت رسول الله ـ ﷺ ـ يلوي ناصية فرس بأصبعه وهو يقول : الخيل معقود بنواصيها الخير إلى يوم القيامة : الأجر ، والغنيمة . م/٨/٧٣ . وعن عروة البارقي ـ رضي الله تعالى عنه ـ وعن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ح/٥/٦٦ . وفي رواية عن عروة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : الخير معقوص بنواصي الخيل ، فقيل له : يا رسول الله لم ذاك ؟ قال : الأجر والمغنم إلى يوم القيامة . م/٨/٧٣ .

١٢٠٣/٥٤ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : البركة في نواصي الخيل . ح/٥/٦٧ . م/٨/٧٤ ، ن .

تەرجەمە :

جەریری کوڕی عەبدوڵڵاو ، عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ، عورووەی باریقی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەفەرموون : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : وڵاغی بەرزە خێریان بەناوچاوانەوە بەستراوە ، گرێدراوە .

لە حەدیثی جەریرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ مووی ناوچاوانی ئەسپێکی بە پەنجەی موبارەکی بائەدا ئەیفەرموو : وڵاغی بەرزە خێری بە ناوچاوانەوە گرێدراوە .

لە ریوایەتی ئەنەسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : بەرەکەت لەناوچاوانی وڵاغی بەرزەدایە .

له زه‌كاتا حه‌ديثێكى درێژ يێت (إن شاء الله) .

**الجهاد ماض مع البرِّ والفاجر لقول النبي ـ ﷺ ـ : الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة .[1] ح/٥/٦٧ .**

**ته‌رجه‌مه :**

جيهاد له‌گه‌ڵ چاك‌و خراپا ده‌وام ئه‌كا له‌به‌ر ئه‌و حه‌ديثه ؛ چونكى ئه‌فه‌رموێ : تا رۆژى قيامه‌ت خێر به‌ناوچاوانى ئه‌سپه‌وه‌يه ، ئه‌و خێره ئه‌جرو غه‌نيمه‌ته . ده‌خلى به‌سه‌ر ئه‌مه‌وه نى‌يه ئيمامى عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خه‌ليفه بێ يا . . . .

**١٢٠٤/٥٥ سهل بن سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان للنبي ـ ﷺ ـ في حائطنا فرس يقال له : اللُّحَيْف [لطول ذَنَبه] . ح/٥/٦٩ .**

**ته‌رجه‌مه :**

سه‌هل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له ناو باغى خورماى ئێمه‌دا ئه‌سپێكى بوو ناوى لوحه‌يف بوو . كلكى ئه‌وه‌نده درێژ بوو ئه‌رزى ئه‌ماڵى .

**١٢٠٥/٥٦ عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : إنما الشؤم في ثلاثة : في الفرس [إذا لم يغز عليه ، أو كان شموسا] والمرأة [إذا كانت غير ولود ، أو غير قانعة ، أو سليطة] والـدار [ذات الجار السـوء ، أو الضيقة ، أو البعيـدة عن المسجد] . [وإبقاؤه على العموم أولى] ح/٥/٧٠ .**

(١) ئه‌م قسه‌يه حه‌ديث نى‌يه‌و ، سه‌ره‌تاى بابێكى (بوخارى)يه‌و ، نووسراوه : «باب ، الجهاد ماض . .» هه‌ر له‌به‌ر ئه‌مه‌يشه دانه‌ر ژماره‌ى بۆ دانه‌ناوه .

**ته رجه مه :**

پێغه مه ر ـ ﷺ ـ فه رمووی : شه ئامه ت هه ر له سێ شتایـه : له ئه سپایه ، که غه زای له سه ر نه کرێ یا به دخولّق بێ . له ژنایه که منالّی نه بێ یا به دخولّق بێ . له خانووایه که دروایسێی خراپی ببێ ، یا ته نگ بێ ، یا دوور بێ له مزگه وت .

**١٢٠٦/٥٧ وفي أخرى عنه : أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : إن كان في شيئ ففي : المرأة ، والفرس ، والمسكن . ح/٥/٧١ .**

**ته رجه مه :**

ئه گه ر شه ئامه ت ببێ له سێ شتایه : ژن و ، ئه سپ و ، خانوو .

**عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان رسول الله ـ ﷺ ـ يكره الشِّكال من الخيل . والشكال : أن يكون الفرس في رجله اليمنى بياض وفي يده اليسرى أو في يده اليمنى ورجله اليسرى . م/٨/٧٥ .**

**ئه م حه دیثه له لای حه دیثی (الخيل معقود بنواصيها الخير) ئه نووسرێ . ئه گه ر له وێ نه منووسیبێ بینووسن .**

**ته رجه مه :**

ئه بوهوره یره ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه فه رموێ : پێغه مه ر ـ ﷺ ـ حه زی له ولاّغی راست و چه پ نه ئه کرد . راست و چه پ ئه و ولاّخه یه له پێی راست و ده ستی چه پیا یا له ده ستی راست و پێی چه پیا سپێتی ببێ .

ئـه م ته فسیـره تـه فسیـری مـوسلیمـه . نـه وه ویی ـ رحمـه الله ـ ئه فه رموێ : ئه بوعوبه یده و جومهووری ئه هلی لوغه ت ئه لّێن : شیکال : ئه وه یه سێ په لی سپی بێ ، وه ك ئه شكێلّ که له سێ په لیا ئه کرێ . ئه بو عوبه یده ئه لّێ : ته نها په لێکیشی سپی بێ بـه راست و چه پ حسێبـه .

سپێتی هەر ئەبێ لە پێدا بێ ، بێنیشانیی نابێ لە پێیدا بێ .

ئیبن و دورەید ئەڵێ : شیکال ئەبێ هەر لە لایەکیا بێ ، دەستی راست و پێی راست ، یا دەستی چەپ و پێی چەپ . ئەگەر لە چەپ و راست بێ پێی ئەڵێن : موخالیف ، پێی ناڵێن شیکال .

ئەبو عەمر ئەڵێ : بەعزێك ئەڵێن : شیکال ئەوەیە هەردوو دەستی یا هەردوو پێی سپی بێ . بەعزێك ئەڵێن : هەردوو دەست و پێیێکی سپی بێ . بەعزێك ئەڵێن : هەردو پێ و دەستێکی سپی بێ .

بۆیێکی حەز لێنەکردوە چونکی بە تەجرەبە ثابت بوە کە لەو جینسەدا نەجابەت نی یە .[1] (نووي) .

(١) دانەر ـ خ ـ ئەم حەدیثەی لە دوای بابی (جهاد وسير)ەوە ـ واتە لە دوای حەدیثی ژمارە (١٧٠/١٣١٩)ەوە نووسیوە ، دوایی ، وەك دەبینی ، دەڵێ : «ئەم حەدیثە لە لای حەدیثی (الخيل معقود بنواصيها الخير) ئەنووسرێ . . .» کە گەراینەوە سەر شوێنەکە ئەم حەدیثە نەنووسرابوو ، بۆیە لەسەر داوای دانەر وەك خۆی گواستمانەوە ئێرە .

دەبێ ئەوەیش بڵێین کە دانەر ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە دانەناوە .

## الركوب على الدابة الصعبة ، والفحولة من الخيل

١٢٠٧/٥٨ - وقال راشد بن سعد [تابعي مُقْرَئي ؛ قرية من قرى دمشق] كان السلف يستحبون الفحولة [أن يقاتلوا عليها ؛ لأنها أجرى وأجسر] ح/٥/٧٣ .

[وروى الوليد بن مسلم من طريق عبادة بن نسي أنهم كانوا يستحبون اناث الخيل في الغارات والبيات ، ولما خفي من أمور الحرب . ويستحبون الفحول في الصفوف والحصون ، ولما ظهر من أمور الحرب . قسطلاني] أثران معلقان ، وفيه حديث أبي طلحة - رضي الله تعالى عنه - .

له شه‌جاعه‌تى پێغه‌مه‌را - ﷺ - رابورد .

ته‌رجه‌مه :

راشيدى كوڕى سه‌عدى موقره‌ئى ئه‌فه‌رموێ : سه‌له‌فى صاليح بۆ غه‌زا حه‌زيان له ئه‌سپ ئه‌كرد ؛ چونكى زۆرتر هه‌ڕا ئه‌كاو جه‌سوورتره له مايين .

[وه‌ليدى كوڕى موسليم وا ريوايه‌ت ئه‌كا كه سه‌له‌ف بۆ تالآن‌و شه‌به‌يخوون‌و ئيشى په‌نهانيى حه‌رب حه‌زيان له مايين ئه‌كرد ؛ چونكه حيله‌حيل ناكاو دوشمن خه‌به‌ردار ناكا ، حه‌زيان له ئه‌سپ ئه‌كرد بۆ صه‌فى حه‌رب‌و ئيشى ئاشكرايى حه‌رب‌و موحاصه‌ره‌ى قه‌لآ . قسطلاني] .

# سهام الفرس

وقال مالك : يسهم للخيل والبرازين [غير الفرس العربي] منها [وزاد في الموطأ : والهجين] لقوله ـ تعالى ـ : ﴿والخيل والبغال والحمير لتركبوها﴾[1] ولايسهم لأكثر من فرس ح/٥/٧٣ . [أثر معلق . وهو مذهب الشافعية ، والحنابلة وأبي يوسف ومحمد . قسطلاني]

تەرجەمە :

ئیمامی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە غەنیمەت بەشی ئەسپیش جوێئەکرێتەوە ، هەجین و ولاغی بەرزەی غەیری عەرەبیش داخلی خەیلە ؛ چونکی خوا ئەفەرموێ : خوا ولاغی بەرزەو ئێسترو گوێدرێژی خەلق کردوە کە سواریان ببن . بۆ غەیری ئەسپێ سەهم نی یە . مەذهەبی (شافعی)و (حنبلي)و (أبو یوسف)و (محمد)یش ـ رحمهم الله ـ وایە .

١٢٠٨/٥٩ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ جعل للفرس سهمين ولصاحبه سهما . ح/٥/٧٤ . م/٧/٣٦٧ . ح/٦/٣٥٧ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ ئەسپ دوو حیصەی جوێ کردۆتەوە ، بۆ صاحیبەکەی حیصەیێ . یەعنی سێ حیصەی داوە بە سوار حیصەیێك بە پیادە .

[ئیمامی ئەعظەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حەز ناکەم

---

(١) النحل / ٨ .

تەرجیحی حەیوان بدەم بەسەر ئینسانا ؛ ئەسپیش وەکو صاحیبەکـەی حیصەیێکی هەیە . ئەم ئیجتیهادە خیلافی ظاهیری حەدیثەکەیە ، دەلیلی حەدیثێکی تری ئیبن‌وعومەرە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە ریوایەتی کردوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوو سەهمی عـەطافـەرموە بـە سوارە ، ئـەبوداود ریوایەت ئەکا لە ئەبوعەمرەوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ سێ سەهمی داوە بە فارس کە وابێ بەم حەدیثەو بە حەدیثە ئەووەڵەکە مەعنای حەدیثی دوەم وایە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوو سەهمی داوە بەسوارە لەبەر سوارێتی‌یەکەی غەیری سەهمی خۆی . قسطلاني]

**٦٠/١٢٠٩ عن أبي إسحاق قال رجل للبراء بن عـازب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : أَفَررْتم [أَوَلَّيتم . أخرى] عن النبي ـ ﷺ ـ يوم حنين ؟ قال : لكن رسول الله ـ ﷺ ـ لم يفرَّ ؛ إن هوازن كانوا قوما رماة ، وإنا لمَّا لقيناهم حملنا عليهم فانهزموا ، فأقبل المسلمون على الغنائم واستقبلونا بالسهام . فأما رسول الله ـ ﷺ ـ فلم يفر ، فلقد رأيته وإنه لعلى بغلته البيضاء ، وإن أبا سفيان [بن الحرث بن عبد المطلب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] آخذ بلجامها والنبي ـ ﷺ ـ يقول : أنا النبي لاكذب . أنا ابن عبدالمطلب . ح/٥/٧٤ . ح/٥/٧٩ . وفيه ولكن ولّى سرعان القوم ، فلقيهم هوازن بالنبل ، والنبي ـ ﷺ ـ . . . الحديث . . .**

**٦١/١٢١٠ وفي أخـرى : ولكنه خـرج شُبَّان أصحـابه وأخِفَّـاؤهم حُسَّراً ليس بسلاح ، فأتوا قوما رماةً جمعَ هوازن ، وبني نضر ، ما يكاد يسقط لهم سهم ، فرشقوهم ما يكادون يخطئون ، فأقبلوا هنالـك إلى النبي ـ ﷺ ـ وهو على بغلته البيضاء ، وابن عمه أبو سفيان بن الحرث بن عبدالمطلب ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقود به ، فنزل واستنصر ، ثم قال :**

أنا النبي لاكـذب ؛ أنــا ابن عبـدالمـطلب . ثم صف أصحـابــه . ح/٥/١٠٣ . وفي أخرى في آخرها : قال : فما رؤي من الناس يومئذ أشـد منـه . ح/٥/١٥٦ . وفي أخـرى : قــال رجـل من قيس . ح/٦/٣٨٨ .

**تەرجەمە :**

ئەبوئيسحاق ئەفەرموێ : پياوێ لە قەيس عەرزى بەراى كوڕى عازيبى كرد - رضي الله تعالى عنهما - : بۆ ئێوە لە رۆژى حونەينا فيرارتان كردو پێغەمەرتان - ﷺ - بەجێ هێشت ؟ فەرمووى : ئەمما پێغەمـەر - ﷺ - فيراري نەكرد ، هەوازين قەومێكى تيرئەنداز بوون ، ئێمە كـە تووشيان بووين حەملەمان بردنۆ شكـان ، موسـوڵمانـان روويان كـردە تالانكردن ، هەوازينيش بە تير بەرەورووومان هاتن ، پێغـەمەر - ﷺ - هەراى نەكرد ، چاوم پێى كەوت كە بەسەر ئێسترە سپى يەكەيەوە بوو ، ئـەبـوسـوفيـانى ئـامـۆزاى كــوڕى حـەرثى كــوڕى (عبـدالمـطلب) دەستەجڵەوەكەى رائەكێشا . پێغەمەر - ﷺ - دابەزىو دوعاى نەصرەتى كردو ئەيفەرموو : من پێغەمەرم درۆ نى يە ، كوڕى (عبدالمطلب)م . لە دواييدا صەفى بە لەشكرەكەى بەست ، بەراء ئەفەرموێ : لەو رۆژەدا كەسم نەدى كە لە پێغەمەر - ﷺ - بەشيددەتتر بێ .

لە ريوايەتێكا ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فيرارى نـەكرد ئـەمما ئەوانەى كە لە ئەصحابى ئەو جەهێڵ بوونو سووك بووونو بێ سيلاح بوون بە قەومێكى تيرئەنداز گەيين لە هەوازينو بەنىنەضـر لەوانـە كە تيريان نەئەكـەوتە سـەر ئەرز ، هيـچ تيريـان بەخـۆرايى نەئـەچوو ، تيرەبارانيان كردن ، ئەو وەختە مـوسوڵمـانەكـان روويان كـردە پێغەمـەر - ﷺ - . . . . . إلخ .

# باب المسابقة

١٢١١/٦٢ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنه - قال : أجرى النبي - ﷺ - ما ضُمِّرَ من الخيل من الحَفْياء إلى ثنية الوداع ، وأجرى مالم يضَمَّر من الثنية إلى مسجد بني زريق ، قال ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - : وكنت فيمن أجري . [وفي م/٨/٧٢ فطفف بي الفرس المسجد . . . . أي : علا ووثب إلى المسجد ، وكان جداره قصيرا - نووي] قال سفيان [الثوري] : بين الحفياء إلى ثنية الوداع خمسة أميال ؛ أو ستة ، وبين ثنيةَ إلى مسجد بني زُرَيق [قبيلة من الأنصار] ميل . ح/٥/٧٥ .

وفي رواية : [قال أبو إسحاق] فقلت لموسى [بن عقبة ، أحد الرواة] : كم كان أمدها [من الحفياء إلى الثنية] ؟ قال : ستة أميال أو سبعة قلت له [من الثنية إلى المسجد] : فكم بين ذلك ؟ قال : ميل أو نحوه .ح - ٥/٧٥ .

تەرجەمە :

ئەصحابی پێغەمەر - ﷺ - بەعزێ ئەسپیان زەعیف ئەکرد بۆ حەرب و موسابەقە . عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - موسابەقەی بە ئەصحاب ئەکرد ، ئەو ئەسپانە کە لەڕ کرابوون موسابەقەی پێ ئەکردن لە بەینی (حەفیا)و (ثنية الوداع)ا . ئەو ئەسپانەی کە قەڵەوبوون و لەڕنەکرابوون موسابەقەی پێ ئەکردن لە (ثنية)وە بۆ مزگەوتی بەنی زورەیق . سوفیان ئەفەرموێ : مابەینی حەفیاو ئەنیە پێنج یا شەش میل بوو . مابەینی ئەنیەو مزگەوتی بەنی زورەیق میلێ بوو . مووسای کوڕی عەقەبە ئەفەرموێ : مابەینی

حەفیاو ئەنیە شەش یا حەوت میلە ، بەینی ئەنیەو مەسجیدی بەنیزورەیق میلێ یا میقداری[1] میلێکە . عەبدوڵلای کوڕی عومەر ئەفەرموێ : من لەو موسابەقەدا بووم ئەسپەکەم بەسەر دیواری مزگەوتەکا بازدی داو بردمی یە ناو مزگەوتەکەوە . دیواری مزگەوتەکە نزم بوو .

**١٢١٢/٦٣ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان للنبي ـ ﷺ ـ ناقة تسمى العضباء لاتسبق . فجاء أعرابي على قَعود [وهو ما استحق الركوب من الابل من سنتين إلى ست . فيُسمى جملا] فسبقها ، فشق ذلك على المسلمين ، حتى عرفه . فقال : حقٌّ على الله أن لا يرتفع شيٌ من الدنيا إلا وضعه . ح/٥/٧٧ .**

**تەرجەمە :**

ئەنەسی کوڕی مالیك ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ وشترێکی بوو ناوی عەضبا بوو هیچ وشترێ لێی پێش نەئەکەوت . عەرەبێکی بەڕانی هات سواری وشترێکی تازەگیراو بوو ، لە موسابەقەدا لە وشترەکەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێش کەوت . ئەصحاب لەبەریان گران = بوو = پێیان ناخۆش بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرقی کرد بەوە کە ئەصحاب لە ..یان ناخۆش بوو . فەرمووی : خوا بە عیلمو ئیرادەی قەدیمەی خۆی وای موقەدەر کردوە کە لە دنیادا دەرەجەو پایەی هیچ شتێ بڵند نابێتەوەو کە لە دواییدا خوا پەستی نەکاتەوەو دای نەنەوێنێ .

ئینسان لازمە لەسەری کە خوا حورمەتی پایەییێکی پێ ئیحسان کرد

(١) لێرەدا باشتر وایە بگوترێ ، یا نزیکی میلێکە .

ئەبێ شوکری خوا بکات و ئەکەبورو غورروور نەکا ؛ گینا خوا بە تەحقیق ئەیشکێنێ .

به چاوی خۆمان گەلێکمان دی
بدولت منازو ، به نکبت منال
که این هردورازود باشد زوال[1]

(1) واتە :
بە دەوڵەت و دەستەلاتدا مەنازەو ، لە نوشوستی و کزیشدا مەناڵێنە ، ئەم دوانە ـ هەردوکیان ـ زوو لائەچن .

# رباط يوم في سبيل الله

**وقول الله ـ تعالى ـ : «يا أيها الذين آمنوا اصبروا ، وصابروا ، ورابطوا ، واتقوا الله لعلكم تفلحون . . . آخر آية آل عمران»[1] ح/٥/٨٦ .**

**تەرجەمە :**

ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ و بەوە کە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمەرانی ـ علیهم الصلاة والسلام ـ صەبر بکەن لەسەر مەصائیبو طاعات ، کە دوشمنیشتان لە حەربا صەبرو ئەباتی کرد ئێوە لە صەبرو ئەباتا غەڵەبەیان بەسەرا بکەن ، لەوان زیاتر صەبرو ئەبات بکەن بۆ جیهاد ، حەیوان بەخێو بکەن ، بە دەوام موهەییا بن لە موخالەفەی ئەمرو نەهی خواو رەسوولی خۆتان بپارێزن ، کە ئەوەتان کرد ئەمجا ئومێدی نەجاتتان ببێ .

**١٢١٣/٦٤ عن سهل بن سعد الساعدي ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : رباط يوم في سبيل الله خير من الدنيا وما عليها . وموضع سوط أحدكم من الجنة خير من الدنيا وما عليها . والروحة يروحها العبد في سبيل الله أو الغدوة خير من الدنيا وما عليها . ح/٥/٨٠ ، ٣٧ من موضع سوط إلخ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : = رۆژێ = بۆ خوا خۆحازرکردن بۆ غەزا لە دنیاو ئەوی لەسەر دنیایە چاکترە [چونکی غەزاکردن لە دنیادا

(١) سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی (٢٠٠)

مودده‌تێ ئینسان ناره‌حه‌ت ئه‌کا به موقابیلی ئه‌وه خوا به‌هه‌شتی ئه‌داتێ] جێ قه‌مچیی یه‌کێ له ئێوه له به‌هه‌شت له دنیاو ئه‌وی له‌سه‌ر دنیایه چاکتره .
ئێواره‌یێ ئینسان بۆ غه‌زا به ڕێدا بروا ، یا به‌یانی‌یێ ئینسان بۆ خوا به‌ڕێدا بروا له دنیاو ئه‌وی له‌سه‌ر دنیایه چاکتره .

[یه‌عنی ئینسان بچێ بۆ غه‌زا ئه‌گه‌ر شه‌هید نه‌کرێ مودده‌یێکی که‌م ناره‌حه‌ت ئه‌بێ ، ئه‌گه‌ر شه‌هید بکرێ دنیایێکی له کیس ئه‌چێ که مودده‌یێکی زۆر که‌مه ئه‌ویش به‌لێلیی رائه‌بوورێ ، موقابیلی ئه‌و حه‌یاتێکی ئه‌به‌دیی و جه‌نناتی عالیه‌ی پێ عه‌طا ئه‌کرێ] .

۱۲۱٤/٦٥ عن سلمان قال : سمعت رسول الله - ﷺ - [ورضي عنه] يقول : رباط يوم وليلة خير من صيام شهر وقيامه ، وإن مات جرى عليه عمله الذي كان يعمله ، وجرى عليه رزقه ، وأَمِنَ من الفُتَّان . م/۸/۱۲٥ . طبري ، د . [الفُتان : بضم الفاء جمع فاتن . وبالفتح مبالغتُه . ولفظ أبي داود أومِنَ من فتاني القبر . من نووي]

تەرجەمە :

سه‌لمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ م بیست ئه‌یفه‌رموو : شه‌وورۆژێ خۆموهه‌ییاکردن بۆ غه‌زا له رۆژووی مانگێك‌و شه‌ونوێژی مانگێ خێری زیاتره . ئه‌گه‌ر ئینسان له‌و مودده‌یه‌دا که موهه‌ییایه بۆ غه‌زا ئه‌گه‌ر بمرێ له دوای مردنیش ئه‌و رزقه‌ی که بوویه‌تی‌و ئه‌و عه‌مه‌له‌ی که کردوویه‌تی هه‌ر ده‌وام ئه‌کا بۆیی‌و قه‌طع نابێ ، له‌و مه‌لائیکانه‌ی که ئینسان مه‌فتون، ئه‌که‌ن له قه‌براو حه‌شرو نه‌شرا ئه‌مین ئه‌بێ ، هیچ فیتنه نابینێ .

[له حه‌دیثێکی غه‌یری موسلیما ئه‌فه‌رموێ : غه‌یری مورابیط

هه‌موو مردوویێ له وه‌ختی مردنا به چه عه‌مه‌لێکه‌وه مه‌شغوولْ بووبێ له‌سه‌ر ئه‌و عه‌مه‌له ئه‌برێته‌وه . عه‌مه‌لی مورابیط نابرێته‌وه تا رۆژی قیامه‌ت ده‌وام ئه‌کا . نووي] .

١٢١٥/٦٦ جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : قال رجل [للنبي ـ ﷺ ـ يوم أُحد م/٨/١٠٥] : أين أنا يا رسول الله إنْ قتلتُ ؟ قال : في الجنة . فألقى تمرات في يده ، ثم قاتل حتى قتل . م/٨/١٠٤ .

**ته‌رجه‌مه :**

رۆژی ئوحود پیاوێ عه‌رزی پێغه‌مه‌ری کرد ـ ﷺ ـ : ئه‌گه‌ر بکوژرێم من له کوێم ؟ فه‌رمووی : له به‌هه‌شتای . ئه‌و پیاوه چه‌ند خورماییێکی له ده‌ستا بوو فرێی داو ده‌ستی‌کرد به حه‌رب تا شه‌هید کرا . ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

١٢١٦/٦٧ عن أبي بكر بن عبدالله بن قيس [الأشعري ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن أبيه وهو بحضرة العدو يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إن أبواب الجنة تحت ظلال السيوف . فقام رجل رث الهيئة فقال : يا أبا موسى أأنتَ سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول هذا ؟ قال : نعم . قال : فرجع إلى أصحابه فقال : أقرأ عليكم السلام . ثم كسر جَفن سيفه فألقاه ! ثم مشى بسيفه إلى العدو فضرب به حتى قتل . م/٨/١٠٧ .

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بوبه‌کری کوری ئه‌بومووسای ئه‌شعه‌ریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ له باوکیه‌وه ریوایه‌ت ئه‌کا ، له‌و وه‌خته‌دا ئه‌بومووسا ـ رضي الله تعالى عنه ـ به‌رابه‌ر به دوشمنی وه‌ستابوو ئه‌یفه‌رموو : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : که قاپی به‌هه شت له ژێر سێبه‌ری شیرایه ، پیاوێکی

هەيئەت پەژموردە عەرزی‌كرد : ئەی ئەبوموسا تۆ ئەمەت لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ = بیست = كە ئەیفەرموو ؟ فەرمووی : بەڵێ . پیاوەكە گەرایەوە بۆ لای رەفیقەكانی دۆعاخوازیی لێكردن ، فـەرمووی : سـەلامتان لێ ئەكەم . لە پاشا كالانەی شیرەكەی شكان‌و فرێی‌دا ! دەست بەشیر چوو بۆ طەرەفی دوشمن ، بە شیرەكەی لە كوففاری دا تا شەهیدكرا .

١٢١٧/٦٨ عن جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : من يصعد الثنيـة ثنية المـرار ؟ [مهبط الحديبيـة ، والمرار شجر مرٌّ عندها] فانه يحط عنه ما حط عن بني إسرائيل . قال : فكان أولُ من صعدها خيلنا خيل بني الخزرج ثم تنامّ [كتمادّ] الناس ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : وكلكم مغفور له إلا صاحب الجمل الأحمر [جدّ بن قيس المنافق] فأتيناه فقلنا له : تعالي يستغفر لك رسول الله ـ ﷺ ـ . فقال : والله أن اَجدِ ضالّتِي أحب إليَّ من أن يستغفر لي صاحبكم . قال : وكان الرجل ينشد ضالة له . م/١٠/٢٥٧ .

تەرجەمە :

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرمـوێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : كێ سەرەكەوێتە سەر كەلی مورار ؟ [كەلێكە بەسەر حودەیبیەدا ئەچێتە خوارێ ، دارێكی تاڵی لێیە] ئەو كەسەی كە لێی سەركەوێ چە گوناهێ لە بەنی‌ئیسرائیل وەریوە ئەوەندەی گوناه لێ هەڵەوەرێ . جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەووەڵ سوارە كە سەركەوت ، سوارەی ئێمە بوو كە بەنی‌خەزرەجین ، لە دواییدا خەڵق بەرەودوا هاتن تا تەواو بوون . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمـووی : صاحیبی وشترو سوورەكە نەبێ خوا هەمووی عەفوكردوون . چووینە لای [جەدی

بنی قەیسی مونافیق] پێمان‌وت : وەرە تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیستیغفارت بۆ بکا . وتی : وەڵلاهی وشترە ونبوەکەم بدۆزمەوە لەوە لام چاترە کە رەفیقەکەتان ئیستیغفارم بۆ بکا ! جابیر ئەفەرموێ : ئەو پیاوە شتێکی لێ ون بووبوو بۆی ئەگەڕا .

ئەو پیاوە بە دوو نەوع کافر بوە :

١ ـ دۆزینەوەی وشترەکەی بە چاکتر زاینوە لە ئیستغفاری پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

٢ ـ ئیستیعمالکردنی لەفظی [صاحیبی ئێوە] بەوە تەبەڕڕی کردوە لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

خەبەردانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەوە کە خوا لەو پیاوە خۆش نابێ موعجیزەیەکی زۆر ئاشکرایە .

**١٢١٨/٦٩ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قدم من سفر ، فلما كان قرب المدينة هاجت ريح شديدة تكاد أن تدفن الراكب ! فزعم أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : بعثت هذه الريح لموت منافق ، فلما قدم المدينة فإذا منافق عظيم من المنافقين قد مات . م/١٠/٢٥٩ .**

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لە سەفەرێ هاتەوە ، کە تەشریفی لە مەدینەوە نزیك بۆوە بایێکی زۆر بە قووەت هات ، ئەوەندە بە قووەت بوو نزیك بوو کە سوار بەهیلاك بەرێت و لە ئەرزا دفنی بکا . جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەم بایە بۆیە نێرراوە کە

عەلامەت بێ بۆ ئەوە کە مونافیقێك ئەمرێ . کە تەشریفی چوەوە مەدینە مونافیقێکی گەورە لە مونافیقان مردبوو .

ئەم خەبەرەیش موعجیزەیە .

# غزو النساء

١٢١٩/٧٠ قال ثعلبة بن مالك أن عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسم مُروطا بين نساء من نساء المدينة ، فبقي مِرط جيد ، فقال له بعض من عنده : يا أمير المؤمنين أعط هذا ابنة رسول الله ـ ﷺ ـ التي عندك ، يريدون أم كلثوم بنت علي [أصغر بنات فاطمة الزهراء ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] فقال عمر : أم سَليط ـ رضي الله تعالى عنها ـ أحق . وام سليط ـ رضي الله تعالى عنها ـ من نساء الأنصار ممن بايع رسول الله ـ ﷺ ـ . قال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فإنها كانت تزفر [تحمل] لنا القرب . قال أبو عبدالله : تزفر تخيط . ح/٥/٨٢ .

تەرجەمە :

ثەعلەبەی کوڕی ئەبومالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەعزێ لیباسی خوریی و ئاوریشمی بەشەکرد لە بەینی ژنانی مەدینەدا ، تەنها لیباسێکی باش مایەوە ، بەعزێ لەوانەی کە لە خزمەتیا بوون عەرزیان کرد : ئەی (أمير المؤمنين) ئەم لیباسە بدە بەو کچی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ کە لای تۆیە ، مەقصوودیان (أم كلثوم)ی کچی حەزرەتی فاطیمەو ئیمامی عەلی بوو ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئوممو سەلیط موستەحەقترە لەو . ئوممو سەلیط ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە ژنانی ئەنصار بوو ، لەوانە بوو کە موبایەعەیان لە خزمەت پێغەمەرا کردبوو ـ ﷺ ـ . ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : چونکی ئوممو سەلیط ـ رضي الله تعالى عنها ـ کونەی بۆ هەڵئەگرتین لە موحارەبەدا . بوخاریی ئەفەرموێ : (تزفر) یەعنی

ئەیدروو .

تـەماشـای عـەدالـەت بکـە ـ رضي الله تعـالی عن فـاعلهـا ـ ! تەرجیحی حەرەمی خۆیو کچەزای پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی نەداوە بەسـەر ژنێکا کە لە حەربا کوننە ئاوی هەڵگرتبێ بـۆ موجـاهید یـا کوننـەی بۆ دروون . رووی دوشمنانی رەش بێ لە جەهەننەما .

١٢٢٠/٧١ عن الرُّبيّع بنت مُعَوِّذ ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : كنا مع النبيّ ـ ﷺ ـ نسقي ، ونداوي الجرحى ، ونردُّ القتلى إلى المدينة . ح/٥/٨٢ . ن .

تەرجەمە :

روبـەیعی کچی (معوذ) ئـەفەرمـوێ : لە غـەزادا لە خـذمەت پێغەمەرا بووین ـ ﷺ ـ ئاومان ئەدا بە ئەصحابی ، بریندارمان تەداوی ئەکرد ، شەهیدمان ئەبردەوە بۆ مەدینە .

١٢٢١/٧٢ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قـال : تَعِس [هلك] عبدالـدينـار ، وعبـدالـدرهم ، وعبـدالخميصـة [وعبدالقطيفـة . أخرى] ؛ إن أعـطي رضي وإن لم يُعْط سَخِط تعس وانتكس ، وإذا شيك فلا انتقش . طوبى لعبد آخذ بعنان فرسه [لجامه] في سبيل الله ، أشعثَ رأسه ، مغبرَّةً قدماه ، إن كان في الحراسة كان في الحراسة ، وإن كان في الساقة كان في الساقة . إن استأذن لم يؤذن له ، وإن شفـع لم يُشَفع . ح/٥/٨٤ . ح/٩/٢٣٨ ، جه . [طوبى اسم الجنة ، أو شجرة فيها] .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەهیلاك بچێ ئاڵتوون پەرستو زیو

پەرستو قەديفەو طاقە پەرست . ئەگەر شتيان بدرێتێ رازی ئـەبن ، ئەگەر نەيان‌درێتێ تووڕە ئەبن ! بەهيلاك بچێ نوخون بێتەوە ! درکێکی پياچوو بە مووکێش لێی نەيێتە دەرێ . بەهەشتو خۆشيی بۆ ئەو کەسە بێ کە لە رێی خوادا دەستەجڵەوی ئەسپی خۆيی گرتوەو ، مووی سەری تێك ئاڵۆزاوە ، هەردوو پێی تۆزاوی‌يەو ، ئەگەر لە لەشکرا لە دەستەی پێشەوا بێ هەر لە پێشەوە ئەبێ ، لە دەستەی دواوە بێ هەر لە دواوە ئەبێ . [يەعنی کەس لێی ناپرسێتەوە ماوە يا نەماوە] . ئەگەر ئيذن بخوازێ بۆ لای يەکێ ئيذن نادرێ ، ئەگەر شەفـاعەت بکـا شەفـاعەتی قـەبووڵ ناکرێ . [ئەوەندە بێ‌قيمەتە لای خەڵق] .

١٢٢٢/٧٣ عن سليمان بن يسار قال : تفرق الناس عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال له ناتل أهل الشام [تابعي ابن صحابي] : أيها الشيخ حدثني حديثا سمعته من رسول الله ـ ﷺ ـ قال : نعم . سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل أستشهد ، فأتي به ، فعرَّفه نعمه ، فعرفها ، قال : فما عملت فيهـا ؟ قال : قاتلت فيك حتى استشهدت ، قال : كذبت ، ولكنك قاتلت لأن يقال جريئ فقد قيل . ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار . ورجل تعلَّم العلم وعلَّمه ، وقرأ القرآن ، فأتي به فعرَّفه نِعَمه فعرفها . قال : فما عملت فيها ؟ قال : تعلمت العلم وعلّمتـه ، وقرأت فيـك القرآن . قال : كذبت ، ولكنك تعلمت العلم ليقـال عالم ، وقـرأت القرآن ليقال هو قارئ ، فقد قيل ، ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار . ورجل وسع الله عليه وأعطاه من أصناف المال كله ، فأتي به فعرَّفه نعمه فعرفها . قال : فما عملت فيها ؟ قال : ما تركت من سبيل

تحب أن ينفق فيها لك إلاّ أنفقت فيها . قال : كذبت ، ولكنك فعلت ليقال هو جواد ، فقد قيل ، ثم أمِر به فسحب على وجهه ثم أُلقي في النار . م/١١٢/٨ .

**ته‌رجه‌مه :**

سوله‌يمانى كوڕى يه‌سار ئه‌فه‌رموێ : خه‌ڵق له ئه‌بوهوره‌يره ـ رضي الله تعالى عنه ـ دووركه‌وتنه‌وه ، (ناتل)ى خه‌ڵقى شام عه‌رزى كرد : ياشێخ حه‌ديثێكم بۆ ريوايه‌ت بكه كه له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ت بيستبێ ، فه‌رمووى : به‌ڵێ ، له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ م بيست ئه‌يفه‌رموو : ئه‌ووه‌ڵ كه‌سێ كه رۆژى قيامه‌ت حوكمى به‌سه‌را ئه‌كرێ [سێ كه‌سن ، ئه‌وه‌ڵيان] :

پياوێكه كه شه‌هيدكراوه ، ئه‌يهێنن خوا ـ عز وجل ـ ته‌عريفى ئه‌و نيعمه‌تانه‌ى بۆ كرد كه له دنيادا پێى عه‌طا فه‌رمووبوو ، ئه‌و نيعمه‌تانه‌ى ناسى يه‌وه ، لێى پرسى : چيت له‌و نيعمه‌تانه كرد ؟ عه‌رزى‌كرد : بۆ تۆ شه‌رم له‌گه‌ڵ كوففارا كرد تا شه‌هيد بووم ، خوا ـ عز وجل ـ ئه‌فه‌رموێ : درۆت‌كرد ، بۆيێكت حه‌رب‌كرد بڵێن ئازايه وا وتيان ! له دواييدا ئه‌مر ئه‌كرێ له‌سه‌ر روو رائه‌كێشرێ تا ئه‌خرێته ناو ئاگره‌وه .

دووه‌م : يه‌كێكه ته‌عه‌للومى عيلمى كردوه ، ته‌عليمى خه‌ڵقى كردوه ، قورئانى خوێندوه ، ئه‌يهێنن خوا ـ عز وجل ـ ته‌عريفى ئه‌و نيعمه‌تانه‌ى كه پێى عه‌طا فه‌رمووبوو بۆ كرد ، ئه‌ويش ناسى يه‌وه ، خوا ـ عز جل ـ فه‌رمووى : چيت‌كرد له‌و نيعمه‌تانه‌دا ؟ عه‌رزى‌ئه‌كا : عيلم فێربووم ، فێرى خه‌ڵقم كرد ، قورئانم خوێند ، خوا فه‌رمووى : درۆت‌كرد . بۆيێكت ته‌عه‌للوم كردوه بڵێن عالمه ، بۆيێكت قورئان

خوێندوە کە بڵێن قورئان خوێنە ، وا وترا ! لە دواییدا ئەمری پێ ئەکرێ لەسەر روو رائەکێشرێ تا ئەخرێتە ئاگرەوە .

سێیەم : پیاوێکە خوا دەرووی لێ کردۆتەوە ، ئەنواعی مـاڵی پێ عەطا فەرموە ، پێنـرێتە حـوضووری خـوا - عز وجـل - تەعـریفی ئەو نیعمەتانەی بۆ ئـەکا کـە پێی عەطـا فەرمـوە . ئەیـان ناسێتـەوە ، خوا ئەفەرموێ : بەو نیعمەتانە چیت کرد ؟ عەرزی ئەکا هیچ رێی خێر نی یە کە تۆ بتەوێ کە لـەو رێیەدا مـاڵ صەرف بکـرێ و لەوەدا صـەرفی ماڵم نەکردبێ بۆ رەزای تۆ ، خوا ئەفەرموێ : درۆت کرد ، بۆیێکت کردوە کە بڵێن سەخی یە وا وترا ! لە دواییا ئەمر ئەکرێ بەسەر روودا رائەکێشرێ تا ئەیخەنە ناو ئاگرەوە .

١٢٢٣/٧٤ عن عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] أن رسول الله - ﷺ - قال : [ما من غازية أو سرية تغزو فتغنم وتسلم ، إلا كانوا قد تعجلوا ثلثي أجورهم ، وما من غازية أو سرية تخفق وتصاب ، إلا تم أجورهم . م/٨/١١٤ .] ما من غازية تغـزو في سبيل الله فيصيبـون الغنيمة إلا تُعُجِّلوا ثلثي أجرهم من الآخرة ، وإن لم يصيبوا غنيمة تم لهم أجرهم . م/٨/١١٣ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هیچ لەشکرێ یا دەستەیێك نی یە کە لە رێی خوادا غەزا بکاو بە سەلامەتی ی بێتـەوەو غەنیمـەت بێنێ و دوو بەشی ئەجرەکەی لە دنیادا پێشەکی وەرنـەگرتبێ . هیـچ لەشکـرێ یا هیـچ دەستەیێ نی یە کـە لە رێی خـوادا غەزا بکـاو غەنیمـەت وەرنەگـرێ و

بئەنگێورێو ئەجری بۆ تەواو نەکرێ .

[یەعنی ئەوی بچێ بۆ غەزا ئەگەر شەهیدکرا ئەجری تەواوی هەیە ، ئەگەر بە سەلامەتی هاتەوەو غەنیمەتی نەهێنا ئەجری لە ئەجری ئەوەی کە شەهید بوە کەمترەو ، لەوەی کە غەنیمەتی هێناوە زیاترە] . سەلامەتیی موقابیلی جوزئێکە لە ئەجرەکەی ، غەنیمەت موقابیلی جوزئێکە . کە وابێ بە غەنیمەتو سەلامەتیی دوو بەشی ئەجرەکە پێشەکی وەرئەگرێ .

١٢٢٤/٧٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : من مات ولم يغزُ ، ولم يحدث به نفسه مات على شعبة من نفاق . قال عبدالله بن المبارك [رحمه الله] : فنرى أن ذلك كان على عهد رسول الله ـ ﷺ ـ م/٨/١١٩ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەرکەسێ بمرێو غەزا نەکاو بە دڵیشیا نەیێ کە غەزا بکا ئەو کەسە لە سەر شوعبەیێ لە نیفاق ئەمرێ [یەعنی لەو صیفەتەدا وەك موونافیق ئەبێ . نووي] . عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك ـ رحمه الله تعالى ـ ئەفەرموێ : ئێمە وا ظەن ئەبەین کە ئەوە مەخصووصە بە زەمانی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ [چونکی حەربی ئەم زەمانانە هەر بۆ دنیایە ، مەقصوودی پادشاکانی دوای (أئمه)ی ئەربەعەو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى عنهم ـ صیرف ئیعلای (كلمة الله) نەبوە . بەعزێ عولەما ئەڵێن : حەدیثەکە لەسەر عموومی خۆی باقی‌یە ؛ چونکی بە هەر نەوعێ حەرب بکرێ ئیعلای (كلمة الله)ی تیایە .

کەسێ نیەتی خێرێکی ببێ و لە پێش کردنیا بمرێ ، مەثەلا نیەتی نوێژی هەیە لە ئەوەڵی وەقتەوە نایکاو ، لە ناوەڕاستی وەقتا بمرێ گوناهکار نابێ . ئەمما لە حەجا ئیختیلاف هەیە . نووي]

۱۲۲۵/۷٦ عن مصعب بن سعد قال : رأى سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن له فضلا على من دونه [من أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ ن] فقال النبي ـ ﷺ ـ : هل تنصرون وترزقون إلا بضعفائكم [بصومهم وصلاتهم ودعائهم . ن] ؟ ح/٥/٨٨ .

تەرجەمە :

موصعەبی کوڕی سەعدی ئەبو وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ [لە باوکیەوە ریوایەت ئەکا . اسماعیلی] کە سەعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ وای ظەن ئەبرد کە فەضلی هەیە بەسەر ئەو ئەصحابی پێغەمەرەدا ـ ﷺ ـ کە لە شەجاعەت و ئیقتیدارا لە خوار ئەوەوەن ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆچ ئێوە بە غەیری نوێژ و ڕۆژووو دوعای زەعیفەکان هیچ نەصرەتتان ئەبێ و رزقتان ئەدرێتێ ؟

[عیبادەت و دوعای فەقیری صاڵح بەرەکەتی هەیە بۆ خەڵقی تر] .

۱۲۲٦/۷۷ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن النبيّ ـ ﷺ ـ قال لأبي طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : إلتمِسْ غلاما من غلمانكم يخدمني حتى أخرج إلى خيبر ، فخرج بي أبو طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ مُردِفِيَّ وأنا غلام راهقت الحلم ، فكنت أخدم رسول الله ـ ﷺ ـ إذا نزل ، فكنت أسمعه كثيرا يقول : أللّهم إني اعوذ بك من الهمِّ والحَزَنِ ، والعَجْز والكسل ، والبُخْل والجُبْن ، وضَلَع الدَّيْن [ثقله] وغلبة الرجال . ثم قدمنا خيبر ، فلما فتح الله عليه الحصن [المسمى بالقموس]

ذكر له جمال صفية بنت حُييّ بن أخطب ، وقد قتل زوجها [كنانة بن أبي الحقيق] وكانت عروسا ، فاصطفاها رسول الله ـ ﷺ ـ لنفسه ، فخرج بها حتى بلغنا سدَّ الصهباء حلَّتْ [طهرت من الحيض] فبنى بها ثم صنع حيسا [خورماو رۆن به پەنیر] في نطع صغير ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ : آذن من حولك ، فكانت تلك وليمة رسول الله ـ ﷺ ـ على صفية ـ رضي الله تعالى عنها ـ .

ثم خرجنا إلى المدينة قال فرأيت رسول الله ـ ﷺ ـ يُحوِّي لها وراءه بالعباءة ، ثم يجلس عند بعيره فيضع ركبته فتضع صفية ـ رضي الله تعالى عنها ـ رجلها على ركبته حتى تركب فسرنا حتى إذا أشرفنا على المدينة نظر إلى أُحد فقال : هذا جبل يحبنا ونحبه ، ثم نظر إلى المدينة فقال : أللهم إنِّي أُحرِّم مابين لابتيها بمثل ما حرَّم إبراهيمُ مكة [إلا في وجوب جزاء الصيد] . أللّهم بارك لهم في مدِّهم وصاعهم . ح/٥/٨٧ ـ ح/٦/٧٦ ـ ح/٩/١٩٩ مختصرا بدون حديث صفية ـ رضي الله تعالى عنها ـ

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری کرد بە ئەبو طەلحە : غولامێکم بۆ دۆزەرەوە لە غولامانی خۆتان ، خذمەتم بکا تا ئەچم بۆ خەیبەر . ئەبو طەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ منی سواری پاشکۆی خۆی کردو بردمی ، من ئەو = وەختە = نزیکی باڵغ بوونم بوو . کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دائەبەزی خذمەتم ئەکرد ، زۆر جار لێم = ئەبیست = ئەم دۆعایەی ئەفەرموو کە مەعنای وایە : ئەی خوایە لە غەم و دڵتەنگی و عاجزبوون و سستێتی و بەخیلی و ترسنۆکی و ، باری گرانی

قەرزو ، غاڵببوونی خەڵق بەسەرما . . پەنا ئەگرم بە تۆ .

لە دواییا گەیینە خەیبەر کە خوا قەڵاکەیی بۆ فەتح کردین بەحثی جەماڵو جوانیی صەفیەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەبیان بۆ کـرد . مێردەکەی کە کەنانەی کوڕی ئەبوحەقیق بوو کوژرا بوو ، = صەفیە = بووك بوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئینتیخابی کرد بۆ خۆی . لە خزمەت خۆیا لە خەیبەر بردی‌یە دەرێ ، تا گەیینە سەددی صەهباء . لە حەیز پاك بۆوە حەڵاڵ = بوو = بۆی . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەوێ تەشریفی چوە زەفافەوە . لە دواییدا خـورماورۆنی بـە پەنیـری بۆ کـرد . ئەمجـا پێغەمـەر ـ ﷺ ـ = ئـەمـری = پێ کـردم : خـەڵقی ئـەطـرافی خـۆت بـانـگ بکـە [بـۆ نانخواردن] . ئەو خورماو ڕۆنە چێشتی شایی پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ کە کردی بۆ صەفیە ـ رضي الله تعالی عنها ـ .

لە پاشا چووین بۆ مەدینە چاوم کەوت بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە پشت خۆیەوە عەباکەیی بۆ ئەکرد بە پەردە تەشریفی لای وشترەکەی دائەنیشت ئەژنۆی موبارەکی دائەنا ، صەفیە ـ رضي الله تعالی عنها ـ پێی ئەنایـە سەر ئەژنۆی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ وسوار ئەبو ، ڕۆیین تا لە مەدینە نـزیك بـووینەوە ، پێغـەمەر ـ ﷺ ـ تـەمـاشـای ئـوحـودی فـەرمـوو ، فـەرمووی : ئـەمە شـاخێکە ئێمـەی خۆش ئـەوێو ئێمەیش ئـەومان خۆشەوێ . لە پاشا تەماشای مەدینەی فەرموو ، فەرمووی : خوایا من مابەینی ئەم دوو شاخی مەدینەیە حەرام ئەکەم [لەوە خراپەی تیا بکرێ حـەربی تیا بکـرێ] وەکوو چـۆن ئیبراهیم ـ علیـە السلام ـ مـەککەی حەرامکرد . خوایا بەرەکەتیان بۆ بخەیتە (مُدّ)و ربەیان .

خزمەتکار راگرتن دروستە . ئیش‌وفرمان بە هـەتیو سپـاردن بە

موقابيلى ئوجرەت دروستە .

بۆ ئەميرى لەشكر ئينتيخابكردنى (جاريه)و عەبد لە ئەسير دروستە بە قەد بەشى خۆى .

ژنى حەربيى عيددەى پێ ناوێ .

ضيافەتى شايى دواى زەفاف سوننەتە .

(بالذات) موعاوەنەتى ئەهلو بەيت سوننەتە .

دۆعاكردن بە خەير بۆ ئەهلى وەطەن سوننەتە .

ئيستيعـاذە لەوانـەى پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ ئيستيعـاذەى لێ كـردوون سوننەتە .

ئيمامى نەوەوى ـ رحمه الله ـ لە ئەذكارا ريوايەت ئەكا كە قەرزار بە قەد كێو قەرزى بەسەرەوە بێ بە دەوامكردن لەسەر ئەو دۆعايە خوا ـ عز وجل ـ قودرەتى ئەوەى ئەداتێ كە قەرزەكەى بداتەوە .

**١٢٢٧/٧٨ عن أبي أسيد ـ رضي الله تعالى عنـه ـ قال : قـال النبي ـ ﷺ ـ يوم بدر حين صففنا لقريش وصَفّوا لنا : إذا أكثبوكم [دنوا منكم] فعليكم بالنبل . وفي أخرى فارموهم واستبقوا نبلكم . ح/٦/٢٤٨ .**

**تەرجەمە :**

پێغـەمەر ـ ﷺ ـ رۆژى بـەدر ، كە ئێمـە صەفمـان بـەست بـۆ قورەيشو ئەوان صەفيان بەست بۆ ئێمە ، فەرمووى : كە لێتان نزيك بوونەوە ئەوەندەى تيريان بگاتێ ئەوو وەختە تيرەبارانيان بكەن ، تيرەكانتان بەخەسار مەدەن تا لێتان نزيك نەبنەوە تيريان تێ مەگرن ، تيرەكانتـان بهێڵنەوە .

**١٢٢٨/٧٩ عن سهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما كسرت بيضة**

**النبي ـ ﷺ ـ على رأسه ، وأدمي وجهه ، وكُسِرت رباعيته وكـان علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ يختلف بالماء في المجنّ ، وكانت فاطمة ـ رضي الله تعالى عنها ـ تغسله ، فلما رأت الدم يزيد على الماء كثرة عَمَدت الى حصير فأحرقتــه[حتى صارت رمادا . طبراني] وألصقتها على جـرحه ، فـرقأ الدم . ح/٥/٩٢ .**

**ته رجه مه :**

سه هل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه فه رموێ : كه كلاوزرێی پێغه مه ر ـ ﷺ ـ له سه ریا شكاو ، دەم وچاوی موباره كی خوێنی پیاهاته خوارێ و ، ددانی موباره كی ته نیشت ددانی پێشه وه ی شكاو ، حه زره تی عه لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ له قه ڵغانا ئـاوی ئه هێنـاو ئه مبـه رو ئه وبـه ری ئه كـرد . حه زره تی فاطیمه ـ رضي الله تعالى عنها ـ برینه كانی ئه شت ، كه حه زره تی فاطیمه ـ رضي الله تعالى عنها ـ چاوی كه وت به وه كه خـوێنه كـه ی له ئاوه كه زیاتره پارچه یێ حه سیری هێناو سووتانی ، تا بوو به خـۆڵه مێش نووسانی به برینه كه یه وه خوێنه كه ی وه ستایه وه .

**١٢٢٩/٨٠ عن عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كانت أموال بني النضير مما أفاء الله على رسوله ـ ﷺ ـ مما لم يوُجف المسلمون عليه بخيل ولا ركاب ، فكانت لرسول الله ـ ﷺ ـ خاصة ، وكان ينفق على أهله نفقـة سنته ثم يجعـل ما بقي في السـلاح والكُراع عـدة في سبيل الله . ح/٥/٩٢د ، ت ، ن .**

**ته رجه مه :**

ئیمامی عومه ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه رمووی : ماڵی به نی نه ضیر له وانه بوو كه خوا ـ عز وجل ـ دابووی به پێغه مه ر ـ ﷺ ـ ، له و ماڵه بوو كه موسوڵمان به سیلاح و سواره و وڵاغ په یدایان نه كردبوو ، ئه و ماڵه خاص

بوو بە نەفسی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەوە نەفەقـەی ساڵی ماڵو منالی لێ ئەکێشا ، لە دواییا باقیەکەی صەرفی سیلاحو حەیوان ئەکرد تا حازریو تەدارەك بێ بۆ رێی خودا .

ذەخیرەدانان بۆ ساڵێ بە بێ کەراهەت دروستە .

لە پێش حەربا موهەییابوونو تەدارەکی وەسائیلی حەرب لازمە .

**١٢٣٠/٨١ شعبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ يقول : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ وهو على المنبر يقول : ﴿وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة﴾[1] . [الآية ،] ألا إن القوة الرمي ، ألا إن القوة الرمي ، ألا إن القوة الرمي . م ـ ١٢٨/٨ .**

**تەرجەمە :**

شوعبە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست تەشریفی لەسەر مینبەر بوو ئەیفەرموو . . . ئەم ئایەتی بەرائەتەی خوێندەوە کە مەعنای وایە : لە قووەت چیتان لە دەست بێ بۆیان حازر بکەن . ئەیفەرموو : خـەبەرتـان ببێ کە قـووەت تیرهـاویتنە . (سێ دەفعەی فەرموو) .

رمو نێـزەو شیرو قـەڵغـانو خـەنجـەرو سـائیـری ئـەسلیحـەو سواریی‌و . . . بۆ ئەم زەمانە : تۆپو ، تفەنگو ، تەیارەو ، واپۆری حەربو ، بۆمباو ، تانقو ، مەترالیۆزو ، شەمەندەفەرو . هەرچی بۆ حەرب لازمو بەکارە هەمووی بۆ جیهاد فەرزە ، بە دەرەجەی ئیقتیدارو حاجەت .

**١٢٣١/٨٢ عن عقبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : سمعت**

(١) الأنفال / ٦٠ .

رسول الله - ﷺ - يقول : ستفتح عليكم أَرَضون ، ويكفيكم الله ، فلا يعجز أحدكم أن يلهو بأسهمه . م/٨/١٢٩ .

**ته‌رجه‌مه :**

عه‌قه‌به - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له پێغه‌مه‌رم بيست - ﷺ - ئه‌يفه‌رموو : له‌مه‌ولا گه‌لێ ئه‌رزتان بۆ فه‌تح ئه‌كرێ ، خوا كافيه بۆ ئێوه . كه وابێ له‌وه عاجز مه‌بن كه به تيره‌كانتان ياريى بكه‌ن .

مه‌قصوود له تير موطلّه‌قى سيلاح و سائيرى ئه‌سبابى حه‌ربه . ئه‌و وه‌خته سيلاحى زۆر موهيم تير بوه ، رم‌و ، شيرو ، خه‌نجه‌ر نـزيكاو نزيك ئه‌بێ ، تير دووراو دوور ئه‌بێ . ته‌وه‌قوفى به‌ستۆته سه‌ر مه‌هاره‌ت له تيرئه‌نـدازيى و نيشـان‌شكـانن . ئێستـه لـه جيێ ئـه‌وانـه : تـۆپ‌و ، تفه‌نگ‌و ، بۆمباو ، ئه‌مثالى هه‌يه .

**١٢٣٢/٨٣** فقيم اللخمي قال لعقبة بن عامر - رضي الله تعالى عنه - : تختلف بين هذين الغرضين وأنت كبير يشق عليك . قال عقبة - رضي الله تعالى عنه - : لولا كلام سمعته من رسول الله - ﷺ - لم أعانيه [وبحذف الياء] قال الحرث فقلت لابن شَماسة [الراوى عن فقيم] : وما ذاك ؟ قال : إنه قال : مَنْ عَلِمَ الرميَ ثم تـركه فليس منـا ، أو قد عصى . م/٨/١٢٩ .

**ته‌رجه‌مه :**

ئيبن‌وشه‌ماسه - رحمه الله - ئه‌فه‌رموێ : فه‌قيمى له‌خمى ى عه‌رزى عه‌قه‌به‌ى كوڕى عاميرى كرد - رضي الله تعالى عنه - : تۆ هاتوچۆ ئه‌كه‌ى له به‌ينى ئه‌م دوو هه‌ده‌فه‌دا تۆيش پيرى زه‌حمه‌ته له‌سه‌ر تۆ . عـه‌قه‌بـه - رضي الله تعالى عنه - فه‌رمووى : ئه‌گه‌ر قسه‌يێ نه‌بوايه كه له پێغه‌مه‌رم بيستـوه - ﷺ - ئه‌و زه‌حمـه‌ته‌م نـه‌ئه‌كێشـا . حه‌رث ئـه‌فه‌رمـوێ : بـه

ئیبن وشەماسەم وت : ئەو قسەیە چیە ؟ فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - فەرموویەتی : هەرکەسێ تیرئەندازیی بزانێو تەرکی بکا ئەوە لە ئێمە نییە [یەعنی لەسەر ئەخلاقی ئێمە نییە] یا فەرمووی : بە تەحقیق ئەو کەسە گوناهکار ئەبێ .

[عیلمی حەرب فێربوون لازمە ، لە دوای فێربوون لە فکری خۆبردنەوەی حەرامە . ]

١٢٣٣/٨٤ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - : إذا سافرتم في الخِصْب فأعطوا الابل حظها من الأرض ، فإذا سافرتم في السَّنة فبادروا بها نقيّها [فأسرعوا عليها السير . أخرى] وإذا عرَّستم فاجتنبوا الطريق ؛ فإنها طرق الدواب ، ومأوى الهوام بالليل . م/٨/١٣٣ .

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : کە لە فەرەحیداو گیازۆریدا سەفەرتان کرد حەزی وشتر بە تەواوی بەجێ بێنن ، یەعنی بە تەواوەتی بیلەوەڕێنن ، ئەگەر لە وەختی بێگیایی و بێپووشیدا سەفەرتان کرد عەجەلە بکەن کە زوو بیانگەیێننە جێی فەرەحی . [یەعنی مەبادا وشترەکانتان برسییان ببێ و پەکیان بکەوێ ریعایەت و تەماشاکردنی حەیوان لازمە . ئیحتیاط لازمە] کە لە ئاخری شەوا بۆ ئیستیراحەت بارتان خست لە رێ لابدەن ؛ چونکی رێ جێی مارو مێرووەو رێی حەیواناتە .

١٢٣٤/٨٥ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - قال : السفر قطعة من العذاب : يمنع أحدكم نومه وطعامه

**وشرابه ، فإذا قضى أحدكم نَهْمته من وجهه فليعجل إلى أهله .**
**م/٨/١٣٥ .**
**ته‌رجه‌مه :**

پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : سه‌فه‌ر پارچه‌یێكه له عه‌ذاب ؛ چونكی مه‌نعی خه‌وو له‌ذه‌ت زانین له خۆراك و ئیستراحه‌ت له ئێوه ئه‌كا . [سه‌رماو گه‌رماو ماندویێتی و ترس و دووركه‌وتنه‌وه‌ی له مال و منال و ئه‌حباب یێنێ به‌سه‌ر ئینسانا] كه له سه‌فه‌ره‌كه‌تان ئیحتیاجیتان به‌جێ هێنا گورج بگه‌ڕێنه‌وه بۆ لای مال و منالتان .

**١٢٣٥/٨٦ عن أنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - كان لايطرق أهله ليلا ، وكان يأتيهم غدوة أو عشية .**
**م/٨/١٣٥ .**
**ته‌رجه‌مه :**

پێغه‌مه‌ر - ﷺ - له سه‌فه‌ر ته‌شریفی بهاتایه‌وه له‌ناكاو به‌شه‌و نه‌ئه‌چووه‌وه بۆ ماڵه‌وه ، یا به‌یانی یا ئێوارێ ته‌شریفی ئه‌چووه‌وه .

**١٢٣٦/٨٧ عن جابر بن عبدالله - رضي الله تعالى عنهما - قال : كنا مع رسول الله - ﷺ - في غزاة ، فلما قدمنا المدينة ذهبنا لندخل . قال : أمهلوا حتى ندخل ليلا أي عشاء كي تمتشط الشعثة ، وتستحد المغيبة .**
**م/٨/١٣٦ .**
**ته‌رجه‌مه :**

جابر - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له غه‌زایێكا له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را بووین - ﷺ - كه هاتینه‌وه مه‌دینه ته‌مامان بوو نه‌وه‌ستین و بچینه‌ماڵه‌وه . پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : جارێ صه‌بر بكه‌ن تا ئێوارێ بچینه‌وه ؛ بۆ خاتری ئه‌وه ئه‌وه‌ی كه پرچی تێك ئالۆزاوه پرچی داهێنێ ،

ئەوی ئیحتیاجی بە گوێزانو ئەوانە هەیە گوێزان لە عەمەل بێنێو خۆی پاك بكاتەوە . م/١٣٨/٨ .

١٢٣٧/٨٨ وعنه قال : نهى رسول الله - ﷺ - إذا أطال الرجل الغيبة أن يأتي أهله طُروقا . م/١٣٦/٨ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - نەهی كردوە لەوە كە پیاو غەیبوبەتی طوولی كێشا[1] لە ناكاو بچێتەوە ناو ماڵو منالی .

١٢٣٨/٨٩ عن جابر - رضي الله تعالى عنه - قال : نهى رسول الله - ﷺ - أن يطرق الرجل أهله ليلا ، يتخونهم [أو يلتمس عثراتهم . أخرى] أو يطلب عثراتهم . قال سفيان : لا أدري هذا في الحديث أو لا ؟ يعني : أن يتخونهم أو يتلمس عثراتهم . م-١٣٦/٨ .

**تەرجەمە :**

جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - نەهی فەرموە لەوە كە ئینسان بە شەو لە پڕ بچێتە ماڵەوە بۆ خاتری ئەمە بزانێ كە ماڵو منالەكەی خیانەتی دەرحەق ئەكەن ؟ فەرمووی : تا بزانێ زەللەو مەللە ئەكەن یان نا ؟

سوفیان ئەفەرموێ : نازانم كە طەڵەبی = زانینی = خیانەتو (إطلاع) بە سەر زەللەیانا لە حەدیثەكەیە یان نا ؟

[لە حەدیثێكی تری جابیرا - رضي الله تعالى عنه - ئەو لەفظە نیە] .

---

(١) یانی كە پیاو لە سەفەرا زۆری پێچوو كاتێ هاتەوە لە پڕ خۆی نەكاتەوە بەماڵدا .

له‌م حه‌ديثانه‌دا ئه‌فه‌رموێ : ئينسان به‌هه‌ر فكرێ بێ كه له سه‌فه‌ر هاته‌وه نه‌دا به‌سه‌ر ماڵو منداڵا ، ئه‌وه‌نده صه‌بر بكا كه خه‌ڵق بزانن كه هاتوه‌ته‌وه . ماڵو مناڵيش پێ بزانن تا ته‌داره‌كي يان بۆ بكه‌ن . له ماڵو مناڵيش نه‌كه‌وێته شكه‌وه‌و ته‌فتيشى ئه‌حواڵيان نه‌كا بزانێ زه‌لله‌و خه‌يانه‌تيان هه‌يه يان نا ؛ چونكى ئه‌وه مونافيى حوسنى عوشره‌ته .

**١٢٣٩/٩٠ أبو أمامة [صُديّ الباهلي ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : لقد فتح الفتوح قومٌ ما كانت حلية سيوفهم الذهب ولا الفضة . إنما كانت حليتهم العلابي [جميع عِلباء . عصب في عنق البعير] والآنك [الرصاص] والحديد . ح ـ ٥/٩٥ ، جه .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بو ئومامه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : به‌عزێ قه‌وم له صه‌حابه ـ رضي الله تعالى عنهم ـ گه‌لێ فه‌تحيان كردوه زينه‌تى شيره‌كانيان نه‌ ئاڵتوون بوه‌و نه زيو . زينه‌تيان : ره‌گى ملى وشترو ، قورقوشمو ، ئاسن بوه .

**١٢٤٠/٩١ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن عبدالرحمن بن عوف والزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ شَكَوا إلى النبي ـ يعني القُمَّل ـ فأرخص لهما في الحرير . فرأيته عليهما في غزاة . ح/٥/٩٩ . م ـ ٨/٣٨٨ ، جه ، د ، ن .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : عه‌بدوره‌حمانى كورى عه‌وفو زوبه‌ير شكاتى ئه‌سپێ زۆرييان له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌را كرد ـ ﷺ ـ ئيذنى دان كه ئاوريشم بپۆشن . له غه‌زايێكا چاوم پێكه‌وت كه ئاوريشميان له‌به‌را بوو .

له حینی حاجه تا ئاوریشم له به رکردن بۆ پیاو حه لاّله .

١٢٤١/٩٢ جويرية عن نافع قال : قال ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : رجعنا من العام المقبل [الذي بعد صلح الحديبية إليها] فما اجتمع منا اثنان على الشجرة التي بايعنا تحتها ، كانت رحمة من الله ، فسألت نافعا : على أي شيء بايعهم ؟ على الموت ؟ قال : لا ، بايعهم على الصبر . ح ـ ١١٦/٥ .

ته رجه مه :

جوه یریه له نافیعه وه ئه ویش له ئیبن و عومه ره وه ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ریوایه ت ئه کا سالّی دوای صولّحی حوده ییبیه گه ڕاینه وه بۆ ئه و جێیه ی که به یعه تی ریضوان له ژێر درخته که یا کرابوو ، دوو که س له ئێمه ئیتیفاقیان نه کرد له سه ر جێیه که ی ، که س نه یزانی له کوێیه . شاررانه وه ی جێیه که ی ره حمه تێ بوو له طه ره ف خواوه [چونکی جاهیلاّن ته عظیمیان ئه کرد .] جوه یریه ئه فه رموێ : له نافیعمان پرسی : له سه ر چی به یعه تیان له خذمه ت پێغه مه را ئه کرد ؟ له سه ر مردن بوو ؟ نافیع ـ رحمه الله ـ فه رمووی : خه یر له سه ر صه برو ئه بات موبایه عه ی له گه لّ فه رموون .

١٢٤٢/٩٣ عن أبي عثمان [النهدي] قال : حدثني مجاشع قال : أتيت النبي بأخي [مجالد أبي معبد] بعد الفتح ، قلت : يا رسول الله جئتك بأخي لتبايعه على الهجرة . قال : ذهب أهل الهجرة بما فيها [مضت الهجرة لأهلها] . فقلت : على أي شيئ تبايعه ؟ قال : أبايعه على الاسلام والايمان والجهاد . [قال أبو عثمان . أخرى] : فلقيت أبا معبد (مجالدا) بعدُ ، وكان أكبرهما ، فسألته ، فقال : صدق مجاشع . ح ـ ٣٨٥/٦ ، ح ـ ١١٧/٥ ، م ـ ٦٢/٨ .

تەرجەمە :

ئەبوعوثمانی نەهەدیی ئەفەرمویٚ : موجاشیع : قسەی بۆکردم ، فەرمووی : کە موجالیدی برای خومم لـە دوای فەتـح بردە خـذمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزم کرد : (یا رسول الله) موجالیدی برامم هێناوەتە خذمەتت کە لەسەر هیجرەتکردن موبـایەعـەی لەگـەڵ بفەرمـووی ، پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەهلی هیجرەت ئەوابی هیجرەتیان بـرد بۆ خۆیان ، هیجرەت بۆ ئەهلی خۆی رابورد . [یەعنی دوای فەتح هیجرەت نەماوە] عەرزم کرد : ئەی لەسەر چی بەیعەتی لەگـەڵ ئەفـەرمووی ؟ فەرمووی ؛ لەسەر ئیسلامو ، ئیمانو ، غەزا بەیعەتی لەگەڵ ئەکەم ، ئەبوعوثمان ئەفەرمویٚ : لەدوای ئەوە بە ئەبومـەعبەد - کـەموجـالیدی برای موجـاشیعە - گـەییم لێم‌پرسی ، فـەرمووی : مـوجاشیـع راستی کردوە .

**١٢٣٤/٩٤ عن سلمـة بن الأكـوع [فـارس النبي ، ومن شجعـان الصحابة - ﷺ - [ورضي عنهم] أنه دخل على الحجاج ، فقال : يا ابن الأكوع ارتددت على عقبيك ؟ تعربت ! قال : لا ، ولكن رسـول الله - ﷺ - أذن لي في البدو . م - ٨/٦١ .**

تەرجەمە :

سەلەمەی کوری ئەکوەع - رضي الله تعالى عنه - ئـەفەرمـویٚ : چوومە لای حەججاج ، فلٚتانی : ئەی (ابن الأكوع) پاشەوپاش لەدین گەراویتەوە ؟ فەرمووی : پێم‌وت : خەیر لە دین وەرنەگەراوم ، نەبووم بە عەرەبی بەرانی ، ئەمما پێغەمەر - ﷺ - ئیذنی‌داوم کە لە چۆڵا دانیشم .

(١) ئەم حەدیثە بە ژمارە ١٢٤٣/٩٤و١٢٤٦/٩٧ یش دووپات دەبێتەوە .

١٢٤٤/٩٥ عن مَعْقل بن يسار ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لقد رأيتني يوم الشجرة ، والنبي ـ ﷺ ـ يبايع الناس وأنا رافع غصنا من أغصانها عن رأسه ، ونحن أربع عشرة مائة . قال : لم نبايعه على الموت ، ولكن بايعناه على أن لانفر . م/٨/٥٩ .

ته‌رجه‌مه :

مه‌عقه‌لی کوڕی یه‌سار ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : به ته‌حقیق رۆژی به‌یعه‌تی (شجرة الرضوان) خۆمم دی که پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌یعه‌تی له‌گه‌ڵ خه‌ڵقا ئه‌فه‌رموو ، لقێکم له‌و داره به‌رزکردبۆوه له سه‌ری پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ [که له سه‌ری موباره‌کی نه‌که‌وێ] ئێمه چوارده‌صه‌د بووین [یه‌عنی هه‌زارو چوارصه‌د بووین] فه‌رمووی : له‌سه‌ر مردن به‌یعه‌تمان له خذمه‌تا نه‌کرد ، ئه‌مما له‌سه‌ر ئه‌مه که فیرار نه‌که‌ین به‌یعه‌تمان له خذمه‌تا کرد .

١٢٤٥/٩٦ عطاء [بن أبي رباح ـ رحمه الله ـ] يقول ذهبت مع عبيد بن عمير إلى عائشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ وهي مجاورة بثبير ، فقالت لنا : انقطعت الهجرة منذ فتح الله على نبيه ـ ﷺ ـ مكة . ح ـ ١٧٨/٥ .

ته‌رجه‌مه :

عائیشه[1] ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : له‌و وه‌خته‌وه که خوا مه‌که‌ی بۆ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌تح کرد هیجره‌ت براوه‌ته‌وه .

---

(١) دانه‌ر ـ خ ـ مانای سه‌ره‌تای حه‌دیثه‌که‌ی نه‌کرد که ئه‌مه‌یه : عه‌طای کوڕی ئه‌بوره‌باح ئه‌ڵێ : له‌گه‌ڵ عوبه‌یدی کوڕی عومه‌یرا چووین بۆ لای عائیشه ـ خ ـ ئه‌ویش له لای کێوی (ثبیر)دا بوو . . . .

١٢٤٦/٩٧ يزيد بن أبي عبيد ـ رحمه الله ـ عن سلمة [بن الأكوع] ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بايعت النبي ـ ﷺ ـ ثم عدلت إلى ظل الشجرة ، فلما خفَّ الناسُ قال : يا ابن الأكوع ألاتبايع ؟ قلت : قد بايعت يا رسول الله . قال : وأيضا . فبايعته الثانية . فقلت له : يا أبا مسلم على أي شيء كنتم تبايعون يومئذ ؟ قال : على الموت [أي على أن لانفرَّ وإن أنتجَ الموتَ ؛ لأن نفس الموت ليس مقصودا .] ح ـ ٥/١١٦ .

ته‌رجه‌مه :

یه‌زیدی کوڕی ئه‌بوعوبه‌ید ـ رحمه الله ـ ئه‌فه‌رموێ : سه‌له‌مه‌ی کوڕی ئه‌کوه‌ع ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : به‌یعه‌تم له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را کرد ـ ﷺ ـ ، له دواییدا چووم بۆ ژێر سێبه‌ری شه‌جه‌ره‌ی ریضوان ، که خه‌ڵق سووك بوون پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : ئه‌ی (ابن الأكوع) به‌یعه‌ت ناکه‌ی ؟ عه‌رزم کرد : (يا رسول الله) به‌یعه‌تم کرد ، فه‌رمووی : دووباره . دووباره به‌یعه‌تم له خذمه‌تا کرده‌وه .

یه‌زید ئه‌فه‌رموێ : عه‌رزم کرد : ئه‌ی ئه‌بامو‌سلیم ئه‌و وه‌خته له‌سه‌ر چی به‌یعه‌تتان له خذمه‌تا ئه‌کرد ؟ فه‌رمووی : له‌سه‌ر مردن . [یه‌عنی له‌سه‌رئه‌مه که له حه‌ربا فیرار نه‌که‌ین ، ئه‌بات بکه‌ین ؛ چونکی مه‌قصوود له حه‌رب هێنانی گومرایه بۆسه‌ر رێی حه‌ق و ته‌نکیلی کوففاره ، خۆبه‌کوشتدان مه‌قصوود نی‌یه] .

١٢٤٧/٩٨ عن عبدالله بن زيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما كان زمن الحرة [يوم أباح يزيد ـ لعنه الله ـ مدينة الرسول ـ ﷺ ـ وفعل ما فعل بالأنصار والمهاجرين وذراريهم] أتاه آت فقال له : إن ابن حنظلة (غسيل الملائكة ـ رضي الله تعالى عنه ـ] يبايع الناس على الموت . فقال : لا

أبايع على هذا أحداً بعد رسول الله ـ ﷺ ـ ح ـ ٥/١١٦ .

**ته رجه مه :**

عه بدوڵلاى كوڕى زه يـدى ئه نصـاريى ـ رضي الله تعالى عنـه ـ = ئـه فه رمـوێ = كه وه قعـه ى حه ڕه بـوو [يه عنى كـه يه زيـدى كـوڕى موعاويه ، كه موعاويه ى باوكى له دواى خۆى كردى به قه راڵ ، ناردیه سه ر مه دينه ، سێ ڕۆژ مه دينه ى حه ڵاڵ = كرد = غه يـرى ماڵو منـاڵ نزيك به دوانزه هه زار كه سى شه هيد كرد] يه كێ چـوه لاى عه بـدوڵلا ـ رحمه الله ـ عه رزى كرد : كه عه بدوڵلاى كوڕى حه نظه لـه ى غه سيـلى مه لائيكه ـ رضي الله تعالى عنه ـ به يعه ت له گه ڵ خـه ڵق ئه كـا له سـه ر مردن . عه بدوڵلاى كوڕى زه يد ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه رمووى : له دواى پێغه مه ر ـ ﷺ ـ ئه و به يعه ته له گه ڵ هيچ كه سا ناكه م . [چونكى پێغه مه ر ـ ﷺ ـ لازمه له سه ر هه موو كه س كه به ماڵو ڕۆح موحافه ظه ى بكا ، خه ڵقى تر وا نى يه . ئه مما ئه بات له غه زاى كوففارا لازمه] .

١٢٤٨/٩٩ قال عبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ لقد أتاني اليوم رجل فسألني عن أمر ما دَرَيت ما أَرُدُّ عليه . فقال : أرأيت رجلا مُؤْديا [قويا من آدى ؛ قوِيَ . ومن أداة الحرب أي تم سلاحه] نشيطا يخرج مع أمرائنا في المغازي فيعزم علينا [إلتفات . أي : عليه] في أشياء لانحصيها ؟ فقلت له : والله ما أدري ما أقول لك إلا أنا كنا مع النبي ـ ﷺ ـ فعسى أن لايعزم علينا في أمر إلا مرة حتى نفعله ، وإن أحدكم لن يزال بخير ما اتقى الله ، وإذا شك في نفسه شيء سأل رجلا فشفاه منه ، وأوشك أن لاتجدوه ، والذي لا إله إلا هو ما أذكر ما غبر من الدنيا إلا كالثَّغْب [أي الماء المستنقع] شرب صفوه ، وبقي كَدِره . ح ـ ٥/١١٧ .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ئەفەرموێ : ئیمرۆ پیاوێکم هاتە لا لە شتێکی لێ‌پرسیم نەمزانی چۆنی جواب بدەمەوە . وتی : خەبەری ئەوەم بدەرێ پیاوێکی بەقووەت‌و سیلاح‌تەواوو بە کەیف‌و نیشاط بۆ غەزا لەگەڵ ئومەرای ئێمە ئەچێتە دەرێ بۆ غەزا ، ئەو ئەمیرە لەسەر گەلێ شت کە لە حساب نایێ ئەمری قەطعیمان پێ ئەکا کە بیکەین [یەعنی لە چاك‌و خراپا بە قسەی بکەین یان نا] ؟ پێم‌وت : وەڵڵاهی ! نازانم چیت جواب بدەمەوە . ئەوەندەی هەیە ئێمە لە خذمەت پێغەمەرا بووین - ﷺ - دەفعەیێ نەبێ ، هیچ وەقت لە هیچ ئیشێکا بە قەطعی ی ئەمری پێ نەکردووین کە بیکەین ، ئێوە لەمەولا هەر لەسەر خێر ئەبن مادام کە تەقوای خواتان بێ ، ئەگەر یەکێکتان لە شتێکا (تردد)تان ببێ کە چاکە یا خراپە لە پیاوێ بپرسن کە شیفاتان بدا نزیکیشە کە یەکێکی واتان دەست نەکەوێ [چونکە ئەو نەوعە ئینسانانە بەرەودوا یەکەیەکە ئەمرن] قەسەم بەو ذاتەی کە غەیری ئەو مەعبوودی بە حەق نی‌یە نازانم لە دنیا کە چی لێ ڕۆییوەو چی ماوە ئەوە نەبێ وەك ئاوێکی پالاوتەو تەنقیەکراو ، صافەکەی خوراوەتەوەو خڵتەکەی ماوە [یەعنی ئومەرای موسوڵمانان چاکیان نەماوە ، ئەوی ماوە بە هەواو هەوەسی خۆی ئەمر ئەکا چاك‌و خراپ لێك ناداتەوە ئێوەیش دیقەت بکەن لە بێ‌شەرعییا بە قسەیان مەکەن] .

# الجعائل والحُملان

١٠٠/١٢٤٩ قال مجاهد : قلت لابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - : الغزوُ ، قال : إني أُحِبُّ أن أُعينك بطائفة من مالي . قلت : أوسع الله علي . قال : إن غناك لك ، وإني أُحب أن يكون من مالي في هذا الوجه . ح - ١٢١/٥ .

١٠١/١٢٥٠ وقال عمر - رضي الله تعالى عنه - : إن ناسا يأخذون من هذا المال ليجاهدوا ثم لا يجاهدون ، فمن فعله فنحن أحقُّ بماله حتى نأخذ منه ما أَخَذَ . وقال طاوس ومجاهد : إذا دُفع إليك شيء تخرج به في سبيل الله فاصنع به ماشئت وضعه عند أهلك . ح - ١٢٢/٥ . آثار .

ته‌رجه‌مه :

موجاهید - رحمه الله - ئه‌فه‌رموێ : عه‌رزی ئیبن وعومه‌رم کرد - رضي الله تعالى عنهما - : که‌ ئیراده‌ی غه‌زام هه‌یه‌ . فه‌رمووی : حه‌زه‌که‌م که‌ به‌ به‌عزێ له‌ ماڵی خۆم موعاوه‌نه‌تت بکه‌م . عه‌رزم کرد : خوا قودره‌تی ماڵی بۆ زۆر کردووم . فه‌رمووی : ده‌وڵه‌مه‌ندیی خۆت بۆ خۆت من وا حه‌زه‌که‌م که‌ ماڵی من بێ . = که‌ هه‌ندێ له‌ ماڵی من له‌م رێگه‌دا بێ = .

ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : به‌عزێ له‌ خه‌ڵق به‌عزێ له‌م ماڵی (بيت المال)ه وه‌رئه‌گرن بۆ ئه‌مه‌ که‌ غه‌زای پێ بکه‌ن و غه‌زایش ناکه‌ن ، هه‌رکه‌سێ وا بکا ئێمه‌ موسته‌حه‌قترین به‌و ماڵه‌ که‌ دراویه‌تی و لێی بستێنینه‌وه‌ .

طاوس و موجاهید ئه‌فه‌رموون : که‌ شتێکت درایه‌ که‌ له‌ رێی خوادا پێی بچیته‌ده‌رێ ، چی له‌و ماڵه‌ ئه‌که‌ی بیکه‌ ، حه‌زه‌که‌ی بیده‌ به‌ ماڵ و

منالّت ، [ئەویش لە رێی خوادایە] .

قسەی ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - خاصە بەوەوە کە هەر بۆ خوصووصی غەزای بدرێتێ ، قسەی موجاهیدو طاوس ئەوەیە کە بۆ صەرفی لە رێی خوادا بیدرێتێ . (فلاتعارض) .

# الأجير في الغزو

١٢٥١/١٠٢ قال الحسن وابن سيرين [رحمهما الله] : يقسم للأجير من المغنم ، وأخذ عطية بن قيس فرسا على النصف ، فبلغ سهم الفرس أربعمائة دينار ، فأخذ مائتين وأعطى صاحبه مائتين . ح - ١٢٣/٥ .

تەرجەمە :

حەسەنی بەصریی و ئیبن و سیرین - رحمهما الله - ئەفەرموون : بۆ ئەوەی لە غەزادا بە ئوجرەت بگیررێ لە غەنیمەت حیصەی بۆ جوێئەکرێتەوە . عەطیەی کوری قەیس بە نیوەیی ئەسپێکی گرت بە کرێ ، حیصەی ئەسپەکەی گەیی بە چوارصەد دینار . عەطیە دووصەدی بۆ خۆی هەڵگرت و دووصەدیشی دا بە صاحیبی ئەسپەکە .

١٢٥٢/١٠٣ عن صفوان بن يعلى عن أبيه - رضي الله تعالى عنه - قال : غزوت مع رسول الله - ﷺ - غزوة تبوك ، فحملت على بكر ، فهو أوثق أعمالي في نفسي فاستأجرت أجيراً ، فقاتل رجلا [يعلى] فعض أحدهما [يعلى] الآخر [الأجير] فانتزع يده من فيه : ونزع ثنيته ، فأتى العاض [يعلى] النبيَّ - ﷺ - فأهدرها ، فقال : أيدفع يده إليك فتقضمها كما يقضم الفحل ؟ ح - ١٢٣/٥ .

تەرجەمە :

یەعلا - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - چووم بۆ غەزای تەبووك پیاوێکم سواری ئوشترێکی جوان کرد ، لام وابوو کە ئەوە چاکترینی عەمەلێکمە کە ئومێدم پێی ببێ . یەکێکم بە کرێگرت [کە لە رێ خزمەتم بکا] شەری لەگەڵ کردم بەدەستیا گەزیم ، دەستی لە دەمم راپسکان دوو ددانی پێشەوەی دەرهێنام ، چوومە

خزمەت پێغەمەر - ﷺ - بە هەدەری برد ؛ قەصاصی بۆ نەستەنم و دییەیشی بۆ لێ نەستەندم . فەرمووی : بۆ دەستی خۆی لە دەمی تۆدا بێڵیتەوە تا بیکوروژێ وەك فەحل شت ئەکوروژێ ؟

١٠٤/١٢٥٣ نافع بن جبير قال : سمعت العباس يقول للزبير - رضي الله تعالى عنهما - : ههنا [بالحجون] أمرك النبي أن تركُز الراية .

ح - ١٢٤/٥ .

**تەرجەمە :**

عەباس بە زوبەیری فەرموو : پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێ فەرمووی : کە بەیباخەکە لێرەدا دابچەقێنی .

بەیباخ تا ئەمری سەرکردە نەبێ دانانرێ و لە جێێ بە بێ ئەمری ئەو داناچەقێنرێ ؛ چونکی بەیباخ عەلامەتی ئەمیرو جێگەیەتی .

١٠٥/١٢٥٤ عن أسامة بن زيد - رضي الله تعالى عنهما - أن رسول الله - ﷺ - ركب على حمار على إكاف عليه قطيفة ، وأردف أسامة وراءه

ح - ١٢٨/٥ ن م - في المغازي . أخرجه أيضا في اللباس . تفسير ، أدب ، إستئذان .

**تەرجەمە :**

ئوسامەی کوری زەید - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - سواری گوێدرێژێ بووبوو کۆپانێکی لێ کرابوو قەطیفەیێکی بەسەرا راخرابوو ، ئوسامەی سواری پاشکۆی خۆی کرد .

حەیوان تەحەمولی ببێ دووپشتەکیی سواربوونی دروستە .

نەرمەزین لەعەمەل هێنان دروستە .

١٠٦/١٢٥٥ عبدالله بن عمرو بن العاص - رضي الله تعالى عنهما -

قال : أقبل رجل إلى رسول [نبي] الله ، فقال : أبايعك على الهجرة والجهاد ، أبتغي الأجر من الله ـ تعالى ـ . قال : فهل من والديك أحد حيٌّ ؟ قال : نعم بل كلاهما . قال : فتبتغي الأجر من الله ؟ قال : نعم . قال : فارجع إلى والديك فأحسن صحبتهما ! م ـ ٩/٤٤١ . وفي اخرى أخصر : ففيهما فجاهد . ح ـ ٥/١٣٤ .

تەرجەمە :

پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی‌کرد : بەیعەتت لە خزمەتا ئەکەم لەسەر هیجرەت‌و غەزا ، بەوە ئەجر لـە خوایِ تـەعالا طەلەب ئەکەم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی پرسی : هیچ کـامێ لە بـاوك‌و دایکت زینـدوون ؟ عـەرزی‌کـرد : بـەڵێ هـەردوکیـان زینـدوون . فەرمووی : ئەجر لـە خوا طـەڵەب ئـەکەی ؟ عـەرزی‌کرد : بـەڵێ . فەرمووی : بگەڕێرەوە لە صوحبەتیانا موعامەلەی چاکیان لەگەڵ بکە .

غەزاو هیجرەت گوناه ناییڵن ، خزمەت‌و ئیطاعەی دایك‌و باوك لە هەردوکیان خێری زیاترە .

١٠٧/١٢٥٦ أبو إسماعيل السكسكي [رحمه الله] قال : سمعت أبا بردة [الأشعري] واصطحب هو ويزيد بن أبي كبشة [رحمهما الله] في سفر ، فكان يزيد يصوم في السفر ، فقال له أبو بردة : سمعت [أبي] أبا موسى [الأشعري رضي الله تعالى عنه] مرارا يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إذا مرض العبد أو سافر كتب له مثل ماكان يعمل مقيما صحيحا . ح ـ ٥/١٣٢ .

تەرجەمە :

ئەبو بوردە ـ رحمه الله ـ لەگەڵ یەزیدی کوڕی ئەبوکەبشـەدا لە سەفەرێکا ڕەفیق ئەبن . یەزید ـ رحمـه الله ـ لەو سـەفەرەدا بـەڕۆژوو

ئه‌بوو ، ئه‌بوبورده ـ رحمه الله ـ فه‌رمووی : چه‌ند ده‌فعه له ئه‌بوموسای باوکمم بیستوه ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئه‌یفه‌رموو : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : که عه‌بد نه‌خۆش که‌وت یا سه‌فه‌ری کرد ، به ساغی و به موقیمی ی چه عه‌مه‌لێکی کردوه ئه‌وابی ئه‌و عه‌مه‌له‌ی بۆ ئه‌نووسرێ .

به عوذر ته‌رکی عیباده‌تێ که عاده‌تیی بووبێ ، ئه‌گه‌ر ئه‌و عوذره‌ی مانیع نه‌بوایه ئه‌یکرد ، ئه‌و عیباده‌ته‌ی بۆ ئه‌نووسرێ .

قه‌صر له سه‌فه‌را ئه‌وابی ته‌مامی هه‌یه ، به دانیشتنه‌وه ، یا به پاڵکه‌وتنه‌وه ، یا به ئیشاره‌ت نوێژ کردن ئه‌وابی ته‌واوی هه‌یه . فه‌رز ، یا واجب یا سوننه‌ت ، که ئینسان عاجز بێ له به‌جێهێنانی له ئه‌وابی مه‌حرووم نابێ .

۱۲۵۷/۱۰۸ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لو يعلم الناس ما في الوحدة ما أعلم ما سار راكب بليل وحده .

ح ـ ۱۳۳/۵ .

ته‌رجه‌مه :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : له ده‌رحه‌ق به‌ته‌نهایی به‌رێدا رۆیین ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی من ئه‌یزانم خه‌ڵقیش بیانزانیایه هیچ که‌س ، هیچ سوارێ به شه‌و به ته‌نها به‌رێدا نه‌ئه‌رۆیی .

۱۲۵۸/۱۰۹ أبو بشير الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أخبر أنه كان مع رسول الله ـ ﷺ ـ في بعض أسفاره ، قال عبدالله : حَسِبتُ أنه قال : والناس في مبيتهم ، فأرسل رسول الله ـ ﷺ ـ رسولا : لا تَبْقَيَنَّ وترا أو قِلادة إلا قطعت ، قال مالك (الامام) : أرى ذلك من العين

م ـ ۲٤۷/۸ . د ، ن . ح ـ ۱۳۵/۵ .

تەرجەمە :

ئەبوبەشیری ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە بەعزێ سەفەری پێغەمەرا ـ ﷺ ـ لە خزمەتیا بووم ، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی حەزم ئەڵێ : وابزانم کە ئەوەیشی فەرمووە : کە خەڵق لەجێ مۆڵگەی خۆیانا بوون پێغەمەر ـ ﷺ ـ یەکێکی نارد ئەمری فەرموو : کە هیچ قەلادەو پەت لە ملی حەیوانا نەمێنێ هەمووی ببڕن ، مەبادا لە تاودانا ملیان داببڕێ . یا لەبەر چاوەزار کراوەتە ملیان ئەوە قەزاو قەدەر ناگێڕێتەوە .

١١١/١٢٦٠[1] عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كان النبي ـ ﷺ ـ إذا قفل من الحج أو العمرة ، ولا أعلمه إلا قال الغزو ، يقول : كلما أوفى على ثنية (أعلى الجبل ، أو الطريق في الجبال) أو فدفد (الفلاة من الأرض لاشيء فيها ، او الغليظة ، أو ذات الحصى المستوية ، أو المرتفعة) كبر ثلاثا ، ثم قال : لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد ، وهو على كل شيء قدير ، آيبون ، تائبون ، عابدون ، ساجدون ، لربنا حامدون ، صدق الله وعده ، ونصر عبده ، وهزم الأحزاب وحده . ح ـ ٥/١٣١ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لەحەج یا عومرە (سالمی کوڕی عەبدوڵڵا ئەفەرمۆی) : کە عەبدوڵڵا هەر ئەوەی فەرموو کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە غەزا بگەڕایەوە

(١) دانەر ـ خ ـ لێرەدا ژمارە (١١٠/١٢٥٩)ی لەبیرچوە ، لەبەر تێك نەچوونی ژمارەی حەدیثەکانی کتێبەکە وەك خۆی هێشتمانەوە .

هه‌ر وه‌ختێ كه له شاخێ سه‌ربكه‌وتايه يا له باسكێكى به‌رده‌لانى سه‌ربكه‌وتايه سێ ده‌فعه (الله أكبر)ى ئه‌كرد ، له دواييدا ئه‌يفه‌رموو : غه‌يرى خوا مه‌عبوودى به حه‌ق نى‌يه ، هيچ شه‌ريكى نى‌يه ، كه‌س مولْكى نى‌يه ، مولْك هه‌ر هى ئه‌وه ، هه‌موو ئه‌نواعى حه‌مدو ئه‌نا هه‌ر بۆ ئه‌وه ، قودره‌تى به‌سه‌ر هه‌موو شتێكا هه‌يه ، ئێمه روجووع ئه‌بينه‌وه بۆ لاى خوا ، هه‌ر بۆ لاى ئه‌و ته‌وبه ئه‌كه‌ين ، هه‌ر بۆ ئه‌و عيباده‌ت ئه‌كه‌ين ، هه‌ر بۆ ئه‌و سوجده ئه‌به‌ين ، هه‌ر بۆ ئه‌و حه‌مد ئه‌كه‌ين ، خوا ـ عز وجل ـ وه‌عده‌ى به‌جێ هێنا كه دينى ئێمه سه‌ربخا . موعاوه‌نه‌تى عه‌بدى خۆيى كرد كه محه‌مه‌ده ـ ﷺ ـ به ته‌نها خۆى له‌شكرى ئه‌حزابى شكان . ( . . . . ) .

١١٢/١٢٦٤ عبدالله بن عمرو (بن العاص) ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : جاء رجل إلى النبي ـ ﷺ ـ (جاهمة بن العباس بن مرداس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ن) يستأذنه في الجهاد ، فقال : أحيٌّ والداك ؟ قال : نعم . قال : ففيهما فجاهد[1] . ح ـ ٥/١٣٤ .

**ته‌رجه‌مه :**

جاهيمه‌ى كورى عه‌باسى عورى مه‌رداس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هاته خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئيذنى لێ خواست بۆ غه‌زا ، فه‌رمووى : دايك و باوكت زيندوون يان نا ؟ عه‌رزى كرد : زيندوون .

---

(١) حه‌ديثى ژماره (١٢٥٥/١٠٦) وه‌ك ئه‌م حه‌ديثه وايه‌و ، له‌وێيش ئيشاره بۆ ئه‌م ريوايه‌ته كراوه .

فەرمووی : لەوانا موجاهەدە بکە . نەنك و باپیریش وایە .

صیلەی رەحم و ئیطاعەی دایك و باوك لە ئەمری مەشرووعا فەرزی عەینە ، جیهاد فەرزی کیفایەیە ، فەرزی عەین لە فەرزی کیفایە پێش ئەخرێ .

# الأسارى في السلاسل يدخلون الجنة

١٢٦٢/١١٣ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - عن النبي - ﷺ - قال : عجب الله من قوم يدخلون الجنة في السلاسل ! ح - ٥/١٣٩ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خوا تەعەجوبی فەرموو لە قەومێ کە لە زنجیرا ئەچنە بەهەشت !

تەعەجوب لەسەر خوا مەحاڵە . یەعنی کەسێ لە کەسێ تەعەجوب بکا چە موعامەلەیێکی لەگەڵ بکا خوا بەو نەوعە موعامەلەی لەگەڵ ئەکا لەم مەقامەدا . مەعنای وایە ئەو ئەسیرانەی کە بە ناحەق بە زوڵم پێوەند کراون خوا بە موقابیلی = ئەوە = لە ئاخیرەتا ئەیانباتە بەهەشتو موکافاتی مەزڵوومێتییان ئەداتەوەو ، بە زنجیرەوە ئەچنە بەهەشت ، ئیظهاری ئەکا بۆ خەڵقی بەهەشت .

١٢٦٣/١١٤ عن ابن عباس عن الصعب بن جَثامة - رضي الله تعالى عنهم - قال : مرَّبي النبي - ﷺ - بالأبواء [موضع ثلاثة وعشرون(!) ميلا من المدينة] أو بودّان [بينه وبين الأبواء ثمانية أميال] وسُئل [السائل الراوي] عن أهل الدار يبيتون من المشركين فيصاب من نسائهم وذراريهم قال : هم منهم . وسمعته يقول : لاحمى إلا لله ورسوله - ﷺ - ح - ٥/١٤١ . م - ٧/٣٢٤ . د ، جه ، ت ، ن .

تەرجەمە :

ئیبن‌وعەباس لە صەعبی کوڕی جەثامەوە - رضي الله تعالى عنهم - ریوایەت ئەفەرموێ : کە لە (ئەبوا) یا لە (وەدان) پێغەمەر - ﷺ - بە لاما رابورد لێیان پرسی [لێم‌پرسی . قسطلانی] : کە ئەهلی ماڵێ لە

موشريك شه‌به‌يخوونيان به‌سه‌را ئه‌كرێ له‌وه‌دا ماڵ و مناڵيانيش پێوه ئه‌بن [يه‌عنی گوناهه يان نا ؟] فه‌رمووی : ئه‌وانيش له‌وانن . لێم بيست ئه‌يفه‌رموو : پاوان هه‌ر هی خواو هی پێغه‌مه‌ری خوايه ـ ﷺ ـ .

[ئه‌صڵی پاوان ئه‌وه بوه : ره‌ئيسی عه‌شيره‌تێ سه‌گێكی بردۆته جێيێكی به‌رز . ئه‌و سه‌گه‌يان هێناوه‌ته وه‌رين ده‌نگی تاكوو كوێ رۆيبێ تا ئه‌و جێيه هه‌ر ئه‌و ره‌ئيسه حه‌يوانی لێ له‌وه‌ڕانوه ، ره‌ئيسه‌كه خۆی له‌گه‌ڵ خه‌ڵقا له جێی تريش حه‌يوانی لێ له‌وه‌ڕانوه . شه‌رع ئه‌وه‌ی به‌تاڵ كردۆته‌وه ، ته‌خصيصی كردوه به پێغه‌مه‌رو خوله‌فای پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ورضي عنهم ـ ئه‌ويش بۆ حه‌يوانی (بيت المال) بۆ حه‌يوانی خۆيان له‌گه‌ڵ خه‌ڵق فه‌رقيان نی‌يه ؛ گينا فه‌رقی نابێ له‌گه‌ڵ عاده‌تی جاهيلييه‌ت] .

**١٢٦٤/١١٥ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أن امرأة وُجِدت في بعض مغازي النبي ـ ﷺ ـ [غزوة الفتح] مقتولة ، فأنكر رسول الله ـ ﷺ ـ [فنهى رسول الله ـ ﷺ ـ أخرى عن م]قتل النساء والصبيان ح ـ ١٤٢/٥ . م ـ ٣٢٤/٧ .**

**ته‌رجه‌مه :**

له به‌عزێ غه‌زای پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ [له غه‌زای فه‌تحا] ژنێكی مه‌قتوول دۆزرايه‌وه ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئينكاری ئه‌وه‌ی كرد كه بۆچييان كوشتوه‌و ، نه‌هی كرد له كوشتنی ژن و مناڵ .

حه‌ديثه‌كه‌ی پێشوو له شه‌به‌يخوونا به بێ قه‌صد بكوژرێن به‌ر هێرش بكه‌ون . له‌م حه‌ديثه‌دا كه به عه‌مد بكوژرێن .

**١٢٦٥/١١٦ عن عكرمة أن عليا ـ رضي الله تعالى عنه ـ حرَّق قوما [هم السبائية ، أتباع عبدالله بن سبأ ، يزعمون الألوهية لعلي ـ رضي الله**

**تعالى عنه ـ ] فبلغ ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فقال : لو كنت أنا لم أُحرقهم ؛ لأن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا تعذبوا بعذاب الله ، ولقتلتهم كما قال النبي ـ ﷺ ـ : من بدَّل دينه فاقتلوه . ح ـ ١٤٣/٥ . فبلغ ذلك عليا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : صدق ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قسطلاني . د ، ن ، جه ، ت .**

**ته رجه مه :**

عه كره مه ئه لّێ : ئيمامى عه لى ـ رضي الله تعالى عنه ـ ته به عه ى عه بدوللاّى كورى سه به ئى ـ له سه ر ئه مه كه ئيدديعاى ئولووهييه تى بـۆ ئه كه ن ـ سووتان . ئه و خه به ره گه يى به ئيبن وعه باس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فه رمووى : ئه گه ر من بوومايه نه مه سووتانن ، چونكى پێغه مه ر ـ ﷺ ـ فه رموويه تى : به عه ذابدانێ كه مه خصـووصه بـه خواوه كـه س عه ذاب مه ده ن . من ئه مكوشتن وه ك پێغه مه ر ـ ﷺ ـ فـه رموويـه تى : هه ركه سێ دينى خـۆى بگۆرِێ بيكـوژن . [ئه م قسـه ى ئيبن وعه بـاس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ به ئيمامى عه لى ـ رضي الله تعالى عنه ـ گه ييه وه فه رمووى : ئيبن وعه باس راست ئه كا . قسطلاني] .

رۆح له به ر سووتانن حه رامه . ئيمـامى عه لى ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئه وه ى به ئيجتيهاد كردوه ، حه ديثه كه ى ئيبن وعه باسى ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێ نه گه ييبوو ؛ بۆيه ته صويبى ئيبن وعه باسى كرد ـ رضي الله تعالى عنهم ـ .

**١٢٦٦/١١٧ عن أبي قلابة عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رهطا من عُكْل ثمانيـة قدموا على النبي ـ ﷺ ـ فاجتـووا المدينـة ، فقالوا : يا رسول الله أبغنا رِسْلا [لبنا] ، قال : ما أجد لكم إلا أن تلحقوا بالذَّوْدِ [من الثلاث إلى العشرة من الابل] فانطلقوا ، فشربوا من أبوالها**

وألبانها حتى صحوا وسمنوا [ورجعت إليهم ألوانهم . إسماعيلي] وقتلوا الراعي [يسارا ـ رضي الله تعالى عنه ـ] واستاقوا الذود وكفروا بعد إسلامهم. فأتى الصريخ النبيَّ ـ ﷺ ـ فبعث الطلب . فما ترجل النهار [ارتفع حتى أُتي بهم . فقطع أيديهم وأرجلهم [من خلاف . ت] ثم أمر بمسامير فأُحميت ، فكحلهم بها ، وطرحهم بالحرة يستسقون فما يسقون حتى ماتوا . قال ابو قلابة [رحمه الله] : قتلوا وسرقوا وحاربوا الله ورسوله ـ ﷺ ـ وسعوا في الأرض فسادا . خ ـ ٥/١٤٤ ـ ح ـ ٢٩٢/١ . خ ـ ٧/١٠٠ . م ـ ٧/١٧٥ ـ ١٨٠ . وفيه : ولم يحسمهم [أي لم يكوهم] د ، ن . والبخاري في المغازي والديات .

[يكتب بعد هذا الحديث حديث ١٣٢/١٢٨١ . ][1]

تەرجەمە :

قەومێكی هەشت كەسی لە عوكل هاتنە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ [موسوڵمان بوون] ئاب و هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت ، نەخۆش كەوتن عەرزی پێغەمەریان كرد ـ ﷺ ـ : (یا رسول الله) شیرمان بۆ پەیداكە بیخۆینەوە ، فەرمووی : هیچم نی یە مەگەر بچنە لای وشترەكان . لێیان داو چوونە ئەو جێیەی كە وشترەكانی پێغەمەری ـ ﷺ ـ لێ بوو ، لە میزو لە شیری وشترەكانیان خواردەوە ، چابوونەوەو قەڵەو بوون و رەنگیان گەڕایەوە روو . لە موكافاتی ئەو چاكەی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ شوانەكەیان شەهیدكردو وشترەكانیان برد ! لە دوای موسوڵمانەتی كافر بوون ، هاواركەر هاواری هێنا بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ چەند سوارێكی نارد

(١) لەسەر ئەم داوای دانەرە حەدیثەكە دەگوێزینەوە ئێرە ، بەڵام هەر بە ژمارەكەی خۆیی و لە كاتی خۆیشیدا ئەم ژمارە ئەبوێرین .

بەشوێنیانا لە پێش ئەمەدا رۆژ بەرزبێتەوە هێنانیـان ، پێغەمـەر ـ ﷺ ـ ئەمری کرد : راستو چەپی کردن [چونکی ماڵیان بـردبوو] لـە پاشـا ئەمری فەرموو ئاسنیان بۆ داغکردن هێنایان بەچاویانا ، فڕێیان دانە سەر بەردەلانی یەکەی مەدینە ، داوای ئاویان ئەکرد ئاویان نەدرایێ تا مردن .
ئەبو قەلابە ئـەفەرمـوێ : ئەوان پیـاویان کـوشتبوو ، وشتـرەکانیـان بردبوو ، موحارەبەیان لەگەڵ خواو پێغەمەرا کردبوو ـ ﷺ ـ ، لەسـەر ئەرزا فەسادیان کردبوو .

**[ئەمما لای من وایە هیچ حاجەت بە تەئویل ناکا ، چونکی ئەم حادیثەیە لە مەدینەدا بوە . سوورەی (والنجم) لە مەککەدا نازڵ بوە ، لە سوورەی (والنجم)١ خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : کـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ هییچ قسەیێ بە هەواو هەوەس ناکا ، ئەوی ئەیفەرموێ هەر بە وەحیە . کە وابێ ئەم ئەمری پێغەمەرە ـ ﷺ ـ وەحی ئیلاهیبـوە ، ئەو تەعذیبە بە ئەمری خوا بوە . خوا ـ عز وجل ـ لەوەی کە ئەیکا هیچ کەس حەقی ئەوەی نییە لێی بپرسێ کە بۆچیت کردوە ؟ رەشید]**

بوخاریی ئەم حەدیثەی لە پێنج جێدا ذیکرکردوە .

**١٢٨١/١٣٢ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه قال : بعثنا رسول الله ـ ﷺ ـ في بعثٍ [أميره حمزة بن عمرو الأسلمي ـ رضي الله تعالى عنه ـ] وقال لنا : إن لقيتم فلانا وفلانا ـ لرجلين من قريش سماهما ـ فحرِّقوهما بالنار . ثم أتيناه نودعه حين أردنا الخروج ، فقال : إني كنت أمرتكم أن تحرقوا فلانا وفلانا بالنار ، وإن النار لا يُعذِّب بها إلا الله ، فإن أخذتموهما فاقتلوهما . ح ـ ٥/١١٤ ، ١٤٢ . [فيه نسخ الأمر قبل العمل] .**

يكتب هذا الحديث بعد ١٢٦٦/١١٧ .

**ته رجه مه :**

[زه ينه بى كچى پێغه مه ر ـ ﷺ ـ ، ورضي الله عنها ـ حاميله ئه بیٚ و سوارى وشترێك ئه بیٚ ، هه بيارى كوڕى ئه سوه دو يه كێكى تر ـ كه خيلافى تيايه : يا نافيعى كوڕى عه بدى عه مره ، يا خاليدى كورى عه بدى قه يسه ، يا نافيعى كوڕى قه يسه ، سا هه ركامێكيان بیٚ مه طلووب نى يه ـ ئه و دوانه له و وشتره وه يان ژه ن كه حه زره تى زه ينه بى سوار بووبوو . زه ينه ب ـ رضي الله تعالى عنها ـ به وه مناڵه كه ى له بار چوو . قسطلاني]

ئه بوهوره يره ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه فه رموێ : پێغه مه ر ـ ﷺ ـ ئێمه ى له گه ڵ له شكرێكا نارد بۆ جێيێ فه رمووى : كه تووشى فلان و فلان بوون ـ ده رحه ق دووكه س له قوره يش = ناوى بردن = به ئاگر بيانسووتێنن . له دواييدا ، كه ته مامان بوو برۆين ، چووينه خزمه تى كه ويداعى بكه ين ، فه رمووى : من ئه مرم پێكردن كه فلان و فلان بسووتێنن به ئاگر ـ ئاگر غه يرى خوا كه س عه ذابى پێ نادا [يه عنى ئه و عه ذابه لايه ق به ذاتى ئه وه ـ عز وجل ـ] ئه گه ر ئه و دوانه تان گرت بيان كوژن .

١٢٦٧/١١٨ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : [قال : نزل نبي من الأنبياء تحت شجرة فلدغته نملة ، فأمر بجهازه فأخرج من تحتها ، ثم أمر بها فأحرقت . فأوحى الله إليه : فهلاّ نملة واحدة . م ـ ٩١/٩] قرصت نملة نبيا من الأنبياء [عُزيرا . وعند الترمذي : موسى ـ عليهما الصلاة والسلام ـ] فأمر بقرية النمل فأحرقت ! فأوحى الله إليه : أن قرصتك نملة أحرقت أمة من الأمم تسبح الله ! ح ـ ١٤٥/٥ . م ـ ٩١/٩ . د ، ن ، جه ، ت .

تەرجەمە :

ئەبوهورەيرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : مێروولەیێ یەکێ لە پێغەمەرانی خوای گەزت [یا عوزەیر ، یا موسا - علیهما الصلاة والسلام -] ئەو پێغەمەرە - علیه السلام - ئەمری کرد بە شارەمێروەکە سووتانیان . خوا - عز وجل - وەحی کردە سەر : کە لە بەر ئەمە تەنها مێروولەیێ تۆی گەزت ئوممەتێ لە ئوممەتانت سووتان کە تەسبیحی خوای ئەکرد . لە ریوایەتەکەی موسلیما فەرمووی : بۆ تەنها مێروولەییێکت نەسووتان ؟ یەعنی ئەوەی کە تۆی گەزتبوو .

(إحراقي بالنار) حەرامە

١٢٦٨/١١٩ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : حرق النبي - ﷺ - [سنة أربع] نخل بني النضير . وقطع وهي البُوَيرة . فأنزل الله - تعالى - : ﴿ما قطعتم من لينة أو تركتموها قائمة على أصولها ، فبإذن الله ، وليخزي الفاسقين﴾[1] ح - ٣٥٩/٧ [وخَرَّب بيوتهم بعد أن حاصرهم خمسة عشر يوما . وفيهم نزلت الآيات في سورة الحشر . قسطلاني .] ح - ١٤٦/٥ . ح - ٣٥٩/٧ . ح - ٢٦٩/٦ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - باغی خورمای بەنی نەضیری سووتان [لە دوای ئەمە کە پانزە رۆژ موحاصەرەی دان ، خانوەکانی رووخانن . ئایاتی حەشر دەرحەق ئەم حادیثەیە نازڵبوە] (ومباحثه تأتي إن شاء الله في المغازي) .

کە پێغەمەر - ﷺ - ئەمری فەرموو دارخورمای بەنی نەضیر ببڕن و

(١) بڕوانە : سوورەتی حەشر . ئایەتی : ٥ .

بیسووتێنن ، عەرزیانکرد : ئەی محەمەد تۆ نەهی ئەکەی لەمە کە لـە ئەرزا فەساد بکرێ . کەچی خۆت دارخورما ئەسووتێنیو ئەیانبری ! ئەو وەختە ئەو ئایەتە نـازڵ بوو : ئـەو دارخورمـایانـە کەبـڕیوتـانە یـا نەتانبڕیوەو بەپێوە هێشتووتانەوە بە ئیزنی خوا بوەو بۆیە بوە کە خوا فاسقو فاجیر بێ دەستو بێ قودرەت بکا .

یەعنی فەسادی (في الأرض) ئەوەیە کە بە بێ سەبەب مەحض بۆ نەفعی دنیاو (إضرار)ی خەڵق رێ بگـرێو ،خەڵق تـاڵان بکاو ، پیـاو بکوژێ . . ئەوی کە بە ئەمری خوا بێو بۆ دین بێ بۆ مەنعی فەساد بێو بۆ ئیقامەی عەدالەت بێ لە جێی ظوڵم ئەوە فەساد نییە ، بەڵکو صەلاحە بۆ عیباد وەك گیاو گژەو درك پاككردنەوەیە بۆ مەصلەحەتی مەزرووعات .

# الحرب خُدعة

١٢٠/١٢٦٩ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : سمى النبي - ﷺ - الحرب خُدْعة . ح - ٥/١٥٠ . م - ٧/٣٢٠ .

١٢١/١٢٧٠ جابر بن عبدالله - رضي الله تعالى عنهما - قال : قال النبي - ﷺ - : الحرب خُدعة . ح - ٥/١٥٠ . م - ٧/٣٢٠ . د ت ، ن .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فەرموویەتی : حەرب عیبارەتە لە خەڵەتانی دوشمن . [یەعنی بە هەر نەوعێ بێ ئیستیعمالی حیلە بۆ مەغلووبکردنی دوشمن لازمە ، ئەو لە ئیستیعمالی شەجاعەت موهیمترە] .

# فكاك الأسير وفداؤه

١٢٧١/١٢٢ عن أبي موسى - رضي الله تعالى عنه - قال : قال النبي - ﷺ - : فكّوا العاني ، يعني الأسير ، وأطعموا الجائع ، وعودوا المريض . ح - ٥/١٦٠ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەسیر لە ئەسارەت دەرهێنن ، برسیی تێر بکەن ، ئەحوالی نەخۆش بپرسن ، بچنە لای .

عەیادەتی نەخۆش سونەتی موئەککەدەیە ، نەجاتی ئەسیردان و ، برسی تێرکردن . . فەرزی کیفایەیە .

[ئەبێ ئەوانەی کە شت گران ئەکەن و ئیحتیکار ئەکەن ، بە حیلە پارەی فەقیرو فوقەرا لە دەستیان بێننە دەرێ ، ئەحواڵیان چۆن بێ کە بەو نەوعە ئینسانی تێر برسی ئەکەن ؟ ! (أصلح الله حالنا وحال المحتكرين)] .

١٢٧٢/١٢٣ أنس - رضي الله تعالى عنه - أن رجالا من الأنصار إستأذنوا رسول الله - ﷺ - فقالوا : يا رسول الله إئذن = فلنترك = لابن أختنا عباس فداءه . فقال : لا تدعون منها درهما . ح - ٥/١٦١ .

**تەرجەمە :**

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : بەعزێ پیاو لە ئەنصار ئیذنیان خواست لە پێغەمەر - ﷺ - عەرزیان کرد : (یا رسول الله) ئیذنمان بدە کە فیدیەی عەباسی خوشکەزامان بدەین ؛ لە ئەسارەت دەری هێنین . فەرمووی : نابێ درهەمێکی بەسەرەوە بێڵی ، ئەبێ هەموو

فیدیەکەی بە تەواوەتی لیّ بستیّنن .

ئەنصار خالّی (عبدالمطلب)ن ؛ هاشم لە بەنی نەجار سەلمای کچی عەمری مارە کرد ، (عەبد المطلب)ی لیّبوو ، هاشم لەویّ وەفاتی کرد . (عبدالمطلب)یّ باوك لە مەدینەدا مایەوە . موطەلیبی برای هاشم چوو هیّنایەوە . (عبدالمطلب) رووتو قووت بوو ، لە ریّ لە موطەلیبیان ئەپرسی : ئەو کورەی کە پیّتە کیّیە ؟ موطەلیب رووی نەدەهات بلیّ برازامە ئەیوت : ئەوە عەبدمە . بۆیە ناونرا (عبدالمطلب) .

پیّغەمەریش - ﷺ - بۆیێ رازی نەبوو بەوە کە ئەنصار فیدیەی بۆ بدەن ؛ تا لە دینا طەرەفگیریی نەبیّ . هەموو ئەسیرەکان کە لە بەدرا بە ئەسیریی گیران و بە ئیشارەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - بە فیدیە لە قەتل عەفوکران وەکوو یەك بن . عەباس - رضي الله تعالى عنه - بە واسیطەی ئەمە کە مامی پیّغەمەر بوو - ﷺ - فەرق نەکریّ لەگەلّ ئەوانی تر .

**١٢٤/١٢٧٣ عن أسلم [مولى عمر] أن عمر بن الخطاب - رضي الله تعالى عنه - استعمل مولى له يدعى هُنَيًّا على الحِمى ، فقال : يا هُنَيَ اضمم جناحك عن المسلمين ، واتق دعوة المظلوم ؛ فإن دعوة المظلوم مستجابة ، وأدخل رب الصُّريمة [القطيعة من الابل بقدر الثلاثين] والغُنيمة ، وإياي ونعم ابن عوف ، ونعم ابن عفان ؛ فإنهما إن تهلك**

(١) دانەر - خ - لە دەقی عەرەبییەکەدا وشەی (فلنترك)ی لەبیر چووبوو ، ئەو وشە بخریّتەوە جیّگەی خۆیو مانای لیّك بدریّتەوە مانای حەدیثەکە هەندیّك دەگۆڕیّتو ئاوای لیّ دیّت : «ئەی پیّغەمەری خوا ئیذنمان بدە دەست لە فیدیەی عەباسی خوشکەزامان هەلّگرین . . .» نەك «بۆی بدەین . . .» .

ماشيتهما يرجعان إلى نخل وزرع ، وإن ربَّ الصريمة ورب الغنيمة إن تهلك ماشيتهما يأتني ببنيه فيقول : يا أمير المؤمنين ، يا أمير المؤمنين ! أفتاركهم أنا لا أبا لك ؟ ! فالماء والكلأ أيسر عليَّ من الذهب والورق . وأيم الله إنهم ليرون أني قد ظلمتهم ! إنها لبلادهم ، فقاتلوا عليها في الجاهلية ، وأسلموا عليها في الإسلام . والذي نفسي بيده لولا المال الذي أحمل عليه في سبيل الله ما حَمَيت عليهم من بلادهم شبرا . ح ـ ٥/١٦٨ .

تەرجەمە :

ئەسلەمی مەولای عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ هونەیی مەولای خـۆیی کرد بـە مەئمـووری موحـافەظـەی پاوانی (بيت المال) ئەمـری پێ فەرموو : کە دەستی خۆت لە زوڵم‌کردن لە موسوڵمانان مەنـع بکە ، خۆت لە دۆعای مەزڵووم بپارێزە ؛ چونکی دۆعای مەزڵـووم لای خوا قەبووڵ ئەکرێ صاحیبی وشتری کەم و صاحیبی مەڕی کەم ئیذن بدە کە حەیوانیان بکەنە ناو پـاوانەکـەوە . زینهار ! حـەیوانـاتی ئیبن‌وعەوف‌و ئیبن‌وعەففانی نەکەیتە ناوەوە ؛ چونکی ئەوان ئەگەر حـەیوانـاتیان بـە هیلاك بچێ موراجە عەتی باغی[1] خورماو زەراعەتیان ئەکـەن ، بەوە مەعیشەتیان تەئمین ئەکەن . ئەوانی کە وشترو مەڕیان کـەم بێ وشترو مەڕەکانیان بە هیلاك بچێ ماڵی تریان نی‌یە کە بەوە گوزەران بکـەن بە منداڵەوە بێنە لای من . ئەڵێن : (يا أمير المؤمنين ، يا أمير المؤمنين !) ئایا من ئەوانە تەرك ئەکەم و هیچیان نەدەمێ ؟ ! یا خوا باوکت نەمێنێ ! ئاوو گیام لە لا سووکترە کە بیانەمێ لە ئاڵتوون و لە زیو ، قەسەم بـەخوا !

(١) واتە ئەگەڕێنەوە سەر باخ و کشت‌وکاڵ .

ئەوان وا ظەن ئەبەن کە من زوڵمم لێ کردوون . کە لە ئەرازیی ئەوان پاوانم جوێکردۆتەوە بۆ حەیوانی (بیت المال) ؛ چونکی ئەو ئەرازی‌یە مەملەکەتی خۆیانە لە جاهیلییەتا شەڕیان لەسەر کردوە ، لە ئیسلامەتییا لەسەر ئەوە بە خواهش موسوڵمان بوون . قەسەم بەوەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! ئەگەر ئەوماڵیاتە نەبوایە کە لە ڕێی خوادا غەزایی سوار ئەکەم لە مەملەکەتی ئەوان بستێ ئەرزم لێ قەدەغە نەئەکردن .

عەدالەتی ئیمامی عومەر تەماشاکە - رضي الله تعالى عنه - چەندە بەتەنگ فەقیرەوە بوە ! تەرجیحی داون بەسەر دەوڵەمەندانی موهاجیرو ئەنصارا !

جێگەیێ بە حەرب فەتح بکرێ خۆ یان و ماڵ و منالیان و ئەملاك و ئەرازییان فەیئە بۆ موسوڵمانان حەقی صاحیبەکانیان نامێنێ ، ئەمما جێیێ بە صوڵح فەتحی بکرێ خۆیان حورن و ئەملاك و ئەرازییان بە موڵکایەتی بە دەستەوە ئەمێنێ ، بۆ کەس دروست نی‌یە کە هیچیان لێ بستێنێ . ئیمامی عومەریش - رضي الله تعالى عنه - وای موعامەمەلە لەگەڵ کردوون ، ئەو ئەرازی‌یەی کە قەدەغەی کردوە بۆ حەیوانی (بیت المال) ئاوا نەبوون و مەوات[1] بوون ، ئەو ئیحیای کردۆتەوە بۆ مەصلەحەتی میللەت .

---

(١) مەبەست لە (مەوات) زەوی زاری مردووو بێخاوەنەو ، هەرکەسێ بیەوێ - بە مەرجی خوێ - بوی هەیە زیندووی بکاتەوە .

## إعادة مال المسلم إذا غنمه المشركون ثم غلب اليهم(١)

١٢٧٤/١٢٥ عن نافع عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : ذهب فرس له ، فأخذه العدو ، فظهر عليه المسلمون فرُدَّ عليه في زمن رسول الله - ﷺ - ، وأبق عبد له فلحق بالروم فظهر عليهم المسلمون فرده عليه خالد بن الوليد بعد النبيّ - ﷺ - ح - ١٧٢/٥ . معلق وصله أبو داود .

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌سپێکی عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنهما - ئه‌ڕوا ، دوشمن ئه‌یگرێته‌وه ، له دواییدا موسوڵمانان فائیق ئه‌بن به‌سه‌ریانا ، له زه‌مانی پێغه‌مه‌را - ﷺ - ئه‌سپه‌که ئه‌درێته‌وه به عه‌بدوڵڵا - رضي الله تعالى عنه - له دوای پێغه‌مه‌ر - ﷺ - [له زه‌مانی خه‌لافه‌تی ئه‌بوبه‌کری صه‌دیقا - رضي الله تعالى عنه -] عه‌بدێکی عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنهما - هه‌ڕا ئه‌کا ئیلتیحاق ئه‌کا به ڕۆم ، موسوڵمانان غاڵب ئه‌بن به‌سه‌ریانا ، خالیدی کوڕی وه‌لید - رضي الله تعالى عنه - عه‌بده‌که ئیعاده ئه‌کاته‌وه بۆ عه‌بدوڵڵا - رضي الله تعالى عنه - .

لای ئیمامی شافیعي - رضي الله تعالى عنه - و جه‌ماعه‌تێ له عوله‌ما . . کافر غاڵب ببن به‌سه‌ر موسوڵمانا بیان‌که‌ن به ئه‌سیر ماڵیان

---

(١) مه‌به‌ستی له‌م ناونیشانه ئه‌وه‌یه که کافران ماڵی موسوڵمان به‌تالان به‌رن و دوایی موسوڵمانان سه‌رکه‌ون به‌سه‌ر کافره‌کاناو ئه‌و ماڵه‌یان چنگ بکه‌وێته‌وه ده‌بێ بدرێته‌وه به خاوه‌نه‌که‌ی .

بەش بکەن لە بەینی خۆیانا ، نە خۆیان نە ساڵیان نابێ بە موڵکی ئەوان ، خۆیان هەر حورِن ، دووبارە موسوڵمان غاڵب ببن بەسەر کافرانا مـاڵی کافرەکان با تەقسیمیش بکرێ لە بەینی غەزاییدا هەر موسوڵمانێ ماڵی خۆی بە دەست هەر کەسێکەوە ببینێ بۆی هەیە لێی بستێنێتەوە .

ئەحمەدو مالیك ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئـەفەرمـوون : لە پێش تەقسیما ئەیدرێتەوە ، لە دوای تەقسیم بە قیمەتی خۆی نەبێ نایدرێتەوە .

ئەبوحەنیفە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : عەبدی ئابیق[1] لە پێش تەقسیمو دوای تەقسیم هی صاحیبەکەی خۆیەتی ، لە ماڵی ترا وەك مالیكو ئەحمەدە ـ رضي الله تعالی عنهم أجمعین ـ .

دەلیلی شافیعی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەم حەدیثەیە .

(١) عەبدی ئابیق : بەندەی راکردووو هەڵاتوو .

# الغلول[1]

١٢٧٥/١٢٦ أبو هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : قام فينا النبي - ﷺ - فذكر الغلول فعظمه وعظم أمره قال : لا أُلْفِيَنَّ أحدكم يوم القيامة على رقبته شاة لها ثغاء ، على رقبته فرس له حَمْحَمَةٌ ، يقول : يا رسول الله أغثني ! فأقول : لا أملك لك شيئا قد أبلغتك . وعلى رقبته بعير له رغاء ، يقول : يا رسول الله أغثني ! فأقول : لا أملك لك شيئا أبلغتك . وعلى رقبته صامت (ذهب أو فضة) فيقول : يا رسول الله أغثني ! فأقول : لا أملك لك شيئا قد أبلغتك . أو على رقبته رِقاع (متاع غير النقدين) تَخْفِقُ (تضطرب) فيقول : يا رسول الله أغثني ! فأقول : لا أملك لك شيئا قد أبلغتك . ح - ١٧٥/٥ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌يره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر - ﷺ - ته‌شريفی له به‌ينمانا راوه‌ستا به‌حثی له (غلول) - يه‌عنی خيانه‌تكردن له‌ماڵی غه‌نيمه‌ت - فه‌رموو ، زۆری به گه‌وره حسێب كرد ، به گوناهێكی زۆر گه‌وره‌ی ژمارد فه‌رمووی : له رۆژی قيامه‌تا تووشی هيچ كه‌سێكتان نه‌بم كه مه‌رێ وا له‌سه‌ر ئه‌ستۆی ئه‌بارێنێ ، يا ئه‌سپێ وا له‌سه‌ر ئه‌ستۆی ئه‌حيلێنێ . ئه‌ڵێ[2] : (يا رسول الله) به ئيمدادمه‌وه بێ ! ئه‌ڵێم هيچ شتێكم له ده‌ست نايێ بۆت بكه‌م ، له دنيادا ئه‌حكامی خوام پێگه‌يانی . يا وشترێكی له‌سه‌ر ئه‌ستۆ بێ ده‌نگه‌ده‌نگی لێوه بێ بڵێ : (يا رسول الله) به

---

(١) دزيی كردن له غه‌نيمه‌ت و تالآنيی جه‌نگ .

(٢) زه‌لامه‌كه نه‌ك مه‌ڕو ئه‌سپه‌كه (ئه‌ڵێ) .

ئیمدادمەوە بێ ! منیش ئەڵێم : هیچم لە دەست نایێ بۆت بکەم ، لە دنیادا ئەمرو نەهی خوام پێگەیانی . یا لەسەر ئەستۆی باری گرانی ئاڵتوون‌و زیو بێ بڵێ : (یا رسول الله) بمگەرێ ! منیش بڵێم : هیچم پێ ناکرێ بۆت بکەم ، چاك‌و خراپم تێگەیانی . یا لەسەر ئەستۆی مەتاع‌و ماڵی تری دنیایی بێ‌و بڵێ : (یا رسول الله) فریام‌کەوە ! منیش بڵێم هیچم لە دەست نایێ بۆ تۆ ، ئەحکامی ئیلاهی یەم تەبلیغ کردی .

یەعنی هەر لە ئێستەوە پێتان ئەڵێم ، نەصیحەتتان ئەکەم لە حەربا لە پێش تەقسیما لە ماڵی غەنیمەت لامەدەن ، لە قیامەتا لە ناو خەڵقا (مفتضح) ئەبن ، ئەو شتە ئەگرن بە کۆڵەوە یێنە لام کە نەجاتتان بدەم لە دەستی ، ئەو رۆژە هیچم پێ ناکرێ ئێوەیش عوذرتان نامێنێ .

ئەم حەدیثە تەهدیدێکی زۆری تیایە بۆ ئەوانەی کە (غلول) ئەکەن مەخصووصە بە بەعزێ ئەحواڵەوە (وإلا) پێغەمبەر ـ ﷺ ـ (شفیع المذنبین)ە ، فەقەط نابێ کەس مەغروور بێ بەوە .

**١٢٧/١٢٧٦ عن عبدالله بن عمرو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كان على ثَقَل النبي ـ ﷺ ـ (أي على عياله ومتاعه) رجل يقال له : كَرْكَرَةْ (أهداه له صاحب اليمامة) فمات . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : هو في النار . فذهبوا ينظرون إليه ، فوجدوا عباءة قد غلها . ح/٥/١٧٦ .**

**تەرجەمە :**

پیاوێ ـ غولامێکی کەرکەرە ناو بەسەر باروگرانی پێغەمبەرەوە بوو ـ ﷺ ـ چاوێری ئەکرد ئەو پیاوە وەفاتی کرد . پێغەمبەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە ئاگرایە : چوون تەماشایان کرد ، عەبایێکی لە غەنیمەت لادابوو .

ئه‌مه موعجيزه‌يێكه بۆ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ . بوونى له ئاگرا موعه‌للەقه به مه‌شيئه‌تى ئيلاهى ؛ گينا صه‌حابه‌ى پێغه‌مه‌رو خذمه‌تكارى بوه ـ ﷺ ، ورضي عنه ـ .

١٢٧٧/١٢٨ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنا مع النبي ـ ﷺ ـ مَقْفَلَهُ من عُسفان ، ورسول الله ـ ﷺ ـ على راحلته ، وقد أردف صفية بنت حُيَي ـ رضي الله تعالى عنها ـ فعثرت ناقته ، فصرعا جميعا ، فاقتحم أبو طلحة (ـ رضي الله تعالى عنه ـ ، أي رمى نفسه) فقال : يا رسول الله جعلني الله فداءك ! قال : عليك المرأة ، فقَلَب ثوبا على وجهه وأتاها فألقاها عليها ، وأصلح لهما مركبهما فركبا ، واكتنفنا رسول الله ـ ﷺ ـ فلما أشرفنا على المدينة قال : آيبون تائبون عابدون لربنا حامدون ، فلم يزل يقول ذلك حتى دخل المدينة . ح ـ ٥/ ١٨٠ ، ١٨١ وفيه : فأتى رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : يانبي الله جعلني الله فداءك ! هل أصابك من شيء ؟ قال : لا ولكن عليك المرأة .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را بووم ـ ﷺ ـ كه ته‌شريفى له عوسفان ئه‌گه‌رايه‌وه ، صه‌فيه‌ى كچى حوه‌يه‌يى ـ رضي الله تعالى عنها ـ سوارى پاشكۆى خۆى كردبوو ، وشتره‌كه‌ى سه‌رسمى داو هه‌ردوكيان كه‌وتنه‌خوارێ . ئه‌بوطه‌لحه ـ رضي الله تعالى عنه ـ خۆى له‌سه‌ر وشتره‌كه‌ى فرێدايه خوارێ ، هاته خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌رزى كرد : (يا رسول الله) خوا به فيداى تۆم كا ! هيچ ئازارت پێگه‌يى ؟ فه‌رمووى : خه‌ير ، ئه‌مما بچۆ به لاى ژنه‌كه‌وه ، ئه‌بوطه‌لحه ـ رضي الله تعالى عنه ـ جلێكى له سه‌رو چاويه‌وه پێچاو چوه

خزمه‌ت صه‌فیه - رضي الله تعالى عنها - جله‌که‌ی دا به‌سه‌را . (یه‌عنی سه‌تری کرد له بینـران) وشتره‌کـه‌و جێی بۆ چـاك‌کردن ، تـه‌شریفیـان سـواربوونـه‌وه ، ئێمه‌یش ده‌وره‌ی پێغـه‌مه‌رمـان دا - ﷺ - که نـزیـك بووینه‌وه له مه‌دینه فه‌رمووی : له سه‌فه‌ر گه‌ڕاینه‌وه ، ته‌وبه‌مان کرد ، عیباده‌تی خوامان کرد ، حه‌مدی خوامان‌کرد . . هه‌ر ئه‌وه‌ی فه‌رموو تا داخڵی مه‌دینه بووین .

# فرض الخمس

١٢٧٨/١٢٩ علي - رضي الله تعالى عنه - قال : كان لي شارف (ناقة مسنة) من نصيبي من المغنم يوم بدر ، وكان النبي - ﷺ - أعطاني شارفا من الخمس (من سرية عبدالله بن جحش - رضي الله تعالى عنه - ) فلما أردت أن أبتني بفاطمة بنت النبي - ﷺ - ، (ورضي عنها) واعدت رجلا صوَّاغا من بني قَيْنُقاع أن يرتحل معي فنأتي بإذخِرٍ (زورناتك) أردت أن أبيعه الصواغين وأستعين به في وليمة عرسي ، فبينا أنا أجمع لشارِفيّ متاعا من الأقتاب والغرائر (خەرار) والحبال ، وشارفاي مناخان إلى جنب حجرة رجل من الأنصار ، رجعت حين جمعت ما جمعت ، فإذا شارفاي قد أُجِبَّتْ (أي : قطعت) أسنمتها ، وبقرت خواصرهما (أي شُقَّت) وأخِذ من أكبادهما ! فلم أملك عينيَّ حين رأيت ذلك المنظرَ منهما ! فقلت : مَنْ فعل هذا ؟ فقالوا : فَعَل حمزةُ بن عبدالمطلب - رضي الله تعالى عنه - وهو في هذا البيت في شَرْب من الأنصار .

فانطلقت حتى أدخلَ على النبي - ﷺ - وعنده زيد بن حارثة - رضي الله تعالى عنه - فعرف النبي - ﷺ - في وجهي الذي لقيت ، فقال النبي - ﷺ - : مالَكَ ؟ فقلت : يا رسول الله ما رأيت كاليوم قط ! عدا حمزة على ناقَتَيَّ ؛ فأجَبَّ أسنمتها ، وبقر خواصرهما ، وها هو ذا في بيت معه شَرْب (جماعة اجتمعوا لشرب الخمر) فدعا النبي - ﷺ - بردائه فارتدى ، ثم إنطلق يمشي ، واتبعته أنا وزيد بن حارثة ، حتى جاء البيت الذي فيه حمزة ، فاستأذن ، فأذنوا لهم ، فإذا هم شَرْب ، فطفق رسول الله - ﷺ - يلوم حمزة فيما فعل ، فإذا حمزة قد ثَمِل (أي سكر) محمرة عيناه ، فنظر حمزة - رضي الله تعالى عنه - إلى رسول الله - ﷺ - ثم

صَعَّد النَّظَر فنظر إلى ركبته ، ثم صعد النظر فنظر إلى سُرَّته ، ثم صعد النظر فنظر إلى وجهه ، ثم قال حمزة : هل أنتم إلا عبيد لأبي ! ؟ فعرف رسـول الله - ﷺ - أنه قـد ثَمِل فنكص رسـول الله - ﷺ - على عقبيـه القهقريَّ وخرجنا معه . ح - ١٨٢/٥ . م - ٢٢٢/٨ . وفيه : قالوا : فعله حمزة بن عبدالمطلب وهو في هذا البيت في شرب من الأنصار غَنَّتْهُ قينة وأصحابه ، فقالت في غنائها :

ألا يا حمز للشُّرُف النواء .

فقام حمزة بالسيف فاجتبَّ أسنمتهما . . الحديث والباقي مثله .

[وقد جاء في غير مسلم تمام البيت :

ألا يـاحمز للشـرف النـواء — وهن معقـلات بـالفنـاء
ضـع السكين في اللبـات منها — وضـرّجهن حمزة بـالدمـاء
وعجّـل من أطايبهـا لشَرْب — قـديدا من طبيـخ أو شـواء

نووي]

الشُرُف : جمع شارفٍ . والنواءُ : السمانُ

تەرجەمە :

ئیمامی عەلی - رضي الله تعالی عنه - ئەفەرموێ : وشترێکی پێنج شەش ساڵەم بوو حیصصەی خۆم بوو لە غەنیمەتی بەدر . پێغەمەریش - ﷺ - لە خـومس وشترێکی تری دابوومێ ، کە ئیرادەی ئەوەم کرد کە فاطیمەی کچی پێغـەمەر - ﷺ ، ورضي عنهـا - بهێنم وەعدەم دا بـە پیاوێکی ئاسنگەر[1] لە بەنی‌قەینوقاع کە لەگەڵم بێ بچین زوڕناتك بێنین

---

(١) دانەر - خ - مانای (صواغ)ی بە (ئاسنگەر) لێداوەتەوە ، بەڵام راست وایە (زەڕەنگەر) بنووسرێ ؛ چونکە (حداد) ئاسنگەرە نەك (صواغ) .

بیفرۆشم به ئاسنگه‌ران که پاره‌که‌ی صه‌رفی شایی بووك بکه‌م ، له‌و وه‌خته‌دا که ته‌داروکی کۆپان‌و خه‌رارو گوریسم بۆ وشتره‌کانم ئه‌کرد وشتره‌کانیشم له ته‌نیشت دیواری ماڵێکی ئه‌نصارا ییخ دابوو ، سا چیم کۆکردبوه‌وه کۆم کردوه‌وه‌و گه‌رامه‌وه . چی ببینم ؟ وشتره‌کانم کۆپاره‌کانیان بررابوو ، که‌له‌که‌یان له‌ت کرا بوو ، سیوجگه‌ریان ده‌رهێنرابوو ، که ئه‌وه‌م دی چاوم له‌گریان پێ مه‌نع نه‌کرا ! پرسیم : کێ ئه‌مه‌ی کردوه ؟ وتیان : حه‌مزه‌ی کوڕی (عبدالمطلب) کردوویه‌تی . وا له‌و ماڵه‌دا له‌گه‌ڵ چه‌ند ئه‌نصارێ شه‌راب ئه‌خۆنه‌وه .

رۆییم بۆ خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ زه‌یدی کوڕی حاریثه‌ی له خذمه‌تا بوو . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له سیمام فه‌رقی به‌وه کرد که تووشی بووبووم ، فه‌رمووی : چیت لێ قه‌وماوه ؟ مه‌سئه‌له‌که‌م عه‌رزکرد . به‌رماڵه‌که‌ی طه‌له‌ب فه‌رموو ، دای به‌شانیاو ته‌شریفی رۆیی ، من‌و زه‌یدی کوڕی حاریثه شوێنی که‌وتین تا ته‌شریفی چوه ئه‌و ماڵه‌ی که حه‌مزه‌ی لێ بوو ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئیستیذانی فه‌رموو ، ئیذن‌درا که ته‌شریفی چوه ژوورێ چه‌ند که‌سێکی لێ بوو شه‌رابیان ئه‌خوارده‌وه ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ده‌ستی کرد به سه‌رزه‌نشی حه‌مزه که بۆچی وای کردوه .

ئیمامی حه‌مزه سه‌رخۆش بوو ، چاوی سوور بووبوو ته‌ماشای پێغه‌مه‌ری کرد ـ ﷺ ـ له دواییا چاوی هه‌ڵبری ته‌ماشای ئه‌ژنۆی کرد ، له دواییا چاوی به‌رزکرده‌وه ته‌ماشای ناوکی کرد ، له دواییدا چاوی به‌رز کرده‌وه ته‌ماشای وه‌جهی که‌ریمی پێغه‌مه‌ری کرد ـ ﷺ ـ له دواییدا وتی : بۆ ئێوه غه‌یری عه‌بدی باوکی من چین ؟ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ زانی که زۆر سه‌رخۆش بوه ، مه‌بادا زیاتر ته‌جاوزبکا ، پاشه‌وپاش گه‌ڕایه‌وه ، ئێمه‌یش له خذمه‌تیا چووینه ده‌رێ (له پاشا پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ وشتره‌کانی به

حەرزەتی حەمزە بژارد . م) .

لە موسلیما ئەوەی لێ زیادکردوە کە حەزرەتی حەمزە ـ رضي الله تعالی عنە ـ لەو ماڵەدا خۆیو ئەحبابی شەرابیان ئەخواردەوە . جاریەیێ بەستەی بۆ ئەوتن ، لە بەستەکەیا وتی :

ئەی حەمزە هەڵسە بۆ ئەو وشترە قەڵەوانە (کە لە مەیدانا ئەشکێڵ کراون ، کێرد بێنە بە گەردنیانا ، ئەی حەمزە لە خوێنیان هەڵکێشە ، بە عەجەلە لەجێی بەلەذەتیان گۆشتی کولاّو یا برژاو حازر بکە بۆ ئەم شەرابخۆرانە . غەیری موسلیم ، نووي) کە جاریەکە ئەو بەستەی خوێنەوە حەزرەتی حەمزە ـ رضي الله تعالی عنە ـ تەشریفی هەڵسا چوو کۆپارەی وشترەکانی بری ، کەلەکەی هەڵدڕین جگەرەکەی لێ هێنانە دەرێو بۆی بردن کردیان بە مەزە .

ئەو وەختە ئێشتا شەراب حەرام نەکرابوو . حەزرەتی حەمزە ـ رضي الله تعالی عنە ـ سەرخۆش بووبوو ، عەقڵی لەسەریا نەمابوو ، بۆیە وشترەکانی کوشت ، بۆیە بێ ئەمە سەریان ببڕێ بە وەجهی شەرعي ، جگەرو دووگەکەی خواردن ، بۆیە بەو قسەیە موقابەلەی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ . (والحاصل) لەو وەختەدا موکەللەف نەبوو ، فەقەط غەیرە موکەللەف زەرەری دا پێی تەضمین ئەکرێ[1] . (من نووي) .

١٢٧٩/١٣٠ عن أسلم أنه سمع عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالی عنه ـ يقول : أما والذي نفسي بيده ! لولا أن أترك آخر الناس بَبَّانا (أي مَكَّاسا فقراء) ليس لهم شيء مافُتِحتْ عليَّ قرية إلا قسمتها كما قسم النبي

(١) پێی تەضمین ئەکرێ : واتە پێی ئەبژێررێ .

ـ ﷺ ـ خيـر ، ولكني أتركهـا خزانـة لهم يقتسمـونها (أي خـراجهـا) ح ـ ٦/ ٣٦٠ . وفي رواية : لولا آخر المسلمين .ـ الخ ح ـ ٦/ ٣٦٠ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌سله‌م ئه‌فـه‌رموێ : کـه له عـومه‌ری کـوڕی خه‌طـابم بيست ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌يفه‌رموو : خه‌به‌رتان بيێ قه‌سه‌م به‌وه‌ی نه‌فسم وا له ده‌ستی قودره‌تيا ئه‌گه‌ر ئه‌وه نه‌بوايه که ئاخری خه‌ڵق فه‌قير ئه‌بن و ئـه‌بن به بـاجگرو هيچيـان نابێ . . هيـچ جێيێکم فه‌تـح نه‌ده‌کـرد که ته‌قسيمی نه‌که‌م له به‌ينی غه‌زاييدا وه‌ك پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ خه‌يبه‌ری ته‌قسيم کـرد (يه‌عنی منيش هـه‌ر جێيێکم بگرتـايه تـه‌قسيمم ئه‌کـرد لـه بـه‌ينی غه‌زاييدا ، ئه‌مما له‌وه ئه‌ترسم ئه‌و جێيه‌ی که فه‌تحی ئه‌که‌م ئه‌گه‌ر بێنم ته‌قسيمی بکه‌م ئه‌وانه‌ی که نه‌هـاتوون بـۆ غه‌زاو ئـه‌وانه کـه له‌مـه‌ولا موسوڵمان ئه‌بن ، يا يێنه دنياوه ، هيچيان نه‌بێ و فه‌قيربن و له‌به‌ر فه‌قيريی مه‌جبوور ببن به باجگريی . (لکن) ئه‌و جێگه‌يانه‌ی که فه‌تحی ئه‌کـه‌م ئه‌يێڵمه‌وه‌و به‌شی ناکه‌م ، ئه‌يکه‌م به خه‌زێنه له دواييدا خه‌راجه‌که‌ی له به‌ينی خۆيانا ته‌قسيم بکه‌ن .

(هه‌يهات ! ئه‌م ته‌دبيره عومری هه‌ر به قه‌د عومری خۆی بوو)

١٢٨٠/ ١٣١ جوه‌يريه‌ی کوڕی قدامة التميمي قال : سمعت عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قلنا : أوصنا يا أمير المؤمنين . قال : أوصيكم بذمة الله ؛ فإنه ذمة نبيكم ورزق عيالكم . ح ـ ٥/ ٢٢٥ .

ته‌رجه‌مه :

جوه‌يريه‌ی کوڕی قودامه ئه‌فه‌رموێ : عه‌رزی ئيمامی عومه‌رمان کـرد ـ رضي الله تعالى عنـه ـ که وه‌صيـه‌تمان بـۆ بکه . فـه‌رمـووی :

وه‌صیه‌تتان به‌وه بۆ ئه‌که‌م که عه‌هدی خوا به‌جێ بێنن ؛ چونکه عه‌هدی پێغه‌مه‌ری ئێوه‌یه‌و رزقی ماڵو منالّتانه . (یه‌عنی موعامه‌له‌ی باش بکه‌ن له‌گه‌ڵ ئه‌هلی ذیمـه‌تا ، بـه عه‌دالـه‌ت جیزیـه‌یان لێ بستێنن ، زوڵمیـان لێ مه‌که‌ن ، به‌وه‌ی که موافیقی ئه‌مری خواو پێغه‌مه‌ری خـوایه - ﷺ - لێیان ته‌حصیل ئه‌که‌ن ، ماڵو منالّتانی پێ به‌خه‌م ئه‌که‌ن . ئه‌مما ئێسته گاورو ، جووو ، موسوڵمان وه‌ك یه‌ك سه‌رانه‌یان لێ ئه‌ستێنرێ !)

**١٢٨٢/١٣٣ [1] عن أبي سعيد الخدري - رضي الله تعالى عنه - قال : بينما نحن في سفر مع النبي - ﷺ - إذ جاء رجل على راحلة له ، قال : فجعل يصرف بصره يمينا وشمالا ، فقال رسول الله - ﷺ - : من كان معه فضل ظهر فليعد به على من لا ظهر له ، ومن كان له فضل من زاد فليعد به على من لا زاد له . قال : فذكر من أصناف المال ماذكر ، حتى رأينا أنه لا حق لأحد منا في فضل . م - ٣٠٥/٧ .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بو سه‌عیدی خدری - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فـه‌رموێ : لـه وه‌ختێکا که ئێمه له سه‌فه‌رێکـا له خـذمه‌ت پێغـه‌مه‌را بـووین - ﷺ - پیاوێکی وشترسوار هات چاوی به‌م‌لاوبه‌ولادا ئه‌گێرا به‌راسته‌و چه‌په‌دا (بـه ئومێـدی ئه‌مـه که ده‌فعی ئیحتیـاجی بکرێ) ، پێغـه‌مـه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : هه‌رکه‌سێ له خۆی زیـاد حه‌یـوانێکی سواریی لابێ بیـدا به‌وه‌ی که حه‌یوانی نی‌یه ، هه‌رکه‌سێ زیاد له خۆی زوادێکی هه‌یه بیدا به‌وه‌ی که زوادی نی‌یه . ئه‌بوسه‌عید - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ :

(١) وه‌ك له‌وێیش دیاریمان کرد حه‌دیثی ژماره (١٢٨١/١٣٢) مان دوای حه‌دیثی (١٢٦٦/١١٧) له‌سه‌ر داوای دانه‌ر نووسی .

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له‌ ئه‌نواعی ماڵ ئه‌وی كه‌ فه‌رمووی ـ فه‌رمووی ، حه‌تا لامان وابووكه‌ هیچ كه‌س حه‌قی نی‌یه‌ له‌ زیادیدا .

(له‌م حه‌دیثه‌دا ته‌رغیب‌و ته‌شویقی تیایه‌ به‌ صه‌ده‌قه‌و سه‌خاوه‌ت‌و ئیحسان‌و چاكی‌ی له‌گه‌ڵ براده‌رانی دینیدا .

موحتاج ـ با داوایش نه‌كا ـ كه‌ حه‌ره‌كه‌تێكی وای كرد له‌وه‌ مه‌علووم بێ كه‌ موحتاجه‌ سوننه‌ته‌ ، به‌ڵكو له‌ به‌عزێ ئه‌حوالا فه‌رزی كیفایه‌یه‌ ، كه‌ ده‌فعی ئیحتیاجی‌یه‌كه‌ی بكرێ با سواریش بێ‌و پۆشته‌و پاراویش بێ‌و له‌ جێی خۆیا ده‌وڵه‌مه‌ند بێ ، له‌و حاڵه‌دا له‌ زه‌كات له‌ به‌شی (إبن السبيل) به‌شی بۆ جوێ‌ئه‌كرێته‌وه‌ . نووي)

**١٢٨٣/١٣٤ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : ما أعطيكم ولا أمنعكم ، أنا قاسم أضع حيث أمرت . ح ـ ١٩٧/٥ .**

**ته‌رجه‌مه‌ :**

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : من نه‌ شتتان ئه‌ده‌مێ نه‌ شتتان لێ مه‌نع ئه‌كه‌م (یه‌عنی موعطیی‌و مانیع هه‌ر خوایه‌ ـ عز وجل ـ) من غه‌یری ته‌قسیم كه‌ر هیچی تر نیم (ئه‌وی له‌ ده‌ستمایه‌) له‌و جێیه‌ی دائه‌نێم كه‌ ئه‌مرم پێ ئه‌كرێ كه‌ لێی دانێم .

**١٢٨٤/١٣٥ عن خولة الأنصارية ـ رضي الله تعالى عنها ـ [زوج حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] ؟قالت :سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : إن رجالا يتخوضون في مال الله بغير حق فلهم النار يوم القيامة . ح ـ ١٩٧/٥ .**

**ته‌رجه‌مه‌ :**

خه‌وله‌ی ئه‌نصاری‌یه‌ ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئه‌فه‌رموێ : له‌ پێغه‌مه‌رم بیست ـ ﷺ ـ ئه‌یفه‌رموو : كه‌ به‌عزێ پیاو به‌ ناحه‌ق

تەصەڕوف ئەكەن لە [بيت المال] لە ڕۆژی قیامەتا بەشی ئەوان ئاگرە .

١٣٦/١٢٨٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : غزا نبي من الأنبياء [يوشع ـ عليه الصلاة والسلام ـ] فقال لقومه : لا يتبعني رجل ملَكَ بُضْع امرأة وهو يريد أن يبني بها ولما لم يَبْن بها ، ولا أحدبنى بيوتا ولم يرفع سقوفها ، ولا أحد إشترى غنما [حَوامِل] أو خَلِفات [الحامل من النوق] وهو ينتظر ولادها . فغزا ، فدنا من القرية صلاة العصر أو قريبا من ذلك ، فقال للشمس : إنك مأمورة ، وأنا مأمور أللهم احبسها علينا فحبست حتى فتح الله [تعالى] عليه ، فجمع الغنائم ، فجاءت ـ يعني النار ـ لتأكلها فلم تَطْعَمها . فقال : إن فيكم غُلولا فليبايعني من كل قبيلة رجل فَلَزِقت يد رجل بيده ، فقال : فيكم الغلول ، فليبايعني قبيلتك ، فلَزِقت يد رجلين أو ثلاثة بيده ، فقال : فيكم الغلول ، فجاؤا برأس مثل رأس بقرة من الذهب فوضعوها ، فجاءت النار فأكلتها ، ثم أحل الله لنا الغنائم . رأى ضعفنا وعَجْزنا فأحلها لنا . ح ـ ١٩٩/٥ . م ـ ٣٢٧/٧ . ح ـ ٦٣/٨ إلى ولما يبن بها .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : پێغەمەرێ لە پێغەمەران [عليهم الصلاة والسلام] (كعب الأحبار) ئەڵێ : ئەو پێغەمەرە حەزرەتی یوشع ـ عليه الصلاة والسلام ـ بوو لە دوای حەزرەتی مووسا ـ عليه الصلاة والسلام ـ بوو بە پێغەمەر ، خوا ـ عز وجل ـ ئەمری پێکرد کە حەرب لەگەڵ جەبباران بکا] غەزای کرد بە قەومەکەی [کە بەنی ئیسرائیلە] فەرمووی : کەسێکم شوێن

نه‌که‌وێ که ژنێکی ماره‌کردبێ‌و ته‌مای بێ بچێته زه‌فافه‌وه‌و ئێشتا نه‌چوویێته زه‌فاف . که‌سێکیشم شوێن نه‌که‌وێ که خانووی دروست‌کردبێ‌و ئێشتا سه‌ری نه‌گرتبێ . که‌سێکیشم شوێن نه‌که‌وێ که مه‌ڕو وشتری ئاوسی کڕیبێ‌و چاوه‌ڕوانی زایینیان بێ‌و [ئێشتا نه‌زابن] .

ئه‌و پێغه‌مه‌ره (ـ علیه الصلاة والسلام ـ له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی که موافیقی مه‌طلووبی بوو) ته‌شریفی چوو بۆ غه‌زا ، نزیك بۆوه له‌و شاره‌ی که غه‌زای ئه‌کرد ، که ئه‌ریحایه ، یا وه‌قتی عه‌صر بوو یا نزیکی عه‌صر بوو ، [ ڕۆژی جومعه بوو له‌وه ترسا که شه‌وێ شه‌ممه دابێ‌و غه‌زایان بۆ دروست نه‌بێ] به ڕۆژی وت : تۆ مه‌ئمووری‌و منیش مه‌ئموورم ، خوایه ڕۆژمان بۆ حه‌بس بکه ، حه‌بس‌کرا تا خوا ئه‌ریحای بۆ فه‌تح کردن ، غه‌نیمه‌تی کۆکرده‌وه ، ئاگر هات که بیخوا [یه‌عنی بیسووتێنێ] ئاگره‌که تامی غه‌نیمه‌ته‌که‌ی نه‌کرد ، [یه‌عنی نه‌یسووتان . یوشع ـ علیه الصلاة والسلام ـ] فه‌رمووی : له ناو ئێوه‌دا خیانه‌ت هه‌یه ، له هه‌ر قه‌بیله‌یێ یه‌کێکیان ده‌ست بنێته ناو ده‌ستمه‌وه‌و به‌یعه‌تم له‌گه‌ڵ بکا . ده‌ستی پیاوێ به ده‌ستیه‌وه نووسا . فه‌رمووی ، له قه‌بیله‌ی ئێوه‌دا غولوول هه‌یه ، قه‌بیله‌که‌ت موبایه‌عه‌م له‌گه‌ڵ بکه‌ن . ده‌ستی دوو پیاو یا سیانیان به ده‌ستیه‌وه نووسا . فه‌رمووی : خیانه‌ت له ئێوه‌دایه . چوون به قه‌د سه‌ری گاجووتێ ئاڵتوونیان هێنا له ناو غه‌نیمه‌ته‌که دایان‌نا ئاگر هات‌و خواردی ـ سووتانی ـ .

پێغه‌مه‌ر فه‌رمووی ـ ﷺ ـ خوا غه‌نیمه‌تی بۆ ئێمه حه‌ڵاڵ فه‌رمووه . عیلمی هه‌یه که ئێمه ضه‌عیف‌و عاجزین بۆیه غه‌نیمه‌تی بۆ حه‌ڵاڵ کردووین .

**١٢٨٦/١٣٧ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - ان رسول الله - ﷺ - بعث سرية [فكنت فيها . أخرى] فيها عبدالله بن عمر قِبَل نجد فغنموا إبلا كثيرا [وغنما . م] فكانت سهامهم إثني عشر بعيرا ، أو أحد عشر بعيرا ، ونُفِلوا بعيرا بعيرا . ح - ٢٠٨/٥ . ح - ٤٠١/٦ ، وليس فيه الشك . وفيه : فرجعنا بثلاثة عشر بعيرا . م - ٣٣١/٧ .**

**تەرجەمە :**

ئیبن و عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - دەستەیێکی بۆ شەبەیخوون نارد ، منیشیان لەناوا بووم ، ئوشترێکی زۆرو مەڕێکی زۆریان بەتالاّن هێنا بەشی کوللی کەسێ دوانزە وشتر بوو سەرو وشتریشی زیاد لە بەشی خۆیان پێ عەطا فەرموون هەر یەکە بە سێنزە وشترەوە گەراینەوە .

**١٢٨٧/١٣٨ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن رسول الله - ﷺ - كان يُنَفِّل [أو من باب علم] بعض من يبعث من السرايا لأنفسهم خاصة سوى قَسْم عامة الجيش . ح - ٢٠٩/٥ . م - ٣٣٣/٧ . وفيه : والخمس في ذلك واجب كله .**

**١٢٨٨/١٣٩ وعنه قال : نَفَلَنا رسول الله - ﷺ - نفلا سوى نصيبنا من الخمس ، فأصابني شارف ، والشارف : المسنُّ الكبير . م - ٣٣٢/٧ .**

**تەرجەمە :**

ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - بەعزێ لەوانەی کە بە شەورەویی ئەیناردن بۆ جێیێ لە (خمس الخمس)ی غەنیمەت زیاد لە حەقی خۆیان لەگەڵ عومومی لەشکرا ئەیدانێ ، بە

خوصووصی بەشی تریشی ئەدانێ . لە موسلیما ئەفەرموێ : خومس لە هەموو غەنیمەتەکەدا لازمە کە تەقسیم بکرێ .

ئیبن و عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - غەیری حەقی خۆمان لە خومس لە (خمس الخمس) یش بەشی داین ، وشترێکی بە عومرم بەرکەوت .

نەفل : یەعنی زیادەبەشی مەخصووصە بەوانەوە کـە لە حـەربا هونەرێکی زیادیان نوانبێ ، بە هەموو کەسێ لە لەشکرەکە نادرێ .

لای ئیمامی شافیعی و مـالیك و ئـەبوحـەنیفە - رضي الله تعـالی عنهم - لـە (خمس الخمس) ئـەدرێ ، لای حـەسـەنی بـەصـری و ، ئـەوزاعی و ، ئیمامی ئـەحمەد - رحمهم الله - لـە ئەصـلی غەنیمـەتەکـە ئەدرێ ، لە قەولێکی تری شافیعیدا - رضي الله تعـالی عنە - لـە چوار خومسەکەی تری ئەدرێ . قەولێکی تـریشی موافیقی ئـەحمەدە ، کـە وابێ سێ قـەولی هەیـە . ئەصـەحی هەمـوویان قـەولی ئەوەڵـە . (من نووي) .

# بركة الغازي في ماله حيا وميتا مع النبي - ﷺ - وولاة الأمر

١٤٠/١٢٨٩ عن عبدالله بن الزبير - رضي الله تعالى عنهما - قال : لما وقف الزبير - رضي الله تعالى عنه - يوم الجمل [على باب البصرة ، سنة ست وثلاثين ، بعد مقتل عثمان - رضي الله تعالى عنه -] دعاني فقمت إلى جنبه فقال : يا بُنيَّ إنه لا يقتل اليوم إلا ظالم أو مظلوم وإني لا أُراني إلا سأقتل اليوم مظلوما (لقوله - عليه الصلاة والسلام - : بشر قاتل ابن صفية بالنار) وإن من أكبر همِّي لَدَيْني ! أفَتُرى يُبْقي دَيْنُنا من مالنا شيئا ؟ فقال : يا بني بع مالنا فاقض ديني ، وأوصى بالثلث (مطلقا) وثلثِه لبنيه يعني (بني . أبو ذر) عبدالله بن الزبير ، يقول : ثلث الثلث ، فإن فضل من مالنا فضل بعد قضاء الدين شيئ فثلثه لولدك .

[الظاهر أن في متن الأثر إسقاطا لأنه قال أولا أوصى بالثلث مطلقا وبثلث ثلثه لبني عبدالله - رضي الله تعالى عنه - وهنا يقول : إن بقي شيء فثلثه أي ثلث الباقي . ولا يلتئم مع ما سبق . وحق العبارة أن يقول : فإن فضل بعد قضاء الدين شيء فثلثه للوصية ، وثلثه ، أي ثلث الثلث ، لولدك . رشيد] .

قال هشام : وكان بعض ولد عبدالله قد وازىٰ [في أنصبائهم] بعض بني الزبير [في أنصبائهم ؛ لأن ثلث الثلث إذا قسم بين بني عبدالله بلغ سهم كل منهم مقدار سهام بني الزبير لكثرتهم . ولا تلتفت إلى قول العيني : إن المعنى وازىٰ سن بعض بني عبدالله سن بعض ولد الزبير - رضي الله تعالى عنهما - والوصية لبني عبدالله - رضي الله تعالى عنه - ليس

من الوصية للوارث لحجبهم بأبيهم وأعمامهم . رشيد] خبيبٌ وعَبَّادٌ وله يومئذ تسعة بنين وتسع بنات . [وهذا يؤيد ما قلت . رشيد] = ح ـ ٥/٢٠٣ = .

**ته‌رجه‌مه :**

عه‌بدوڵڵای كوڕی زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئه‌فه‌رموێ : كه زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنه ـ كه [له ساڵی سی وشه‌شی هیجرییا] له به‌ر ده‌رگای به‌صره وه‌ستا [كه له‌گه‌ڵ حه‌زره‌تی عائیشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ] له وه‌قعه‌ی جه‌مه‌لا [بچن له گه‌ڵ ئیمامی عه‌لی شه‌ر بكه‌ن تاكو قاتیلی ئیمامی عوثمانیان بداتێ به قیصاص بیكوژنه‌وه] منی بانگ‌كرد ، كه چووم له ته‌نیشتیه‌وه وه‌ستام ، فه‌رمووی : ئه‌ی كوره بچكۆله‌ی خۆم = ئه‌ی رۆڵه‌ی خۆم ، ئیمرۆ هه‌ركه‌سێ بكوژرێ یا زاڵمه یا مه‌زڵوومه ، من هه‌ر وا ظه‌ن ئه‌به‌م كه ئیمرۆ به مه‌زڵوومی ئه‌كوژرێم ؛ [چونكی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رموویه‌تی : موژده بده‌ن به‌و كه‌سه‌ی كه زوبه‌یر ئه‌كوژێ ئه‌چێته ناو ئاگره‌وه] . گه‌وره‌ترینی غه‌می من قه‌رزه‌كه‌مه ، ئایا ظه‌ن = ئه‌به‌ی = كه قه‌رزه‌كه‌مان هیچ بهێڵێته‌وه له ماڵی ئێمه ؟

فه‌رمووی : ئه‌ی رۆڵه‌ی خۆم هه‌رچی ماڵێكی ئێمه هه‌یه بیفرۆشه ؛ قه‌رزه‌كه‌م بده‌ره‌وه . وه وه‌صیه‌تی به سێیه‌كی كرد . سێیه‌كی سێیه‌كیشی كرد به وه‌صیه‌ت بۆ ئه‌ولادی عه‌بدوڵڵا . [ئه‌وه وه‌صیه‌ت نی‌یه بۆ واریث ؛ چونكی مه‌حجووب ئه‌بن به باوكیان‌و مامه‌كانیان] هیشامی كوڕی عوروه ئه‌فه‌رموێ : به‌عزێ له ئه‌ولادی عه‌بدوڵڵا كه خه‌بیب‌و عه‌بباده [له عومرا (عيني) . له به‌شا (ابن بطال) ] به‌رابه‌ر ئه‌بوون به به‌عزێ له ئه‌ولادی زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌و رۆژه زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنه ـ نۆ كوڕو نۆ كچی بوو .

(به فه رائيض ته قسيمم كرد له دووصه دو چل و سێ سه هم هه شتاو يه ك سه همى وه صيه تى موطلقه ، بيست و حه وت سـه همى هى كوڕانى عه بدوڵلايه . عه بدوڵلا له گه ڵ براكانيا يه كى ده سه هميـان به ره كـه وێ كچانيشى يه كى پێنج سه هميان به رئه كه وێ . ئيوه يش حسێبى بكه ن)

قال عبدالله : فجعل يوصيني بدَيْنه ويقول : يا بُنَيَّ إن عجزت عنه في شيء فاستعن عليه مولاي [عز وجل] قال : فوالله ما دَرَيت ما أراد ، حتى قلت : يا أَبَتِ من مولاك ؟ قال : الله . قال : فوالله ماوقعت في كُربْة من دَيْنه إلا قلت : يا مولى الزبير إقض عنه دينه فيقضيه . فقتل الزبير - رضي الله تعالى عنه - .

[روى الحاكم من طرق متعددة : أن عليا ذكرَّ الزبير - رضي الله تعالى عنهما - أن النبي - ﷺ - قال له : لتقاتلن عليا وأنت ظالم له ، فرجع قبل القتال . فقتله عمرو ابن جُرْمُوز ، وهو نائم بوادي السباع . من قسطلاني]

ولم يدع دينارا ولا درهما إلا أَرَضين منها الغابة [أرض كبيرة من عوالي المدينة ، إشتراها بسبعين ومائة ألف . وبيعت بألف ألف وستمائة ألف] وإحدى عشرة دارا بالمدينة ، ودارين بالبصرة ، ودارا بالكوفة ، ودارا بمصر .

ته رجه مه :

عـه بدوڵـلا ئه فـه رموێ : ئيـتر هه ر وه صيـه تى بۆ قـه رزه كه ى لا ئه كردم ؛ ئه يفه رموو : ئه ى رۆڵه ى خۆم ئه گه ر له شتێكا له قه رزدانه وه دا عـاجز = بـووى = له مـه ولام موعـاوه نه ت طـه له ب كـه . عه بـدوڵلا ئـه فه رموێ : وه ڵلاهى نـه مزانى مـه قصوودى لـه مـه ولاى كێيـه تـا عه رزم كرد : بابه لێ مه ولات كێيه ؟ فه رمووى : خـوايه . عـه بدوڵـلا

ئه‌فه‌رموێ : وه‌ڵڵاهی هه‌ر ته‌نگانه‌یێ تـووش بوومـایه بـۆ قه‌رزه‌كـه‌ی ئه‌موت : یا مه‌ولای زوبه‌یر قه‌رزه‌كه‌ی زوبـه‌یر بـده‌ره‌وه ، خوا ـ عـز وجل ـ ئه‌یدایه‌وه . زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنه ـ شه‌هیدكرا .

[حاكم ریوایه‌ت ئه‌كا كه ئیمامی عه‌لی ئه‌خاته‌وه فكری زوبه‌یر كه پێغه‌مه‌رر ـ ﷺ ـ به = زوبه‌یری = فه‌رموو : تۆ شـه‌ڕ له‌گـه‌ڵ عه‌لیـدا ئه‌كه‌ی ، له‌وه‌دا تۆ زاڵمی . له‌به‌ر ئه‌وه زوبه‌یر له پێش شه‌ڕا گه‌ڕایه‌وه ، له (وادی السباع) نوستبوو عه‌مری كوڕی جورموز به ناغافڵ شه‌هیدی كرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ]

نه دیناری نه درهه‌مێكی به‌جێ نه‌هێشت ، ته‌نها چه‌نـد ئه‌رزێ نه‌بێ كه غابه یه‌كێ بوو له‌و ئه‌رزانه [غابه ئه‌رزێكی زۆر گه‌وره‌یه له ژوور مه‌دینه‌وه] یازده خانوویشی له مه‌دینه بوو ، دوو خانووی له به‌صره بوو ، خانوویێكی له كووفه بوو ، خانوویێكی له میصرا بوو .

قال : وإنما كـان دَينه الـذي عليه أنِ الـرجل كـان يأتيـه بالمـال فيستودعه إياه ، فيقول الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لا ، ولكنه سَلَف (قرض) فإني أخشى عليه الضيعة . وما وليَ إمارة قط ولا جباية خراج ، ولا شيئا إلا أن يكون في غزوة مع النبي ـ ﷺ ـ أو مع أبي بكر ، وعمر ، وعثمان ـ رضي الله تعالى عنهم ـ [روى الزبير بن بكّار أنه كان له ألف مملوك يؤدّون إليه الخراج] .

قال عبدالله بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : فَحَسَبْتُ ما عليه من الدين فوجدته ألفي ألف ومائتي ألف . قال : فلقي حكيم بن حِزام ـ رضي الله تعالى عنه ـ عبدالله بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فقال : يا ابن أخي كم على أخي من الدين ؟ فكتمه . فقال : مائة ألف . فقال

حكيم - رضي الله تعالى عنه - : والله ما أُري أموالكم تسع لهذه . فقال له عبدالله : أفرأيتك إن كانت ألفي ألف ومائتي ألف ؟ ! قال : ما أراكم تطيقون هذا ، فإن عجزتم عن شيء منه فاستعينوا بي .

ته‌رجه‌مه :

عه‌بدولّلا ئه‌فه‌رموێ : ئه‌و قه‌رزه‌ی كه له‌سه‌ر زوبه‌یر بوو - رضي الله تعالى عنه - هه‌ر ئه‌وه بوو خه‌لّق مالّیان ئه‌هێنایه لای به ئه‌مانه‌ت ، ئه‌ویش فه‌رموویه : ئه‌مانه‌ت قه‌بوولّ ناكه‌م ، ئه‌ترسم كه ضایع ببێ ، ئه‌مما به قه‌رز قه‌بوولّی ئه‌كه‌م . زوبه‌یر - رضي الله تعالى عنه - نه ئه‌میرێتی كردوه ، نه ته‌حصیلاتی خه‌راجی كردوه ، نه هیچی تر ، ئه‌وه‌نده‌ی هه‌یه له خزمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - یا له خزمه‌ت ئه‌بوبه‌كرا ، یا عومه‌را ، یا عوثمانا - رضي الله تعالى عنهم - چووبێ بۆ غـه‌زا . [زوبه‌یـری كوڕی به‌كار ئه‌فه‌رموێ : هه‌زار عه‌بدی بوو خه‌راجیان ئه‌دایێ] . عه‌بدولّـلا - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : قه‌رزه‌كه‌یم حیساب كرد . دوو هه‌زارهه‌زارو دووصه‌د هه‌زار بـوو ، فه‌رمـووی : به حـه‌كیمی كوڕی حیزام گه‌یی - رضي الله تعالى عنه - لێی پرسی : ئه‌ی كوڕی برای خۆم قـه‌رزی براكـه‌م چه‌نـده ؟ عه‌بـدولّلا - رضي الله تعـالى عنه - كـه‌تمی میقداره‌كه‌ی كرد ، فه‌رمـووی : صه‌د هـه‌زاره - حه‌كیم فـه‌رمووی : وه‌للاهی ظه‌ننم نی‌یه كه مالّی ئێوه به‌شی ئه‌و قه‌رزه بكا . عـه‌بدولّـلا - رضي الله تعـالى عنـه - فـه‌رمـووی : ئـه‌گـه‌ر دوو هـه‌زارهـه‌زارو دووصه‌دهه‌زار بێ ئه‌لّێی چی ؟ حه‌كیم فه‌رمووی : ظه‌ننم نی‌یه كه بتوانن بیده‌نه‌وه . ئه‌گه‌ر له میقدارێكی عاجز بوون موعـاوه‌نه‌تم لێ طـه‌له‌ب بكه‌ن .

قال : وكان الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ إشترى الغابة بسبعين ومائة ألف ، فباعها عبدالله بألف ألف وستمائة ألف ، ثم قام فقال : من كان له على الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ حقٌّ فليوافنا [فليأتنا] بالغابة ، فأتاه عبدالله بن جعفر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وكان له على الزبير أربعمائة ألف ، فقال لعبدالله : إن شئتم تركتها لكم . قال عبدالله : قال لا . قال : فإن شئتم جعلتموها فيما تؤخرون ـ إن أخرتم ـ فقال عبدالله : لا . قال : فأقطعوا لي قطعة . فقال عبدالله : لك من هٰهنا إلى ههنا . قال : فباع منها [من الغابة وغيرها] فقضى دَيْنه فأوفاه ، وبقي منها أربعة أسهم ونصف ، فقدم على معاوية وعنده عمرو بن عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ والمنذر بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ وابن زمعة أخو أم المؤمنين سودة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فقال له معاوية : كم قوَّمتَ الغابة ؟ قال : كل سهم مائة ألف . قال : كم بقي ؟ قال : أربعة أسهم ونصف . قال المنذر بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ : قد أخذت سهما بمائة ألف . قال عمرو بن عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ : قد أخذت سهما بمائة ألف . وقال ابن زمعة : قد أخذت سهما بمائة ألف . فقال معاوية : كم بقي ؟ فقال : سهم ونصف . قال : أخذته بخمسين ومائة ألف .

قال : وباع عبدالله بن جعفر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ نصيبه من معاوية بستمائة ألف . فلما فرغ ابن الزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ من قضاء دينه قال بنو الزبير : أقسم بيننا ميراثنا قال : لا والله لا أقسم بينكم حتى أنادي بالموسم أربع سنين : ألا من كان له على الزبير دين فليأتنا فلنقضه ! قال : فجعل كل سنة ينادي بالموسم . فلما مضى أربع سنين

قسم بينهم . قال : فكان للزبير أربع نسوة ، ورفع الثلث فأصاب كل إمرأة ألف ألف ومائتا ألف فجميع ماله خمسون ألف ألف ومائتا ألف . ح - ٥/٢٠٣ . غلط في الحساب في زيادة مائتا ألف على ألف ألف في حصص نسوة الزبير . [كما غلطتُ أنا في الحساب حيث لم أُدخل النسوة في تصحيح المسألة ، فصححوه .[1] وفي القسطلاني توجيهات للسهو الذي رواه البخاري] .

**تەرجەمە :**

عورووە ئەفەرموێ : زوبەیر غابەی بە صەدو حەفتا هەزار كڕیبوو ، عەبدوڵلا بە هەزار هەزارو شەشصەد هەزاری فرۆت ، لە دواییدا عەبدوڵلا راوەستا فەرمووی : هەركەسێ حەقێكی بەسەر زوبەیرەوە هەیە لە غابە بێتە لام . عەبدوڵلای كوڕی جەعفەر - رضي الله تعالى عنهما - چوەلای چوار هەزاری لەسەر زوبەیر بوو فەرمووی : ئەگەر هەوەستان هەیە واز لە قەرزەكەم بێنم . عەبدوڵلا فەرمووی : خەیر . فەرمووی : ئەگەر هەوەستان بێنێ بمخەنە دواوە ، ئەگەر بەعزێكی تەئخیر ئەكەن . عەبدوڵلا فەرمووی : خەیر . فەرمووی : كە وابێ پارچەیێكم لە غابە بۆ بربدەن . عەبدوڵلا فەرمووی : لەوێوە تا ئەوێ بۆ تۆ بێ ، عورووە ئەڵێ : ئەو پارچەیەی پێ فرۆت و تەسلیمی كردو قەرزەكەی بە تەواوی دایەوە .

---

(١) دانەر - خ - مەبەستی لەم هەڵەی خۆی لەو مەسئەلەدایە كە لە پێشەوە فەرمووی : «بە فەرائیض تەقسیمم . .» خۆی لێرە بە دواوە ژنەكانیش دەخاتە مەسئەلەكەو حەلی دەكات .

له غابه چوار سه‌هم‌و نیوی مایه‌وه عه‌بدوڵلا ته‌شریفی چوه لای موعاویـه ، عه‌مـری کوڕی عـوثمان‌و ، مـونذیـری کوڕی زوبـه‌یرو ، عه‌بدوڵـلای کوڕی - رضي الله تعـالى عنهم - له لای مـوعاویـه بوو ، موعاویه له عه‌بدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - ی پرسی : غابه به چه‌نده نرخی بڕرا ؟ فه‌رمووی : هه‌ر سه‌همێکی به صه‌دهه‌زار . وتی : چه‌ند سه‌همی ماوه ؟ فه‌رمووی : چوار سه‌هم‌و نیوی ماوه . مونذیری کوڕی زوبه‌یر - رضي الله تعالى عنه - فه‌رمووی : سـه‌همێکم به صـه‌د هه‌زار وه‌رگرت . عه‌مری کوڕی عوثمان - رضي الله تعالى عنه - وتی : منیش سه‌همێکم به‌صه‌د هه‌زار وه‌رگرت . عه‌بدوڵلای کوڕی (زمعه) - رضي الله تعالى عنه - فه‌رمووی : منیش سه‌همێکم به صه‌دهه‌زار وه‌رگرت . موعاویه وتی : چه‌ند سه‌همی ماوه ؟ عه‌بدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - فه‌رمووی : سه‌هم‌و نیوێکی ماوه . موعاویه وتی : منیش ئه‌وه‌م به صه‌دو په‌نجاهه‌زار وه‌رگرت .

عورِوه ئه‌فه‌رموێ : عـه‌بدوڵـلای کوڕی جـه‌عفه‌ر حیصـه‌که‌ی خۆیی به موعاویه فرۆت به شه‌شصه‌د هه‌زار ، که (ابن الزبیر) - رضي الله تعالى عنها - له قه‌رزدانه‌وه بوه‌وه کوڕانی زوبه‌یـر - رضي الله تعالى عنه - عه‌رزیان کرد : ئیتر میراته‌که‌مان له‌ به‌ینا به‌ش بکه . فه‌رمووی : وه‌ڵلاهی تا چوار ساڵ له مه‌وسیمی حه‌جا جاڕ نه‌ده‌م کـه کێ قه‌رزی به‌سه‌ر زوبه‌یره‌وه هه‌یه - رضي الله تعالى عنه - بێ بیده‌مه‌وه . . . به‌شی ناکه‌م ! چوار ساڵ له مه‌وسیما به‌و نه‌وعه جاڕی دا ، دوای چوار ساڵه له به‌ینیانا ته‌قسیمی کرد . زوبه‌یر - رضي الله تعالى عنه - چوار ژنی بـوو ثولثی و [ثولثی ثولثی] لێ جویٚ کرده‌وه ، ژنه‌کانی هه‌ر یه‌کی صه‌د هه‌زار

هەزارو دووصەدهەزاريان بەركەوت . بەم حسابە مەجمووعی تەريكەی زوبەير پەنجاهەزار هەزارو دووصەد هەزار بوو .

تەصحيحی مەسئەلەی ميراثی يە[1] . ٧٧٧٦ :

---

(١) گەلێك گەڕام نەمزانی دانەر ـ خ ـ ئەم مەسئەلەی لە كوێ ـ بەم شێوە ـ وەرگرتوە . لەسەر ئەم ماڵی زوبەيرە گەلێ قسە كراوەو ، قەسطەلانیو عەسقەلانیو كەسانی ديكەيش قسەيان لەسەر كردوە ، بۆ زيادە متمانەی باسەكە چوومە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدولكەريمی مدرِس ، ئەنجام پاش گەڕانو پشكنين ئەمە نەتيجەی باسەكە بوو : تێكڕای ماڵی زوبەير (٢٠٠ر٥٠) پەنجا مليۆنو دووصەد هەزار درهەم بوە . ئەمەيش بە هەموو سامانەكەی كە (غابە)و زەویو زارو خانوەكانی مەدينەو بەصرەو ميصرو . . تاد قازانجی مانەوەی ئەو چوار ساڵە كە عەبدوڵلا ماڵەكەی هێشتەوەو بەشی نەكرد . بەشكردنەكەيش بەم شێوە دەبێت :

دوو مليۆنو دووصەد هەزاری قەرز لێ دەردەچێيت .

سێ يەكيشی ـ كە (١٦) شازدە ـ مليۆنە جيادەكرێتەوە . دوای ئەوەی كە ئەمانە دەركرا (٣٢) مليۆن دەمێنێتەوە ، بە پێی زانياری فەرائيض بەش دەكرێ .

چوار ژنەكە هەر يەكەيان هەشتيەك دەبات كە دەكاتە يەك مليۆن ، واتە بەشی چوار ژنەكە چوار مليۆن دەبێت . (٢٨) بەش دەمێنێتەوە بەسەر كوڕو كچەكاندا ـ نێر دوو بەشو مێ بەشێك ـ بەش دەكرێت . كوڕەكان كە (٩) ن (١٨) بەشو ، كچەكانيش كە نۆن (٩) بەش ، ئەمە (٢٧) بەشی ، يەك بەش دەمێنێتەوە ـ لە بەشی كچو كوڕەكان ـ دووبارە بە ياسای پێشوو بەش دەكرێتەوە بەسەريانا .

ثلث/٢٥٩٢ ، ثلث الثلث/٨٦٤ ، أربع نسوة لكل منها/٢٤٣ ، البنات لكل منها/١٢٤ ، والبنون لكل منهم/٢٤٨ ، مسألة/٧٧٧٦ .

١٤١/١٢٩٠ مروان بن الحكم [. . . .] ومسور بن مخرمة [ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أسلم مع أبيه بعد الفتح] أخبرا أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال حين جاءه وفد هوازن مسلمين فسألوه أن يرد إليهم أموالهم وسبيهم [وعند الواقدي كان فيهم أبو برقان السعدي ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : يا رسول الله إنْ في هذه الحظائر إلا أمهاتك ، وخالاتك ، وحواضنك ، ومرضعاتك . فامننْ علينا منَّ الله عليك ! وفي شعر زهير بن صُرَد كما في المعجم الصغير للطبرراني :

أمنن على نسوة قد كنتَ ترضعها إذ فوك تملؤه من محضها الدرر

قسطلاني]

فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : أحبُّ الحديث إلي أصدقه ، فاختاروا إحدى الطائفتين : إمّا السبي ، وإمّا المال ، وقد كنت إستأنيت بهم . وقد كان رسول الله ـ ﷺ ـ إنتظرهم بضع عشرة ليلة حين قفل من الطائف ، فلما تبين لهم أن رسول الله ـ ﷺ ـ غير راد إليهم إلا إحدى الطائفتين قالوا : فإنا نختار سبينا ، فقام رسول الله ـ ﷺ ـ في المسلمين فأثنى على الله بما هو أهله ، ثم قال : أما بعد : فإن إخوانكم هؤلاء قد جاؤنا تائبين ، وإني قد رأيت أن أرد إليهم سبيهم ، من أحبَّ أن يُطَيِّبَ فليفعل ، ومن أحبَّ منكم أن يكون على حظه حتى نعطيه إياه من أول ما يفيء الله علينا فليفعل . فقال الناس : قد طيَّبْنا ذلك يا رسول الله لهم . [ولأبي ذر : قد طيَّبنا ذلك لرسول الله ـ ﷺ ـ] فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : إنا لاندري من أذِن لكم في ذلك ممن لم يأذن ، فارجعوا حتى

يرفع إلينا عرفاؤكم أمركم . فرجع الناس ، فكلّمهم عرفاؤهم ثم رجعوا إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فأخبروه أنهم قد طيَّبوا فأذنوا . (قال ابن شهاب) : فهذا الذي بلغنا عن سبي هوازن . ح ـ ٥/٢٠٧ .

ح ـ ٤/١٥٤ ، ٣٠٥ ، ٣٤٣ ، ح ـ ٦/٣٨٩ . د ، ن .

ح ـ ١٠/٢٣٦ .

ئه‌گه‌ر تیكراری به‌عزێ حه‌دیث ببێ له (مجمع البحرين)ا عه‌ییم لێ‌مه‌گرن ، موكه‌ڕه‌ركه‌ی طه‌ی بكه‌ن .

ئـه‌م حه‌دیثـه مورسـه‌له ؛ چـونكی مه‌روان صـه‌حابـه نی‌یـه ، تابیعی‌یه . میسوره‌یش ـ رضي الله تعالى عنه ـ حازری وه‌قعه‌كه نه‌بوه فه‌قه‌ط مورسه‌لی صه‌حابی‌یه حوكمی مه‌رفووعی هه‌یه .

ته‌رجه‌مه :

میسو ه‌ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خه‌به‌ری داوه به عورووه‌ی كوڕی زوبه‌یر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : له‌و وه‌خته‌دا كه وه‌فدی هـه‌وازین به مـوسوڵـمانه‌تی هـاتنه خـذمه‌ت پێغـه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ طـه‌ڵه‌بیـان لێ‌كرد كـه ئه‌سیره‌كان‌و ماڵه‌كانیان پێ ببه‌خشێ . (ئه‌بو به‌رقانی) سه‌عدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ یشیان له‌ناوا بوو ، عه‌رزی پێغه‌مه‌ری كرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) ئه‌وانه‌ی كه له‌و حه‌بسخـانه‌ی تـۆدان غه‌یـری[1] دایك‌و ، پوورو ، دایه‌ن‌و ، به‌خێوكـه‌ری تۆ كـه‌سی تر نـین ، به عـه‌فویـان له ئه‌سیریی منه‌تمان به‌سه‌را بنێ ، خوا مه‌منوونت بكا . زوهه‌یر له شیعری

(١) له ئه‌سڵه‌كه‌دا (غه‌یری ئه‌وانه‌ی غه‌یـری دایك‌و . . .) بـوو به‌هـه‌ڵه‌مـان زانی‌و ، وه‌ك سه‌ره‌وه راستمان كرده‌وه .

= خوّیا = ئه‌ڵێ : منه‌ت بێ به‌سه‌ر ئه‌و ژنانه‌دا که شیرت ئه‌مژین ، له‌و وه‌خته‌دا که مژینیان دوڕی قه‌طره‌ی شیریان ده‌می موباره‌کی پڕه کردی) .

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێی فه‌رموون : خۆشترین قسه لای من ئه‌و قسه‌یه که راست بێ ؛ له دوو شت یه‌کێکیان ئیختیار بکه‌ن : یا ئه‌سیره‌کان ، یا ماڵه‌کانتان . تا ئێسته ته‌ئخیرم خست به‌شم نه‌کرد . راویی ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ده پانزه رۆژ مونته‌ظیریان بوو ، له‌و وه‌خته‌دا که ته‌شریفی له طائیف گه‌رایه‌وه (به‌شکردنه‌که‌ی دوا خست) .

که لێیان مه‌علووم بوو که پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ هه‌ر یه‌کێ له‌و دوو طائیفه‌یان ئه‌داته‌وه عه‌رزیان‌کرد : ئێمه هه‌ر ئه‌سیره‌کانمان ئه‌وێته‌وه ، یه‌عنی ماڵمان ناوێ ، که ئه‌وه‌یان عه‌رزکرد پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شریفی له ناو موسوڵمانانا راوه‌ستا ، به‌وه‌ی که لایه‌ق به شه‌ئنی خوابێ حه‌مدو ئه‌نای خوای کرد ، له دواییدا فه‌رمووی : (أما بعد) که براده‌رانی دینیی ئێوه که فروستاده‌ی هه‌وازینن تۆبه‌یان له کوفر کردوه‌و هاتوونه لامان ، منیش ره‌ئیم وایه‌و وا مه‌صڵه‌حه‌ت ئه‌بینم که ئه‌سیره‌کانیان بده‌مه‌وه . هه‌رکه‌سێ حه‌زه‌کا به طیبی نه‌فسی بێ عیوه‌ض که ئه‌سیره‌کانیان بدرێته‌وه با بیکا ، هه‌رکه‌سێ له ئێوه وا حه‌زه‌کا که له‌سه‌ر به‌شی خۆی بمێنێ تا له ئه‌وه‌ڵ غه‌نیمه‌تێ که خوا بۆمان بنێرێ بی‌ئه‌مێ[1] بیکا . هه‌موو خه‌ڵق عه‌رزیان‌کرد : (یا رسول الله) به طیبی نه‌فس رازین که بیان‌درێته‌وه بێ عیوه‌ض . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی . ئێمه نازانین کێ ئیذنی داوه‌و کێ ئیذنی نه‌داوه ، بگه‌رێنه‌وه تا وه‌کیل و حه‌که‌مه‌کانتان

(١) بی‌ئه‌مێ : بیده‌مێ .

ئیرادەو فیکری هەمووتانمان پێنێتە لا .

خەڵق گەڕانەوە ، وەکیلە کانیان (یەکە یەکە) قسەیان لەگەڵ کردن ، لە دواییدا گەڕانەوە بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەریان دایێ و عەرزیان کرد کە هەموو بە حوسنی ڕەزای خۆیان ئیذنیان دا .

[کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە بێ عیوەض بیان داتەوە . ئیبن و شەهاب ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئەمەیە گەییوە بە ئێمە لە ئەسیرانی هەوازین . ]

## من قتل قتيلا فله سلبه

١٢٩١/١٤٢ عن عبدالرحمن بن عوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بينا أنا واقف في الصف يوم بدر فنظرت عن يميني وشمالي فإذا أنا بغلامين من الأنصار حديثة أسنانهما [معاذ بن عمرو ، ومعاذ بن عفراء ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] تمنيت أن أكون بين أضْلَع [أقوى] منهما ، فغمزني أحدهما فقال : ياعم هل تعرف أبا جهل ؟ قلت : نعم ما حاجتك إليه يا ابن أخي ؟ قال : أُخْبِرتُ أنه يَسبُّ رسول الله ـ ﷺ ـ والذي نفسي بيده ! لئن رأيته لايفارق سوادي سواده [شخصي شخصه] حتى يموت الأعجل منا [أي الأقرب أجلا] فتعجبت لذلك . فغمزني الآخر ، فقال لي مثلها .

فلم أنشب [ألبث] أن نظرت إلى أبي جهل يجول في الناس [يزول . م] قلت : ألا إن هذا صاحبكما الذي سألتماني ، فابتدراه بسيفيهما فضرباه حتى قتلاه ، ثم إنصرفا إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فأخبراه ، فقال : أيكما قتله ؟ قال كل واحد منهما : أنا قتلته . فقال : هل مسحتما سيفيكما ؟ قالا : لا . فنظر في السيفين فقال : كلاكما قتله . سَلَبه لمعاذ بن عمرو بن الجموح [لأنه هو الذي أثخنه] . وكانا معاذ بن عفراء ومعاذ بن عمرو بن الجموح . ح ـ ٢١٢/٥ . م ـ ٣٤١/٧ ـ ح ـ ٢٤٩/٦ . ولفظه :

إني لفي الصف يوم بدر إذ إلتفت ، فإذا عن يميني وعن يساري فَتَيان حديثا السِّنّ ، فكأني لم آمن بمكانهما ، إذ قال لي أحدهما سرًّا مِن صاحبه : ياعم أرني أبا جهل . فقلت : يا ابن أخي وما تصنع به ؟

قال : عاهدت الله ، إن رأيته ، أن أقتله أو أموت دونه ! فقال لي الآخر سرًّا مِن صاحبه مثله . قال : فما سرَّني أني بين رجلين مكانهما . فأشرت لهما إليه ، فشدًّا عليه مثل الصقرين حتى ضرباه ، وهما ابنا عفراء والحرث بن رفاعة : معاذ ومعوِّذ . وليس فيه السلَب . وفيه مباينة للحديث الأول في معوِّذ .

تەرجەمە :

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژی بەدر لە وەختێکا کە لە صەفی حەربا وەستابووم تەماشای راستو چەپی خۆم کرد ، تێفکریم لە ئەنصار دوو جوانکەی تازەعومرم لە تەنیشتەوە بوو ، تەمەننای ئەوەم کرد کە لە بەینی لەوان بەقووەتترا بوومایە ، یەکێکیان بەدزیی ئەویتریان پێی وتم : مامە ئەبوجەهل ئەناسی ؟ لێم پرسی : ئیشت چیە بە ئەبوجەهل ئەی کوڕی برای خۆم ؟ وتی : خەبەرم دراوەتێ کە جوێن ئەدا بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ، قەسەم بەوەی کە نەفسی منی بەدەستە ! ئەگەر ببینم لێی جوێ نابمەوە تا کامان زووتر ئەجەلی هاتبێ ئەمرێ . لەوە عەجایب مام . ئەوی تریشیان تێوەژەندم وای وت . زۆری پێ نەچوو تەماشام کرد ئەبوجەهل لە ناو خەڵقائەگەڕێ ، لە جێیێ ناوستێ . پێموتن : ها ئەوە ئەوەیە کە لێتانپرسیم ، عەجەلەیان بۆ کرد [وەك هەڵۆ تێوەرۆهاتن . م] لێیان دا تا کوشتیان ، لە دواییدا گەرانەوە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ و عەرزیانکرد ، فەرمووی : کامتان کوشتی ؟ هەردوکیان عەرزیانکرد : من کوشتم . فەرمووی شیرەکانتان سریوە یان نا ؟ عەرزیانکرد : خەیر . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەماشای شیرەکانی کردن ،

فه‌رمووی : هه‌ردوكتان كوشتووتانه . سه‌له‌به‌كه‌ی[1]دا به مه‌عاذی كوڕی عه‌مری كوڕی جه‌مووح ؛ چونكی به‌شیره‌كه‌ی ئه‌و ئیشی ته‌واو بووبوو . ئه‌و دوانه : مه‌عاذی كوڕی عه‌فرای كوڕی حه‌رثی كوڕی ره‌فاعه‌و ، مه‌عاذی كوڕی عه‌مری كوڕی جه‌مووح بوون .

له ریوایه‌ته‌كه‌ی تری بوخارییا ئه‌فه‌رمویٚ : كه مه‌عاذو (معوذ)ی كوڕی عه‌فراو كوڕی حه‌رث بوون . ئیحتیمالی هه‌یه موعه‌ویذیش ئیشتیراكی كردبیٚ له‌وه‌دا ؛ چون ئیبن و مه‌سعوود[2] - رضي الله تعالى عنه - ئیٚشتا ئه‌بوجه‌هل رۆحی تیا مابوو له دوای سوئال و جوابیٚ له به‌ینیانا جاری بوو ، سه‌ری بری و بردی بۆ خذمه‌تی سه‌عاده‌ت - عليه الصلاة والسلام - بۆیه پیٚغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : هه‌ردوكتان كوشتووتانه به‌وه دلٚی ئه‌وی هیٚنایه‌جیٚ ؛ چونكی شه‌ریكی (ابن الجموح) بوو له لیٚدانا فه‌قه‌ط به برینه‌كه‌ی كه (ابن الجموح) لیٚی كردبوو ئیشی ته‌واو بووبوو پیٚی

(١) سه‌له‌ب : ئه‌و كه‌ل‌وپه‌ل‌و شت‌ومه‌كه‌یه كه به‌كوژراوه‌كه‌وه‌یه .

(٢) ئه‌م باسه له‌م حه‌دیثه‌ی ئیٚره‌دا نی‌یه‌و ، حه‌دیثیٚكی تره‌و كورته‌ی باسه‌كه وایه : دوای برانه‌وه‌ی شه‌ڕی به‌درو ، شكانی كافران‌و سه‌ركه‌وتنی موسوڵمانان . . ئیبن‌ومه‌سعوود به ناو كوژراوه‌كاندا ده‌گه‌ڕا ، ئه‌بوجه‌هلی له سه‌ره‌مه‌رگدا دی ، چوو چۆكی دادایه سه‌ردڵی . ئه‌بوجه‌هل لیٚی پرسی : پیرۆزی‌و سه‌ركه‌وتن ده‌ست كیٚ كه‌وت ؟ ئیبن‌و مه‌سعوود فه‌رمووی : پیرۆزی‌و سه‌ركه‌وتن بۆ خواو پیٚغه‌مه‌ری خوایه ! دوای ئه‌وه ئه‌بوجه‌هل وتی : به راستی ئه‌ی شوانكاره شوێنیٚكی سه‌ختت گرتوه - كه‌سه‌ر سنگی ئه‌وه - . دوای ئه‌وه ئیبن‌و مه‌سعوود سه‌ری له لاشه‌ی جیاكرده‌وه‌و بردی بۆ خزمه‌ت پیٚغه‌مه‌ر - د - .

ئه‌مرد ، به‌ بريني (ابن العفراء) چونكی شيـره‌كه‌ی زۆر نـه‌ڕۆييبو پێی نه‌ده‌مرد .

ئينسـان به‌ چاوی بچووكيی تـه‌ماشـای كـه‌س نـه‌كـا . بـۆيـه‌ عه‌بدوره‌حمانی بنی عه‌وف له‌ دواييدا فـه‌رمووی ـ وه‌ك لـه‌ حه‌ديثـه‌كه‌ی ترايه‌ ـ : ئه‌وه‌م پێ خۆش نه‌بوو كه‌ له‌ باتی ئه‌وان له‌ به‌ينی دوو پياوی ترا بوومايه‌ .

پـه‌له‌پـه‌ل‌كردن بـۆ كردنی فـه‌ضائيـلی ئـه‌عمـال ، رق‌هـه‌ڵسـان له‌گونه‌هكار صيرف بۆ خواو پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ سوننه‌ته‌ .

سه‌له‌بی مه‌قتوول حه‌قی قاتيله‌كه‌يه‌تی .

قاتيل له‌ غه‌زادا بڵێ : من كافرێكم كوشتوه‌ پيێ بڕوا ئه‌كرێ به‌و شه‌رته‌ ئه‌ماره‌تێكی ببێ .

**١٢٩٢/١٤٣ مصعب بن سعد عن أبيه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أخذ أبي من الخمس سيفا فأتى به النبي ـ ﷺ ـ فقال : هب لي هذا . فأبى ، فأنزل الله ـ عز وجل ـ : ﴿يسألونك عن الأنفال ، قل : الأنفال لله والرسول﴾[1] . م ـ ٣٢٩/٧ . وقد مر بأبسط في فضائل[2] سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ .**

**ته‌رجه‌مه‌ :**

موصعه‌ب ئه‌فه‌رموێ : سه‌عدی باوكم ـ رضي الله تعالى عنه ـ شيـرێكی له‌ خـومس هـه‌ڵگـرت بـرديـه‌ خـزمـه‌ت پێغـه‌مـه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌رزی‌كرد : (يا رسول الله) ئه‌م شيره‌م پێ هيبه‌ بفه‌رموو : پێغه‌مـه‌ر

---

(١) سووره‌تی ئه‌نفال/ ٩ .

(٢) بڕوانه‌ : به‌رگی سێيه‌می ئه‌م كتێبه‌ . ل : ٤٨٦ .

ـ ﷺ ـ ئیبای فەرموو نەیدایێ . ئەم ئایەتە نازڵ بوو کە مەعنای وایە : لە ئەنفال لێت ئەپرسرێ ؛ بڵێ : ئەنفال هی خواو رەسوولی خوایە .

١٤٤/١٢٩٣ عن عوف بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قتل رجل من حمير رجلا من العدوّ فأراد سلَبَه فمنعه خالد بن الوليد ـ رضي الله تعالى عنه ـ وكان واليا عليهم ، فأتى رسول الله ـ ﷺ ـ عوف بن مالك فأخبره ، فقال لخالد : ما منعك أن تعطيه ؟ قال : إستكثرته يا رسول الله . قال : إدفَعْه إليه ، فمرَّ خالد بعوف فجرَّ بردائه ثم قال : هل أنجزت لك ما ذكرت لك عن رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فسمعه رسول الله ـ ﷺ ـ فاستغضب فقال : لا تعطه يا خالد ، لاتعطه يا خالد ، هل أنتم تاركو لي أمرائي ؟ إنما مثلكم ومثلهم كمثل رجل استرعى إبلا أو غنما فرعاها ، ثم تحين سقيها ، فأوردها حوضا فشرعت فيه فشربت صفوه وتركت كَدِره ؛ فصَفْوُه لكم وكدره عليهم . م ـ ٣٤٣/٧ . وفي أخرى عنه : قال : خرجت مع من خرج مع زيد بن حارثة ـ رضي الله تعالى عنه ـ في غزوة مؤتة (مهموزا وغير مهموز) ورافقني مددي من اليمين . . وساق الحديث عن النبي ـ ﷺ ـ بنحوه ، غير أنه قال في الحديث : قال عوف : فقلت : يا خالد أما علمت أن رسول الله ـ ﷺ ـ قضى بالسَّلَب للقاتل ؟ قال : بلى ولكني إستكثرته . م ـ ٣٤٥/٧ .

تەرجەمە :

عەوفی بنێ مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریثەدا چوون بۆ غەزای مۆتە منیش چووم ، یەکێ لەوانەی کە مەدەدی لەشکرەکە بوو . بوو بە رەفیقم ، پیاوێ لە حیمیەر پیاوێکی لە دوشمن کوشت [زاهیر وایە ئەو پیاوە

ره‌فيقه‌كه‌ى بووبىٚ] ، سه‌له‌بى كوژراوه‌كه‌ى ويست . خاليدى كوڕى وه‌ليد - رضي الله تعالى عنه - نه‌يدايىٚ ، خاليد - رضي الله تعالى عنه - واليى ئه‌و جێيه بوو ، پێم‌وت : ئه‌ى خاليد بۆ نازانى كه پێغه‌مه‌ر - ﷺ - حوكمى وا كردوه كه كه‌سىٚ - كه‌سىٚ له دوشمن بكوژىٚ مالى ئه‌و كه‌سه كوژراوه كه پێيه‌تى بۆ ئه‌و كه‌سه‌يه كه كوشتوويه‌تى ؟ وتى : به‌لىٚ ئه‌زانم ، ئه‌مما لام وايه كه سه‌له‌به‌كه‌ى زۆره هه‌مووى نادرێتىٚ . عه‌وف - رضي الله تعالى عنه - ته‌شريفى چوه خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - كه‌يفيه‌ته‌كه‌ى عه‌رزكرد ، پێغه‌مه‌ر - ﷺ - به خاليدى فه‌رموو : بۆچيت نه‌داوه‌تىٚ ؟عه‌رزى‌كرد : به زۆرم زانى . فه‌رمووى : بيده‌رىٚ . له دواى ئه‌وه حه‌زره‌تى خاليد به لاى عه‌وفا رابورد ، عه‌وف كه‌واكه‌ى راكێشاو پێى‌وت : خۆ ئه‌وه‌ى كه له (رسول الله)وه - ﷺ - بۆم ذيكر كردى به‌جێم‌هێنا ! [يه‌عنى به‌مه طه‌عنى له حه‌زره‌تى خاليد دا - رضي الله تعالى عنه - ] پێغه‌مه‌ر - ﷺ - بيستى غه‌ضه‌بى هه‌لسا ، دوو ده‌فعه فه‌رمووى : ئه‌ى خاليد مه‌يده‌رىٚ ، ئێوه بۆ خاترى من واز له ئومه‌راكانم يێنن ؟ [يه‌عنى وازيان لىٚ بێنن طه‌عنيان لىٚ مه‌ده‌ن] مه‌ثه‌لى ئێوه‌و ئه‌وان وه‌ك مه‌ثه‌لى پياوىٚ = وايه = وشترىٚ يا مه‌رىٚ بێنێته سه‌ر حه‌وزىٚ ، ئاوه سافه‌كه‌ى بخواته‌وه‌و لێله‌كه نه‌خواته‌وه . سافى ئه‌وان بۆ ئێوه‌يه لێلى ئه‌وان بۆ خۆيانه [يه‌عنى ئومه‌را زه‌حمه‌ت ئه‌كێشن ، جه‌مع‌و جيبايه‌تى مال ئه‌كه‌ن ، حيمايه‌ى ره‌عيه‌ت ئه‌كه‌ن ، به عه‌داله‌ت مال ئه‌گه‌يێنن به موسته‌حه‌ق ، شه‌وو رۆژ له زه‌حمه‌تان ، ئێوه بىٚ زه‌حمه‌ت مالتان

---

(١) دانه‌ر - خ - سه‌ره‌تاى ريوايه‌ته‌كه‌ى دوايى بردوه‌ته پێشه‌وه‌و ، له‌گه‌ل ريوايه‌ته‌كه‌ى ديكه‌دا پێكيه‌وه شێلاون .

تعالى عنه ـ قال : خرجنا مع ررسول الله ـ ﷺ ـ عام حنـين [في السنة الثامنة] فلما إلتقينا كانت للمسلمين جولة [تقدم وتأخر] ، فرأيت رجلا من المشركين عَلا رجلا من المسلمين ، فاستدرت حتى أتيته من ورائه حتى ضربته بالسيف على حَبل عاتقه ، فأقبل عليَّ فضمَّني ضمَّةً وجدت منها ريح الموت ، ثم أدركه الموت ، فأرسلني ، فلحقت عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقلت : ما بال الناس ؟ قال : أمر الله . ثم إن الناس رجعوا ، وجلس النبي ـ ﷺ ـ فقال : من قتل قتيلا له عليه بيِّنة فَلَهُ سَلَبُه فقمت . فقلت : من يشهد لي ؟ ثم جلست . ثم قال : من قتل قتيلا له عليه بينة فله سلَبه ، فقمت فقلت : من يشهد لي ؟ ثم جلست . ثم قال الثالثة مثله ، فقمت . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ما لك يا أبـا قتادة ؟ فاقتصصت عليه القصة . فقال رجل : صدق يا رسول الله وسلبه عندي فأرضه عني . فقال أبو بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لاها الله ، إذا لا يَعمِد إلى أسد مِن أُسد الله يقاتل عن الله ورسولـه ـ ﷺ ـ يعطيك سلَبَه ! فقال النبي ـ ﷺ ـ : صدق . فأعـطاه (سلبه) ، فبعت الدِّرْع فابتعت به مَخْرَفا (بستانا) في بني سَلمة فإنه لَأوّل ما تأثلته (تكلفت جمعه) في الاسلام . ح ـ ٥/٢١٣ . م ـ ٧/٣٣٤ .

ته رجه مه :

ئه بو قه تاده ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه فه رموێ : ساڵی حونه ین له خذمه ت پێغه مه را ـ ﷺ ـ چووینه ده رێ بۆ غه زای حونه ین ، که له گه ڵ موشریکا مولاقاتمان بوو ، موسوڵمانان [غه یری پێغه مه ر ـ ﷺ ـ و ئه وانه که له ده وری ئـه وبوون] پـاشکه وتن و پێشکـه وتنیان تێکـه وت ، چاوم که وت به موشریکێ به سه ر موسوڵمانێکا غـاڵب بوو وه ختبـو بیکوژێ ،

دەورەم کردەوە تا چوومە پشتیەوە ، تا شیرێکم دا لە رەگی ملی ، رووبی تێکردم و گوشیمی ، وای گوشیم کە بۆنی مردنم لێ‌کرد ! لە دواییدا مردنی پێگەیی و بەرەڵلای کردم . لە دواییدا موشریکـان شکان و مـوسوڵمـانان گەرانەوە ، پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی دانیشت ، فەرمووی : هەرکەسێ یەکێکی کوشتبێ و شـاهیدێکی ببێ لـەسەر ئـەوە سەلـەبی ئەو بـۆ ئەو کەسەیە . هەڵسام وتم : کێ شاهیدیم بۆ ئەداو ؟ دانیشتمەوە ، دووبارە وای فەرموو ، دووبارە منیش هەڵسامەوە وام‌وت ، دەفعەی سێیەمیش فەرمووی و هەڵسام ، پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : (یا أبو قتادة) چیت دەوێ ؟ قسەکەم عەرزکرد . پیاوێ وتی : راست ئەکا سەلەبەکەی لای منە ، لە طەرەف منەوە رازیی بکـە . حەزرەتی ئـەبوبـەکری صـەدیق - رضي الله تعـالى عنه - فـەرمـووی : خـەیـر وەڵاهی ، کـەوابێ و تـۆ شەهادەتی بۆ ئەدەی کە ئەو کوشتوویەتی پێغەمەر - ﷺ - ئەوە ناکا کـە شێرێ لە شێرانی خوا شەر بکاو دەفعی دوشمن بکا لە خواو رەسوولی خوا بێنێ غەنیمەتی ئـەو کەسـە بدا بـە تۆ ، پێغـەمەر - ﷺ - فـەرمووی : ئەبوبەکر راست ئەکا . پێغەمەر - ﷺ - غەنیمەتی - یـەعنی ئەوەی لـە حەربا بەو کەسە بوو - دایمێ ، زرێکەم فرۆت لە بەنی‌سەلەمەدا باغێکم پێ‌کری ، ئەو باغە ئەو وەڵ ماڵێکە کە لە ئیسلامەتیدا کردوومە بە موڵکی خۆم .

١٢٩٦/١٤٧ عن نافع - مرسل - [عن ابن عمر . أخرى] أن عمر بن الخطاب - رضي الله تعالى عنه - قال : يا رسول الله إنه كان عليَّ إعتكاف في الجاهلية ، فأمره أن يفي به ، قال نـافع [مـرسلا] : وأصـاب عمر - رضي الله تعالى عنه - جاريتين (من الخمس . أخرى) من سبي حنين ،

فوضعهما في بعض بيوت مكة ، فمنَّ رسول الله ـ ﷺ ـ على سبي حنين . فجعلوا يسعون في السكك ، فقال عمر : يا عبد الله أنظر ماهذا ، فقال : منَّ رسول الله ـ ﷺ ـ على السبي . [وعند الاسماعيلي : قلت : ما هذا ؟ قالوا : السبي أسلموا . فأرسلهم النبي ـ ﷺ ـ] قال : إذهب فأرسل الجاريتين . ح ـ ٥/٢١٦ .

تەرجەمە :

نافيع [مەولای ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] ئەفەرموێ : کە عومەری کوڕی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : [يا رسول الله] لە جاهيليەتا ئیعتیکافێکم بەسەرەوەیە ، ئەمری پێ فەرموو کە بەجێی بێنێ .

نافيع ئەفەرموێ : عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ئەسیرانی حونەین دوو جاریەی بەرکەوت ، لە یەکێ لە خانوانی مەکە دایانان . پێغەمەر ـ ﷺ ـ منەتی بەسەر ئەسیرانی حونەینا = نا = ئازادی کردن ، ئەو ئەسیرانە لە خۆشیانا لە کۆڵانی مەکەدا دەستیان بەهەڕاکردن = کرد = . ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەی عەبدوڵلا تێفکرە بزانە ئەوە چیە ؟ عەرزی کرد : ئەسیرانی هەوازین موسوڵمان بوون و پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەریدان ، فەرمووی بچۆ تۆیش ئەو دوو جاریە بەردە .

١٢٩٧/١٤٨ عمرو بن تغلب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أعطى رسول الله ـ ﷺ ـ قوما ومنع آخرين ، فكأنهم عتبوا عليه ، فقال : إني أعطي قوما أخاف ضَلَعهم وجزعهم [مرض قلوبهم وضعف يقينهم] وأَكِل أقواما إلى ما جعل الله في قلوبهم من الخير والغنى منهم عمرو بن تغلب . فقال عمرو بن تغلب : ما أُحبُّ أنّ لي بكلمة رسول الله ـ ﷺ ـ حمر النعم . ح ـ ٥/٢١٦ . خ ـ ٢/١٧٥ . وفي أخرى عنه : أن رسول

الله ـ ﷺ ـ أُتي بمال أو بسبي فقسمه بهذا .

**ته‌رجه‌مه :**

عـه‌مری کـوڕی تیغلیب ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ئه‌فـه‌رموێ : به‌عزێ ماڵیان یا غه‌نیمه‌تیان هێنایه خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌شی کرد ، به به‌عـزێ که‌سی داو بـه به‌عـزێکی نه‌دا (کـأنه) گله‌یی یـان لێ کرد ، فه‌رمووی : به‌شی به‌عزێك ئه‌ده‌م له دڵ نه‌خۆشی یان و زه‌عیفی ئیمان و فه‌ریادو فوغانیان ئه‌ترسم . به‌عزێ قه‌ومیش حه‌واڵه‌ی ئه‌و ئیمان و خێرو غینایه ئه‌که‌م که خوا ـ عز وجل ـ له دڵیا خه‌لقی کردوه [یه‌عنی ئه‌وانه‌ی که ئـه‌یانـده‌مێ وه‌ك موعـاویه‌و بـاوکی و باقی (مؤلفـة القلوب) ئـه‌گـه‌ر نه‌یانـده‌مێ ، چونکی ئیمـانیان زه‌عیفـه ، ئه‌تـرسم ئیرتیـداد بکه‌ن ،

ئه‌وانه‌ی که نایانده‌مێ ئیمانیان به قووه‌ته نه‌یشیانده‌مێ خه‌له‌ل به ئیمانیان ناگا] عه‌مری کوڕی تیغلیب له‌و ئیمان و یه‌قین به‌قووه‌تانه‌یه . عه‌مری بنی تیغلیب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : ئه‌و که‌لیمه‌ی که پێغـه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی ناگۆڕمه‌وه به هه‌موو وشتری سووری دنیاو ماڵییاتی .

١٢٩٨/١٤٩ عن بُريدة بن الحُصَيْب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بعث النبي ـ ﷺ ـ عليـا إلى خـالـد ـ رضي الله تعـالى عنهـما ـ ليقبض الخمس ، وكنت أبغض عليا [ـ رضي الله تعالى عنه ـ لأنه أخذ من المغنم جارية] وقد اغتل ، فقلت لخالد : ألا ترى إلى هذا ؟ ! فلما قدمنا على النبي ـ ﷺ ـ ذكرتُ ذلك له ، فقال : يا بريدة أتبغض عليا ؟ فقلت : نعم . قال : لاتبغضه فإنه له في الخمس أكثر من ذلك . وإن كنت تبغضه فازدد له حبا . لا تقع في علي فإنه مني وأنا منه ، وهو وليكم بعدي . أحمد . قال : فما كان في الناس أحد أحبَّ إلي من علي ـ رضي الله تعالى

ئه‌دريتێ ، ئێشكتان ئه‌كێشرێ ، مه‌نعى زوڵمتان لێ ئه‌كرێ ، شتێك كه موجيبى طه‌عن و له‌وم بێ روو بدا له‌وان ئه‌پرسرێته‌وه ، ئێوه وه‌ك به‌رزه‌كى بانان ده‌ره‌چن ، سوئالتان لێ ناكرێ . نووي]

١٤٥/١٢٩٤ سلَمة بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه - قال : غزونا مع رسول الله - ﷺ - هوازن ، فبينا نحن نتضحى مع رسول الله - ﷺ - إذ جاء رجل على جمل أحمر : فأناخه ، ثم إنتزع طَلَقا (عقالا) من حَقَبه [حبل يشد على حقو البعير] ، فقيد به الجمل ، ثم تقدم يتغدى مع القوم ، وجعل ينظر ، وفينا ضعفة ورقَّة في الظَّهْر ، وبعضنا مشاة ، إذ خرج يشتدُّ فأتى جمله ، فأطلق قيده ، ثم أناخه فقعد عليه ، فأثاره ، فاشتدَّ به الجمل ، فأتبعه رجل على ناقة ورقاء . قال سلَمة - رضي الله تعالى عنه - : وخرجت [راجلا] أشتد فكنت عند وَرِك الناقة ثم تقدمت حتى كنت عند ورك الجمل ؛ ثم تقدمت حتى أخذت بخطام الجمل ، فأنخته ، فلما وضع ركبته في الأرض إخترطت سيفي فضربت رأس الرجل فندر [سقط] ثم جئت بالجمل أقوده عليه رحله وسلاحه . فاستقبلني رسول الله - ﷺ - والناس معه ، فقال : من قتل الرجل ؟ قالوا : ابن الأكوع . قال : له سلبه أجمع . م - ٣٤٦/٧ . د ، ن . ح - ١٦٢/٥ مختصرا .

ته‌رجه‌مه :

سه‌له‌مه‌ى كوڕى ئه‌كوه‌ع - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له خزمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - غه‌زاى هه‌وازينمان كرد ، له وه‌ختێكا له خزمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - چێشته‌نگاومان ئه‌كرد پياوێ هات ، سوارى وشترێكى سوور بووبوو ، وشتره‌كه‌ى ييخ دا ، له دواييدا له

پاشكۆبەندەكەی[1] ئەشكێڵێكی هێنایەدەرێ دەستی پێ ئەشكێڵ كرد ، لە دواییدا هات لەگەڵ خەڵقا نانی خوارد ، دەستی كرد بە تەماشاكردنمان ئێمەیش نەوعە زەعیفییێك و لە حەیوانی سواریدا كەمیەتیەكمان بوو ، ئەوەندەمان زانی ئەو پیاوە هەڵسا بە هەڕاكردن چوو بۆ لای وشترەكەی ئەشكێڵەكەی كردوەو ییخی داو سواری بوو وشترەكەی كەوتە غار ، پیاوێ (لە ئێمە) لەسەر وشترێكی سووربۆری مێ شوێنی كەوت .

سەلەمە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : منیش بە هەڕاكردن شوێنی كەوتم ، گەییمە لای كەفەلی وشترە سووربۆرەكەو لێی پێشكەوتم تا گەییمە لای كەفەلی وشترەكەی ئەو پیاوە ، لە دواییدا كەوتمە بەردەمیەوە دەستەوسارەكەییم گرت ، ییخم دا ، كە ئەژنۆی وشترەكە گەیی یە سەر ئەرز شیرەكەمم لە كالان دەركێشاو دام لە سەری ، سەری كەوتە خوارێ ، لە دواییدا وشترەكەم راكێشا ، هەموو سیلاح و تەدارەكی بەسەرەوە بوو ، پێغەمەرم - ﷺ - پێگەیی و خەڵقیشی لە خزمەتا بوو ، فەرمووی : كێ پیاوەكەی كوشت ؟ عەرزیان كرد : (ابن الأكوع) فەرمووی : هەموو سەلەبی بۆ ئەو بێ .

١٢٩٥/١٤٦ عن أبي قتادة [الحرث بن ربعي الأنصاري] - رضي الله

(١) دانەر - خ - دوای ئەوەی مانای (حەقەب)ی بە پاشكۆبەند لێداوەتەوە لە پەراوێزەوە نووسیویە : «حەقەب : ئەو چوار بەنەیە كە دوانی لەم دیوو دوانی لەودیوی پاشكۆۆ شتی بە پاشكۆدا پێ ئەبەستن . ناویم لە فكر چۆتەوە ، مەلا سەلام - سلمه الله - بینووسێ . نەوزاد - خوا حافیظی بێ - وتی : پاشكۆبەندە» . لە هەندێ ناوچەی كورردستاندا بەو پەتە دەڵێن : (بەن سامۆتە) .

عنه - .[1]
ئەرجەمە :

بورەیدەی کوڕی حوصەیب - رضي الله تعالی عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - عەلی نارده لای خالید کە خومسی لێ وەربگرێ . منیش عەلیم ئەبوغضان - رضي الله تعالی عنه - ؛ چونکی لە پێش تەقسیما جاریەیێکی لە غەنیمەت هەڵگرت ، (غل)ی کردبوو ، بە خالیدم وت - رضي الله تعالی عنه - : تەماشای ئەمە کە ! کە چووینەوە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی پێغەمەرم کرد - ﷺ - ، فەرمووی : ئەی بورەیدە بۆ تۆ عەلی ئەبوغضێنی ؟ عەرزم کرد : بەڵێ . فەرمووی : مەیبوغضێنە ؛ چونکی عەلی لە خومس لەوە زیاتری هەیە ، ئەگەر ئەیبوغضێنی دەرحەقی مەحەبەتت زیاد بکە . [دەرحەق ئەو قسەی خراپ مەکە ؛ چونکی ئەو لە منەو من لەوم ، لە دوای من ئەو سەرداری ئێوەیە] بورەیدە ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - ئەوەی فەرموو ئیتر هیچ کەسێکم لەو[2] لە لا خۆشەویستر نەبوو .

١٥٠/١٢٩٩ سلمة [بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه -] قال : غزونا فزارة وعلينا أبو بكر - رضي الله تعالى عنه - أمّره رسول الله - ﷺ - علينا ، فلما كان بيننا وبين الماء ساعة أمرنا أبو بكر - رضي الله تعالى عنه -

(١) دانەر - خ - سەرچاوەی ئەم حەدیثەی دیاریی نەکردوە ، منیش گەڕام نەمدۆزییەوە تا دیاریی بکەم .

(٢) دیارە دوای خواو پێغەمەر ؛ لەبەر حەدیثی : «لایؤمن أحدکم حتی أکون أحب إلیه من والده وولده والناس أجمعین» و حەدیثی «ثلاث من کن فیه وجد حلاوة الایمان : أن یکون الله ورسوله أحب إلیه مما سواهما . . .»

فعرَّسنا ، ثم شن الغـارة [فرَّقهـا] فورد المـاء ، فقتل من قتـل عليه ، وسبي ، وأنظر إلى عنق من الناس [أي جماعة] فيهم الذراري ، فخشيت أن يسبقوني إلى الجبل ، فرميت بسهم بينهم وبين الجبل ، فلما رأوا السهم وقفوا ، فجئت بهم أسوقهم ، وفيهم امرأة من بني فزارة عليها قَشْع من أدمٍ ، قال : القشع : النِّطع . معها إبنة لها من أحسن العرب . فسقتهم حتى أتيت بهم أبا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فنفلني أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ إبنتها ، فقدمنا المدينة ، وما كشفت لها ثوبا . فلقيني رسول الله ـ ﷺ ـ في السوق فقال : يا سلمة هب لي المرأة ، فقلت : يا رسول الله والله لقد أعجبتني وما كشفت لها ثوبا . ثم لقيني رسول الله ـ ﷺ ـ من الغد في السوق ، فقال : يا سلمة هب لي المرأة لله ابوك ! فقلت : هي لك يا رسول الله ، فوالله ماكشفت لها ثوبا . فبعث بها رسول الله ـ ﷺ ـ إلى أهـل مكة ففـدى بهـا نـاسـا من المسلمـين كـانـوا أسـروا بمكـة .

م ـ ٧/ ٣٥٠ .

ته‌رجه‌مه :

سه‌له‌مه‌ی کوڕی ئه‌کوه‌ع ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـه‌فه‌رمـوێ : غه‌زای فه‌زاره‌مان = کرد = ئه‌بوبه‌کر ـ رضي الله تعالى عنه ـ سه‌ردارمان بوو ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ کردبووی به سه‌رکرده‌مان ، که سه‌عاتێ مـا له بـه‌ینی ئێمه‌و ئـاوا . . ئـه‌بـوبـه‌کـر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ ئـه‌مـری پێ فه‌رمووین که = له = ئاخری شه‌وا دابه‌زین ، له دواییدا تالآنکه‌ری بلآوکرده‌وه ، ئه‌مجا هاته سه‌ر ئاوه‌که ، ئه‌وی له‌وێدا کـوژرا کوژراو ، ئه‌سیر گیررا ، ته‌ماشام کرد جه‌ماعه‌تێ له خه‌ڵق ماڵ‌و مناڵیان له ناوا بوو ، له‌وه ترسام که = له = پێش ئێمه‌دا سه‌رکه‌ونه سه‌ر شاخه‌که ، تیرێکم هاویته به‌ینی ئه‌وان‌و شاخه‌که ، که چاویان به تیره‌که که‌وت وه‌ستان ،

هێنامن لێم ئه‌خورین ، ژنێکی له به‌نی فه‌زاره تیابو ، پێستێکی له‌به‌رابوو ، کچێکی خۆیی له‌گه‌ڵ بوو له جوانترینی هه‌موو عه‌ره‌ب بوو ، لێم خورین تا هێنامنه خذمه‌ت ئه‌بوبه‌کر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ زیاد له حیصه‌ی خۆم کچه‌که‌یی دامێ ئه‌مما جلم له‌سه‌ر لانه‌دا ، پێغه‌مه‌رم ـ ﷺ ـ له بازاڕ پێگه‌یی ، فه‌رمووی : یا سه‌له‌مه ئه‌و ژنه‌م پێ ببه‌خشه ، عه‌رزم کرد : (یا رسول الله) وه‌ڵلاهی حه‌زم لێ کردوه جلم له‌سه‌ر لا نه‌داوه . سبه‌ینێی دواییش له بازاڕا پێغه‌مه‌رم ـ ﷺ ـ پێگه‌یی ، فه‌رمووی : ئه‌ی سه‌له‌مه ئه‌و ژنه‌م پێ هیبه بکه باوکت بۆ خوا بێ [که ئه‌ولادی وه‌کوو تۆی لێ بوه] عه‌رزم کرد : (یا رسول الله) بۆ تۆ بێ ، وه‌ڵلاهی جلم له‌سه‌ر لانه‌داوه .

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌و کچه‌ی نارد بۆ ئه‌هلی مه‌ککه کردی به فیدیه‌ی نه‌جاتی چه‌ند پیاوێ له موسوڵمانان که به ئه‌سیر گیررابوون له مه‌ککه .

موباده‌له‌ی ئه‌سیر به‌ئه‌سیر ، موباده‌له‌ی پیاو به‌ژن ، ته‌فریق له به‌ینی دایك و وه‌له‌دی باڵغا ، طه‌ڵه‌بی پادشاه له ئه‌هلی ئۆردوه‌که‌ی که واز له حیصه‌ی خۆی بێنێ بۆ مه‌صله‌حه‌تی موسوڵمانان ، مه‌دحکردن به (لله أبوك ، لله درك) . . . دروسته . نووي .

١٥١ / ١٣٠٠ أبو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : أيما قرية أتيتموها أقمتم فيها فسهمكم فيها ، وأيما قرية عصت الله ورسوله ، فإن خمسها لله ولرسوله ـ ﷺ ـ ثم هي لكم .
م ـ ٧ / ٣٥٠ .

**ته‌رجه‌مه :**

یه‌عنی هه‌ر شارێ هه‌ر دێیێ که دوشمن چۆڵی بکا یا به صوڵح بیگرن به‌شی ئێوه له‌وه‌دا وه‌ك باقی فه‌یئ وایه ، یه‌عنی له فه‌یئا چۆنتان

بەش ئەدرێ ، لەويشا وا بەشتان ئەدرێ ، ئەوی بە زەبری شيرو رمو تير بيگرن ؛ يەعنی ئيطاعەی خوا نەكەن و مەجبوورتان بكەن بە حەرب پێنج يەكێكی هی خواو پێغەمەری خوايە ، چوار بەشی هی ئێوەيە .

ئيمامی شافيعی نەبێ كە فەيئيش وەك غەنيمەت ئەكا بە پێنج حيصەوە ؛ حيصەيێكی بۆ حوكوومەت چواری بۆ غەزايی ، هيچ عالمێ = يا = موجتەهيدێ فەيئی تەخميس نەكردوە ، يەعنی هەمووی راجيعە بە ئيمام .

**١٣٠١/١٥٢ عن أسماء إبنة أبي بكر - رضي الله تعالى عنهما - قالت : كنت أنقل النوى من أرض الزبير التي أقطعه رسول الله - ﷺ - على رأسي وهو مني على ثلثي فرسخ . وقال [معلق ، مرسل] أبو ضَمْرة عن هشام عن عروة : أن النبي - ﷺ - أقطع الزبير أرضا من أموال بني النضير . ح - ٢١٩/٥ ، ح - ١٠٦/٨ ، ن بأتم . م - ٢/٦ ، في النكاح .**

**تەرجەمە :**

ئەسمای كچی ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : لەو ئەرزەی كە پێغەمەر - ﷺ - ئيعطای كردبوو بە زوبەير دەنكەخورمام بەسەر سەر نەقڵ ئەكرد . ئەو ئەرزە لە منەوە دوو بەشی فەرسەخێ بوو لە سێ بەش . ئەو ئەرزە - ئەو ئەرزە بوو كە پێغەمەر - ﷺ - لە ئەموالی بەنی نەضير دابووی بە زوبەير - رضي الله تعالى عنه - .

**١٣٠٢/١٥٣ أسماء بنت أبي بكر - رضي الله تعالى عنهما - قالت : تزوجني الزبير وما له في الأرض من مال ، ولا مملوك ، ولاشيء غير ناضح ، وغير فرسه . وأستقي الماء ، وأغرِزُ غَرْبه [دۆلكەی گەورە] ، وأعجن ، ولم أكن أُحسن وكان يخبز [لي] جارات لي من الأنصار ، وكن**

نسوة صدق ، وكنت أنقل النوى من أرض الزبير التي أقطعه رسول الله - ﷺ - [من أموال النضير] على رأسي وهي مني على ثلثي فرسخ ، فجئت يوما والنوى على رأسي ، فلقيت رسول الله - ﷺ - ومعه نفر من الأنصار ، فدعاني ثم قال : إخ ، إخ ، ليحملني خلفه . فاستحييت أن أسير مع الرجال ، وذكرت الزبير وغيرته ، وكان أغير الناس ، فعرف رسول الله - ﷺ - أني قد استحييت فمضى ، فجئت الزبير ، فقلت : لقيني رسول الله - ﷺ - وعلى رأسي النوى ومعه نفر من أصحابه ، فأناخ لأركب ، فاستحييت منه وعرفت غيرتك . فقال : والله لحملك النوى كان أشد عليّ من ركوبك معه . قالت : حتى أرسل إليّ أبو بكر بعد ذلك بخادم يكفيني سياسة الفرس ، فكأنما أعتقني . ح - ٨/١٠٦ ، م - ٩/٢ .

وهذا الحديث مغن عن الأول .

[وزاد م[1] : وأكفيه ، وأسوسه ، وأدق النوى ، لناضحه ، وأعلفه . وفي مسلم في أخرى : كنت أخدم الزبير خدمة البيت ، وكان له فرس ، وكنت أسوسه ، فلم يكن من خدمته شيء أشد علي من سياسة الفرس ؛ كنت أحتش له وأقوم عليه . ]

تەرجەمە :

ئەسماى كچى ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : زوبەير - رضي الله تعالى عنه - مارەى‌كردم ، لە ئەرزا غەيرى ئەو وشترەى كە ئاوى پێ هەڵەكێشاو غەيرى ئەسپەكەى ، نە ماڵى بوو ، نە عەبدى بوو ، نە شتێكى ترى بوو ، كاو ئاليكى ئەسپەكەم ئەدا ، ئاوم لە

(١) ئەم زيادە لە دواى (أعلف فرسه ، وأستقي الماء)ەوەيە .

بیر هه‌ڵئه‌هێنجا ، کونه‌ی که ئاوی پێ له بیر هه‌ڵه‌هێنجرا ئه‌مـدروۆوه ، هه‌ویرم ئه‌شێلا ، نه‌مه‌زانی نان بکه‌م ، دوو دراوسێم بوو له ئه‌نصار ، دوو ژنی دۆست‌و راست بوون ، ئه‌وان نانیان بۆ ئه‌کردم . سه‌ییسێتی[1] ئه‌سپه‌که‌م ئه‌کرد ، ده‌نکه خورماکه‌م ئه‌کوتا بۆ وشتره‌که‌یی‌و ئه‌ممایێ ، خذمه‌تی زوبه‌یرم ئه‌کرد ، هیچ شتێکم له خذمه‌تی ئه‌سپه‌که‌ی له لا به زه‌حمه‌تتر نه‌بوو ، گیاو پووش‌و په‌لاشم بۆ حازر ئه‌کرد ، = چاودێـریم ئه‌کرد= .

له‌و ئه‌رزه‌ی که پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ عه‌طای فه‌رموو بوو به زوبه‌یر له‌سه‌ر سه‌رم ده‌نکه‌خورمام ئه‌برده‌وه ، ئه‌و ئه‌رزه له سێ به‌شی سه‌عاتێ دوو به‌شی دوور بوو له جێی منه‌وه ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ م پێگه‌یی چه‌ند که‌سێکی له ئه‌نصار له خذمه‌تا بوو بانگی کردم ، له دواییدا به وشتره‌که‌ی فه‌رموو : ئیخ ، ئیخ که بیخی بداو له پشت خۆیه‌وه سوارم بکا ، له‌وه‌م حه‌یاکرد که له‌گه‌ڵ پیاوانا برۆم‌و غیره‌تی زوبه‌یریشم له فکر که‌وته‌وه ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رقی به‌وه کردو ته‌شریفی لێداو رۆیی ، هاتمه‌وه بۆ لای زوبه‌یرو بۆم گێرایه‌وه ، فه‌رمووی : وه‌ڵلاهی ئه‌وه‌م له لا ناخۆشتر بو که ده‌نکه خورمات هه‌ڵگرتبوو له‌وه که له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را سوار ببوویتایه [چونکی له‌وه‌دا عه‌یب‌و عار نی‌یه ، ئه‌مما ده‌نکه خورماهه‌ڵگرتن ره‌نگه خه‌ڵق حه‌ملی بکه‌نه سه‌ر خه‌سیسی] ئه‌سما فه‌رمووی ـ رضي الله تعالى عنها ـ : هه‌ر به‌م نه‌وعـه بووم تـا ئه‌بـوبه‌کـر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ خادمێکی بۆ ناردم له سه‌ییسێتی ئه‌سپـه‌که نـه‌جاتی‌دام ، لام وابـوو که ئازادی کردووم .

(١) کورد له باتی ئه‌م وشه (مه‌یته‌ره‌وانی) به‌کار دێنێ .

**فەوائیدی ئەم حەدیثە :**

ئەم نەوعە خذمەتانە کە ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ کردوویەتی هەمووی ئیحسانەو حوسنی موعاشەرەیە ، هیچی لەسەر ژن لازم نییە بیکا ، ئەگەر نەیکا هیچ داخلی بێ ئیطاعەتیی نابێو گوناهی ناگاتێ ، هەمووی وەظیفەی پیاوە بیکا ، نیهایەت عادەتێکی باشو جوانە کە ژن لە قەدیمەوە تا ئێستە گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی ، ئەوی لەسەر ژن لازم بێ هەر ئەوەیە بۆ کەیف خۆی تەسلیمی مێرد بکاو ، لەو جێگەیەی کە مێردەکەی لێی دائەنێ بێ ئیذنی ئەو جوێ نەبێتەوە .

دروستە پادشا لە ئەرزی (بیت المال) بە تەملیك یا مەحض بۆ ئینتیفاع بیدا بە خەڵق ، ئەمما لە ئەرزی (موات) بێ ئیذنی ئیمام هەموو کەسێ بۆی هەیە ئیحیای بکاتەوە .

وە خورماو سائیری ئەو شتانەی کە صاحیبی ئیعرازی لێناوەو فرێی داوە کۆکردنەوەو تەمەللوکی دروستە .

دروستە ژن ـ با نامەحرەمیش بێ ـ سواری پاشکۆی پیاو ببێ ، ئەگەر حەیوانەکەی تەوانای ئەوەی ببێو ئەو پیاوە لە صولەحا بێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ موشفیق بوە بە ئوممەتی خۆی .

غیرەتکێشانی پیاو لەسەر ژنو ریعایەتکردنی ژنیش هی مێردی لەو خوصووصەوە لازمەو لە ئەخلاقی (مرضیة)یە .

ئینسان تا مومکینی بێ ئیشێکی وا نەکا کە لە ناو خەڵقا بە خەسیس حسێب بێ .

# إجلاء اليهود

١٣٠٣/١٥٤ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن عمر بن الخطاب - رضي الله تعالى عنه - أجلى اليهود والنصارى من أرض الحجاز ، وكان رسول الله - ﷺ - لما ظهر على خيبر أراد أن يخرج اليهود منها ، وكانت الأرض لما ظهر عليها لليهود وللرسول وللمسلمين ، فسأل اليهودُ رسولَ الله - ﷺ - أن يتركهم على أن يَكْفوا العمل ولهم نصف الثَّمرِ ، فقال رسول الله - ﷺ - : نُقِرُّكم على ذلك ما شئنا ، فأقرّوا حتى أجلاهم عمر - رضي الله تعالى عنه - في إمارته إلى تَيْماء وأريحا .

ح - ٥/٢١٩ . م - ٦/٤٣٦ .

تەرجەمە :

ئیبن و عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : عومەر - رضي الله تعالى عنه - جوولەکەو گاوری لە ئەرزی حیجاز دەرکرد . پێغەمەریش - ﷺ - کە فەتحی خەیبەری کرد ئیرادەی فەرموو کە جوولەکەی لێ بکاتە دەرێ ، ئەو ئەرزە کە فەتح کرا هی خواو پێغەمەرو موسوڵمانان بوو [دوای ئەمە کە پێغەمەر - ﷺ - صوڵحی لەگەڵ کردن ئیتر حەقی جوولەکەی تیا نەما ، لە پێش صوڵحا بەعزێ جێی بەدەست جوولەکەوە مابوو] . ئەو وەختە جوولەکەکان عەرزی پێغەمەریان کرد - ﷺ - کە دەریان نەکا ، بەو شەرتە کە ئیشی تیابکەن و بەرهەمی بێنن و نیوەی حاصڵاتی بۆ ئەوان بێ ، پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : تا هەوەسمان بێ لەسەر ئەو شەرتە ئەتان هێڵمەوە ، بەو شەرتە هێشتنیەوە تا عومەر - رضي الله تعالى عنه - دەری کردن بۆ تەیماو ئەریحا .

١٣٠٤/١٥٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه قال : بينا نحن في المسجد إذ خرج علينا رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : إنطلقوا إلى يهود ، فخرجنا معه حتى جئناهم [بيت المدراس] فقام رسول الله ـ ﷺ ـ فناداهم ؛ فقال : يا معشر اليهود أسلموا تسلَموا ! فقالوا : فقد بلغت يا أبا القاسم . فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : ذلك أريد أسلموا تسلَموا ، فقالوا : قد بلغت يا أبا القاسم . فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : ذلك أريد ، فقال لهم الثالثة . فقال : إعلموا إنما الأرض لله ورسوله ، وإني أريد أن أجليكم من هذه الأرض ، فمن وجد منكم بماله شيئا فليبعه ، وإلا فاعلموا أن الأرض لله ورسوله . م ـ ٣٧٦/٧ . واللفظ لمسلم . ح ـ ٢٢٦/٥ . مختصرا . ح ـ ١٧٢/٤ ، ٣ ، ٩ . ح ـ ٣٦٤/٦ مختصرا . د ، ن .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بو هوره‌يره ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووى : له وه‌ختێكا ئێمه له مه‌سجيدا بووين پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفى هاته‌ده‌رێ لامان فه‌رمووى : بكه‌ونه رێ بۆ لاى جووله‌كه‌كان ، له خزمه‌تيا چووينه‌ده‌رێ ، تا چووينه لاى جووله‌كه‌كان ناو مه‌كته‌به‌كه‌يان ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ بانگى كردنێ فه‌رمووى : ئه‌ى جه‌ماعه‌تى يه‌هوديى موسوڵمان بين به سه‌لامه‌تى ده‌رچن ، عه‌رزيان كرد : (يا أبا قاسم) ته‌بليغت كردين ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێى فه‌رموون : ئه‌و ئيقرارەم له ئێوه ئه‌وێ ، موسوڵمان بين سه‌لامه‌ت ئه‌بن . عه‌رزيان كرد : ته‌بليغت كردين ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێى فه‌رموون : ئه‌وه‌م لێتان ئه‌وێ ، ده‌فعه‌ى سێيه‌ميش پێى فه‌رموون . له پاشا فه‌رمووى : مه‌علوومتان بێ كه ئه‌م ئه‌رزه هه‌ر هى خواو پێغه‌مه‌رى ئه‌وه ئيراده‌م وايه له‌م ئه‌رزه‌تان بكه‌مه

ده‌رێ ، هه‌ركه‌سێ له‌ ئێوه‌ دڵی به‌ ماڵیه‌وه‌ بێ بیفرۆشێ . (وإلا) بزانن كه‌ ئه‌م ئه‌رزه‌ هی خواو ره‌سوولی خوایه‌ .

١٥٦/١٣٠٥ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : لما فدع أهل خيبر عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قام عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خطيبا ، فقال : إن رسول الله ـ ﷺ ـ كان عامل يهود خيبر على أموالهم ، وقال : نقركم ما أقركم الله ، وإن عبدالله بن عمر خرج إلى ماله هناك ، فعُدِيَ عليه ففُدِعَتْ يداه ورجلاه [انخلعتا] وليس لنا هناك عدوٌّ غيرهم ، هم عدوُّنا وتُهمتنا ، وقد رأيت إجلاءهم ، فلما أجمع عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ على ذلك أتاه أحد بني الحقيق فقال : يا أمير المؤمنين أتخرجنا وقد أقرَّنا محمد ـ ﷺ ـ وعامَلَنا على الأموال وشرط ذلك لنا ؟ فقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أظننت أني نسيت قول رسول الله ـ ﷺ ـ : كيف بك إذا أُخرجت من خيبر تعدو بك قلوصك ليلة بعد ليلة ؟ فقال : كانت هذه هُزَيلة من أبي القاسم ! ـ ﷺ ـ قال : كذبت يا عدو الله . فأجلاهم عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وأعطاهم قيمة ما كان لهم من الثمر مالا وإبلا وعروضا من أقتاب وحبال وغير ذلك . . .
ح ـ ٤/٤٢٥ .

ته‌رجه‌مه‌ :

عه‌بدوڵڵای كوڕی ئیمامی عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئه‌فه‌رموێ : كه‌ جووله‌كه‌ی خه‌یبه‌ر [له‌ وه‌ختێكا كه‌ عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر نوستبوو] ده‌ستو پێیان له‌جێ برد [شه‌ویش بوو نه‌یزانی كه‌ كێ وای كردوه‌] ئیمامی عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ به‌ خه‌طیبی ته‌شریفی راوه‌ستا ، فه‌رمووی : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ موعامه‌له‌ی له‌گه‌ڵ جووله‌كه‌ی خه‌یبه‌ركردوه‌ له‌سه‌ر ئه‌مه‌ كه‌ ئه‌و ماڵه‌یان كه‌ به‌ ده‌سته‌وه‌ بوه‌ بێ هێننه‌

بەرهەمو نیوەی حاصلاتی بۆ ئەوان بێو ، فەرمووی : تا خوا ئێوە لێرە بێڵێتەوە منیش ئەتان هێڵمەوە دەرتان ناکەم . عەبدوڵلای کوری عومەر چۆتە سەر ئەو ماڵو موڵکەی کە لەوێیە ، قەصدی رۆحی کراوە هەردوو دەستو پێی لەجێ براوە ، ئێمە لەوێ غەیری ئەوان دوشمنمان نی یە ، ئەوان دوشمنی ئێمەنو موتتەهەمی ئێمەن ، رەئییم وایە کە لە خەیبەر بیانکەمە دەرێ .

کە ئیمامی عومەر - رضي الله تعالی عنه - عەزمی لەسەر ئەوە کردو قەراری دا یەکێ لە ئەولادی حەقیق هاتەخذمەتی ، عەرزیکرد : (یا أمیر المؤمنین) تـۆ چۆنمـان ئەکـەیتە دەرێ کـە پێغەمـەر - ﷺ - لەسـەر ئیـدارەکردنی مـاڵمان مـوعامـەلەی لـەگەڵ کـردووینو ئیـدارەو نیصفی حاصلاتی کردوە بەشەرت بۆ ئێمە کە لە خەیبەرا بمان بێڵێتەوە ؟ ئیمامی عومەر - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : بۆ تۆ وا ظەن ئەبەی کە من ئەوەم لەفکر چوەتەوە کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : تۆچۆن ئەبی کە لە خەیبەر بکرێیتە دەرێو وشترەکەت شەواوشەو بتفرێنێ ؟ [ئەو کەسە کە بەنیحەقیق بوو بۆ ئەو خوصووصە هاتبوە خذمەتی] عەرزیکرد : ئـەو فەرمووده گاڵتەیێ بوو لە طەرەف (أبو القاسم) ەوە - ﷺ - کە لەگەڵ ئێمەی کرد جیـددیی نەبـوو ! ئیمامی عـومەر - رضي الله تعـالی عنه - فەرمووی : ئەی دوشمنی خوا درۆتکرد جیددیی بوو . ئیمامی عومەر - رضي الله تعالی عنه - دەریکردن لە باتی بەری باغەکان قیمەتی بەشی ئەوان چی بوو ماڵی دانێ ، وشترو ، مەتاعو ، کۆپانو ، گـوریسو ، شتی تری دانێ .

ئەم حادیثەیە مـوعجیزەی پێغـەمەرە - ﷺ - وەك فـەرمووبـووی هاتەجێ .

## ما يصيب المجاهد من الطعام في أرض الحرب هل له أكله قبل القسمة[1] ؟

١٣٠٦/١٥٧ عن عبدالله بن مغَفَّل ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنا محاصِرين قصر خيبرٍ ، فرمى إنسان بجراب فيه شحم فنزوت [أي وثبت] لآخذه فالتفتُّ فإذا النبي ـ ﷺ ـ فاستحييت منه ـ عليه الصلاة والسلام ـ ح ـ ٢١٩/٥ . ح ـ ٢٦٩/٨ . ح ـ ٣٥٥/٦ . م ـ ٣٩٠/٧ ، ٣٨٩ . ن ، د ، وفيه : فالتزمته فقلت : لا أعطي اليوم أحدا من هذا شيئا قال : فالتفتت فإذا رسول الله ـ ﷺ ـ مبتسما .

**ته‌رجه‌مه :**

عه‌بدوڵڵای كوڕی موغه‌ففه‌ل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : موحاصه‌ره‌ی قه‌صری خه‌یبه‌رمان = دابوو = ئینسانێ نانه‌به‌ره‌یێكی فرێدایه خوارێ شه‌حمی تیا بوو ، خۆم بۆ هاویت كه هه‌ڵی بگرم [وتم : له‌مه ئیمرۆ به‌شی هیچ كه‌سی لێ نادەم . مسلم] ئاوڕم دایه‌وه كه‌چی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شریفی حازر بوو [پێئه‌كه‌نی] حه‌یام كرد له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ [یه‌عنی چونكی به‌حه‌ریصیی دیمی] .

ذه‌بیحه‌ی كیتابی خواردنی دروسته ؛ چونكی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له‌و وه‌خته‌دا نه‌هی لێ نه‌كردو به‌ده‌میه‌وه پێئه‌كه‌نی .

ئه‌بوداودی طه‌یالیسیش ـ رحمه الله ـ له ئاخری ئه‌م حه‌دیثه‌دا ریوایه‌ت ئه‌كا كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێی فه‌رموو : ئه‌وه بۆ تۆ بێ .

---

(١) ئایا جه‌نگاوه‌ران بۆیان هه‌یه له‌و خواردنه بخۆن پێش به‌شكردن ـ كه‌له شه‌ڕگه‌دا ده‌یگرن ؟

١٣٠٧/١٥٨ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كنا نصيب في مغازينا العسل والعنب (وعن حماد بن زيد : والفواكه . وعنه : كنا نصيب العسل والسمن في المغازي . قسطلاني) فنأكله ولا نرفعه (إلى النبي ـ ﷺ ـ أو لا نحمله للادخار . قسطلاني) ح ـ ٥/٢٢٠ .

تەرجەمە :

ئيبنو عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئێمە لە غەزامانا هەنگوينو ترێو رۆنو ميوەمان دەستئەكەوت ئەمانخواردو نەمانئەبردە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ يا نەمانئەكرد بە ذەخيرە بۆ دوايى .

## باب الجزية والموادعة مع أهل الذمة والحرب

وقول الله ـ تعالى ـ : ﴿قاتلوا الذين لايؤمنون بالله ولا باليوم الآخر (كإيمان الموحدين) ولا يحرّمون ما حرم الله وررسوله ، ولا يدينون دين الحق من الذين أوتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يد (قهر وغلبة) وهم صاغرون﴾[1] (أذلّاء) . وما جاء في أخذ الجزية من : اليهود ، والنصارى ، والمجوس ، والعجم (عند أبي حنيفة) . ح ـ ٥/ ٢٢٠

خوا ـ عز وجل ـ ئەفەرموێ : موحارەبە بکەن لەگەڵ ئـەوانەی باوەڕیان نی‌یە نە بە خواو نە بە ڕۆژی ئاخیرەت‌و ، = نە = ئەوەی کە خواو ڕەسوولی خوا حەرامیان کردوە حەرام ئەکەن ، نە بە دینی حەق ، کە دینی ئیسلامە ، (تدیّن) ئەکەن لەوانەی کە کیتابیان بۆ نێرراوە تا لەبەر قەهرو غەڵەبەی ئێوە بەسەریانا بە زەلیلیی جیزیە ئەدەن .

ئەم بابە هەم لە بەیانی ئەوەدایە کە جیزیە لە جولەکەو گاورو مەجووس‌و لە عەجەم ئەستێنرێ .

ئەبو حەنیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە هەموو ئەهلی عەجەم ئەستێنرێ ؛ حەزەکا موشریك بن یا ئەهلی کیتاب بن . شافیعی و ئەحمەد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموون : جیزیە هەر لە ئەهلی کیتاب‌و ئەوانەی کە شوبهەی کیتابیان بە دەستەوەیە = وەردەگیرێ =جیزیە لە بتپەرست‌و ، ڕۆژپەرست‌و ، مانگ پەرست‌و ، مورتەدقەبووڵ ناکرێ ، یا ئەبێ بکوژرێن یا موسوڵمان ببن .

---

(١) التوبة / ٢٩ .

جيزيه له‌وانه‌ى كه ته‌مه‌سوكيان كردوه به صوحوفى ئيبراهيم‌و ، زه‌بوورى داود - عليهما السلام - و ئه‌وه‌ى يه‌كىٚ له دايك‌و باوكى كيتابى يه‌و ئه‌وى‌تريان بتپه‌رسته - مثلا - = وه‌رده‌گيرىٚ = .

ئيمامى ماليك - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموىٚ : له غه‌يرى موڕته‌د له هه‌موو كافرىٚ جيزيه ئه‌ستيٚنرىٚ .

(ئيٚسته فه‌رق له به‌ينى موسوڵمان‌و كافرا نى‌يه ، له هه‌موويان ئه‌ستيٚنرىٚ !)

قال أبن عيينة (مما وصله عبدالرزاق - رحمهما الله -) له ئه‌بونه‌جيحه‌وه ريوايه‌ت ئه‌كا : به موجاهيدم وت : بۆچ ئه‌هلى شام چوار ديناريان لىٚ ئه‌ستيٚنرىٚ‌و ئه‌هلى يه‌مه‌ن ديناريٚكيان لىٚ ئه‌ستيٚنرىٚ ؟ فه‌رمووى : له‌به‌ر ده‌وڵه‌مه‌ندى .

ئيٚسته ماڵى كوللى كه‌سىٚ چواريه‌كى تا نيوه‌ى جيزيه‌يه ، كه‌س نه ماڵى هه‌يه نه موڵكى هه‌يه .[1] .

**١٣٠٨/١٥٩ بجالة قال : كنت كاتبا لجَزْءِ بن معاوية - رضي الله تعالى عنه - عم الأحنف (بن قيس) فأتانا كتاب عمر - رضي الله تعالى عنه - بن الخطاب قبيل موته بسنة : فرِّقوا بين كل ذي محرم من المجوس ، ولم يكن عمر - رضي الله تعالى عنه - أخذ الجزية من المجوس حتى شهد عبدالرحمن بن عوف - رضي الله تعالى عنه - أن رسول الله - ﷺ - أخذها من مجوس هجر . ح - ٢٢١/٥ . ت ، ن ، د .**

**ته‌رجه‌مه :**

به‌جاله - رحمه الله - ئه‌فه‌رموىٚ : من كاتبى جه‌زئى كورى

(١) ده‌بىٚ ئه‌م قسه‌ى ده‌رباره‌ى بارودۆخ‌و شويٚن‌و كاتيٚكى تايبه‌تى كردبىٚ .

موعاويەی مامی ئەحنەف بووم ـ رضي الله تعالى عنـه ـ ساڵێ لـه پێش مردنیا کاغەزی ئیمامی عومەری کوڕی خەطابمان بۆ هات ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە مەجووس کوللی دوو کەسێ کە مەحرەمیێتیان لە بەینا بێ و بووبن بە ژن و مێرد لێك جوێ بکەنەوە ، ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ جیزیەی لە مەجووس وەرنەدەدەگرت تا عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ شەهادەتی دا کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ جیزیەی لە مەجووسی هەجەر سەندوە .

**١٦٠/١٣٠٩ مسور بن مخرمة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أخبر (عروة بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـأن عمرو بن بن عوف الأنصاري ، وهو حليف لبني عامر بن لؤي وكان شهد بدرا ، أخبر (مسورا) أن رسول الله ـ ﷺ ـ بعث أبا عبيدة بن الجراح ـ رضي الله تعالى عنه ـ إلى البحرين يأتي بجزيتها (وهو مجوس) وكان رسول الله ـ ﷺ ـ صالَحَ أهلَ البحرين (سنة تسع) وأمر عليهم العلاء بن الحضرمي ، فقدم أبو عبيدة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بمال من البحرين ، فسمعت الأنصار بقدوم أبي عبيده ـ رضي الله تعالى عنه ـ فوافت (فوافقت . كش) صلاة الصبح مع النبي ـ ﷺ ـ فلما صلى بهم الفجر إنصرف ، فتعرضوا له ، فتبسم رسول الله ـ ﷺ ـ حين رآهم ، وقال : أظنكم قد سمعتم أن أبا عبيدة قد جاء بشيء ؟ قالوا : أجل يا رسول الله . قال : فأبشروا وأمِّلوا (ومجردا) ما يسرُكم . فوالله لا الفقر أخشى عليكم ، ولكن أخشى عليكم أن تبسط عليكم الدنيا كما بسطت على من كان قبلكم فتُنافسوها كما تَنافسوها وتهلككم كما أهلكتهم ، (وتلهيكم كما ألهتهم . م أخرى) ح ـ ٥/٢٢٢ . م/١٠/٤١٦ .**

**ته‌رجه‌مه :**
عه‌مري كوري عه‌وفي ئه‌نصاريي به‌دريي ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌بوعوبه‌یده‌ی كوري جه‌راحی ـ رضي الله تعالى عنه ـ نارده به‌حره‌ين كه جيزيه‌ی بێنێ . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له‌وه‌پێش صولحی له‌گه‌ڵ ئه‌هلی به‌حره‌ين كردبو عه‌لای (ابن الحضرمي) كردبوو به ئه‌ميريان ، ئه‌بوعوبه‌يده ـ رضي الله تعالى عنه ـ له به‌حره‌ين ماڵی هێنا . ئه‌نصار ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بيستيان نوێژی سبه‌ينێ له خـذمه‌تی پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ ته‌صادوفی هاتنه‌وه‌ی ئه‌وی كرد . كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ نوێژی سبه‌ينێی پێ كردن‌و سه‌لامی دايه‌وه چوه‌وه بۆ مـاڵی خۆيـان[1] ، ئه‌نصار چوونه رێگه‌یی و عه‌رزيان كرد . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ كه چاوی پێيان كه‌وت پێكه‌نی‌و فه‌رمووی : وابزانم بيستووتانه كه ئه‌بوعوبه‌يده شتێكی هێناوه ! عه‌رزيان كرد : به‌ڵێ . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : موژده لـه ئێوه بێ ، به ته‌مای ئه‌وه بن كه پێی مه‌سرووره‌بن ، كـه ماڵی دنيـايه . [يه‌عنی دنياتان ده‌ست ئه‌كه‌وێ فه‌قير نابن] . وه‌ڵلاهی من له‌وه ناترسم كه فه‌قير ببن . ئه‌مما له‌وه‌تان ئه‌ترسم كه چۆن دنيا بۆ ئه‌وانه‌ی كه له پێش ئێوه‌وه بوون زۆر بـوه بۆ ئێـوه‌يش زۆر ببێ ، چۆن ئـه‌وان له‌سـه‌ر دنيا حه‌سه‌ديان به يه‌كتری بـردوه ، هه‌ركـه‌س بۆ خـۆيی ويستوه ئێـوه‌يش حه‌سه‌د به يه‌كتريی ببه‌ن . دنيا چۆن ئـه‌وانی به‌هيـلاك بردوه ئێـوه‌يش به‌هيلاكا ببا . (معجزة أيُّ (!) معجزة ! صدق رسول الله ـ ﷺ ـ) لـه بوخاريی و له موسليما[2] : ئێوه غـافڵ بكـا وه‌ك ئه‌وانی غـافڵ كـردوه .
ح ـ ٢٣٢/٩ . م ـ ٤١٧/١٠ .

(١) لێره‌دا كه‌وتن‌و ئاڵۆزی‌يه‌ك هه‌بوو ، به گوێره‌ی ده‌قه عه‌ره‌بی‌يه‌كه چاكمان كرد .
(٢) واته له ريوايه‌تێكی ديكه‌ی بوخاری‌و موسليما ئه‌م قسه‌يش هه‌يه .

١٦١/١٣١٠ عن جبير بن حية [بن مسعود الثقفي] قال : بعث عمر - رضي الله تعالى عنه - الناس في أفناء الأمصار يقاتلون المشركين ، فأسلم الهُرْمُزان ، فقال : إني مستشيرك في مغازيَّ هذه [فارس ، وأصفهان ، وآذربايجان بأيها نبدأ ؟] قال : نعم مَثَلُها ومثل من فيها من الناس من عدو المسلمين مَثَلُ طائر له رأس وله جناحان وله رِجْلان ، فإن كسر أحد الجناحين نهضت الرجلان بجناح والرأسُ ، فإن كسر الجناح الآخر نهضت الرجلان والرأسُ ، وإن شدخ الرأس ذهبت الرجلان والجناحان والرأس . فالرأس كسرى ، والجناح قيصر ، والجناح الآخر فارس ، فمُرِ المسلمين فلينْفِروا إلى كسرى .

وقال بكر وزياد جميعا عن جبير بن حية : فندَبَنا عمرُ - رضي الله تعالى عنه - واستعمل علينا النعمان بن مُقَرِّن - رضي الله تعالى عنه - حتى إذا كنا بأرض العدوِّ [نهاوند] وخرج علينا عامل كسرى في أربعين ألفا [من أهلِ فارس وكرمان ، ومن أصفهان ونهاوند مائة ألف وعشرة آلاف] فقام ترجمان ، فقال : ليكلمني رجل منكم . فقال المغيرة [بن شعبة - رضي الله تعالى عنه - ] : سل عما شئت . قال : ما أنتم ؟ قال : نحن أناس من العرب كنا في شقاء شديد وبلاء شديد ؛ نَمَصُّ الجلد والنوى من الجوع ، ونلبس الوبر والشعر ، ونعبد الشجر والحجر ، فبينا نحن كذلك إذ بعث رب السماوات ورب الأرضين - تعالى ذكره ، وجلَّت عظمته - إلينا نبياً من أنفسنا نعرف أباه وأمه [في شرف منا ، أوسطنا حسبا ، وأصدقنا حديثا . إبن أبي شيبة] فأمرنا نبينا رسول ربنا - ﷺ - أن نقاتلكم حتى تعبدوا الله وحده أو تؤدوا الجزية [وهم مجوس] . وأخبرنا نبينا - ﷺ - عن رسالة ربنا أنه من قتل منا صار إلى الجنة في نعيم لم ير مثلها قط ، ومن بقي منا ملك رقابكم . فقال النعمان [بن مُقَرِّن]

- رضي الله تعالى عنه - : ربما أشهدك الله مثلها مع النبي - ﷺ - فلم يندمك [على التأني والصبر] ولم يخزك ، ولكني شهدت القتال مع رسول الله - ﷺ - كان إذا لم يقاتل في أول النهار انتظر حتى تهب الأرواح وتحضر الصلوات . ح - ٥/٢٢٣ .

**ته‌رجه‌مه :**

جوبه‌یری کوری حه‌ببه - رحمه الله - ئه‌فه‌رموێ : عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - خه‌ڵقی نارد بۆ مه‌مله‌که‌تانی ئه‌طراف که شه‌ر له‌گه‌ڵ موشریکانا بکه‌ن [که گه‌یینه (قادسیه) له‌شکری یه‌زدجوردیان بۆ هات شه‌ڕێکی وایان کرد که نه‌بینرابێ، له ئه‌ووه‌ڵی موحه‌ڕه‌می چوارده‌دا خوا له‌و ڕۆژه‌دا باییکی به شیدده‌تی نارد خێوه‌تی دوشمنی له بن هه‌ڵکه‌ند ، سه‌رکرده‌ی له‌شکره‌که‌یان که ڕۆسته‌می یه‌کده‌ست بوو هه‌ڕای کرد ، موسوڵمانانی گه‌یی پێ کوشتیان ، له‌شکری فارس شکاو موسوڵمانیان شوێن که‌وت تا بردنیانه شاری مه‌دائین ، که تاقی کیسرای لێیه . هورمزانیش له ناو ئه‌وانه‌دا بوو که فیراریان کردبوو ، ئه‌ویش ناوی ڕۆسته‌م بوو ، له به‌ینی ئه‌وو موسوڵمانانا حه‌ربێ واقیع بوو ، له پاشا صوڵحیان کرد . هورمزان ئه‌و صوڵحه‌ی تێکدا .

ئه‌بوموسای ئه‌شعه‌ری - رضي الله تعالى عنه - له‌شکری کۆکرده‌وه ، موحاصه‌ره‌ی دان ، طه‌ڵه‌بی ئه‌مانیان کرد تا هورمزان ببرێته خزمه‌ت ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - ئه‌بوموسا له‌گه‌ڵ ئه‌نه‌سی کوڕی مالیکا ناردی‌یه خزمه‌ت ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنهم - ] .

هورمزان به ئاره‌زوو موسوڵمان بوو ، ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - پێی فه‌رموو : من له‌م غه‌زایه‌دا که ئه‌یکه‌م ته‌دبیرت پێ ئه‌که‌م

که کامیان پێش بخه‌م . هـورمزان عـه‌رزی کرد : مـه‌ثه‌لی ئـه‌و ئه‌رزه‌و مه‌ثه‌لی ئه‌وانه‌ی که تیایان وه‌ك مه‌ثه‌لی مورغێ[1] وایه سه‌ری بێ و دوو باڵ و دوو پێی بێ . ئه‌گه‌ر یه‌کێ له باڵه‌کانی بشکێ به باڵه‌که‌ی تری و پێی سه‌ری هه‌ڵه‌ستێ ، ئه‌گه‌ر باڵه‌که‌ی تریشی بشکێ پێ و سه‌ری هه‌ڵه‌ستێ . ئه‌گه‌ر سه‌ری پان بکرێته‌وه هه‌ردوو پێ و هه‌ردوو باڵی و سه‌ری به جارێ ئه‌ڕۆن نامێنن .

سه‌ر کیسرایه ، باڵ قه‌یصه‌ره ، باڵه‌که‌ی تر فارسه ، ئه‌مر بکه به موسوڵمانان بچنه سه‌ر کیسرا . جوبه‌یری کوڕی حه‌بیه ئه‌فه‌رموێ : عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کۆی کردینه‌وه بۆ غه‌زا ، نوعمانی کوڕی موقه‌رینی کرد به سه‌رکرده‌مان ـ رضي الله تعالى عنه ـ تا گه‌یینه ئه‌رزی دوشمن که نه‌هاوه‌نده . عامیلی کیسرا له له‌شکرێکی صه‌دو په‌نجا هه‌زار که‌سیدا هاته سه‌رمان ، ته‌رجومانێکی نارد ، هه‌ڵسا وتی : یه‌کێ له ئێوه قسه‌م له‌گه‌ڵ بکا . موغیره‌ی کوڕی شوعبه ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : چیت هه‌وه‌س هه‌یه بپرسه . ته‌رجومانه‌که وتی : ئێوه چین ؟ [به‌لاوه به‌وه ته‌حقیری کردن] موغیره ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : ئێمه که‌سانێکین له عه‌ره‌ب له گومراهی یه‌کی به‌شیدده‌تا بووین ، له موصیبه‌تێکی گه‌وره‌دا بووین ، له برسا مه‌شکاڵه‌و ده‌نکه خورمامان ئه‌مژی ، تووکی وشترو موومان ئه‌پۆشی ، عیباده‌تی دارو به‌ردمان ئه‌کرد ! له‌و وه‌خته‌دا که له‌و حاڵه‌دا بووین خوای ئه‌رزو ئاسمان ـ جل وعلا ـ پێغه‌مه‌رێکی له خۆمان بۆ ناردین ، باوك و دایکی ئه‌ناسین ، له

(١) مورغێ : مریشکێ ، باڵداری .

حه‌سه‌با له هه‌موومان گه‌وره‌تره ، له فه‌رمووده‌یا له هه‌موومان راستره ، پێغه‌مه‌ری ئێمه كه ره‌سوولی ئێمه‌یه له طه‌ره‌ف خواوه بۆمان نێرراوه - ﷺ - ئه‌مری پێ كردووین تا واتان لێ بێ كه هه‌ر عیباده‌تی خوا بكه‌ن و هیچی تر یا جیزیه ئه‌ده‌ن شه‌رتان له‌گه‌لا بكه‌ین ، پێغه‌مه‌ری ئێمه - ﷺ - خه‌به‌ری له طه‌ره‌فی خوای خۆمانه‌وه داوینێ : كه هه‌ركه‌سێ له ئێمه شه‌هید بكرێ ئه‌چێته به‌هه‌شتێكه‌وه له نیعمه‌تێكا كه هیچ میثلی نه‌بینراوه ، ئه‌وی له ئێمه ئه‌مێنێ ئه‌بێ به مالیكی ره‌قه‌به‌ی ئێوه[1] .

[موغیره ئینكاری له‌سه‌ر ئه‌وه كرد كه بۆچی نوعمان - رضي الله تعالى عنهما - ته‌ئخیری حه‌رب ئه‌كا ، ده‌ستوبردێ ناكا له حه‌ربا ؟] نوعمان - رضي الله تعالى عنه - به موغیره‌ی فه‌رموو - رضي الله تعالى عنه - : كه خوا - عز وجل - له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - له میثلی ئه‌م وه‌قعه‌یه گه‌لێ وه‌قعه‌ی پێ نیشان‌داوی له‌سه‌ر (تأني)و صه‌بر په‌شیمانی نه‌كردوویته‌وه تۆیشی له موعاوه‌نه‌تی مه‌حرووم نه‌كردوه‌و خوا نه‌صره‌تی داوی . ئه‌مما من له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - له حه‌ربا حازر بووم ، حالی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - وابوو كه ئه‌ووه‌لی رۆژ حه‌ربی نه‌كردایه مونته‌ظیری ئه‌وه ئه‌بوو كه بای (صه‌با) بێ‌و وه‌قتی نوێژی نیوه‌رۆ بێ . [یه‌عنی منیش مونته‌ظیری ئه‌وه‌م بۆیه عه‌جه‌له ناكه‌م له حه‌ربا (بالنتیجة) كیسرا كوژراو هه‌موو ئێران فه‌تح كرا] .

---

(١) واته زال ده‌بێ به‌سه‌رتاناو دیلتان ده‌كا .

## غدر ونقض العهد[1]

١٣١١/١٦٢ عن عبدالله بن عمرو - رضي الله تعالى عنهما - عن النبي - ﷺ - قال : من قتل معاهدا [بغير حق] لم يَرُحْ رائحة الجنة . وإن ريحها يوجد من مسيرة أربعين عاما . ح - ٥/٢٢٦ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هەرکەسێ موعاهیدێ بکوژێ بە ناحەق بۆنی بەهەشت ناکا کە بۆنی لە رێی چل ساڵ رێوە ئەکرێ .

١٣١٢/١٦٣ وقال عمر - رضي الله تعالى عنه - : إذا قال (مەتەرس) فقد آمنه ، إن الله يعلم الألسنة كلها . وقال عمر - رضي الله تعالى عنه - للهرمزان : لا بأس عليك . ح - ٥/٢٣٠ .

تەرجەمە :

ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - = فەرمووی = : کە موسوڵمانێ بە حەربیێکی وت : مەترسە ئەو کەسە ئەمین ئەکا لە زەرەری ماڵ و عیرض و رۆح : یەعنی کەسێ تر بۆی نی یە ئیتر دەخڵ بکا . ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - بە هورمزانی فەرموو : هیچ ترس لەسەر تۆ نی یە .

---

(١) غەدرو پەیمان شکاندن .

## غدر المشركين بالمسلمين[1]

١٦٤/١٣١٣ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما فتحت خيبر أُهدِيَتْ للنبي ـ ﷺ ـ شاة فيها سُمٌّ [بتثليت السين] فقال النبي ـ ﷺ ـ : أجمعوا إليَّ من كان ههنا من يهود ، فجمعوا له ، فقال : إني سائلكم عن شيّ فهل أنتم صادقيَّ عنه ؟ فقالوا : نعم . قال لهم النبي ـ ﷺ ـ : من أبوكم ؟ قالوا : فلان . قال : كذبتم ، بل أبوكم فلان . قالوا : صدقت . قال : فهل أنتم صادقيَّ عن شيٍّ إن سألت عنه ؟ فقالوا : نعم يا أبا القاسم ، وإن كذبنا عرفت كذبنا كما عرفته في أبينا . فقال لهم : مَنْ أهل النار ؟ قالوا : نكون فيها يسيرا ثم تَخْلفونا فيها ، فقال النبي ـ ﷺ ـ : إخسؤا فيها ، والله لانخلفكم فيها أبدا . ثم قال : هل أنتم صادقيَّ عن شيٍّ إن سألتكم عنه ؟ فقالوا : نعم يا أبا القاسم . قال : هل جعلتم في هذه الشاة سُمًّا . قالوا : نعم . قال : ما حملكم على ذلك ؟ قالوا : أردنا إن كنت كاذبا نستريح وإن كنت نبيـا لم يضرك . ح/٦/٣٦٤ ، مختصرا . ح ـ ٥/٢٢٧ ، ح ـ ٨/٣٩٥ . م ـ ٩/٢١ ن عن أنس بفرق .

١٦٥/١٣١٤ ولفظ مسلم عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أن إمرأة يهودية أتت رسول الله ـ ﷺ ـ بشاة مسمومة فأكل منها ، فجيئ بها إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فسألها عن ذلك ، فقالت : اردت لأقتلك . قال : ما كان الله ليسلطكِ على ذلك . قال : أو قال : عليَّ . قال : قالوا : ألا نقتلها ؟ قال : لا . قال : فما زلت أعرفها في لهوات رسول الله ـ ﷺ ـ

---

(١) خه‌يانه‌ تكردنى موشريكان له‌ موسولمانان .

م - ٢١/٩ . أهدتها له زينب بنت الحرث اليهودية إمرأة سلام بن مشكم . وسألت : أي عضو من الشاة أحب إليه ؟ فقيل : الذراع . فأكثرت فيها السم . قسطلاني : ٣٩٦/٨ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌یره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : که خه‌یبه‌ر فه‌تح کرا ژنه جووله‌که‌یێ [که زه‌ینه‌بی کچی حه‌رثه که ژنی سه‌لامی کوڕی میشکه‌م] ه مه‌ڕێکی زه‌هرپێوه‌کراوی به هه‌دییه هێنا بۆ پێغه‌مه‌ر - ﷺ - پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی: جووله‌که‌ی ئێره‌م بۆ کۆبکه‌نه‌وه ، بۆی کۆکرایه‌وه ، پێی فه‌رموون : ئه‌گه‌ر شتێکتان لێ بپرسم راستیم پێ ئه‌ڵێن ؟ عه‌رزیان کرد: به‌ڵێ . پێغه‌مه‌ر - ﷺ - پێی فه‌رموون : باوکتان کێیه ؟ عه‌رزیان کرد : فلان که‌سه . پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : درۆ ئه‌که‌ن به‌ڵکو باوکتان فلان که‌سه . عه‌رزیان کرد : راسته‌فه‌رمووی . پێی فه‌رموون : شتێکتان لێ بپرسم راستیم پێ ئه‌ڵێن ؟ عه‌رزیان کرد : به‌ڵێ (یا أبا القاسم) ئه‌گه‌ر درۆ بکه‌ین ئه‌یزانی وه‌ك ئه‌و درۆیه‌ت زانین که ده‌رحه‌ق باوکمان کردمان . فه‌رمووی : جه‌هه‌ننه‌میی کێن ؟ عه‌رزیان کرد : ئێمه که‌مێکی تیا ئه‌بین ، له دواییدا ئێوه ئه‌بن به خه‌له‌فمان . پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : چغه ! وه‌ڵڵاهی قه‌ت ئێمه نابین به خه‌له‌فی ئێوه . له پاشا پێی فه‌رموون : شتێکتان لێ بپرسم راستیم پێ ئه‌ڵێن ؟ عه‌رزیان کرد : به‌ڵێ (یا أبا القاسم) . فه‌رمووی : زه‌هرتان کردۆته ناو ئه‌و مه‌ڕه‌وه ؟ عه‌رزیان کرد : به‌ڵێ . فه‌رمووی : بۆچیتان کردوه ؟ عه‌رزیان کرد : چونکی وتمان ئه‌گه‌ر درۆبکه‌ی له ده‌عوای پێغه‌مه‌ریدا له ده‌ستت ره‌حه‌ت ئه‌بین . ئه‌گه‌ر راست بیّ و پێغه‌مه‌ر بی زه‌ره‌رت پێ ناگه‌یێنێ .

له ريوايه‌ته‌كه‌ى موسليما پيْغه‌مه‌ر - ﷺ - ليْى پرسى : بۆچيت زه‌هر كرده‌ناو ؟ عه‌رزى‌كرد : بۆيه كه بتكوژم . فه‌رمووى : خوا موسه‌لله‌طت ناكا به‌سه‌رما . عه‌رزى پيْغه‌مه‌ريان‌كرد - ﷺ - : ئبۆ نه‌يكوژين ؟ فه‌رمووى : مه‌يكوژن .

ئه‌نه‌س - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رمویٚ : ته‌ئثيرى ئه‌و زه‌هره‌م هه‌موو وه‌قت فه‌رق ئه‌كرد له مه‌لاٚشووى پيْغه‌مه‌را - ﷺ - .

خيلاف له‌وه‌دا هه‌يه كه ژنه‌كه‌ى كوشت يان نا .[1]

١٣١٥/١٦٦ عن ابن شهاب [الزهري - رحمه الله -] سئِل : أعَلى مَن سحَر من أهل العهد قتل ؟ قال : بلغنا أن رسول الله - ﷺ - قد صُنِعَ له ذلك ، فلم يقتل من صنعه . وكان من أهل الكتاب . ح - ٥/٢٣١ .

ته‌رجه‌مه :

له ئيبن‌و شه‌هابيان پرسى : ئه‌هلى عه‌هد سيحر بكا له موسولْمانىٚ ئه‌كوژرىٚ يان نا ؟ فه‌رمووى : وامان پيْگه‌ييوه كه پيْغه‌مه‌ر - ﷺ - سيحرى لىٚ كراو پيْغه‌مه‌ر - ﷺ - ئه‌و سيحركه‌ره‌ى نه‌كوشت ، ئه‌و سيحركه‌ره‌يش له ئه‌هلى كيتاب بوو . [ئه‌مما له‌وه‌دا ده‌ليلى بۆ ئيبن‌و شه‌هاب تيا نى‌يه ؛ چونكى پيْغه‌مه‌ر - ﷺ - بۆنه‌فسى خۆى ئينتيقامى له كه‌س نه‌سته‌ندوه‌و سيحره‌كه‌يش نه له وه‌حيا نه له به‌ده‌نى پيْغه‌مه‌را - ﷺ - ته‌ئثيرى نه‌بوو .]

(١) دانه‌ر - خ - ئه‌وه‌ى له ريوايه‌ته‌كه‌ى قه‌سطه‌لانى له‌بير چوه كه «ژنه‌كه پرسى : پيْغه‌مه‌ر - ﷺ - زياتر حه‌ز له چ پارچه‌ييْكى مه‌ڕ ده‌كات ؟ وتيان : له ده‌ست‌و باسكى . ئه‌ويش زه‌هرى زياتر كرده ئه‌وىٚ» .

١٣١٦/١٦٧ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال: كيف أنتم إذا لم تجتبوا دينارا ولا درهما ؟ فقيل له : وكيف ترى ذلك كائنا يا أبا هريرة ؟ قال : إي والذي نفس أبي هريرة بيده عن قول الصادق المصدوق . قالوا : عَمَّ ذلك ؟ قال : تنتهك ذمة الله وذمة رسوله ـ ﷺ ـ فيشد الله ـ عز وجل ـ قلوب أهل الذمة فيمنعون ما في أيديهم . ح ـ ٥/٢٣٤ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌بوهوره‌یره ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووى : ئێوه چۆنن له‌و وه‌خته‌دا كه نه دینارێ نه درهه‌مێ له ئه‌هلی ذیمه‌ت كۆناكه‌نه‌وه ؟ لێیان پرسی : چۆن وا ئه‌بێ ئه‌ی ئه‌بوهوره‌یره ؟ فه‌رمووى : به‌ڵێ وا ئه‌بێ قه‌سه‌م به‌و ذاته‌ی نه‌فسی ئه‌بوهوره‌یره به ده‌ستی قودره‌تیه‌تی ، له فه‌رمووده‌ی كه‌سێكه‌وه ئه‌یڵێم كه راسگۆیه‌و باوه‌رپێكراوه . لێیان پرسی : (یا رسول الله) له‌به‌رچی وا ئه‌بێ ؟ فه‌رمووى : ذیمه‌تی خواو ره‌سوولی ـ ﷺ ـ ریعایه‌ت ناكرێ ؛ خوایش ـ عز وجل ـ دڵی ئه‌هلی ذیمه‌ت به قووه‌ت ئه‌كاو ئه‌وی له ده‌ستیانا هه‌یه نایده‌ن مه‌نعی ئه‌كه‌ن .

[زوڵم له ئه‌هلی ذیمه‌ت حه‌رامه ، ریعایه‌تی حوقووقیان فه‌رزه] .

١٣١٧/١٦٨ عن إبن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : لكل غادر لواء ينصب لغدرته . ح ـ ٥/٢٣٧ . م ـ ٧/٣١٧ .

١٣١٨/١٦٩ وعنه قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إذا جمع الله الأولين والآخرين يوم القيامة يرفع لكل غادر لواء [يعرف به . أخرى . م] فقيل : هذه غدرة فلان بن فلان . م ـ ٧/٣١٧ .

١٣١٩/١٧٠ وعن أبي سعيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ

قال : لكل غادر لواء [عند أسته] يوم القيامة يرفع له بقدر غدره ، ألا ولا غادر أعظم غدرا من أمير عامة . م - ٣١٩/٧ . وفي مسلم كثير ، وهذا القدر كاف .

تەرجەمە :

مەئالی ئەم حەدیثانە یەکە . پێغەمەر - ﷺ - = ئـەفەرمـوێ = : هەرکەسێ غەدر بکا [یەعنی عەهد هەڵبوەشێنیّو بە خیلافی موقتەضای ئەو عەمەل بکا دەرحەق هەرکەسێ بێ پادشاە بێ ، یا ئەهلی ذیمەت بێ] بۆ ئەو کەسە لـە رۆژی قیامـەتا بـەییاخێکی = [لای قنگی یـەوە] = بۆ هەڵەکرێ بە قەد غەدرەکەی بۆی بەرزئەکرێتەوە کە خەڵق ببینێ ئەڵێن : ئەمە غەدری فلاّن کەسە . هیچ غەدرێ لەو غەدرە گەورەتر نی یە کە لە طەرەف ئەمیری عامەوە بکرێ .

تم السير بحمد الله فنشرع بتوفيق الله في الغزوات - إن شاء الله[1] .

---

(١) باسی (سیر) تەواوبوو سوپاس بۆ خودا ، بە یارمەتیی خودا دەست بە باسی غەزەوات ئەکەین .

## بسم الله الرحمن الرحيم

## باب غزوة العُشَيرة أو العُسَيرة

### ٩٤١/١/٢٣ (بعد الظهر) پێنج شەنبە

وقال إبن إسحاق ، إمام المغازي ، ـ رحمه الله ـ : أول ما غزا النبي ـ ﷺ ـ الأبواء [وهي وَدّان في صفر على رأس إثني عشر شهرا من الهجرة] ثم بَواط [في ربيع الأول سنة اثنتين] ثم العشيرة [في جمادي الأولى سنة (٢) ولم يقع في هذه الثلاث حرب ، وإنما يخرج ـ ﷺ ـ ليلقى عير قريش] ح ـ ٦/٢٣١ .

تەرجەمە :

ئیبن وئیسحاق ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ ئەوەڵ غەزای ئەبواء بوو ، دوەمی بەواط بوو ، سێیەمی عوشـەیرە بـوو [لەم غەزایانەدا موحارەبە نەبوو ؛ بۆیە تەشریفی ئەچوو تا تووشی کـاروانی قورەیش ببێ] .

١٣٢٠/١ عن البراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : غزوت مع النبي ـ ﷺ ـ خمس عشرة غزوة . ح ـ ٦/٤٦٧ .

تەرجەمە :

بەراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ پانزە غەزام کردوە .

١٣٢١/٢ عن أبي إسحاق : كنت إلى جنب زيد بن الأرقم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ليس بيني وبينه غير رجل ، أو بيني وبينه رجل . قال فقلت م ـ ٧/٤٧٢] فقيل له : كم غزا النبي ـ ﷺ ـ من غزوة ؟ قال : تسع عشرة قيل [قلت . م] : كم غزوت أنت معه ؟ قال : سبع عشرة . قلت : فأيهم كانت أول ؟ قال : العُسَيرة أو العُشَيرة . فذكـرت لقتادة

فقال : العشير . ح ـ ٦/٢٣١ ، ٤٦٦ . م ـ ٧/٢٧٢ ، ت .

**تەرجەمە :**

ئەبوئیسحاق ئەفەرموێ : لە تەنیشت زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ دانیشتبووم ، غەیری پیاوێکمان لە بەینا نەبوو ، فەرمووی : عەرزم کرد : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ چەند غەزای کردوە ؟ فەرمووی : نۆزدە . عەرزم کرد : لە چەند غەزادا لە خدمەتیا بووی ؟ فەرمووی : لە حەڤدە غەزادا . عەرزم کرد : کامیان لە ئەووەڵەوە بوو ؟ فەرمووی : عوسەیرە یا عوشەیرە . ئەوەم بە قەتادە وت ، قەتادە فەرمووی : عوشەیر .

[رەنگە زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ ددانی کەوتبێ ، وەکوو من (شین)ی بە (سین) خوێندوتەوە] .

١٣٢٢/٣ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ غزوت مع رسول الله ـ ﷺ ـ تسع عشرة غزوة . قال جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لم أشهد بدرا ولا أُحداً ؛ منعني أبي ، فلما قتل عبدالله ـ رضي الله تعالى عنه ـ يوم أُحد لم أتخلف عن رسول الله ـ ﷺ ـ في غزوة قط . م ـ ٧/٤٧٤ .

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خدمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ نۆزدە غەزام کردوە ، نەچوومە غەزای بەدرو ئوحود ، باوکم نەیهێشت ، کە باوکم لە ئوحودا شەهید کرا لە هیچ غەزاییکا لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە مالا بەجێ نەمام .

عن عبدالله بن بريدة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن أبيه قال : غزا رسول الله ـ ﷺ ـ تسع عشرة غزوة قاتل في ثمان ، وفي أخرى ست عشرة غزوة . م ـ ٧/٤٧٤ . ح ـ ٦/٤٦٧ .

**تەرجەمە :**

بـورەیدە ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : نۆزدە غـەزا لە ریوایەتێکا شانزە غەزام کرد ، لە خـذمەت پێغـەمەرا ، لـە هەشتیـانا پێغەمەر ـ ﷺ ـ شـەڕی لەگـەڵ کوففـارا کرد . پێغـەمەر ـ ﷺ ـ لـەم غەزایانا لە نۆیا (بالذات) شەڕی کردوە :

١ ـ بەدر

٢ ـ ئوحود .

٣ ـ ئەحزاب .

٤ ـ = بەنی = قورەیظە .

٥ ـ بەنو لموصطەلەق .

٦ ـ خەیبەر .

٧ ـ فەتحی مەککە .

٨ ـ حونەین .

٩ ـ طائیف .

# غزوة بدر

٤/١٣٢٣ ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - يقول : شهدت من المقداد بن الأسود - رضي الله تعالى عنه - مشهدا لأن أكون صاحبه أحب إليّ مما عُدِل به : أتى النبي - ﷺ - ، وهو يدعو على المشركين ، فقال : لانقول كما قال قوم موسى [عليه الصلاة والسلام] ﴿إذهب أنت وربك فقاتلا﴾[1] ولكنا نقاتل عن يمينك ، وعن شمالك ، وبين يديك ، وخلفك . فرأيت النبي - ﷺ - أشرق وجهه ، وسرَّه ، يعني قوله .

ح - ٦/٢٣٦ .

تەرجەمە :

ئیبن و مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە میقدادی کوڕی ئەسوەد - رضي الله تعالى عنه - شتێکم دی ئەگەر هی من بوایە لە هەموو شتێك کە لە موقابیلی ئەودا بمبێ لە لام خۆشترە : میقداد - رضي الله تعالى عنه - هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - ، پێغەمەر - ﷺ - دوّعای لە موشریکان ئەکرد . میقداد - رضي الله تعالى عنه - عەرزی کرد : ئێمە وەکوو قەومی مووسا - عليه الصلاة والسلام - نین [کە خوا ئەمری پێ کردن بچن شەر لەگەڵ جەبابیرە بکەن] وتیان : تۆو خوات بچن شەریان لەگەڵ بکەن ، ئێمە لێرەدا دائەنیشین . ئەمما ئێمە لای راستەوەو ، لای چەپتەوەو ، لە بەردەمتەوەو ، لە پشتەوەت شەرت بۆ ئەکەین . کە میقداد ئەمەی عەرزی پێغەمەر - ﷺ - = کرد = پێغەمەرم دی - ﷺ - رووی گەش بۆوەو ئەو قسەی میقدادە مەسرووری کرد .

[ئیبن و ئیسحاق ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - کە تەشریفی

---

(١) بڕوانە سوورەتی : مائیدە ، ئایەتی : ٢٤ .

گەیی یە (صفراء)و خەبەری ئەوەی پێگەیی کە قورەیش یێن بۆ بەدرو ، ئەبوسوفیان خۆیو کاروانەکەی نەجاتی بوە ، ئیستیشارەی بە ئەصحابی کیرام کرد . ئەبوبەکر - رضي الله تعالی عنه - تەشریفی هەڵساو قسەی باشی فەرموو . لە پاشا عومەر - رضي الله تعالی عنه - تەشریفی هەڵساو ئەویش قسەی چاکی فەرموو ، لە دواییدا میقداد - رضي الله تعالی عنه - ئەوەی عەرزی پێغەمەر کرد - ﷺ - و عەرزیکرد : قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە ئەگەر تەشریفت بچێتە (بَرْكِ الغِماد) لە خزمەتتا غەزا ئەکەین .

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : چی ئەڵێن بیڵێن بیکەم ؟ زانییان کە مەقصوودی ئەو ئەنصارە . پێغەمەر - ﷺ - لەوە ترسی بوو کە بۆ بەدر موافەقەی نەکەن ؛ چونکی هەر لەسەر ئەوە موبایەعەیان لە خـزمەتـا کردبوو کـە دوشمنێ هاتـەسەریـان موعـاوەنەتی بکـەن ، لەسـەر ئەوە موبایەعەیان لە خزمەتتا نەکردبوو کە لە خزمەتیا بچنە سـەر دوشمن . سەعدی کوڕی مەعاذ - رضي الله تعالی عنه - عەرزی کرد : (یا رسول الله) چیت ئەمر پێ کراوە تەشریفت بچێ بۆی ئێمەت لە خزمەتاین . ئەم قسەی سەعدە - رضي الله تعالی عنـه - پێغەمـەری مەسـروورو کەیف خۆش کرد . قسطلاني] .

**١٣٢٤/٥ عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - يقول : لا يستوي القاعدون من المؤمنين عن بدر والخارجون إلى بدر . ح - ٦/٢٣٧ . ت**

**تەرجەمە :**

ئیبن و عەباس - رضي الله تعالی عنه - لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە ئەفەرموێ : ئەو موسوڵمانانەی کە دانیشتوونو ناچن بۆ غەزا لە ئەجرا بەرابەر نابن . .[1] . ئەفەرموێ : ئەو موسوڵمانانەی کە لە غەزای بەدرا

(١) مەبەستی ئایەتی (١٠٥)ی سوورەتی (النساء)ە .

له مالاّ دائه‌نیشن و ناچن بۆ به‌در له ئه‌جرا به‌رابه‌ر نابن له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌دا که ئه‌چنه غه‌زای به‌در .

١٣٢٥/٦ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ شاور ، حين بلغه إقبال أبي سفيان ، قال : فتكلم أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأعرض عنه ، ثم تكلم عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأعرض عنه . فقام سعد بن عبادة ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : إيّانا تريد يارسول الله ؟ والذي نفسي بيده لو أمرتنا أن نخيضها = البحر = [أي الخيل] لأخضناها ، ولو أمرتنا أن نضرب أكبادنا إلى بَرْك الغِماد لفعلنا ! قال : فندب رسول الله ـ ﷺ ـ الناس فانطلقوا حتى نزلوا بدرا ، ووردت عليهم روايا قريش [جمع راوية : الجمال التي يحمل عليها الماء] وفيهم غلام أسود لبني الحجاج فأخذوه ، فكان أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ يسألونه عن أبي سفيان وأصحابه فيقول : ما لي علم بأبي سفيان ، ولكن هذا أبو جهل ، وعتبة ، وشيبة ، وأمية بن خلف . فإذا قال ذلك ضربوه . فقال : نعم أنا أخبركم هذا أبو سفيان . فإذا تركوه فسألوه فقال : مالي بأبي سفيان علم ، ولكن هذا أبو جهل ، وعتبة ، وشيبة ، وأمية بن خلف في الناس . فإذا قال هذا أيضا ضربوه ، ورسول الله ـ ﷺ ـ قائم يصلي . فلما رأى ذلك إنصرف وقال : والذي نفسي بيده لتضربوه إذا صدقكم ، وتتركوه إذا كذبكم ! قال : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : هذا مصرع فلان ويضع يده ههنا وههنا . قال : فما ماط أحدهم عن موضع يد رسول الله ـ ﷺ ـ . م ـ ٧/ ٤١٠ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌نه‌سی کوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ که خه‌به‌ری ئه‌وه‌ی پێگه‌یی که ئه‌بوسوفیان له شام گه‌راوه‌ته‌وه‌و بێته‌وه ، موشاوه‌ره‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌صحابی کیراما کرد ، ئه‌بوبه‌کر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسه‌ی فه‌رموو ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ رووی

لێوەرگێرا ، ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسەی فەرموو رووی لەویش وەرگێرا . سەعدی کوڕی عوبادە هەڵسا فەرمووی : (یا رسول الله) مەقصوودت ئێمەیە قەسەم بەوەی نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! ئەگەر ئەمرمان پێ بفەرمووی کە ئەسپەکانمان تاویدەین بۆ[1] ئەو جێی کە تەشریفت ئەچێتێ تاوی ئەدەین . ئەگەر ئەمرمان پێ بکەی کە جگەرمان[2] بدەین (بەرك الغماد) [کە پێنج رۆژ رێگەیە] ئەیکەین !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەڵقی بانگ‌کرد تەشریفیان رۆیی تا لە بەدرا دابەزین ، راویەی[3] ئاوی قورەیش بەسەریانا هاتن بۆ ئاو ، عەبدێکی رەشیان لە ناوا هی (بني الحجاج) بوو گرتیان ، ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەبوسوفیان و رەفیقەکانیان لێ پرسی . وتی : خەبەرم لە ئەبو سوفیان نی‌یە ، ئەمما ئەوە ئەبوجەهل و ، عوتبەو ، شەیبەو ، ئومەییەی کوڕی خەلەفە . کە وای وت دەستیان‌کرد بە لێدانی ، غولامەکە وتی : بەڵێ خەبەری ئەبوسوفیانتان ئەدەمێ ؛ ئەوە ئەبوسوفیانە . کە وازیان لێ هێناو

(١) لێرەدا لە عەرەبی‌یەکەدا وشەی (البحر) کەوتبوو ئێمە خستمانەوە شوێنی خۆی ، دانەر ـ خ ـ مانای حەدیثەکەی بە بێ ئەو وشەیە کردوەو ماناکە نەختێك گۆڕاوەو دەبێ ئاوا بێت : «وەڵڵاهی ئەگەر بفەرموویت و فەرمانمان پێ بدەی کە ئەسپەکانمان تاو بدەین بۆ دەریاو مل بنێینە سەر ئاوی دەریا ئەیکەن و سەرپێچی لە فەرمانت ناکەین» .

(٢) لێرەدا کەوتن و ئاڵۆزی‌یەك هەست پێدەکرێت ، دەکرێ ئاوا بنووسرێت : ئەگەر ئەمرمان پێ بکەی کە بدەین لە جگەرمان بۆ (برك الغماد) ، واتە برۆین تا ئەوێ . .

(٣) مەبەست لە راوی‌یە ئەو وشترانەیە ئاویان پێ ئەبرێ بۆ کۆمەڵ و سوپا . واتە ئاویەرانی سوپاکەی قورەیش هاتن بەسەریانا .

لێیان پرسی وتی : خەبەرم لە ئەبو سوفیان نی یە ، ئەوە ئەبوجەهل و ، عوتبەو ، شەیبەو ، ئومەییەی کوری خەلەفە لەگەڵ خەڵقان . کە ئەمەی وت دووبارە دەستیان کرد بە لێدانی ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەستابوو نوێژی ئەکرد ، کە چاوی کەوت بە موعامەلەی ئەصحاب نوێژەکەی بە عەجەلە کردو سەلامی دایەوەو فەرمووی : قەسەم بەو ذاتەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! کە راستتان پێ بڵێ لێی ئەدەن ، کە درۆیشتان پێ بڵێ وازی لێ ئەهێنن ! لە پاشا فەرمووی : ئەمە جێی کوژرانی فلانە ، دەستی لەسەر ئەرز لەمێ و لەوێ لەسەر دائەنا . ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : هیچ کامێکیان لەجێ دەستی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لای نەدا .

دوو موعجیزەی گەورەی تیایە :

١ ـ خەبەردان لە راستیی غولامەکە .

٢ ـ خەبەردان لەو جێگەیەی کە جەبابیرەی[1] قورەیشی بە کوژراویی لێ ئەکەوێ . هەردووکی وەك فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ هاتەدی .

دروستە لە کافر بدرێ ، بەو شەرتە موعاهیدو ئەهلی ذیمەت نەبێ ، با ئەسیریش بێ .

لە نوێژا ئیشێ رووی دا سوننەتە تەخفیفی نوێژ بکرێ بۆ دەفعی . (نووي) .

١٣٢٦/٧ حذيفة بن اليمان ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : ما منعني أن

(١) جەبابیرە : کۆی جەببارە ، واتە : گەورەو سەردارانی ستەمگەری قورەیش وەك ئەبوجەهل و . .

أشهد بدرا إلا أني خرجت أنا وأبي حُسَيل . قال : فأخذنا كفار قريش ، فقالوا : إنكم تريدون محمدا - ﷺ - فقلنا : ما نريده ، ما نريد إلا المدينة . فأخذوا منا عهد الله وميثاقه : لنصرفن إلى المدينة ولا نقاتل معه . فأتينا رسول الله - ﷺ - فأخبرناه الخبر . فقال : إنصرفا ، نَفي لهم بعهدهم ونستعين الله - عز وجل - عليهم . م - ٤٢٧/٧ .

ته‌رجه‌مه :

حوذه‌يفه‌ی كوڕی یه‌مان - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : هه‌ر ئه‌وه منی مه‌نع كرد له‌وه كه بچمه غه‌زای به‌در من و ئه‌بوحوسه‌یل چووینه ده‌رێ ، كوففاری قوره‌یش ئێمه‌یان گرت ، وتیان : ئێوه ئه‌چنه به‌در لای محه‌مه د - ﷺ - . وتمان : خه‌یر ناچینه لای ئه‌و ، هه‌ر ئیراده‌مان وایه بچینه‌وه مه‌دینه ، له‌سه‌ر ئه‌وه عه‌هدو میثاقی = خوا = یان لێ وه‌رگرتین كه بگه‌ڕێینه‌وه بۆ مه‌دینه و له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را - ﷺ - حه‌رب نه‌كه‌ین . هاتینه خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - عه‌رزمان كرد ، فه‌رمووی : بگه‌ڕێنه‌وه بۆ مه‌دینه عه‌هده‌كه‌یان بۆ به‌جێ بێنین و له خوا موعاوه‌نه‌ت طه‌لَه‌ب ئه‌كه‌ین - عز وجل - .

وه‌فا به عه‌هد لازمه .

١٣٢٧/٨ [عن ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - خ] عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال : قال النبي - ﷺ - يوم بدر : من ينظر [يعلم . أخرى . م] ما فعل [صنع . خ أخرى] أبو جهل ؟ فانطلق ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - فوجده قد ضربه إبنا عفراء [معاذ ومعوذ] حتى برد [برك . م] فأخذ بلحيته ، فقال : [أأنت . أخرى خ] آنت أبا [أبو . خ أخرى] جهل ؟ قال : وهل [أَعْمَدُ (أي : أشرف) من رجل ؟

خ أخرى] فوق رجل قتله قومه ، أو قال : قتلتموه ؟ ح - ٦/٢٣٩ ، ٢٤٠ . م - ٧/٤٤٠ . أحمد . وفي اخرى : فلو غير أكار [زراع] قتلني ؟ م .

[وعن ابن إسحاق أن ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - كان يقول : قال لي أبو جهل : لقد إرتقيت - يا رويعي الغنم ! - مرتقى صعبا . قال : ثم إحتززت رأسه ، ثم جئت به رسول الله - ﷺ - فقلت : يا رسول الله هذا رأس عدو الله أبي جهل . فقال رسول الله - ﷺ - : آلله الذي لا إله إلا هو ؟ قال : قلت : والله الذي لا إله غيره ، ثم ألقيت رأسه بين يدي رسول الله - ﷺ - ، فحمد الله - قسطلاني . ]

**تەرجەمە :**

ئەنەسی کوڕی مالیك - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - ڕۆژی بەدر فەرمووی : کێ تێئەفکرێ بزانێ ئەبوجەهل چی کردوە ؟ ئیبن و مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - تەشریفی ڕۆیی ، ئەبوجەهلی بینی کە مەعاذو (معوذ) ی کوڕی عەفراء لێیان دابوو تا سارد بووبووەوە [لە موسلیما : تا کەوتبوو] ئیبن و مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ریشی ئەبوجەهلی گرت پێی فەرموو : تۆ ئەبوجەهلی ؟ ئەبوجەهل وتی : لەو کەسە شەریفتر هەیە ، لە ژوور ئەو کەسەوە کەسی تر هەیە کە قەومی خۆی ، یا وتی : کە ئێوە کوشتووتانە ؟ لە ریوایەتەکەی ترا : کاشکی غەیری ئەهلی زەراعەت بیکوشتمایە ! [چونکە هەردوو : مەعاذو (معوذ) لە ئەنصار بوون هەردوکیان لە ئەهلی زەراعەت بوون] .

[ئیبن و ئیسحاق ئەفەرموێ : بەعزێ بەنی مەخزووم ئەڵێن : ئیبن و مەسعود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : ئەبوجەهل پێی وتم : ئەی شوانە بچکۆلەی مەڕ چوویتە سەر جێیەکی بەرز ! [ظاهیر وایە ئیبن و

مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ كە ڕیشی ئەبوجەهلی گرت كە سەری ببرێ پێی نابێتە سەر سنگی بۆیە وای پێ وت] . ئیبن‌ومەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پاشا سەرم بری‌و لە بەدەنم كردەوەو بردمە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عـەرزم‌كرد : (یـا رسول الله) ئـەمە سـەری ئەبوجەهلە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : توو ئەو خوایەی كە غەیری ئەو مەعبوودی بەحەق نی‌یە ؟ عەرزم‌كرد : بەو خوایەی كە غەیری ئەو مەعبوودی بەحەق نی‌یە ! لە پاشا سەرەكەم فڕێدایە بەردەمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەمدی خوای كرد .

١٣٢٨/٩ عن علي بن أبي طالب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أنا أول من يجثو بين يدي الرحمن للخصومة يوم القيامة . ح ـ ٦/ ٢٤٠ .

١٣٢٩/١٠ عن أبي ذر ـ رضي الله تعالى عنه ـ [يقسم . أخرى] قال : نزلت : ﴿هذان خصمان اختصموا في ربهم . .﴾[1] [هم الذين تبارزوا يـوم بدر . خ أخـرى] في ستة من قـريش : عـلي ، حمـزة ، وعبيـدة ابن الحرث ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وشيبة بن ربيعة ، وعتبة بن ربيعة ، والـوليـد بن عتبـة . ح ـ ٦/ ٢٤١ . م ـ ١٠/ ٤٨٢ ، ح ـ ٧/ ٢٣٦ . ن ، جه .

تەرجەمە :

حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمـوێ : من ئەوەڵ كەسێكم كە لە ڕۆژی قیامـەتا لـە حوزووری خـوادا چۆك دائـەدەم بۆ موحاكەمە .

ئەبوذەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـەم ئایـەتی سوورەتی حـەجەی

(١) سوورەتی حەج ، ئایەتی : ١٩ .

خوێندەوە = کە ئەفەرموێ : ئەم دوانە دوو خەصمن لە حوزووری خوای خۆیانا موحاکەمە ئەبن : [ئەوانە کە کافر بوون لە ئاگر دەستێ جلیان بۆ ئەبرن ، ئاوی داغیان بەسەرا ئەڕێژرێ ، بەو ئاوە هەموو ناوزگیان و پێستیان دائەماڵێ و ئەتوێتەوە ، گورزیانیش هەیە لە ئاسن ، [بەوە لێیان ئەدرێ] کوللی دەفعەیێ کە تەمایان ئەبێ بچنە دەرێ لە غەمی ئەو ئاگرە لە وەختی چوونەدەرەوەیان لە جەهەننەم ئەخرێنەوە ناو جەهەننەم ، پێیان ئەڵێن : عەذابی سووتانن بچێژن] .

دەرحەق شەش کەس لە قورەیش نازڵ = بوە = : عەلی و ، حەمزەو ، عوبەیدەی کوڕی حەرث ـ رضي الله تعالى عنهم ـ و شەیبەی کوڕی رەبیعەو ، عوتبەی کوڕی رەبیعەو ، وەلیدی کوڕی عوتبە . [ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەلیدی کوشت ، حەمزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ شەیبەی کوشت ، عوبەیدە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەگەڵ عوتبەدا شیریان لە یەکتری دا شیری هەردووکیان کاریگەر بوو ، عەلی و حەمزە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بایان دایەوە سەر عوتبە بە تەواوەتی بە جەهەننەمیان گەیان . عوبەیدەیش ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەو ضەربەی عوتبەیە کە = لە = ئەژنۆی دابوو کە گەڕانەوە لە صەفەردا بە شەهیدیی وەفاتی کرد .

لە بەیضاوی و جەلالەینا ئەفەرموون : ئەو = دوو = خەصمە موسوڵمانان و موشریك و یەهوودین . فەقەط ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ حازری وەقعەو نوزوولی ئایەتەکە بوە .

۱۱ / ۱۳۳۰ وقال علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فينا نزلت هذه الآية : ﴿هذان خصمان اختصموا في ربهم﴾[1] [في دينه تعالى] ح ـ ٢٤١/٦ .

(۱) سوورەتی حەج ئایەتی : ۱۹ .

١٣٣١/١٢ عن أبي إسحاق [رحمه الله] : سأل رجل البراء - رضي الله تعالى عنه - وأنا أسمع قال : أشَهِد علي - رضي الله تعالى عنه - بدرا ؟ قال : بارز ، وظاهر . [أي لبس درعا على درع] ح - ٢٤٢/٦ .

تەرجەمە :

ئەبوئیسحاق - رحمه الله - ئەفەرموێ : پیاوێ لە بەرای پرسی - رضي الله تعالى عنه - منیش ئـەمبیست وتی : ئایـا عەلی - رضي الله تعـالى عنه - حازری وەقعەی بەدر بوە یان نا ؟ فەرمووی : بەڵێ حازری وەقعەی بەدر بوەو ، موبارەزەیشی کردو ، زرێی لەسەر زرێ پۆشی .

١٣٣٢/١٣ عن عروة [رحمه الله] قال : كان في الزبير - رضي الله تعالى عنه - ثلاث ضربات بـالسيف ؛ إحداهن في عـاتقه ، قـال : إن كنت لأدخِـل أصابعي فيهـا . قال : ضُـرِبَ ثنتين يـوم بدر ، وواحـدةً يوم اليرموك . قال عروة : وقال لي عبدالملك بن المروان . . . . حين قتل عبدالله بن الزبير - رضي الله تعالى عنهما - [أي وأخذ الحجاج ما وجد له ، فأرسله إلى عبدالملك ، وكان من جملته سيفهُ ، وخرج عروة إلى عبدالملك بالشام] : يا عروة هل تعرف سيف الـزبير - رضي الله تعـالى عنه - ؟ قلت : نعم . قال : فما فيه ؟ قلت : فيه فَلَّةٌ فُلَّهـا يوم بـدر . قال : صدَقْتَ .

«بهن فلول من قراع الكتائب»

ثم ردَّه علي عروة ، قال هشام : فأقمناه بيننا ثلاثة آلاف ، وأخذه بعضنا ، ولوَدِدْتُ أنِّي كنت أخَذْتُه .[1]

---

(١) ئەم حەدیثە جارێکی دیکە بە ژمارە (١٠٣٢/١٥٥) لە بـاسی زوبەیـردا رابورد .

**وعن هشام عن أبيه ، قال : كان سيف الزبير - رضي الله تعالى عنه - محلى بفضة . قال هشام : وكان سيف عروة محلّى بفضة . ح - ٦/٢٤٢ .**

**تەرجەمە :**

عورروەی کوڕی زوبەیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : زوبەیر - رضي الله تعالى عنه - سێ ضەربەی شیری پێوە بوو ؛ یەکێکیان لە پشتی ملیا بوو ، من پەنجەم پیائەکرد . دوانی لە ڕۆژی بەدرا لێی درابوو ، یەکێکی لە ڕۆژی یەرمووکا . [لە زەمانی خەلافەتی ئیمامی عومەرا - رضي الله تعالى عنه - لە ساڵی پانزەی هیجرەتا دوای فەتحی شام ئەمیری موسوڵمانان ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح بوو - رضي الله تعالى عنه - چوار هەزار موسوڵمان شەهید بوو ، لە ڕۆم نزیکی صەدو پێنج هەزار کوژرا ، چل هەزاریان لێ ئەسیر کرا ، لەو غەزایەدا لە ئەهلی بەدر صەد صەحابەی تیا بوو]

عورروە - رحمه الله - ئەفەرموێ : کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر شەهیدکراو[1] [حەجاج تەریکەی عەبدوڵڵای - رضي الله تعالى عنه - نارد بۆلای عەبدولمەلیك لە ناو تەریکەکەیا شیری زوبەیریش مەوجوود بوو] . عەبدولمەلیك پێی وتم : ئەی عورروە تۆ شیری زوبەیر - رضي الله تعالى عنه - ئەناسیتەوە ؟ عورروە فەرمووی : بەڵێ . وتی : نیشانەی چیە ؟ وتم : کە لێ‌یێکی تیایە لە ڕۆژی بەدرا تێی بووبوو . وتی : ڕاستەکەی ، ئەو شیعرەی خوێنەوە کە مەعنای وایە : هیچ عەیبیان نی‌یە غەیری ئەوە

(١) لێرەدا ناکۆکی و ناجۆری‌یەك لە وەرگێڕانەکەی دانەردا بوو ، ئێمە ڕێکمان خستەوە .

كه لەبەر ئەوە كە لەگەڵ پاڵەوانان ئەوەندەیان لە یەك داوە بەشیر ـ شیرەكانیان كەل بوە[1] . لە دواییدا عەبدوڵەلیك شیرەكەی دایەوە بە عوروە .

هیشامی كوڕی عوروە ـ رحمهما الله تعالى ـ ئەفەرموێ : لە بەینی خۆمانا قیمەتی شیرەكەمان بە سێ هەزار بڕی ، بەعزێ لە ئێمە شیرەكەی لە باقی ئیرث وەرگرت ، حەزم ئەكرد كە من هەڵم بگرتایە بۆ خۆم . عوروە ئەفەرموێ : شیری زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە زیو تەزیین كرابوو . هیشام ئەفەرموێ : شیری عوروەیش بە زیو تەزیین كرابوو .

١٣٣٣/١٤ عن أبي طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن نبي الله ـ ﷺ ـ أمر يوم بدر بأربعة وعشرين رجلا من صناديد قريش فقُذِفوا في طويٍّ من أطواء بدر خبيث مُخبث [وطرح باقي السبعين في مواضع أخرى] وكان النبي ـ ﷺ ـ إذا ظهر على قوم أقام بالعرصة ثلاث ليال ، فلما كان ببدر اليوم الثالث أمر براحلته ، فشُدَّ عليها رحلها . ثم مشى وتبعه أصحابه ، وقالوا : ما نُرى ينطلق إلا لبعض حاجته حتى قام على شفة الرَّكِيِّ ، فجعل يناديهم بأسمائهم وأسماء آبائهم : يا فلان بن فلان ، ويا فلان بن فلان [وفي رواية مسلم وأحمد وابن إسحاق : فينادي : يا عتبة بن ربيعة ! ويا شيبة بن ربيعة ! ويا أُمية بن خلف ! ويا أبا جهل بن هشام ! ولم يكن أُمية بن خلف في القليب ؛ لأنه كان ضخما فانتفخ فأُلقي عليه الحجارة] : أيسرُّكم أنكم أطعتم الله ورسوله ؟ فإنا قد وجدنا ما وعدنا

(١) ئەمە بەیتێكی مەشهووری نابیغەیە ، لە حەدیثەكەدا نیوەی نووسرابوو ، لێرەدا . دانەر هەمووی ماناكردوە ئەمە نیوەكەی تریەتی :

ولا عيب فيهم غير أن سيوفهم

ربنا حقًا . فهل وجدتم ما وعد ربكم حقًا ؟ قال : فقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا رسول الله ماتكلم من أجساد لا أرواح لها ؟ [وأنى يجيبوا وقد جيفوا ؟ . م] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : والذي نفس محمد بيده ! ما أنتم بأَسمعَ لما أقول منهم [ولكنهم لايقدرون أن يجيبوا] . قال قتادة : أحياهم الله حتى أسمعهم قوله ، توبيخا ، وتصغيرا ، ونِقْمة [وبفتح فكسر] وحسرة وندما . ح ـ ٦/٢٤٤ . م ـ ١٠/٣٤١ . بفرق لا يضير .

**تەرجەمە :**

ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژی بەدر ئەمری فەرموو کە بیستو چوار کەسیان لە صەنادیدی قورەیشیان هاویتە ناو بیرێ لە بیرانی بەدر ، پیسی رەفیقی پیس ، ئەوانی تریشیان فڕیدایە جێی تر . پێغەمەر ـ ﷺ ـ عادەتی وابوو کە بەسەر قەومێکا غاڵب بوایە سێ رۆژ لەو مەیدانەدا تەشریفی بەند ئەبوو ، کە رۆژی سێیەمی غەڵەبەی بوو ئەمری فەرموو کە کۆپانیان لە وشترەکەی کردو تەشریفی لێیدا رۆیی ، وتیان : ئەڵبەتە ئیشێکی هەیە . ئەصحابیش لە خزمەتیا چوون تا تەشریفی چوو لەسەر لێوی بیرەکەدا راوەستا ، یەکە ، یەکە دەستی‌کرد بە بانگکردنیان بە ناوی خۆیانو ناوی باوکیانەوە ناوی ئەبردن : ئەی فلانی کوڕی فلان ، ئەی فلانی کوڕی فلان . [ئەی ئەبوجەهلی کوڕی هیشام ! ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف ! ئەی عوتبەی کوڕی رەبیعە ! ئەی شەیبەی کوڕی رەبیعە ! م] : ئێوە مەسروور ئەبن بەوە کە ئیطاعەی خواو رەسوولی خواتان بکردایە ؟ بە تەحقیق ئێمە ئەوەمان دەستکەوت کە خوا ـ عز وجل ـ وەعدەی پێدابووین [یەعنی بەسەرتانا غاڵب بووین] ئایا ئێوەیش

ئەوەتان دەست کەوت کە خوا وەعدەی پێدابوون ؟ ئەوی خوا وەعدەی پێدابووین بە حەقمان زانی ، ئایا ئێوەیش ئەوی خوا وەعدەی پێدابوون تێی گەیین کە حەقە ؟ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : تۆ چۆن خیطاب لەگەڵ ئەو لاشە بێ رۆحانە ئەفەرمووی ؟ [ئەوانە چۆن جواب ئەدەنەوە کە بۆگەنیان کردوە ؟ م] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەو ذاتەی کە رۆحی من لە قەبضەی قودرەتیایە ! ئێوە لەوان زیاتر گوێتان لەوە نی یە کە من ئەیلێم . [ئەمما ناتوانن جواب بدەنەوە . م] قەتادە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : خوا رۆحی کردنەوە بەبەرا تا ئەو فەرموودەی پێغەمەری ـ ﷺ ـ پێ بیستن ، بۆ تەوبیخ و تەحقیرو نەگبەت و حەسرەت و نەدامەت .

١٣٣٤/١٥ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : ﴿الذين بدلوا نعمة الله كفرا﴾[1] هم والله كفار قريش . قال عمرو [بن دينار] : هم قريش ، ومحمد ـ ﷺ ـ نعمة الله ، ﴿وأحلوا قومهم دار البوار﴾ ، قال : النار يوم بدر . ح ـ ٦/٢٤ .

تەرجەمە :

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەوانەی کە تەبدیلی نیعمەتی خوایان کردوە بە کوفر وەڵڵاهی کافرانی قورەیشن . عەمری کوڕی دینار ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئەوانە قورەیشن ، نیعمەتی خوایش محەمەدە ـ ﷺ ـ مەعنای ﴿وأحلوا قومهم دار البوار﴾ وایە : قورەیش تەبەعەی خۆیان خستۆتە ناو ئاگرەوە کە رۆژی بەدرە .

(١) ئیبراهیم/ ٢٨ .

## فضل أهل بدر

١٦/١٣٣٥ رفاعة بن رافع - رضي الله تعالى عنه - عن أبيه ، وكان أبوه من أهل بدر ، قال : جاء جبريل [عليه السلام] إلى النبي - ﷺ - فقال : ما تعدون أهل بدر فيكم ؟ قال : من أفضل المسلمين ؛ أو كلمة نحوها ، قال : وكذلك من شهد بدرا من الملائكة . وكان رافع من أهل عقبة [التي بمنى ، أحد الستة ، والإثني عشر ، والسبعين] وكان يقول لابنه : ما يسرني أني شهدت بدرا بالعقبة قال : سأل جبريل [عليه السلام النبي - ﷺ - بهذا . فقال : ما تعدون ؟ . . الحديث . ح - ٦/٢٥٣ .

**تەرجەمە :**

رەفاعەی کوڕی رافیع لە باوکیەوە - رضي الله تعالى عنه - ریوایەت ئەکا ، باوکی لە ئەهلی بەدر بوو : جیبریل - علیه السلام - هاتە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - لێی پرسی : ئێوە لە ناو خۆتانا ئەهلی بەدر چۆن حسێب ئەکەن ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : لە چاکترینی موسوڵمانانیان عەد ئەکەین ، یا کەلیمەیێکی وای فەرموو . جیبریل - علیه السلام - فەرمووی : ئەو مەلائیکانەی کە حازری بەدر بوون ئەوانیش ئەفضەلی مەلائیکەن .

رافیع لە ئەهلی هەر سێ عەقەبە بوە کە لە میناداا هاتنە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - کە هیجرەت بفەرموێ : بۆ مەدینەو لەوێدا موعاوەنەتی بکەن ، ساڵی ئەوەڵ شەش کەس چوون ، دوەم‌ساڵ دوانزە ، سێیەم ساڵ حەفتا کەس چوونە خذمەتی . رافیع - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کە لە باتی عەقەبە لە غەزای بەدرا بوونم لە لا خۆشتر نی‌یە .

لەگەڵ ئەمەدا کە جیبریل - علیه السلام - دەرحەق بەدریی وای فەرموە .

راستی فەرموە ؛ چونکی مەبدەئی نەشری ئیسلام ئەو عەقەبانە بوو ، بەدر نەتیجەی ئەوانەیە .

١٣٣٦/١٧ عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - أن النبي - ﷺ - قال يوم بدر : هذا جبريل آخذ برأس فرسه ، عليه أداة الحرب . ح - ٢٥٣/٦ .

[وعند ابن إسحاق أن النبي - ﷺ - خفق خفقة ، ثم إنتبه ، فقال : أبشر يا أبا بكر أتاك نصر الله ؛ هذا جبريل آخذ بعنان فرسه يقوده ، على ثناياه الغبار . قسطلاني] .

[ومن مرسل عطية بن قيس - رحمهما الله - أن جبريل - عليه السلام - أتى النبي - ﷺ - بعدما فرغ من بدر على فرس حمراء معقود الناصية ، قد عصب الغبار ثنيته عليه درعه . وقال : يا محمد إن الله - عز وجل - بعثني إليك وأمرني أن لا أفارقك حتى ترضى ، أفَرضيتَ ؟ قال : نعم . قسطلاني .]

تەرجەمە :

ئەم حەدیثی ئیبن‌وعەباسە - رضي الله تعالى عنهما - مورسەلی صەحابی‌یە . ئیبن‌وعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - رۆژی بەدر فەرمووی : ئەوە جیبریلە سەری ئەسپەکەیی گرتوە سیلاحی حەربی لەسەرە .

[ئیبن‌و ئیسحاق ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - بێخودی‌یێکی بەسەرا هات ، لە پاشا خەبەری بۆوە ، فەرمووی : ئەی ئەبوبەکر موژدە بێ ! نوصرەتت لە خواوە بۆ هات ، ئەوە جیبریلە دەستە جڵەوی ئەسپەکەیی گرتوە رایەکێشێ ، ددانی پێشەوەی تۆزی لێ نیشتوە .

عەطیەی کوڕی قەیس بە مورسەلی ریوایەت ئەکا کە جیبریل ـ علیه السلام ـ لە دوای ئەمە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە غەزای بەدر بۆوە هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ سواری ئەسپێکی سوورکوێت بوو ناوچـاوانی پێچابوو ، تۆز لە دەم و ددانی نیشتبوو ، زرێی پۆشیبو ، فەرمووی : ئەی محەمەد خوا ـ عز وجل ـ منی ناردۆتە لات ئەمری پێ کردووم تا رەزات بێتە جێ لێت جوێ نەبمەوە ، ئایا رازی بووی ؟ فەرمووی : بەڵێ . [یەعنی ئەمجا لێی جوێ بۆوە] .

خوا ـ عز وجل ـ ئیرادەی ئیشێکی بوو بێ واسیطەو ئەسباب بە [کن فیکون] کفلەکوونێك ئەیکا ، چە ئیحتیاجی بە جیبریلە ؟ جیبریل ـ علیه السلام ـ شەشصەد باڵی هەیە ، بە ئانێ لە ئاسمانی حەوتەم بێتە خوارێ و ئەچێتەوە سەرێ ، چە ئیحتیاجی بە ئەسپ هەیە ؟ نە تیر ، نە شیر ، نە رم و گورز تەئثیری لێ ناکا چە ئیحتیاجی بە زرێ هەیە ؟ ئەوەندە گەورەیە کە مابەینی ئوفوق پڕ ئەکا . وەك لە بەدئی وەحیا رابورد . بە دوو پەنجە هەموو ئەرز غەور ئەکا ، چە ئیحتیاجی بە سیلاحی حـەرب هەیـە ؟ خوای ـ عز وجل ـ کە وای کردوە ؛ چونکی ئیرادەی ئەزەلیی وایـە کە ئیشی دنیایی هەمووی (معلق)ە بە ئەسبابەوە ، خەرقی عادەتێ نەبێ هیچ شتێ بە بێ سەبەب ناکا . مەقصوودی تەعلیمی عیبادە کە (تشبث) بـە ئەسباب بکەن ، ئەمجا تەوەکول بکەن ، بۆیە فەرموویەتی : ﴿وأعدوا لهم ما استطعتم . . . الآية﴾[1] تەوەکولی صیرف ـ صیرف کەرێتی یە ، تەوەکولی حەقیقی (تشبث) بە ئەسبابەو ئیعتیمادی تام بە خـوایە ـ عـز وجل ـ هەموو ئیشێ لەوەوە بزانرێ نەك لە سەبەبەکەوە .

---

(١) الأنفال/ ٦٠ .

١٨/ ١٣٣٧ براء بن عازب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : جعل النبي ـ ﷺ ـ على الرماة يوم أحد عبدالله بن جبير فأصابوا منا سبعين ، وكان النبي ـ ﷺ ـ وأصحابه أصابوا من المشركين يوم بدر أربعين ومائة : سبعين أسيرا ، وسبعين قتيلا . قال أبو سفيان : يوم بيوم بدر والحرب سجال . ح ـ ٦/ ٢٤٨ .

تەرجەمە :

بەرای کوڕی عازیب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : رۆژی ئوحود پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەبدوڵلای کوڕی جوبەیری کرد بە سەرکردەی تیرئەندازەکان ، موشریکان حەفتا کەسیان لە ئێمە شەهید کرد ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەصحابە لە رۆژی بەدرا صەدو چل کەسی لێ گرتن[1] حەفتایان ئەسیربوون ، حەفتایان کوژران ، ئەبو سوفیان وتی : ئەمە رۆژیکە بە رۆژی بەدر ، حەرب لە بەینمانا نەوبە نەوبەیە ؛ جارێ ئێوە غاڵب ئەبن جارێ ئێمە .

١٩/ ١٣٣٨ عبدالله بن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حدثني عمر بن الخطابُ ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما كان يوم بدر نظر رسول الله ـ ﷺ ـ إلى المشركين وهم ألف ، وأصحابه ثلاثمائة وتسعة عشر رجلا ، فاستقبل رسول الله ـ ﷺ ـ القبلة ثم مد يديه ، فجعل يهتف بربه : أللّهم أنجز لي ما وعدتني ، اللّهم آت ما وعدتني ، أللهم إنك إن تهلك هذه العصابة [الجماعة] من أهل الاسلام لا تُعبد في الأرض . فما زال : يهتف بربه مادًّا يديه مستقبل القبلة حتى سقط رداؤه عن منكبيه ، فأتاه أبو بكر

(١) گرتن بۆ ماناى (أصابوا) تەواونی یەو باشتر وایە بگوترێ : (لێ پێکان) ، یا (دووچار کردن) . . .

ـ رضي الله تعالى عنه ـ فـأخذ رداءه فـألقاه عـلى منكبيه ثم التـزمه من وراثه ، وقال : يا نبي الله كذاك مناشدتُك ربك [رفع صوتك بسؤال ربك] فإنه سينجز لك ما وعدك . فأنزل الله ـ عز وجل ـ ﴿إذ تستغيثون ربكم ، فـاستجاب لكم : أني ممـدُّكم بألف من المـلائكة مـردفين﴾[1] [متتابعين] فأمدّه الله بالملائكة .

قال أبو زميل : فحدثني إبن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : بينما رجل من المسلمين يومئذ يشتدّ في إثر رجل من المشركين أمـامه إذ سمع ضربة بالسوط فوقه وصوت الفارس فوقه يقول : أَقْـدِم حيزوم [إسم فرس المَلَك] فنظر إلى المشرك أمامه فخرّ مستلقيا ، فنظر إليه فإذا قد خطم أنفه [أُثِرَ فيها] وشُقّ وجهه كضربة السـوط ، فاخضـرّ ذلك أجمع . فجاء الأنصاري فحدَّث بذلك رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : صدَقْتَ ذلك من مدد السماء الثالثة . فقتلوا يومئذ سبعين ، وأسروا سبعين .

قال أبو زميل : قال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهـما ـ : فلما أسروا الأسارى قال رسول الله ـ ﷺ ـ لأبي بكر وعمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : ما ترون في هؤلاء الأسارى ؟ فقال أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا نبي الله هم بنو العم والعشيرة ، أرى أن تـأخذ منهم فـدية فتكون لنا قوة على الكفار ، فعسى الله أن يهديهم للاسلام . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ما ترى يا ابن الخطاب ؟ قال : قلت : لا والله يا رسول الله ما أرى الذي رأى أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ولكني أرى أن تُمكِّننا فنضرب أعناقهم ، فتمكن عليا من عقيل فيضرب عنقه ، وتمكنني من فلان ـ نسيبا لعمر ـ ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأضرب عنقه ، فإن هؤلاء

(١) الأنفال/ ٩ .

أئمة الكفر وصناديدها [أشرافها] فَهوِيَ رسول الله ـ ﷺ ـ ما قال أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ولم يَهوَ ما قلت ، فلما كان من الغد جئت فإذا رسول الله ـ ﷺ ـ وأبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قاعدين وهما يبكيان . قلت : يا رسول الله أخبرني من أي شيئ تبكي أنت وصاحبك ؟ فإن وجدت بكاء بكيت ، وإن لم أجد بكاء تباكيت لبكائكما ! فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : أبكي للذي عرض على أصحابك من أخذهم الفداء ، لقد عرض عليّ عذابهم أدنى من هذه الشجرة ، شجرة قريبة من نبي الله ـ ﷺ ـ فأنزل الله ـ عز وجل ـ : ﴿ما كان لنبي أن يكون له أسرى حتى يثخن في الأرض . . . إلى قوله ـ فكلوا مما غنمتم حلالا طيباً﴾[1] فأحل الله الغنيمة لهم . م ـ ٧/٣٦٩ . ح ـ ٥/٩٨ مختصرا . ولفظه :

٢٠/١٣٣٩ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ وهو في قبة : أللهم إني أَنْشُدك عهدك ووعدك ، أللهم إن شئت لم تعبد بعد اليوم ! فأخذ أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بيده فقال : حسبك يا رسول الله فقد أَلحَحتَ على ربك ، وهو في الدرع . فخرج وهو يقول : ﴿سيهزم الجمع ويولّون الدبر ، بل الساعة موعدهم والساعة أدهى وأمرُّ﴾[2] . ح ـ ٦/٢٣٦ . وليس فيه مارواه أبو زميل ـ رحمه الله ـ وهذا الحديث وما رواه أبو زميل مرسل صحابي .

تەرجەمە :

عەبدوڵلای کوڕی عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : عومەری کوڕی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قسەی بـۆ کردووم ، فەرمووی : کە ڕۆژی بەدر بوو پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەماشای موشریکانی کرد هەزار بوون ، تەماشای ئەصحابی کیرامی کرد سێصەدو نۆزدە بوون .

(١) الأنفال/ ٦٧ . (٢) القمر/ ٤٥ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ رووی کردە قیبلە دەستی موبارەکی درێژ کردو لە خوای خۆی ئەپارایەوەو ئەیفەرموو : ئەو وەعدە کە پێت عەطا فەرمووم بۆم بەجێ بێنە ، ئەو وەعدەی پێت‌دوام پێم عەطا بفەرموو خوایا ئەگەر ئەم جەماعەتە موسوڵمانە بە هیلاك‌بەری ئیتر لەسەر ئەرزا عیبادەتت بۆ ناکرێ ! هەر بەم نەوعە بەرەو قیبلە لە پارانەوەدا بوو دەستی موبارەکی هەڵبری‌و دۆعای ئەکرد تا بەرماڵەکەی لە شانی موبارەکی کەوتە خوارێ ، ئەبوبەکری صەدیق ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هاتەخذمەتی‌و بەرماڵەکەی هەڵگرت‌و دایەوە بەسەر شانی موبارەکیا ، لە پشت پێغەمەرەوە بوو[1] عەرزی‌کرد : (یا رسول الله) پارانەوەت لە خوا بەسە ، زۆر ئیلحاحت لە خوا کرد ، خوا وەعدەکەت بۆ بەجێ بێنێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ زرێی پۆشیبو تەشریفی [لە خێوەتەکەی] لەو جێگەی کە تیابوو هاتەدەرێ‌و ئەیفەرموو ؛ گەلی قورەیش ئەشکێن‌و پشت هەڵەکەن [هەر بەوەندە ئیش نابڕێتەوە] بەڵکو رۆژی قیامەت مەوعیدی عەذابیانە ، رۆژی قیامەت عەذابی ئەوان لە کوژرانی ئێستەیان گەلێ بەشیددەت‌ترەو گەلێ تاڵترە [سورة القمر] .

ئەو وەختە خوا ـ عز وجل ـ ئەم ئایەتی ئەنفالەی نازڵ کرد کە مەعنای وایە : کە لە خوا ئەپارێنەوە خوا دۆعاکەی قوبووڵ کردن فەرمووی : هەزار مەلائیکە ئەنێرم بەئیمدادتانەوە یەك لە دوای یەکەوە بێن . خوا ـ عز وجل ـ مەلائیکەی بۆ ناردن .

ئەبو زەمیل ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەووەختە سێ چوار

(١) دانەر ـ خ ـ مانای (إلتزمه) ی باش لێك نەدایەوە ؛ دەبوو بیفەرموایە : لە پشتەوە باوەشی کرد بە پێغەمەرا ـ ﷺ ـ یان گرتی .

ساڵ بوو له مه‌كه‌دا لای دایكی بوو ، باوكیشی له‌گه‌ڵ موشریكان بوو ، كه وابێ حه‌دیثه‌كه‌ی ، لێره به‌دواوه ، مورسه‌لی صه‌حابی‌یه ، له ئیمامی عومه‌ر یا له ئه‌بوبه‌كری بیستوه ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] فه‌رمووی : ئه‌و رۆژه له‌و وه‌خته‌دا موسوڵمانێ ئه‌كه‌وێته شوێن موشریكێك‌و ، موشریكه‌كه له به‌رده‌میه‌وه ئه‌بێ‌و هه‌را ئه‌كا ، ئه‌و موسوڵمانه له‌پر ده‌نگی قه‌مچی پیامالینێ و ده‌نگی سوارێك ئه‌بیێ له‌سه‌ر ئه‌و موشریكه‌وه ، ئه‌ڵێ : ئه‌ی (حه‌یزووم) پێش‌كه‌وه . ئه‌و موسوڵمانه ته‌ماشای موشریكه‌كه ، كه له به‌رده‌میه‌وه‌یه‌تی ، ئه‌كا به پشتا ئه‌كه‌وێ ، كه تێی ئه‌فكرێ وه‌ك چۆن به قه‌مچی لێی بدرێ ئه‌ثه‌ری پێوه دیاره‌و ده‌م‌و چاوی له‌ت بوه‌و هه‌موو شین‌و سه‌وز بۆته‌وه = ئاوایه = !

ئه‌و ئه‌نصاری‌یه[1] هاته‌خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ و ئه‌وه‌ی عه‌رزكرد . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : راست ئه‌كه‌ی ، ئه‌وه له مه‌ده‌دی ئاسمانی سێیه‌مه . ئه‌و رۆژه حه‌فتایان له موشریك كوشت‌و حه‌فتایان لێ به دیل گرتن .

ئه‌بوزه‌میل ـ رحمه الله ـ ئه‌فه‌رموێ : ئیبن‌وعه‌باس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فه‌رمووی : كه ئه‌سیره‌كانیان گرت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به ئه‌بوبه‌كرو عومه‌ری ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فه‌رموو : ره‌ئیتان چۆنه ده‌رحه‌ق ئه‌م ئه‌سیرانه ؟ ئه‌بوبه‌كر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : (يا نبي الله) ئه‌وانه ئامۆزاو عه‌شیره‌تی خۆتن ، ره‌ئی من وایه فیدیه‌یان لێ

(١) له سه‌ره‌تاوه فه‌رمووی : «له‌و وه‌خته‌دا موسوڵمانێ . . . » لێره‌یشدا ئه‌فه‌رموێ : «ئه‌و ئه‌نصاری‌یه . . » دیاره موسوڵمانه‌كه ئه‌نصاریی بوه .

بستێنه ؛ ئەبێ بە قووەت بۆ ئێمەو رجایشم وایە کە خوا هیدایەتیان بدا بۆئیسلامەتی ، پێغەمەر - ﷺ - = فەرمووی = : ئەی (ابن الخطاب) تۆ ئەڵێی چی ؟ فەرمووی [بەم لەفظە ئەم پارچەیە ئەبێ بەمەرفووع] : عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) رەئی من وەك رەئی ئەبوبەکر نی‌یە - رضي الله تعالى عنه - (لكن) رەئی من وایە کە موسەللەطمان کەی بەسەریانا کە لە گەردنیان بدەین ؛ عەقیل بدەی بە عەلی - رضي الله تعالى عنهما - لە گەردنی بدا ، فلانیش بدەی بە من لە گەردنی بدەم ؛ چونکی ئەوانە لە پێشکەوتوانی کوفرن ، لە گەورە گەورەی کوفرن . پێغەمەر - ﷺ - بە قسەی ئەبوبەکری کردو بە قسەی منی نەکرد ، بۆ سبەینێ چوومە خزمەتی ، پێغەمەر - ﷺ - و ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - تەشریفیان دانیشتبوون ئەگریان ، عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) خەبەرم بدەرێ لەبەرچی ئەگرین منیش ئەگەر گریانم هات بگریم ، ئەگەر گریانم نەهات لەبەر گریانی ئێوە خۆم بێنمە گری ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : بۆیە ئەگریم لەبەر ئەوەی کە برادەرەکانت چونکی فیدیەیان لە ئەسیرەکان وەرگرت‌و بەریان‌دان عەذابیان بۆ نێررا ، ئیشارەتی دارێکی کرد کە لێوە نزیك بوو ، فەرمووی : وام پێ‌نیشان‌درا ئەو عەذابەیان لەو درەختە لێ نزیکتر بوو ، خوا ئەو وەختە ئەو ئایەتی سوورەتی ئەنفالەی نازڵ‌فەرموو :

بۆ هیچ پێغەمەرێ دروست نی‌یە کە ئەسیری ببێ تا لەو ئەرزەی کە تیایایە کوفر دوور نەخاتەوە ، ئێوە دنیاتان ئەوێ‌و خوا ئاخیرەتی لە ئێوەو بۆ ئێوە ئەوێ . تا لە نیهایەتی ئەو ئایەتانەدا ئەفەرموێ : لەوەی کە بە تالان گرتووتانە بە حەلاڵی‌و بە پاکی بیخۆن . خوا - عز وجل - غەنیمەتی بۆ حەلاڵ‌کردن .

# قتل أمية بن خلف

٢١/١٣٤٠ عبدالرحمن بن عوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كاتبت أمية بن خلف كتابا بأن يحفظني في صاغيتي [مالى وحاشيتي ، أو أهلي ، ومن يصغي إليه أي يميل] بمكة ، وأحفظه في صاغيته بالمدينة ، فلما ذكرت الرحمن قال : لا أعرف الرحمن ! كاتبني باسمك الذي كان في الجاهلية . فكاتبته عبدُ عمرو . فلما كان في يوم بدر خرجت إلى جبل لِأحرزه حين نام الناس ، فأبصره بلال [وكان يعذبه بمكة] فخرج حتى وقف على مجلس من الأنصار ، فقال : أمية ابن خلف ، لا نجوت إن نجا أمية ! فخرج معه فريق من الأنصار في آثارنا ، فلما خشيت أن يلحقونا خلفت لهم إبنه [عليا] لِأشغُلهم [ومن الافعال] فقتلوه ، ثم أبَوْا حتى يتبعونا ، وكان رجلا ثقيلا ، فلما أدركونا قلت له : أبرك ، فبرك فألقيت عليه نفسي لِأمنَعه ، فتخلَّلوه بالسيوف [فطعنوه] من تحتي حتى قتلوه . وأصاب أحدُهم رجلي بسيفه ، وكان عبدالرحمن بن عوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ يُرينا ذلك الأثر في ظهر قدمه . ح ـ ٤/ ١٥٠ . ح ـ ٦/٢٤٢ .

هنيئا زادك الرحمنُ فضلا * فقد أدركتَ ثأركَ يا بِلالُ

تەرجەمە :

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کاغەزێکم نووسی بۆ ئومەییەی کوڕی خەلەف کە لەمەکەدا ماڵ و کەس و کارم موحافەظە بکا ، منیش ماڵ و تەعەلوقاتی ئەو لە مەدینەدا موحافەظە ئەکەم . لەو کاغەزەدا کە موعاهەدەنامە بوو کە ذیکری (عبدالرحمن)م کرد وتی : من ئەو رەحمانەی کە خۆت کردوە بە عەبدی ئەو ناناسم ! ئەو ناوەت بنووسە کە لە زەمانی جاهیلییەتا بووتە . منیش لە

موعاهەدەنامەكەدا عەبدی عەمرم نووسی .

كە رۆژی بەدر بوو لە وەختێكا كە خەڵق نوستن چوومە شاخێ كە موحافەظەی = ئومەییە = بكەم ، بیلال چاوی بە ئومەییە كەوت [ئومەییە لە مەكەدا بیلالی زۆر ئەذیەت دابوو] بیلال ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوە دەرێ تا بەسەر مەجلیسێكی ئەنصارەوە وەستا پێی وتن : ئەوە ئومەییەی كوڕی خەلەفە [تەمایەتی خۆی نەجات بدا] نەجاتم نەبێ ئەگەر ئەو نەجاتی ببێ ! فیرقەیێ لە ئەنصاری لەگەڵا چوەدەرێ ، بە شوێنمانا هاتن ، كە ترسام لەوە بمانگەنێ عەلیی كوڕی ئومەییەم بۆبەجێ یێشتن كە پێوە مەشغووڵ ببن . عەلی یان كوشتو هەر هاتن بە شوێنمانا كە پێمان گەیین ؛ چونكی ئومەییە پیاوێ قورس بوو [نەیەتوانی بڕوات] پێم وت : چۆك دادە ، چۆكی دادا خۆم بەسەرا خست تا نەیێڵم بیكوژن ، لە ژێر منەوە بە شیر لێیان داو كوشتیان ، شیری یەكێكیان لە پێم كەوت . ئیبراهیمی كوڕی عەبدورەحمان ئەفەرموێ : باوكم ئەو جێ شیرەی كە لە پشتی پێیا بوو پێنیشانی ئێمەی ئەدا .

[رەحمەت لەو شاعیرەی كە فەرموویەتی : فەضیلەتت عافیەت بێ ئەی بیلال ، تۆ گەییت بە حەقی خۆت، ئینتیقامت لە ئومەییە سەند .

١٣٤١/٢٢ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بعث رسول الله ـ ﷺ ـ بُسَيْسَةَ ـ بَسْبَسة [الأنصاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ] عينا ينظر ما صنعت عير أبي سفيان . فجاء وما في البيت أحد غيري وغير رسول الله ـ ﷺ ـ قال [ثابت أو غيره من الرواة] : لا أدري ما استثنى بعض نسائه . قال [أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ] : فحدثه الحديث . قال : فخرج رسول الله ـ ﷺ ـ فتكلم فقال : إن لنا طِلْبة ، فمن كان ظهره حاضرا فليركب معنا ، فجعل رجال يستأذنونه في ظُهْرانهم [أي

مركوباتهم] في عُلْو المدينة ، فقال : لا إلا من كان ظهره [مركوبه] حاضرا . فانطلق رسول الله ـ ﷺ ـ وأصحابه حتى سبقوا المشركين إلى بدر .

وجاء المشركون فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لا يقدمنَّ أحد منكم إلى شيئ حتى أكون له دونه [أي قدامه] . فدنا المشركون ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : قوموا إلى جنة عرضها السماوات والأرض . قال : يقول عمير ابن الحُمام ـ رضي الله تعالى عنه ـ : يا رسول الله جنة عرضها السماوات والأرض ؟ قال : نعم . بخ ، بخ ! فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ما يحملك على قولك بخ بخ ؟ قال : لا والله يا رسول الله إلا رجاءة أن أكون مِن أهلها . قال : فإنك من أهلها . فأخرج تمرات من قرنه [جعبة السهام] فجعل يأكل منهنّ ، ثم قال : لَإن أنا حييت حتى آكل تمراتي هذه إنها لحياة طويلة ! فرمى بما كان معه من التمر ، ثم قاتلهم حتى قتل . ـ رضي الله تعالى عنه ـ . م ـ ٨/١٠٥ .

ته‌رجه‌مه :

ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ بوسه‌یسه‌ی به جاسووسي نارد تێفكرێ كه كاروانه‌كه‌ی ئه‌بوسوفیان چییان كرد . له ماڵی پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ غه‌یری من و غه‌یری پێغه‌مه‌ری تیا نه‌بوو ـ ﷺ ـ . راویی ئه‌فه‌رموێ : = نازانم = ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ به‌عزێ ئه‌زواجی طاهیراتیشی (استثنا) كرد یان نا ؟ بوسه‌یسه ـ رضي الله تعالى عنه ـ هاته‌وه‌و قسه‌ی بۆ پێغه‌مه‌ر كرد ـ ﷺ ـ ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شریفی له ماڵ چوه ده‌رێ ، قسه‌ی فه‌رموو ، فه‌رمووی : ئێمه ئیشێكمان هه‌یه كه مه‌طلووب بێ ، هه‌ركه‌سێ ولاخی حازر بێ له گه‌ڵمان

سوار ببێ . بەعزێ ئەصحاب ئیذنیان لێ خواست : کە وڵاخی سواریمان لە ژوور مەدینەوەیە بچین بیهێنین ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەر ئەوانە کە وڵاخیان حازرە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەصحابی کیرامی تەشریفیان کەوتنە رێ ، لە پێش موشریکەکانا گەیینە بەدر ، موشریکەکانیش هاتن ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هیچ کەس هیچ ئیشێ نەکا تا من لە پێشەوە ئەیکەم ، لە موشریکەکان نزیك بوونەوە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەڵسن بۆ بەهەشتێ کە پانیی ئەو بە قەد پانیی ئەرزو ئاسمانە . ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : = عومەیری کوڕی حومام فەرمووی = : (یا رسول الله) بەهەشتێ بە قەد ئەرزو ئاسمان پانە ؟ ئۆخەیش ئۆخەیش ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ = فەرمووی = : ئەم ئۆخەیش ئۆخەیشەت لە چی بوو ؟ عەرزی کرد : (یا رسول الله) وەڵلاهی غەیری ئەوە کە ئومێدم وایە من لە ئەهلی ئەو بەهەشتە بم هیچ مەقصوودی ترم نەبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە وابێ تۆ لە ئەهلی ئەو بەهەشتەی . ئەو وەختە عومەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە تیرکەشەکەی چەند خورماییێکی دەرهێناو دەستی کرد بەخواردنی ، لە پاشا وتی : ئەگەر من بژیم تا ئەم خورمایانە ئەخۆم ئەوە ژیانێکی زۆر درێژە ! خورماکانی فڕێداو دەستی کرد بە شەڕکردن تا شەهید کرا . ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

تێفکرە لە قووەتی ئیمانی ئەصحاب ! لێی یەقین بوە کە هەر لەگەڵ شەهید بوونیا ئەچێتە بەهەشتەوە بەوەندە رەزا نەبوە تادوو سێ دەنك خورما ئەخوا بەجێ بمێنێ ، کەچی ئێمە بۆ دوو سێ دەنك خورما خۆمان ئەهاوینە ناو ئاگرەوە ! (أصلح الله حالنا !)

[دروسته بۆ طەلەبی شەهادەت حەملەبردنە سەر کوففار ، هیـچ کەراهەتی نی یە . نووي .]

١٣٤٢/٢٣ عن عروة قال : قال الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ لقيت يوم بدر عبيدةَ بن سعيد بن العاص وهو مدجَّج [مغطى] بالسلاح ، وهو يُكنى أبو ذات الكَرش [كثير العيال] فقـال : أنا أبـو ذات الكِرش . فحملت عليه بالعَنَزَة فطعنته في عينه فمات . قال هشام : فأُخبرت أن الزبير قال : لقد وضعت رجلي عليه ثم تمطأت [تمطيت] فكان الجَهْدُ أن نزعتها . وقد انثنى طرفاها ، قال عروة : فسأله إياها رسول الله ـ ﷺ ـ [عارية] فأعطاه ، فلما قبض رسول الله ـ ﷺ ـ أخذها ، ثم طلبها أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأعطاه ، فلما قبض أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ سألها إياه عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأعطاه إيـاها . فلما قبض عمـر ـ رضي الله تعالى عنه ـ أخذها .. ثم طلبها عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ منه فأعطاه إياها . فلما قتل عثمان وقعت عند آل علي ـ رضي الله تعالى عنها ـ فطلبها عبدالله بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فكانت عنده حتى قتل . ح ـ ٦/٢٥٤ .

تەرجەمە :

عوروە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : رۆژی بەدر تووشی عوبەیدەی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بووم ، لە سیلاحا غەرق بوو ، غەیری چاوی هیچ جێی نـەئەبینـرا ، کونیەی (أبو ذات الكرش) بو [یەعنی باوکی ورگنان ؛ کچی زۆری بوو] وتی : من باوکی ورگنانم ، زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : بە نێزەوە هەڵمەتم بردێ ، نێزەییکم دا لە چاوی پێی مرد .

هيشامی کوڕی عوروه [هەر بەو ئیسنادە یەعنی لە عوروەوە ، ئەویش لە زوبەیرەوە - رضي الله تعالى عنه - کە وابێ نابێ بە حەدیثی مونقەصیع ؛ چونکی راویێ تەرك کراوه] ئەفەرموێ : خەبەرم دراوەتێ کە زوبەیر فەرمووی : پێم نا بەسەر سەری باوکی ورگنانا خۆم پاشەوپاش کێشایە دواوە بە زۆر دەرم کێشا ، هەردوو سەری خوار بوو بوو ! عوروە ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - بە عاریە ئەو نێزەیەی لە زوبەیر طەلەبکرد ، پێی ئیعطاکرد . دوای وەفاتی زوبەیر وەریگرتەوە لای خۆی . لە پاشا ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - لێی طەلەبکرد ، دایێ . دوای وەفاتی . . عومەر - رضي الله تعالى عنه - داوای لێکرد . دوای وەفاتی . . عوثمان - رضي الله تعالى عنه - داوای لێکرد تا شەهید کرا لە لای بوو . دوای ئەو کەوتە لای ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - . دوای ئەو عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر وەریگرتەوە لای خۆی تا شەهید کرا .

[مەقصوود لەم حەدیثە وەقعەییێکی رۆژی بەدرە ، فائیدەی ئەوەیە ئالەتی حەرب ئیشێکی گەورەی پێ بکرێ بە قیمەتو بە حورمەت ئەبێ . ئینسانیش بۆ خوا ئیشی باش بکا لای خوا عەزیز ئەبێ ، ئیشی خراپە بکا رەذیل ئەبێ] .

# متى يجب الجهاد ؟[1]

## عدد أهل بدر - رضي الله تعالى عنهم -

١٣٤٣/٢٤ عن البراء - رضي الله تعالى عنه - قال : أستصغرت أنا وابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - يوم بدر ، وكان المهاجرون يوم بدر نيفا على ستين (ما بين العقدين) ، والأنصار نيفا وأربعين ومائتين . ح - ٦/٢٣٨ .

**تەرجەمە :**

بەراء - رضي الله تعالى عنە - ئەفەرموێ : رۆژی بەدر من و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - بە بوچووك درایناقەڵەم [نەبراین] . رۆژی بەدر موهاجیر شەصت و ئەوەندە بوو ، ئەنصار دووصەدو چل و ئەوەندە بوو [یەعنی سێصەدو دوو نەخت] .

وعنه[2] قال : [حدثني أصحاب محمد - ﷺ - ممن شهد بدرا أنهم كانوا عدّة أصحاب طالوت . . ] كنا أصحابَ محمد - ﷺ - نتحدث أن عدّة أصحاب بدر - رضي الله تعالى عنهم - على عدّة أصحاب طالوت الذين جاوزوا معه النهر ، ولم يجاوز معه إلاّ مؤمن بضعة عشر وثلاثمائة [وفسر البضع بثلاثة] . ح - ٦/٢٣٨ .

**تەرجەمە :**

بەرای کوڕی عازیب - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : کە ئەصحابی محەمەد - ﷺ - لەوانەی کە حازری بەدر بوون - رضي الله تعالى

---

(١) کەی جیهاد واجب ئەبێ ؟

(٢) دانەر - خ - ژمارەی ئەم حەدیثەی لەبیر چوە . ئێمەیش وەك خۆی هێشتمانەوە .

عنهم ـ خه‌به‌ریان داومێ که عه‌ده‌دی ئه‌صحابی به‌در ـ رضي الله تعالی عنهم ـ به‌قه‌د عه‌ده‌دی ئه‌صحابی (طالوت) بوون که له نه‌هره‌که په‌رینه‌وه ، غه‌یری موسوڵمان له‌و نه‌هره نه‌په‌رینه‌وه که سێصه‌دو (ئه‌وه‌نده) بوون . ئه‌وه‌نده به سێ ته‌فسیر کراوه‌ته‌وه .

[ئیبن و سه‌عد ـ رحمه الله ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شریفی له‌گه‌ڵ سێ صه‌دو پێنج ئه‌صحابا چوو بۆ به‌در ؛ موهاجیر حه‌فتاو چوار بوون ، ئه‌وانی تر ئه‌نصار بوون . هه‌شت که‌س هه‌ر یه‌که له‌به‌ر سه‌به‌بێ ته‌خه‌للوفیان کرد نه‌چوون بۆ به‌در .

١ ـ عوثمانی کوڕی عه‌ففان ؛ روقیه‌ی حه‌ره‌می که کچی پێغه‌مه‌ر بوو ـ ﷺ ـ نه‌خۆش بوو ، به‌سه‌ر ئه‌وه‌وه به‌ند بوو .

٢ ـ طه‌لحه‌ی کوڕی عوبه‌ید وڵڵا .

٣ ـ سه‌عیدی کوڕی زه‌ید . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌و دوانه‌ی نارد که (تجسس)ی کاروانی قوره‌یش بکه‌ن .

٤ ـ ئه‌بولوبابه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌سه‌ر مه‌دینه‌وه به‌جێی هێشت .

٥ ـ عاصیمی کوڕی عه‌دیی ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌سه‌ر ئه‌هلی عالیه‌وه به‌جێی هێشت .

٦ ـ حه‌رثی کوڕی حاطه‌ب ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له (روحا) وه گێرایه‌وه بۆ ته‌حقیقی خه‌به‌رێ له به‌نی عه‌مری کوڕی عه‌وفه‌وه پێی گه‌یی بوو .

٧ ـ حه‌رثی کوڕی صمه ، له ره‌وحا له حه‌یوان که‌وته خوارێ جێیلی شکا ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ناردیه‌وه بۆ مه‌دینه .

٨ ـ خه‌واتی بنی جوبه‌یر ، ئه‌ویش به‌و نه‌وعه .

ئه‌مانه‌یش ـ رضي الله تعالی عنهم ـ هه‌موویان له ئه‌هلی به‌در حسێبن ، پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ له غه‌نیمه‌ت وه‌ك ئه‌وانی تر سه‌همی بۆ

داتان . قسطلاني] .

بەم ئیعتیبارە ئەهلی بەدر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەبن بە سێصەدو سێنزە .

عن عروة ـ رحمه الله ـ عن الزّبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ قـال : ضربت يوم بدر للمهاجرين بمائة سهم . ح ـ ٦/٢٦٥[1] .

من سمي من أهل البدر في الجامع الذي وضعه أبو عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري ـ رحمه الله ـ على حروف المعجم . [إلا النبيّ ـ عليه الصلاة والسلام ـ والخلفاء الأربعة ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ] :

١ ـ النبي محمد بن عبدالله الهاشمي ـ ﷺ ـ .

٢ ـ ثم أبو بكر الصديق .

٣ ـ عمر .

٤ ـ ثم عثمان .

٥ ـ ثم علي ـ رضي الله تعالى عنهم ـ .

٦ ـ ثم أياس بن البكير .

٧ ـ بلال بن رباح ، مولى أبي بكر الصديق .

٨ ـ حمزة بن عبدالمطلب الهاشمي .

٩ ـ حاطب بن أبي بلتعة ، حليف لقريش .

١٠ ـ أبو حذيفة بن عتبة بن ربيعة القرشي .

١١ ـ حارثة بن الرُّبيع الأنصاري . قتل يوم بدر وهو وحارثة بن سراقة

---

(١) دانەر ـ خ ـ ماناى ئەم قسەی عوروەیە نەکردوە ، لە دواییدا قسەیەکی نزیك بەم قسە مانا دەکات . بەڵام ماناى ئەو ناوانەی نە کرد کە لە بەشداربووانی بەدر لێرەدا نووسیونی .

كان في النظارة .

١٢ ـ خُبيب بن عدي الأنصاري .

١٣ ـ خُنيس بن حذاقة السهمي .

١٤ ـ رِفاعة بن رافع الأنصاري .

١٥ ـ رفاعة بن المنذر .

١٦ ـ أبو لبابة الأنصاري .

١٧ ـ الزبير بن العوّام القرشي .

١٨ ـ زيد بن سهل = أبو طلحة الأنصاري .

١٩ ـ أبو زيد الأنصاري .

٢٠ ـ سعد بن مالك الزهري .

٢١ ـ سعد بن خولة القرشي .

٢٢ ـ سعيد بن زيد بن عمرو بن نفيل القرشي .

٢٣ ـ سهل بن حنيف الأنصاري .

٢٤ و ٢٥ ـ ظهير بن رافع وأخوه [مظهر] .

٢٦ ـ عبدالله بن مسعود الهذلي .

٢٧ ـ عتبة بن مسعود الهذلي . (وفيه خلاف) .

٢٨ ـ عبدالرحمن بن عوف الزهري .

٢٩ ـ عبيدة بن الحرث القرشي .

٣٠ ـ عبادة بن صامت الأنصاري .

٣١ ـ عمرو بن عوف .

٣٢ ـ حليف بن عامر بن لؤي .

٣٣ ـ عقبة بن عمرو الأنصاري .

٣٤ ـ عامر بن ربيعة العنزي .

٣٥ - عاصم بن ثابت الأنصاري .

٣٦ - عويم بن ساعدة الأنصاري .

٣٧ - عِتبان بن مالك الأنصاري - رضي الله تعالى عنهم - .

٣٨ - قدامة بن مظعون .

٣٩ - قتادة بن النعمان الأنصاري .

٤٠ - مُعاذ بن عمر بن الجموح .

٤١ و ٤٢ - معوذ بن عفراء وأخوه [عوف] .

٤٣ - مالك بن ربيعة .

٤٤ - أبو أُسيد الأنصاري .

٤٥ - مُرارة بن الربيع الأنصاري .

٤٦ - معن بن عدي الأنصاري .

٤٧ - مِسْطح بن أُثاثة بن عباد عبدالمطلب بن عبدمناف .

٤٨ - مِقداد بن عمرو الكندي حليف بني زهرة .

٤٩ - هلال بن أمية الأنصاري .

[قال أبو عبدالله البخاري] فجميع من شهد بدرا من قريش ممن ضرب له بسهمه أحد وثمانون رجلا . وكان عروة ابن الزبير يقول : قال الزبير - رضي الله تعالى عنه - : قسمت سُهْمانهم فكانوا مائة [من قريش ممن شهدها ولو حكما] والله أعلم . ح - ٦/٢٦٥ .

ته‌رجه‌مه :

بوخاری - رحمه الله - ئه‌فه‌رموێ : هه‌موو ئه‌وانه‌ی که له قوره‌یش سه‌همی بۆ جوێ کردنه‌وه هه‌شتاو یه‌ك بوون .

زوبه‌یر - رضي الله تعالى عنه - فه‌رموویه‌تی : ئه‌وانه‌ی که له قوره‌یش حازری به‌در بوون ، یا وه‌کوو ئیمامی عوثمان - رضي الله تعالى

عنه ـ لەبەر مەعذەرەتێ حازر نەبوون لەوان حسێبن لە غەنیمەتی بـەدر بەشم بۆجوێکردنەوە . . صەد کەس بوون . (والله أعلم)

## حديث بني النضير[1]

عن عروة بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ كانت على ستة أشهر من وقعة بدر قبل وقعة أحد [مرسل] ، وقول الله تعالى : ﴿هو الذي أخرج الذين كفروا من أهل الكتاب من ديارهم لأول الحشر ، ماظننتم أن يخرجوا . .﴾[2] وجعله ابن إسحاق بعد بئر معونة [في صفر سنة ٤] وأحد . ح ـ ٦/٢٦٨ .

تەرجەمە :

عوروەی کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حەدیثی (بنو النضیر) لە پێش ئوحودا شەش مانگ دوای بەدر واقیع بوو . ئیبن و ئیسحاق : لە دوای بیری مەعوونەو ئوحودا بوو لە ساڵی چوارەمی هیجرەتا .

٢٥/١٣٤٤ عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ سمع رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : لأخرجنَّ اليهود والنصارى من جزيرة العرب حتى لا أدع إلا مسلما . م ـ ٧/٣٧٨ .

تەرجەمە :

عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کە لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی بیستوە کە ئەیفەرموو : جوولەکەو گاور لە (جزيرة العرب) ئەکەمە دەرێ تا غەیری موسوڵمان هیچ کەسی تیا نایێڵمەوە .

٢٦/١٣٤٥ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : حاربت النضيرُ وقريظةُ . فأجلى بني النضير وأقرَّ قريظة ، ومنَّ عليهم ، حتى

---

(١) باسی بەنو نەضیر .

(٢) الحشر/٢ .

حاربت قريظة [فحاصرهم خمسا وعشرين ليلة حتى جهدهم الحصار ، وقذف الله في قلوبهم الرعب ، فنزلوا على حكمه - ﷺ -] فقتل رجالهم ، وقسم نساءهم ، وأولادهم ، وأموالهم بين المسلمين ، إلا بعضهم لحقوا بالنبي - ﷺ - فآمنهم وأسلموا ، وأجلى يهود المدينة كله بني قَيْنُقاع ، وهم رهط عبدالله بن سلام - رضي الله تعالى عنه - ويهود بني حارثة وكل يهود المدينة . ح - ٦/٢٦٩ . م - ٧/٣٧٧ بفرق في بعض الكلمات .

تەرجەمە :

ئیبن‌و عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرمـوێ : جوولـەکەی نەضیرو قورەیظە موحارەبەیان کرد لەگەڵ پێغەمەرا - ﷺ - . پێغەمـەر - ﷺ - بەنی نەضیری لە وەطەن کردە دەرێ ، قورەیظەی هێشتەوەو بە بێ فیدیە منەتی نا بەسەریانا . مانەوە تا دووبارە حەربیان لەگەڵ پێغەمەر کرد - ﷺ - [بیست‌و پێنج رۆژ موحاصەرەی دان تا موحاصەرە وای لێ‌کردن نزیکی هەلاکـەت بوون‌و خـوا ترسی خستـە دڵیان‌و لـەسەر حـوکمی پێغەمەر لە قەڵاکـەیان هـاتنەخـوارێ . پێغەمـەر - ﷺ - حوکمـەکەی بەرەورووی سەعدی کوڕی مەعاذ - رضي الله تعـالى عنه - کـردەوە ، موافیقی رەئی ئەو] پێغەمەر - ﷺ - پیاوەکانیـانی کوشت‌و ، ژنیـان‌و ، ئەولادیان‌و ، ماڵیانی لە بەینی موسوڵمانانا بەش‌کرد . بەعزێکیان نەبێ کە ئیلتیحاقیان بە پێغەمەر کرد - ﷺ - و پێغەمەر - ﷺ - ئەمینی کردنـەوەو موسوڵمان بوون . هەموو جوولەکەی مەدینـە کە بـەنی قەینـوقاع بـوون = کە = قەومی عەبدوڵڵای کوڕی سـەلام بوون‌و ، جـوولەکـەی بەنی حاریثە و . . هەموو یەهوودی مەدینەی کردە دەرێ .

١٣٤٦/٢٧ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن النبي - ﷺ - حرَّق نخل بني النضير . قال : ولها يقول حسان بن ثابت - رضي الله

تعالى عنه - :

وهان على سراة بني لؤي حريق بالبويرة مستطير

قال : فأجابه أبو سفيان بن الحرث [ابن عم النبي - ص -] :

أدام الله ذلك من صنيع وحرق في نواحيها السعير

ستعلم أينا منها بنُزْهٍ وتعلم أي أرضنا تضير !

ح - ٦/ ٢٧٠ . م - ٧/٣٢٦ .

**تەرجەمە :**

ئيبن و عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - خورمای بەنی نەضیری سووتان ، دەرحەق ئەوە حەسانی کوڕی ثابیت - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لەسەر ساداتو گەورە - گەورەی قورەیشو بەنی لوئەی ئاگرێ کە خورمای (بویر)ی سووتانو بە ناویا بڵاو بۆوە . . سووكو بێقیمەت بوو . ئەبو سوفیانی ئامۆزای پێغەمەر - ﷺ - کوڕی حەرثی مامی ئێشتا موسوڵمان نەبووبوو . . جوابی حەسانی دایەوە : ئەو صنعەتی سووتاننە خوا هەر بەردەوامی بکاو بیە یڵێو ئاگر لە ئەطرافی مەدینە بەربداو بیسووتێنێ ، ئەووەختە ئەزانی کە کامان لە تەنەزوهو کەیفا ئەبینو ئەزانی کە ئەرزی کامان زەرەر ئەکا !

# قتل كعب بن الأشرف[1] ربيع الأول ٣

١٣٤٧/٢٨ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : من لكعب بن الأشرف ؛ فإنه قد آذى الله ورسوله ؟ فقام محمد بن مَسْلَمة ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : يا رسول الله أتُحِبُّ أن أقتُلَه ؟ قال : نعم . قال : فأذن لي أن أقول شيئا . قال : قل [وعند ابن عبد البر فرجع محمد بن مسلمة ، فمكث أياما مشغول النفس بما وعد رسول الله ـ ﷺ ـ من قتل ابن الأشرف ، فأتى أبا نائلة : سلكان بن سلامة بن وقش ـ وكان أخا كعب بن الأشرف من الرضاعة ـ وعباد بن بشر بن وقش ، والحرث بن أوس بن معاذ ، وأبا عبس بن جبر ، فأخبرهم بما وعد به رسول الله ـ ﷺ ـ من قتل ابن الأشرف فأجابوه إلى ذلك . فقالوا : كلنا نقتله ، ثم أتوا رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : يا رسول الله إنه لابد لنا أن نقول . قال : قولوا ما بدا لكم فأنتم في حل . قسطلاني] فأتاه محمد بن مسلمة فقال : إن هذا الرجل قد سألنا صدقة ، وإنه قد عنّانا [أتعبنا] وإني قد أتيتك أستسلفك . قال : وأيضا والله لتملُّنَّه . قال : إنا قد اتبعناه فلا نحب أن ندعه حتى ننظر إلى أي شيٍّ يصير شأنه ، وقد أردنا أن تسلفنا وَسقا أو وَسقين [ستون صاعا . والصاع : أربعة أمداد ، كل مد رطل وثلث رطل] = وحدثنا عمرو غير مرة ، فلم يذكر وسقا أو وسقين . فقلت له : فيه وسقا أو سقين ؟ قال : أرى فيه وسقا أو وسقين = فقال [كعب] : نعم إرهنوني . فقالوا : أي شيٍّ تريد ؟ قال : إرهنوني نساءكم . قالوا : كيف نرهنك نساءنا وأنت

---

(١) كوژرانی كەعبی كوڕی ئەشرەف

أجمل العرب ؟ قال : فارهنوني أبناءكم . قالوا : كيف نرهنك أبناءنا فيُسبُّ أحدهم فيقال : رُهِن بوَسق أو وِسقين ؟ هذا عار علينا ، ولكنا نرهنك اللامة . قال : سفيان [ابن عيينة ـ رحمه الله ـ] : يعني السلاح ، فواعده أن يأتيه ، فجاءه ليلا ومعه أبو نائلة وهو أخو كعب من

الرضاعة . فدعاهم إلى الحصن ، فنزل إليهم ، فقالت له امرأته أين تخرج هذه الساعة ؟ فقال : إنما هو محمد بن مسلمة وأخي أبو نائلة . قال غير عمرو : قالت أسمع صوتا كأنه يقطر منه الدم ! قال : إنما هو أخي محمد بن مسلمة ورضيعي أبو نائلة . إن الكريم لو دُعي إلى طعنة بليل لأجاب !

قال : ويُدْخل محمد بن مسلمة معه رجلين . قيل لسفيان سماهم عمرو [ابن دينار] قال : سمى بعضهم . قال عمرو : جاء معه برجلين . وقال غير عمرو : أبو عبس بن جبر ، والحرث بن أوس ، وعباد بن بشر . قال عمرو : جاء معه برجلين ، فقال : إذا ما جاء فإني قائل بشَعْره فأشمه ، فإذا رأيتموني إستمكنت من رأسه فدونكم فاضربوه . وقال مرة : ثم أُشِمُّكم فنزل إليهم . متوشحا ، وهو ينفح منه ريح الطيب .

فقال : ما رأيت كاليوم ريحا ، أي أطيب ! وقال غير عمرو : قال : عندي أعطر نساء العرب وأكمل العرب . قال عمرو : فقال : أتأذن لي أن اشم رأسك ؟ قال : نعم . فشمه ، ثم أشم أصحابه ، ثم قال : أتأذن لي ؟ قال : نعم . فلما استمكن منه قال : دونكم ! فقتلوه . ثم أتوا النبي ـ ﷺ ـ فأخبروه . ح ـ ٦/٢٧٣ . م ـ ٧/٤٤٢ .

**تەرجەمە :**

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کێ کەعبی کوڕی ئەشرەفم بۆ ئەکوژێ ؟ زۆر ئیذای[1] خواو پێغەمەری کردوە . محەمەدی کوڕی مەسلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەڵسا عەرزیکرد : (یا رسول الله) حەزەکەی بیکوژم ؟ فەرمووی : بەڵێ . عەرزیکرد : ئیذنم بدە کە شتێ بڵێم لە (علیه) تۆ فەرمووی : بڵێ .

[لە ریوایەتی (ابن عبدالبر)ا ئەفەرموێ : محەمەدی کوڕی مەسلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەڕایەوە ، چەند رۆژێ ذیهنی بەو وەعدەی کە بە پێغەمەری دابوو ـ ﷺ ـ مەشغووڵ بوو ، چوە لای ئەبونائیلە کە سلکی کوڕی سەلامەیە ـ کە برای شیریی کەعب بووـ و ، لای عوببادی کوڕی بیشرو ، حەرثی کوڕی ئەوس و ، ئەبو عەبسی کوڕی جەبر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ خەبەری دانێ کە وەعدەی داوە بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە کەعبی کوڕی ئەشرەف بکوژێ ، موافەقەیان کرد . فەرموویان : هەموومان ئەیکوژین . لە پاشا هاتنە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیان کرد : (یا رسول الله) لازمە کە شتێك بڵێین لە (علیه) تۆ . فەرمووی : گەردنتان ئازاد بێ هەرچی ئەڵێن بیڵێن .]

محەمەدی کوڕی مەسلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوە لای کەعب

---

(١) یانی سزای خواو پێغەمەری داوە . مانای وا نی یە دەستەڵاتی هەبوە بەسەر سزادانی خوادا ، بەڵکو مانای وایە بەدڕەوشتی ی بەرانبەری خواو فەرمانەکانی خوا کردوەو کارێکی وای کردوە کە خودا پێی ناخۆشە .

وتی : ئەم پیاوە داوای صەدەقەمان لێ ئەکا [ئێمەیش خۆمان هیچمان نی‌یە بیخۆین] ئێمەی زۆر خستۆتە ئەذیەت و مەشەقەتەوە ، هاتوومە لات کە قەرزێکت لێ بکەم . کەعب وتی : وەڵلاهی زۆر لێی ئەبێزرێن . = محەمەدی کوڕی = مەسلەمە ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئێمە تابیعی بووین حەز ناکەین کە وازی لێ بێنین تا بزانین ئیشی بە چی ئەگا . ئیستە ئیرادەمان ئەمەیە کە ویسقێ یا دوو وەسق خورمامان بە قەرز بدەیتێ . =[1] راویی ئەڵێ : عەمر چەند جار ئەم حەدیثەی بۆ گێراوینەتەوە ، بەڵام باسی ویسقێك و دوو ویسقی نەدەکرد . منیش پێم وت : ئایا ویسقێك و دوو ویسقی تیا نی‌یە ؟ وتی : وابزانم ویسقێك و دوو ویسقی تیایە = کەعب وتی : بەڵێ ئەتانئەمێ ، ئەمما رەهنم لا دابنێن . فەرموویان : چیت بە رەهن ئەوێ ؟ وتی : ژنەکانتانم بە رەهن بدەنێ ! فەرموویان : چۆن ژنەکانمانت بە رەهن ئەدەینێ کە تۆ جوانترینی هەموو عەرەبی ؟ ! کەعب وتی : کورەکانتانم بدەنێ بە رەهن ! فەرمووی : چۆن کورەکانمانت ئەدەینێ بە رەهن لە پاشا جوێن بە یەکێکیان بدرێ پێیان ئەڵێن : تۆ رەهنی ویسقێ یا دوو ویسقی ؟ ! ئەوەمان پێ عارە ! ئەمما سیلاحەکانمانت بە رەهن ئەدەینێ . وەعدەی دایێ کە بچێتەوە لای بیباتێ . شەو لەگەڵ ئەبونائیلەدا ـ کە شیربرای کەعبە ـ چۆوە لای بانگی کردن بۆ قەڵاکە ، خۆی چوە خوارێ لایان ، ژنەکەی وتی : لەم ساعەتەدا بۆ کوێ ئەچیت ؟ وتی : بۆ ئەوانە کێن ؟ : محەمەدی کوڕی مەسلەمەو شیربراکەم ئەبو نائیلەیە .

---

(١) ئەمە لە عەرەبی‌یەکەیشدا لەبیرکرابوو ، خستمەوە جێی خۆیی و لێرەدا تەرجەمەم کرد .

غەيری عەمری كوڕی دينار ئەفەرموێ : ژنەكەی وتی : دەنگێك ئەبيێم كە خوێنی لێ ئەتكێ ! وتی : بۆ كێن ؟ محەمەدی كوڕی مەسلەمەی برامەو ئەبو نائيلەی شيربرامە ! پياوی كەريم ئەوەيە ئەگەر بەشەو بانگ بكرێ تا بە شيرو رم لێی بدرێ خۆی ناگرێو ئەچێ !

راويی ئەفەرموێ : محەمەدی كوڕی مەسلەمە - رضي الله تعالى عنه - دوو پياوی بردە ناو قەڵاكەوە . لە سوفيانيان پرسی : عەمری كوڕی دينار فەرمووی : ئەو پياوانە كێن ؟ فەرمووی : ناوی بەعزێكی بردن . غەيری عەمر فەرموويانە : ئەبو عەبسی كوڕی جەبرو ، حەرثی كوڕی ئەوس و ، عەببادی كوڕی بيشر بوون .

عەمر فەرمووی : دووپياوی لەگەڵ خۆی برد ، پێی فەرموون : كە كەعب هات من مووی سەری ئەگرم بۆنی ئەكەم ، كەديتان كە بە تەواويی سەرم توند گرت ئێوە بە شير لێی بدەن . دەفعەيێكی تر عەمر وای فەرموو : بە ئێوەيشی بۆن ئەكەم . كەعب لە قەڵاكەی هاتەخوارێ لايان جلی جوانی لەبەرابوو ، بۆنی خۆشی لێ ئەهات . محەمەدی كوڕی مەسلەمە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : بۆنی وەك بۆنی ئيمرۆ خۆشم نەديوە . كەعب وتی : بۆن خۆش و ، موعەطەرترين و بە كەماڵ و جوانترينی عەرەبم لە لايە . محەمەدی كوڕی مەسلەمە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : ئيذنم ئەدەی كە سەرت بۆن بكەم ؟ وتی : بەڵێ . عەمر بۆنی كردو بە رەفيقەكانيشی بۆن كرد . لە دواييدا پێی وتەوە : ئيذنم ئەدەی كە ديسان بۆنی بكەم ؟ وتی : بەڵێ . كە تەواو توند سەری گرت بە رەفيقەكانی فەرموو : دەی لێيدەن ! كوشتيان و هاتنەوە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزيان كرد [كە كوشتمان] .

# کوشتنی ئەبو رافیع

قتل أبي رافع عبدالله بن أبي الحقيق . ويقال سلّام بن أبي الحقيق كان بخيبر ، ويقال : كان في حصن له بأرض الحجاز . وقال الزهري : هو بعد قتل كعب بن الأشرف [قال ابن سعد : في رمضان سنة ست . وقيل غير ذلك . . . ] ح - ٦/٢٧٥ .

تەرجەمە :

ئەبورافیعی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبولحەقیق ، یا ناوی سەلـلامی کوڕی ئەبولحەقیق بوو لە خەیبەرا ، یا لە قـەلاّییّکی خۆیـا لە ئـەرزی حیجاز ، لە دوای کەعبی کوڕی ئەشرەف کوژرا (زهری) [ئیبن وسەعد ئەفەرموێ : لە رەمەزانی ساڵی شەشەما کوژرا . بەعزێ غەیری ئەوەیان وتوە . ]

١٣٤٨/٢٩ عن البراء بن عازب - رضي الله تعالى عنهما - قال : بعث رسول الله - ﷺ - رهطا [مادون العشرة ، منهم عبدالله بن عتيك الأنصاري] إلى أبي رافع ، فدخل عليه عبدالله بن عتيك بيته ليلا وهو نائم فقتله . ح - ٦/٢٧٥ (مختصر الحديث الآتي) .

١٣٤٨/٢٩ [1]عن البراء بن عازب - رضي الله تعالى عنهما - قال : بعث رسول الله - ﷺ - إلى أبي رافع اليهودي رجالا من الأنصار ، فأمّر عليهم عبدالله بن عتيك - رضي الله تعالى عنه - وكان أبو رافع يؤذي رسول الله - ﷺ - ويعين عليه [وهو الذي حزّب الأحزاب يوم الخندق] وكان في حصن له بأرض الحجاز ، فلما دنوا منه وقد غربت الشمس ، وراح الناس بسَرْحهم ، فقال عبدالله لأصحابه : إجلسوا مكانكم فإني

---

(١) دانـەر - خ - ئەم ژمـارەی دووجار نـووسیوە . رەنگـە لەبـەر ئەوەبێ کـە حەدیثەکان وەك یەك وان ، وەك خۆی ئیشارەی بۆ کردوە .

منطلق ومتلطف للبواب لعلي أن أدخل. فأقبل حتى دنا من الباب ، ثم تقنّع بثوبه كأنه يقضي حاجته ، وقد دخل الناس ، فهتف به البواب : يا عبدَ الله إن كنت تريد أن تدخل فادْخُلْ ، فإني أريد أن أغلِّقَ الباب . فدخلت ، فكَمَنْت ، فلما دخل الناس أغلق الباب ، ثم علّق الأغاليق [المفاتيح] على وتِدٍ . قال : فقمت إلى الأغاليق [أي المفاتيح] فأخذتها ففتحت الباب ، وكان أبو رافع يُسْمَر عنده [يُتَحدث عنده ليلا] وكان في علاليَ [جمع عُلَيَّة ، أي غرفة] .

فلما ذهب عنه أهل سمره صعدت إليه ، فجعلت كلما فتحت بابا أغلقت عليّ من داخل ، قلت : إنِ القوم نُذِروا [علموا] بي لم يَخْلصوا إليَّ حتى أقتله ، فانتهيت إليه ، فإذا هو في بيت مظلم وَسْط عياله لا أدري أين هو من البيت . فقلت : أبا رافع ! فقال : من هذا ؟ فأهويت نحو الصوت فأضربه ضربة بالسيف ، وأنا دَهيش ، فما أغنيت شيئا . وصاح فخرجت من البيت فأمكث غير بعيد [قليلا] ثم دخلت إليه فقلت : ما هذا الصوت يا أبا رافع ؟ فقال : لِأمِّك الويلُ ! [دايك واويلات بوّ بكا] إن رجلا في البيت ضربني قبل بالسيف . قال : فأضربه ضربة أثخنته [بالغت في جراحته] ولم أقتله ، ثم وضعت ظُبَة السيف [أي حدّه] في بطنه حتى أخذ في ظهره فعرفت أني قتلته . فجعلت أفتح الأبواب بابا ، بابا . حتى انتهيت إلى درجة له فوضعت رجلي وأنا أُري أني قد انتهيت إلى الأرض ، فوقعت في لية مقمرة ، فانكسرت ساقي فعصَبْتها بعمامة ثم انطلقت حتى جلست على الباب ، فقلت : لا أخرج الليلة حتى أعلم أقتلته ؟ فلما صاح الديك قام الناعي على السُّور ، فقال : أنعىٰ أبا رافع تاجر أهل الحجاز ، فانطلقت إلى أصحابي فقلت : النجاء . فقد قتل الله أبا رافع فانتهيت إلىٰ النبي ـ ﷺ ـ فحدثته فقال لي : ابسط

رجلك ، فبسطت رجلي . فمسحها ، فكأنها لم أشتكها قط . ح - ٢٧٥/٦ .

١٣٤٩/٣٠ البراء - رضي الله تعالى عنه - قال : بعث رسول الله - ﷺ - إلى أبي رافع عبدالله بن عتيك وعبدالله ابن عتبة في ناس معهم [مسعود بن سنان الأسلمي ، عبدالله بن أنيس الجُهَني،أبو قتادة الأنصاري ، فأرسل رسول الله - ﷺ - خزاعي بن الأسود الأسلمي - رضي الله تعالى عنهم - ] فانطلقوا حتى دنوا من الحصن ، فقال لهم عبدالله بن عتيك : امكثوا أنتم حتى أنطلق أنا فأنظر . قال : فتلطّفت أن أدخل الحصن ، ففقَدوا حمارا لهم ، قال فخرجوا بقَبَس يطلبونه ، قال : فخشيت أن أعرف ، فغطيت رأسي ورجلي كأني أقضي حاجة ، ثم نادى صاحب الباب : من أراد أن يدخل فليدخل قبل أن أُغلِقَه ، فدخلت ، ثم اختبأت في مربط حمار عند باب الحصن ، فتعشّوا عند أبي رافع ، وتحدثوا حتى ذهبت ساعة من الليل ، ثم رجعوا إلى بيوتهم . فلما هدأت الأصوات [سكَنَت] ولا أسمع حركة خرجت .

قال : ورأيت صاحب الباب حيث وضع مفتاح الحصن في كوة ، فأخذته ، ففتحت به باب الحصن . قال : قلت : إن نَذِر بي القوم . إنطلقت على مَهَل . ثم عَمَدت إلى أبواب بيوتهم فغلقتها عليهم من ظاهر ، ثم صعدت إلى أبي رافع في سُلَّم ، فإذا البيت مظلم قد طُفِئَ سراجه ، فلم أدْر أين الرجل ، فقلت : يا أبا رافع ! قال : من هذا ؟ قال : فعمدت نحو الصوت فأضربه ، وصاح فلم تغْن شيئا . قال : ثم جئت كأني أُغيثه ، فقلت : ما لك يا أبا رافع ؟ وغيرت صوتي . فقال : ألا أعجبك ؟ لِأُمِّك الويل ! دخل عليَّ رجل فضربني بالسيف ، قال : فعمدت له أيضا فأضربه أخرى . فلم تغن شيئا ، فصاح وقام أهله .

[وعنـد ابن إسحاق : فصـاحت إمرأتـه فنوهت بنـا ، [فرفعت صوتها] فجعلنا نرفع السيف عنها . ثم نذكر نهي النبي - ﷺ - عن قتل النساء فنكف عنها] . قال : ثم جئت وغيرت صوتي كهيئة المغيث ، فإذا هو مستلق على ظهره ، فأضع السيف في بطنه ، ثم أنكَفئُ [انقلب] عليه حتى سمعت صوت العظم . ثم خرجت دَهِشا حتى أتيت السُّلَّم أُريد أن أنزل ، فأسقط منه ، فانخلعت رجلي ، فعصبتها ، ثم أتيت أصحـابي أَحْجُل ، فقلت : إنطلقوا فبشروا رسول الله - ﷺ - فإني لا أبرح حتى أسمع الناعية ، فلما كان في وجه الصبح ، صعد الناعية ، فقال : أنعىٰ أبا رافع . قال : فقمت أمشي ما بي قَلَبة ، فأدركت أصحابي قبل أن يأتوا النبي - ﷺ - فبشرته . ح - ٦/٢٧٨ .

تەرجەمە :

ئەم دوو حەدیثە هەر حادیثەییکن ، لە بەعزیٚ ئەلفاظا فـەرقیان هەیە بۆییکم نووسیون .

ئەبورافیع جوولەکەی خەیبەر بوە ، لە خەیبەرا ، یا لە قەلاٚییکی خۆیا ئـەبیٚ لە ئـەرزی حیجاز ، پیٚغـەمەر - ﷺ - عـەبدوڵـلاٚی کوڕی عەتیکی لەگەڵ چەند کەسیٚ لە ئەصحابی ئەنیٚریٚتە سەر ، بە شـەو لە وەختیٚکا کە نوستبوو ئـەیکوژیٚ . زوهـری - رحمه الله - ئـەفەرمـویٚ : کوشتنی ئەو لە دوای کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف بوە . ئیبن وسەعد ئەفەرمویٚ : لە رەمەزانی ساڵی شەشا بوو .

زۆر ئیذای پیٚغەمەری کردوە - ﷺ - . ئەو ئەحزابی کۆکردۆتەوە کە موحاصەرەی مەدینەیان دا لە رۆژی خەندەقا . کە وابیٚ ئەبیٚ لـە دوای خەندەق بووبیٚ ، لە پیٚش فەتحی خەیبەرا .

کەیفییەتی قەتلەکەی وابوە :

بەرای کوڕی عازیب - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك و عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی لەگەڵ چەند کەسێکا [کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەنیس و ، مەسعوودی کوڕی سینان و ، ئەبوقەتادەی سوارچاکی پێغەمەر - ﷺ -و خوزاعای کوڕی ئەسوەدن] ناردەسەر ئەبو رافیع کە بیکوژن . تەشریفیان لێیان‌دا ڕۆیین تا لە قەڵاکە نزیك بوونەوە [ڕۆژئاوا بووبوو خەڵق حەیوانیان هێنابوەوە] .

عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك بە ڕەفیقەکانی فەرموو : ئێوە لێرە بوەستن تا تێفکرم شتێکی وا بکەم کە بچمە قەڵاکەوە ، ئەهلی قەڵاکە کەرێکیان لێ ون‌بووبوو ، بە دەستەچراوە بۆی ئەگەڕان ، لەوە ترسام کە بناسرێم ، سەرو پێی خۆم داپۆشیی وەك قەضای حاجەت بکەم . لە پاشا دەرگاوانەکە بانگی کرد کێ ئێتە ژووری لە پێش ئەمەدا دەرگاکە دابخەم بێت . [لە ریوایەتەکەی ترا بانگی کردم : ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر ێیتەژووری وەرە وا دەرگا دائەخەم . چوومە ژووری . کە خەڵق هەموو چوونە ژووری دەگارکەی داخست و کلیلەکانی بە سنگێکا هەڵاوەسی] چوومە ژووری ، لە تەویلەییکا کە کەریان تیا ئەبەستەوە لای دەرگای قەڵاکەوە خۆم شاردەوە . خەڵق لای ئەبورافیع شێویان کردو قسەیان کرد تا ساعەتێ لەشەو رابورد . لە پاشا چوونەوە بۆ ماڵی خۆیان ، کە دەنگ براو هیچ هاتوچۆکەر نەما ، لە تەویلەکە چوومە دەرێ ، چاوم لە دەرکەوانەکە بوو کە کلیلەکانی لە کوێ دانابوو ، لە تاقێکا دایناببوون ، کلیلەکانم برد دەرکی قەڵاکەم کردەوە ، وتم : ئەگەر پێیان‌زانیم گورج بچمە دەرێ . لە دوایی‌دا چووم بە لای دەرگای هۆدەکانەوە ، لە دەرەوە هەمووم لەسەر داخستن ، لە دوایی‌دا بە پەیژەیێکا سەرکەوتم بۆ لای ئەبورافیع .

[له رایوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : لە هەر دەرگاییـك ئەچـوومە ژووریێ لە ناوەوە دەرگاکەم دائەخست ، وتم : ئەگەر پێم بزانن رێیان نەبێ بێنەسەرم] . کە گەییمە ئەو هۆدە کە ئەبورافیعی تیابوو تاریك بوو ؛ چرای کوژرابوەوە ، نەمزانی کە لە کوێوەیە ، وتم : ئەی ئەبـورافیع . وتی : ئەوە کێیە ؟ عەبدوللا ئەفەرموێ : چووم بۆ لای دەنگـەکەوە ، شیرێکم پیاکێشاو هاواری‌کرد ، شیرەکەم بێ‌فایدە بوو ، چووم بەلایەوە وەك بە هاواریەوە بچم ، دەنگی خۆم گۆری‌و وتم : چی بوو ئەی ئەبو رافیع ؟ وتی : دایك واوەیلات بۆ بکا ! بۆ نازانی پیاوێك هاتۆتە سەرم بە شیر لێیدام ؟ فەرمووی : دیسان چووم بەلایەوە ، شیرێکی ترم پیاکێشا ئەویش بێ فایدە بوو . [لە ریوایەتەکەی ترا ئەڵێ : بەو شیـرە برینێکی کاری‌گەرم لێ‌کردو نەمکوشت] .

هـاواری‌کردو ژنـەکەی خـەبەری بـوەوە [ئیبن‌و ئیسحاق ئەڵێ : ژنەکەی هاواری‌کردو بە ناوی ئێمەوە = دەنگی = بەرزکردەوە ، ئێمەیش شیرمان بۆ هەڵبری کە لێی بدەین لـە پاشـان فکری ئـەوەمان کردەوە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەهی کردوە لە ژن‌کوشتن . . لـەبەر ئـەوە دەخلمان نەدەکرد] .

فەرمووی : لە پاشا چووم بەلایەوە دەنگی خـۆم گۆری وەکـوو بـەهاوارەوەچـوو کەچی لـەسەر پشت راکشـابوو، نـووکی شیرەکـەم نایەسەر ورگی‌و بەسەریاوەرسووڕام تا گوێم لە دەنگی ئێسقانی پشتی بوو کە ئەشکا ، لە پاشا بە ترسەوە چوومە دەرێ تا گەیمە لای پەییژەکە تا بچمە خوارێ [لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : نووکی شیرەکەم لەسەر زگی دانا تا لە پشتیەوە چوەدەرێ ، ئیتر زانیم کە کوشتوومە ، دەرگاکانم یەکەیەکە کـردەوە تا گـەییمە لای پـەییژەکـە ، پێم‌داناو لام وابـوو کە

گەییمەوە ئەرزی ، لە شەوێکی مانگەشەوا کەوتمە خوارێ و پێم شکا . بە سەرپێچێ بەستم و چوومە لای دەرگاکەوە دانیشتم و وتم ئیمشەو ناچمە دەرێ تا تێگەم کە کوشتوومە یان نا ؟ کە کەڵەشێر خوێنی خەبەردەر چوە سەر دیواری شوورەکەو بانگی کرد : کە خەبەری کوژرانی ئەبورافیعی تاجیری حیجازتان ئەدەمێ . ئەو وەختە چوومە لای رەفیقەکانم وتم : نەجاتی خۆتان بدەن خوا ئەبو رافیعی کوشت . گەییمە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - کەیفییەتەکەم عەرزکرد . فەرمووی : قاچت راکێشە ، قاچم راکێشا دەستی موبارەکی پیاهێنا = چاك بووەوە = وەك هیچ ئازاری نەبووبێ] . لە پەیژەکە کەوتمە خوارێ قاچم لە جێ چوو ، بە پارچە پەرۆیێ بەستم ، لە پاشا بە شەلەشەل هاتمە لای رەفیقەکانم وتم : ئێوە بچن موژدە بەرن بۆ پێغەمەر - ﷺ - من لێرە نابزووم تا دەنگی خەبەردەر ئەبیێم.کە.وەختی سبەینێ بوو خەبەردەر سەرکەوت و خەبەری دا کە ئەبو رافیع کوژراوە .

ئیبن و عەتیك ئەفەرموێ : هەڵسام هیچ لەنجەم نەبوو ، لە پێش ئەوەدا کە رەفیقەکانم بگەنە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - پێیان گەییم و لە پێش ئەوانا موژدەم دا بە پێغەمەر - ﷺ - ئەم حەدیثە موعجیزەیە بۆ پێغەمەر - ﷺ - .

# غزوة أحـد

فيها آيات من آل عمران ﴿وإذ غدوت . . .﴾[1]

٣١/١٣٥٠ عن البراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لقينا المشركـين يومئذ [يوم أحد ، وكان المشركون ثلاثة آلاف ، ومعهم مائتا فارس ؛ وجعلوا على الميمنة خالد بن الوليد ، وعلى الميسرة عكرمة بن أبي جهل ؛ وعلى الخيل صفوان بن أمية ، أو عمرو بن العاص ، وعلى الرماة عبدالله بن ربيعة ، وكان فيهم مائة رام ، وكان المسلمون مع رسول الله ـ ﷺ ـ سبعمائة وفـرسه ـ عليـه الصلاة والسـلام ـ وفرس أبي بـردة بن نيار] وأجلس النبي ـ ﷺ ـ جيشا من الرماة [خمسين] وأمّر عليهم عبدالله [بن جبير] وقال : لاتبرحوا إن رأيتمونا ظهرنا عليهم فـلا تبرحـوا ، وإن رأيتموهم ظهروا علينا فلا تعينونا .

[وعند ابن إسحاق فقال : إنضح الخيل عنا بالنَّبل لا يأتوننا من خلفنا ، إن كانت لنا أو علينا فاثبت مكانك]

[وفي رواية زهير في الجهاد : حتى أرسل إليكم . وعند ابن سعد في الطبقات وكان أول من أنشب الحرب بينهم أبو عامر الفاسق : طلع في خمسين من قومه ، فنادى : أنا أبو عامر . فقال المسلمون : لا مرحبا بك ولا أهلا يا فاسق . فقال : لقد أصاب قومي بعدي شر ! ومعه عبيـد قريش ؛ فتراموا بالحجارة هم والمسلمون حتى ولّى أبو عامر وأصحابه . وجعل نساء المشركين يضربن بالدفوف والغرابيل ويحرِّضْن ويذكِّرنهم قتلى بدر ، ويقلن :

---

(١) آل عمران / ١٢١ .

نحن بِنات طارق          نمشي على النمارق
إن تُقبلِوا نعانق          او تدبروا نفارق
فراق غير وامق]

فلما لقينا هربوا حتى رأيت النساء يشتددن في الجبل يـرفعن عن سوقهن ، قد بدت خلاخلهن .

[ولابن عساكر : لقيناهم ، وجعل الرماة يرشقون خيلهم بالنَّبل ،فتولَّوا هوارب ، فصاح طلحة بن أبي طلحة ، صاحب اللواء : من يبارز ؟ فبرز له علي بن أبي طالب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فالتقيا بين الصفين ، فبدره علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ فضربه على رأسه حتى فلق هامته ، فوقع وهو كبش الكتيبة ، فسُرَّ رسول الله ـ ﷺ ـ بذلك وأظهر التكبير ، وكبر المسلمون ، وشددوا على كتائب المشركين يضربونهم حتى نقضت صفوفهم ، ثم حمل لواءهم عثمان بن أبي طلحة أبو شيبة ، وهو أمام النسوة يرتجز ويقول :

إن على أهل اللواء حقا
أن تخضب الصعدة أو تندقا

وحمل عليه حمزة بن عبدالمطلب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فضربه بالسيف على كاهله فقطع يده وكتفه حتى انتهى إلى مؤتزره ـوسطه ـ وبدا سَحْره ـ وسط صدره ـ ثم حمله أبو سعيد بن أبي طلحة ؛ فرماه سعد بن أبي وقاص فأصاب حنجرته فأدلع لسانه إدلاع الكلب فقتله . ثم حمله مسافع بن طلحة بن أبي طلحة فرماه عاصم بن ثابت ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقتله . ثم حمله الحرث بن طلحة بن أبي طلحة فرماه عاصم بن ثابت ـ أيضا ـ فقتله . ثم حمله كلاب بن أبي طلحة فقتله الزبير بن العوّام ـ رضي الله تعالى عنه ـ . ثم حمله الجلاس بن طلحة فقتله طلحة بن عبيد

الله . ثم حمله أرطاة بن شرحبيل فقتله علي بن أبي طالب - رضي الله تعالى عنه - . ثم حمله شريح بن قارظ فقتل . ثم حمله صوّاب غلامهم قتله سعد بن أبي وقاص ، أو علي بن أبي طالب ، أو قزمان - رضي الله تعالى عنهم - فهربوا . . . الخ] .

فأخذوا يقولون : الغنيمة ، الغنيمة ! فقال عبدالله بن جبير : عهد إليّ النبيُّ - ﷺ - أن لا تبرحوا فأبوا ، فلما أبوا صرف وجوههم . [تحيّروا فلم يدروا أين يذهبون . ونظر خالد بن الوليد إلى خلاء الجبل وقلّةِ أهله فكرَّ بالخيل ، وتبعه عكرمة بن أبي جهل ، وحملوا على من بقي من الرماة فقتلوهم ، وقتل أميرهم عبدالله بن جبير - رضي الله تعالى عنهم - وانتقضت صفوف المسلمين ، واستدارت رحاهم ، وحالت الريح فصارت دبورا ، وكانت قبل ذلك صبا . ونادى إبليس - لعنه الله - : إن محمدا قد قتل ، واختلط المسلمون ، فصاروا يقتلون على غير شعار ، ويضرب بعضهم بعضا] فأصيب سبعون قتيلا . [وثبت رسول الله - ﷺ - ما زال يرمي عن قوسه حتى صارت شظايا ، ويرمي بالحجر ، وثبت معه عصابة من أصحابه أربعة عشر رجلا : سبعة من المهاجرين ، وسبعة من الأنصار . وأصيب رسول الله - ﷺ - و أصيبت رباعيته ، وكلمت شفته][1] .

(١) دانەر ـ خ ـ لەو شوێنانەدا کە لە قەسطەلانی وەرگرتوون لێی کورت کردوونەتەوە . بۆ نموونە ئەم شوێنە وەك قەسطەلانی یەکە دەنووسمەوە :

«. . . سبعة من المهاجرين ، منهم أبو بكر الصديق ، وسبعة من الأنصار ، وكان يوم بلاءوتمحيص، أكرم الله فيه من أكرم من المسلمين بالشهادة . . .»

وأشـرف أبو سفيـان فقال : أفي القـوم محمد ؟ ـ ﷺ ـ فقـال : لاتجيبوه . فقال : أفي القوم إبن أبي قحافة ؟ ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لاتجيبوه . فقال : أفي القوم ابن الخطاب ؟ فقال : إنَّ هؤلاء قتلوا ، فلو كانوا أحياء لأجابوا . فلم يملك عمر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ نفسـه ، فقال : كذبت يا عدو الله أبقى الله عليك ما يَحزنُك [يُخْزيك] قـال أبو سفيان أُعل هبل . فقال النبي ـ ﷺ ـ : أجيبوه . قالـوا : ما نقـول ؟ قال : قولوا : الله أعلىٰ وأجلّ . قال أبو سفيان : لنا العُزّىٰ ولا عزّىٰ لكم . فقال النبي ـ ﷺ ـ : أجيبوه . قالوا : ما نقول ؟ قال : قولوا : الله مولانا ولا مولى لكم . قال أبو سفيان : يوم بيوم بـدر ، والحرب سجال [نُوَب] وتجدون مثلة لم آمر بها ، ولم تسؤني ! ح ـ ٦/ ٢٨٠ .

[عن صالح بن كيسان قال : خـرجت هند والنسـوة معها يمثلن بالقتلىٰ من أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ : يجـدعن الآذان والأنوف حتى اتخذت هند من ذلك خدما وقلائد ، وأعطت خدمها وقلائدها وقرطها اللاتي كن عليها لوحشيّ جزاء له على قتله حمزة ، وبقرت عن كبد حمزة ، فلاكتها فلم تسغها ، فلفظتها ! ثم علت على صخرة مشرفة ، فصرخت بأعلى صوتها ، فقالت :

نحن جزيناكم بيوم بدر
والحرب بعد الحرب ذات سعر
ما كان عن عتبة لي من صبر
ولا أخي ، وعمه ، وبكر
شفيت نفسي ، وقضيت نذري
شفيت وحشي غليل صدري

فشكر وحشي علي عمري
حتى ترم أعظمي في قبري ؟]
= قسطلاني ٢٨٢ =

[في طبقات إبن سعد عن عمير بن إسحاق قال : كان حمـزة بن عبدالمطلب يقاتل بين يدي رسول الله ـ ﷺ ـ يوم أحد بسيفين ، ويقول : أنا أسد الله ، وجعل يقبل ويدبر ، فبينما ، هو كذلك إذ عثر عثرة فوقع على ظهره ، وبصر به الأسود فزرقه بحربة فقتله . وفيها ـ أيضا ـ أن هندا لما لاكتْ كبده ولم تستطع أكلها قال ـ ﷺ ـ : أأكلتْ منها شيئا ؟ قالوا : لا ، قال : ما كان الله ليدخـل شيئا من حمـزة النار] قسـطلاني ٢٩٦/٦ .

هذه الرواية ـ إن صحت ـ تدل على أن هندا من أهل النار . رشيد بابان .

تەرجەمە :

بەراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : [رۆژی ئوحود] لەگەڵ موشریکا گەیین بەیەك [ئەوان سێ هەزار پیاو بوون و دووصەد سواریان لـەگەڵ بـوو ، خالیـدی کوڕی وەلیـدیان کـرد بە رەئیسی لـەشکـری دەستەڕاست ، عەکرەمەی کوڕی ئەبـوجەهلیـان کرد بـە سەرکـردەی لەشکری دەستەچەپ ، صەفوانی کوڕی ئومەییەیـان ، وە یا عەمـری کـوڕی عاصیـان ، کرد بـە سەرکـردەی سوارە ، عـەبدوڵـڵای کوڕی رەبیعەیان کرد بە رەئیسی تیرانداز ؛ صەد تیرانـدازیان تیـا بوو . ئـەو موسوڵمانانەی لە خزمەت پێغەمەرا بوون ـ ﷺ ـ ورضي عنهم ـ حەوصەد بوون . دوو ئەسپیان بوو : یەکێکی ئەسپی پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ یەکێکی ئەسپی ئەبوبوردەی کوڕی (نیار) بوو !]

پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەشکرێکی پەنجاکەسیی لە تیرانداز دامەزران . عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری ـ رضي الله تعالى عنه ـ کرد بە سەرکردەیان ، ئەمری پێ فەرموون : لە جێی خۆتان مەبزوون ئەگەر بە غاڵبمان ببین هەر مەبزوون ، ئەگەر ئەوان غاڵب بوون هەر مەبزوونو یاریەمان مەدەن . [هەر بە تیر سوارەکانمان لێ دووربخەنەوە لە پشتەوە نەیێنە سەرمان . لە (لە) مان یا لە (علیە) مان بێ هیچ مەبزوون ، لە جێی خۆتان ثابت ببن تا خۆم ئەنێرم بە دواتانا . لە طەبەقاتی ئیبن وسەعدا ئەفەرموێ : ئەووەڵ کەسێ کە حەربی لە بەینا هەڵگیرسان ئەبوعامیری فاسق بوو ؛ لە قەومەکەی لەگەڵ بیست کەسا هات ، بانگی کرد : من ئەبوعامیرم . موسوڵمانان جوابیان دایەوە : مەرحەبات لێ نەبێ ، بە ملی شکاو بێی ئەی فاسق ! ئەو فاسقە وتی : لە پاش من قەومەکەم تووشی شەڕ بوون یەعنی لە بەدرا . عەبیدی قورەیشی لەگەڵا بوو ، لەگەڵ موسوڵمانانا دەستیان کرد بە بەرد لە یەك گرتن تا ئەبوعامیرو رەفیقەکانی پشتیان هەڵکرد . ژنی موشریکەکان بە دەف لێدانو بە کەلەبێژنگ لێدان تەرغیبو تەشویقیان ئەکردن لەسەر حەربو ، ئەوانەیان ئەخستنەوە بیر کە لە بەدرا کوژرابوون ؟ ئەیانوت : ئێمە کچی ئەستێرەو زەهرەین . بەسەر فەرشی ئاوریشمینا ئەڕۆین . ئەگەر روو بکەنە دوشمن شەو دەستەملانتان ئەبین . ئەگەر پشت هەڵبکەنو هەڕا بکەن لێتان جوێ ئەبینەوە وەك کەسێ کە لە کەسێ جوێ بێتەوە کە هیچ خۆشی ناوێ] کە مولاقاتمان لە گەڵیانا بوو موشریکان هەرایان کرد . بەراء ئەفەرموێ : ژنەکانیان رایان ئەکرد بۆ شاخەکە ، قولیان لێ هەڵکردبوو تا پاوانەکانیان دەرکەوت .

[ئیبن و عەساکیر : بمولاقاتمان لەگەڵیانا بوو تیراندازەکانمان بە تیر

تیره‌بارانی سواره‌کانیانی ئه‌کرد ، پشتیان هه‌ڵکردو هه‌ڕایان کرد . طه‌لحه‌ی کوڕی ئه‌بوطه‌لحه که به‌یباخداریان بوو به‌رانی له‌شکره‌که‌یان بوو ، بانگی کرد موباره‌زه‌ی طه‌له‌ب کرد . ئیمـامی عه‌لی ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ته‌شریفی چوه مه‌یدانی ، له به‌ینی هه‌ردوو صه‌فه‌که‌دا به یه‌ك گه‌یین . ئیمامی عه‌لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ده‌سته‌بردی کردو شیرێکی به ته‌پڵی سه‌ریا کێشا سه‌ری کرد به دوو له‌ته‌وه‌و که‌وت . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌وه مه‌سروور بوو ، به ده‌نگی به‌رز (الله أكبر)ی فه‌رموو موسوڵمانانیش له‌گه‌ڵ ئه‌وا (الله أكبر)یان کردو حه‌مله‌یان بۆ بردن ، خۆیان به موشریکه‌کاناو[1] به‌شیر لێیان ئه‌دان تا صه‌فی موشریکه‌کانیان دڕان ، له پاشا عوثمانی کوڕی ئه‌بوطه‌لحه که باوکی شه‌یبه‌یه له به‌رده‌می ژنه‌کـانیانـه‌وه بوو بـه‌یباخی موشریکه‌کانی هه‌ڵگرت .

ره‌جه‌زی ئه‌خوێنه‌وه‌و ئه‌یوت :

حه‌قه له‌سه‌ر ئه‌وه به‌یباخدار بێ که رمی خوێناویی ببێ تا ئه‌شکێ !

حه‌مزه‌ی مامی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ورضي عنه ـ حه‌مله‌ی بردێ‌و به شیر دای له‌سه‌ر شانی ده‌ستێـك‌و شانێکی تـا هێنایـه جێ به‌نـده‌خوێنی پـه‌ل‌کرد ، سـه‌رسنگی ده‌رکه‌وت ، لـه پاشـا ئه‌بـوسـه‌عیـدی کـوڕی ئه‌بوطه‌لحه به‌یباخه‌که‌یـانی هه‌ڵگـرت ، سه‌عـدی کوڕی ئـه‌بووه‌قـاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ تیرێکی تێ‌گرت له قوڕقوڕاگه‌ی که‌وت وه‌ك چۆن سه‌گ زمان ده‌ره‌کێشێ زمانی پێ‌ده‌رکێشاو کوشتی ، له پاشا مه‌سافیعی کوڕی طه‌لحه‌ی ئه‌بوطه‌لحه به‌یباخه‌که‌ی هه‌ڵگـرتن ، عاصیمی کـوڕی

(١) لێره‌دا له‌بیرچوونێك هه‌یه . ره‌نگه ئاوا بێ : «خۆیان کرد بـه ناو سـوپای موشریکه‌کانا» چونکه ته‌رجه‌مه‌ی لێدانی که‌تائیبه .

ثابیت ـ رضي الله تعالى عنه ـ تیرێکی تێ گرت و کوشتی ، له پاشا حەرثی کوڕی طەلحەی ئەبوطەلحە بەبیاخەکەی هەڵگرتن ، عاصیمی کوڕی ثابیت ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە تیرێ ئەویشی کوشت . له پاشا کیلابی کوڕی ئەبوطەلحە بەبیاخەکەی هەڵگرت ، زوبەیری کوڕی عەووام ـ رضي الله تعالى عنه ـ کوشتی ، له پاشا جەلاسی کوڕی طەلحە بەبیاخەکەی هەڵگرت ، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ کوشتی . له پاشا ئەرطاتی کوڕی شەرحەبیل بەبیاخەکەی هەڵگرت ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ کوشتی ، له پاشا شورەیحی کوڕی قاریظ بەبیاخەکەی هەڵگرتن ئەویش کوژرا ، له پاشا صەووابی غولامیان بەبیاخەکەی هەڵگرتن ، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص یا ئیمامی عەلی یا قەزمان کوشتی ، ئەمجا هەرایان کرد] .

ئەصحابی کیرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ دەستیان پێکرد کە تالان بگرن ، عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ فەرمووم کە لە جێی خۆم نەبزووم بەگوێیان نەکرد ، کە ئیبایان کرد ڕێیان لێ هەڵە بوو نەیان ئەزانی کە روو بکەنە کوێوە و موتەحەییر بوون .

[خالیدی کوڕی وەلید کە شاخی ئوحودی دی خاڵیی بوەو کەسی پێوە نەماوە تەنها عەبدوڵلای کوڕی جوبەیرو هەشت نۆ ئەصحابی تیا ماوە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بەو سوارانە کە لەگەڵیا = بوون = بای دایەوە سەر ئەصحاب ـ رضي الله تعالى عنهم ـ عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهلی شوێن کەوت ، پەلاماری ئەو تیراندازانەیان دا کە لەگەڵ عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنهم ـ مابوونەوە ، هەموویان شەهیدکردن ، صەفی موسوڵمانان دڕیان دا ، ئاشیان وەرگەڕا ، بای صەبایان بوو بە بای

دەبوور ، ئیبلیس - لعنه الله - بانگی کرد کە : محەمەد - علیه الصلاة والسلام - کوژرا ، موسوڵمانان تێکەڵ و پێکەڵ بوون ، سەریان لێ شێوا ، بێ شوعوور یەکتریان ئەکوشت ، بە شیر لە یەکتریان ئەدا ، یەمانی باوکی حوذەیفەیان دەورە دابوو - رضي الله تعالى عنهما - خەریك بوو بیکوژن . هەرچەندە حوذەیفە هاواری کردنێ کە یەمانی باوکمە مەیکوژن گوێیان نەدایێ نیهایەت شەهیدیان کرد ، کە گەیینە پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - لە جێی خۆی ثابت بوو ئەوەندەی تیر هاویتنێ کە ژێی کەوانەکە پارچە پارچە بوو ، ئەمجا بەردی تێ ئەگرتن ، بە قەد چواردە کەسی لە دەور ما . وەك : ئەبوبەکرو ، عومەرو ، عەلی و ، زوبەیرو ، ئەبوطەلحەو سەعدی بنی وەقاص و ، حەمزەو بەعزێ ئەصحابی تر - رضي الله تعالى عن جمیعهم - ] حەفتا کەسیان لێ شەهید کرا [ددانی پێشەوەی پێغەمەر - ﷺ - شەهید کرا ، لێوی موبارەکی بریندار بوو ، لاجانگیان بریندار کرد] .

ئەبو سوفیان چوە جێیەکی بەرز بانگی = کرد = : محەمەدتان لە ناوایە ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : جوابی مەدەنەوە ، لە دواییا ئەبوسوفیان بانگی کرد : کوڕی ئەبو قوحافەتان لە ناوایە ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : جوابی مەدەنەوە . بانگی کرد : (ابن الخطاب) تان لە ناوایە ؟ کە جوابی نەدرایەوە رووی کردە موشریکەکان پێی وتن : ئەمانە کوژراون ، ئەگەر زیندوو بوونایە جوابیان ئەدایەوە ! ئیمامی عومەر شێری خواو پێغەمەر - ﷺ - ورضي عنه - خۆی پێ راگیر نەکرا ، فەرمووی : ئەی دوشمنی خوا درۆت کرد ! ئەوانەی کە مەحزوونت بکاو پێی بتەقی خوا بۆ تۆی هێشتۆتەوە . ئەبوسوفیان بانگی بتەکەی کرد : ئەی هوبەل هەر سەرکەوەو بەرز بە . پێغەمەر - ﷺ - ئەمری

پێ فەرموون : جوابی بدەنەوە . عەرزیان کرد : بڵێین چی ؟ فەرمووی : بڵێن : خوا ـ عز وجل ـ بڵندترو بەقووەتترە [لە هەموو ماسیوای خوا ، چە جای هوبەلی قیتکە بەلی تۆ ؟ !]

ئەبو سوفیان وتی : ئێمە عوززامان هەیە ئێوە عـوززاتان نی‌یـە ! پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : جـوابی بدەنـەوە . عەرزیـان‌کرد : چی بڵێین ؟ فەرمووی = بڵێن = : خوا ـ عز وجل ـ مەولامانەو سەردارمانە ئێوە هیچ مەولاتان نی‌یە . ئەبو سوفیان وتی : ئەم رۆژە بە رۆژی بەدر ، حەرب نەوبە نەوبەیە ؛ گاە ئێمە گاە ئێوە غاڵب ئەبین . لە ناو کوژراوانا ئەبینن‌کە بەعزێ کەس موثلە کراون : لووت‌و گوێیان کراوە ، من ئەمرم پێ نەکردوە ئەمما پێیشم ناخۆش نی‌یە !

[ئیبن‌و ئیسحاق لە صاڵحی کوڕی کـەیسان ریـوایەت ئـەکا کـە هیندی ژنی ئەبوسوفیان . . . ژنە موشریکەکانی برد ، دەستیان کرد بە لووت‌وگوێ‌گردنی شەهیدەکان ـ رضي الله تعالى عنهم ـ . ئەوەندەیان لووت‌و گوێی ئەصحابی کیرام بری پاوانەو ملیوانکەی لێ دروست‌کـرد کردی‌یە پێ‌و ملی [ . . . . . . ] پاوانەو ملیوانکەو گوارەکانی خۆیی دا بە وەحشیی ، جەزای ئەوە کە حەزرەتی حەمزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی شەهید کردبوو . جگەری حەمزەی ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەڵـدڕی خستیە دەمی‌و جویی بۆی قووت نـەچوو ! دەری‌هـاویتەوە لـە دواییدا پەڕی‌یە سەر بەردێکی بەرز ، تا تیا بوو قیرانی ئەم رەجەزەی وت :

ئێمە بە موقابیلی رۆژی بەدر جەزای ئێوەمان دایەوە ، حەربی دوای حەرب گڕی لێ هەڵەستێ ـ چونکی بۆئێنتیقامە ـ لەبەر عوتبەو ، برام‌و ، لە = بەر = مامم‌و بەکر صەبرم نەماوە . لە باقی ئەوانە ـ لعنهم الله ـ ئەو ئەصحابی کیرامە شەهیدکران‌و لە لووت‌و گوێیانم کرد بە پێوەنـدو . .

شیفای دەردی خۆم داو نەذری خۆمم بەجێ هێنا . ئەی وەحشیی تۆ شیفای دەردی سنگمت دا ، لە موددەتی عومرما تا لە قەبرا ئێسکم ئەڕزێ هەر شوکری وەحشیی ئەکەم]

[لە طەبەقاتی ئیبن و سەعدا لە عومەیری کوڕی ئیسحاقەوە ریوایەت ئەکا حەمزەی کوڕی (عبدالمطلب) کە شێری خواو پێغەمەری خوا بوو - عز وجل ، - ﷺ - ورضي عنه - لە رۆژی ئوحودا لە بەردەمی پێغەمەرەوە - ﷺ - بە دوو شیر حەربی ئەکردو ئەیفەرموو : من شێری خوام و بە راستەو چەپەدا شیری ئەوەشان ، لەو وەختەدا پێی هەڵخلیسکاو بەسەر پشتا کەوت . وەحشیی ئەسوەد کە بەو نەوعەی دی نێزەیێکی بۆ هاویت و شەهیدی کرد ، دیسان لە طەبەقاتا ریوایەت ئەکا کە هیند جگەری حەزرەتی حەمزە - رضي الله تعالى عنه - ی جویی و نەیتوانی قووتی بداو ، پێغەمەر - ﷺ - بیستی ، پرسی : هیند لە جگەری حەمزە هیچی خوارد یان نا ؟ عەرزیان کرد : خەیر پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خوا - عز وجل - ئیرادەی نەکردوە کە هیچ جوزئێ لە حەمزە بچێتە ناو ئاگرەوە] .

ئەم ریوایەتی ئیبن و ئیسحاقە - ئەگەر صەحیح بێ و تەئویل هەڵنەگرێ - صەریحە لەوەدا کە هیند ئەچێتە جەهەننەمەوە . . . .

١٣٥١/٣٢ زيد بن ثابت - رضي الله تعالى عنه - قال : لما خرج النبي - ﷺ - [إلى أحد سنة ثلاث] رجع ناس [عبدالله بن أبي مع ثلاثمائة من أصحابه] ممن خرج معه ، وكان أصحاب النبي - ﷺ - فرقتين : فرقة تقول : نقاتلهم [لأنهم منافقون] وفرقة تقول : لا نقاتلهم [لأنهم مسلمون . أي ظاهرا] فنزلت : ﴿فما لكم في المنافقين فئتين * والله

أركسهم [ردهم إلى حكم الكفار] بما كسبوا﴾[1] وقال : إنها طيبة تنفي الذنوب كما تنفي النار خبث الفضة [وقال : إنها . . . الخ حديث آخر ذكره في الحج .] ح ـ ٦/٢٨٥ . م ـ ١٠/٢٥٤ . ليس فيه الجملة الثانية .

ته‌رجه‌مه :

زه‌يدی كوڕی ثابيت ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفی چوو بۆ ئوحود له‌وانه‌ی كه = له = خذمه‌تيا بوون به‌عزێكيان گه‌ڕانه‌وه [كه عه‌بدوڵلای كوڕی ئوبه‌يی موناڤيق بوو له‌گه‌ڵ سێصه‌د ره‌فيقی مونافيقيا] ئه‌صحابی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ بوون به دوو فيرقه : فيرقه‌يێكيان فه‌رموويان : ئه‌مانه مونافيقن حه‌ربيان له‌گه‌ڵ بكه‌ين . به‌عزێكيان فه‌رموويان : به زاهير موسوڵمانن بۆ حه‌ربيان له‌گه‌ڵ بكه‌ين ؟ ئه‌م ئايه‌ته نازڵ بوو كه مه عناى وايه : چيه ئێوه بوون به دوو فيرقه ده‌رحه‌ق مونافيقان ؟ خوا ئه‌وانی له رێی حه‌ق وه‌رگێراوه به واسيطه‌ی ئه‌و گوناهانه‌ی كه به حه‌زو ئاره‌زوو كردوويانه . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌رمووی : مه‌دينه (طيبه) يه پاكه ، وه‌ك مووشه‌ده‌مه[1] چۆن خه‌ڵته‌ی زيو نايێڵێ مه‌دينه‌يش گوناهی ئينسان نايێڵێ .

١٣٥٢/٣٣ عن سعد بن أبي وقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : رأيت رسول الله ـ ﷺ ـ يوم أحد ومعه رجلان : [جبريل ، وميكائيل ـ

(١) النساء / ٨٨ .

(١) له حه‌ديثه‌كه‌دا (النار = ئاگر) وتراوه ، دياره دانه‌ر ـ خ ـ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌يه ئاگر به ته‌نها خۆی زيو پاڵفته ناكات و ده‌بێ كووره‌و مووشه‌ده‌مه‌ی له‌گه‌ڵ بێ ، بۆيه وا ته‌رجه‌مه‌ی كردوه .

عليهما السلام . م] يقاتلان عنه [عن يساره وشماله . م] عليهما ثياب بيض ، كأشد القتال ، ما رأيتهما [قط] قبل ولا بعد . ح ـ ٦/٢٨٦ . م ـ ٩/١٧١ .

تەرجەمە :

سەعدی کوڕی = ئەبو = وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژی ئوحود دوو کەسم دی لیباسی سپی یان لەبەرا بوو ، لای راستو لای چەپی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ شەڕێکی زۆر بە شیددەتیان ئەکرد ، نە لەمەوپێش نە لەوەپاش نەمدیبوون ، ئەو دوو پیاوە حەرزەتی جیبریلو میکائیل = بوون = علیهما السلام ـ .

١٣٥٣/٣٤ عن أبي طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت فيمن تغشاها النعاس يوم أحد حتى سقط سيفي من يدي مرارا : يسقط وآخذه ، ويسقط فآخذه . ح ـ ٦/٢٩١ . فنزل : ﴿ثم أنزل عليكم من بعد الغم أَمَنَةً نعاسا . . . الآيه﴾[1]

تەرجەمە :

ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لەوانە بووم کە لە رۆژی ئوحودا وەنەوز ئەیگرتن ، تا چەند دەفعە شیرم لە دەست کەوتەخوارێ ؛ هەر ئەکەوتو هەڵم ئەگرتەوە ، هەرئەکەوتو هەڵمئەگرتەوە . لە پاشا ئەم ئایەتی ئالیعیمرانە نازڵ بوو : لە پاش ئەمە کە فیرارتان کردو کوشتاری زۆرتان لێکرا خوا ئەمیني لە دوشمنو وەنەوزدانی بۆ ناردن . . . (الآية بطولها) .

١٣٥٤/٣٥ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ : شُجَّ النبي ـ ﷺ ـ يوم

---

(٢) آل عمران / ١٥٤ .

أحد ، فقال : كيف يفلح قوم شَجُّوا نبيهم ؟ فنزلت : ﴿ليس لك من الأمر شيئ . . .﴾[1] ح ـ ٦/٢٩٢ . رواه البخاري معلقا وأحمد ، ت ، ن ، موصولا .

تەرجەمە .

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژی ئوحود پێغەمەر ـ ﷺ ـ سەری موبارەکی بریندار کرا ، فەرمووی : قەومێ کە سەری پێغەمەری خۆیان بشکێنن چۆن نەجاتیان ئەبێ ؟ خوا ـ عز وجل ـ ئەم ئایەتی ئالیعیمرانەی نازڵ فەرموو : ئەی محەمەد تۆ هیچت بە دەست نیە ؛ نە عەفوکردن نە عەذاب . یەعنی ئیتر بۆچ وا ئەڵێی ؟

١٣٥٥/٣٦ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ كان يقول يوم أُحد : أللهم إنك إن تشأ لاتعبد في الأرض م ـ ٧/٣٢٣ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژی ئوحود ئەیفەرموو : یا ڕەببی ئەگەر تۆ ئیرادە بکەی لە ئەرزا عیبادەتت بۆ ناکرێ .

١٣٥٦/٣٧ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ أفرد يوم أُحد في سبعة من الأنصار ورجلين من قريش فلما رهقوه [غشوه] قال : من يردهم عنا وله الجنة ، أو هو رفيقي في الجنة ؟ فتقدم رجل من الأنصار فقاتل حتى قتل ثم رهقوه ـ أيضا ـ فقال : من يردهم عنا وله الجنة ، أو هو رفيقي في الجنة ؟ فتقدم رجل من الأنصار فقاتل حتى قتل فلم يزل كذلك حتى قتل السبعة . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ لصاحبيه : ما أنصفنا أصحابنا م ـ ٧/ ٤٣٠ .

(١) آل عمران / ١٢٨

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە رۆژی ئوحودا لەگەڵ حەوت ئەنصارو دوو قورەیشیا جوێبوونەوە کە دوشمن ئیحاطەیان = دان پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی = : کێ ئەوانەمان لێ دوور ئەخاتەوە موقابیل بەوە بەهەشتی ببێ ، یا فەرمووی : رەفیقی من بێ لە بەهەشتا ؟ یەکێ لە ئەنصار پێش کەوت شەڕی لەگەڵ کردن تا شەهیدکرا . دووبارە موشریکان دەورەی پێغەمەریان ـ ﷺ ـ گرت ، فەرمووی : کێ ئەوانەمان لێ دوور ئەخاتەوە موقابیل بەوە بەهەشتی ببێ ، یا فەرمووی : لە بەهەشتا رەفیقی من بێ ؟ پیاوێ لە ئەنصار پێش کەوت و شەڕی لەگەڵ کردن تا ئەویش شەهید کرا . ئیتر هەر بەم نەوعە تا هەر حەوت ئەنصارەکە شەهید کران . . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە دوو رەفیقە قورەیشی یەکەیی فەرموو : بە ئینصاف موعامەلەمان لەگەڵ ئەو رەفیقانەمان نەکرد ؛ [چونکی قورەیشی یەکان هیچیان بەو ئیشەوە نەچوون] .

١٣٥٧/٣٨ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أن رسول الله ـ ﷺ ـ كسرت رباعيته يوم أحد ، وشُجَّ في رأسه فجعل يسلت الدم [يمسحه] عنه ويقول : كيف يفلح قوم شجُّوا نبيهم وكسروا رباعيته ، وهو يدعوهم إلى الله ؟ ! فأنزل الله ـ تعالى ـ : ﴿ليس لك من الأمر شيءٌ﴾[1] م ـ ٤٣٢/٧

١٣٥٨/٣٩ عن عبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كأني أنظر إلى رسول الله ـ ﷺ ـ يحكي نبيا من الأنبياء ضربه قومه وهو يمسح

---

(١) آل عمران / ١٢٨ .

الدم عن وجهه [ينضح الدم عن جبينه . أخرى م] ويقول : رب اغفر لقومي فإنهم لايعلمون . م ـ ٤٣٢/٧ . ح ـ ٤٣٤/٥ .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ددانی موبارەکی تەنیشتی دوو ددانی پێشەوەی لە ڕۆژی ئوحودا شەهیدکرا ، سەری موبارەکی بریندار کرا ، خوێنی لەسەری ئەسرِی و ئەیفەرموو : چۆن قەومێ نەجاتی ئەبێ کە ددانی پێغەمەریان بشکێنن و سەری بریندار بکەن ، لەو وەختەدا کە ئەو پێغەمەرە قەومەکەی بۆ لای خوا دەعوەت ئەکا ؟ ! خوا ئەو ئایەتەی نازڵ کرد ، فەرمووی : ئەی محەمەد تۆ هیچت بە دەست نی یە : نە عەفو ، نە عەذاب ، چووزانی نەجاتیان نابێ ؟ ـ ئەکثەریان موسوڵمان بوون ـ .

ئیبن و مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەوەم لە پێش چاوە وەك تەماشای بکەم کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ حیکایەتی یەکێ لە پێغەمەرانی ئەفەرموو کە قەومەکەی لێیان دابوو ئەویش خوێنی لە دەم و چاوی ئەسرِی و ئەیفەرموو : خوایا لە قەومەکەم خۆش ببە ؛ چونکی ئەوان جاهیلن نازانن . یەعنی بۆیە لێیان داوم .

١٣٥٩/٤٠ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان رسول الله ـ ﷺ ـ يغزو بأم سليم ونسوة من الأنصار معها إذا غزا ، فيسقين الماء ، ويداوين الجرحىٰ . م ـ ٤٦٤/٧ .

١٣٦٠/٤١ عن أم عطية الأنصارية ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : غزوت مع رسول الله ـ ﷺ ـ سبع غزوات ، أخلفهم في رحالهم ؛ فأصنع لهم الطعام ، وأداوي الجرحى ، وأقوم على المرضى . م ـ ٤٧٢/٧ .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ غەزای بە (أم سليم)و بەعزێ ژنە ئەنصاریی ئەکرد ـ رضي الله تعالى عنهن ـ ئاویان ئەدانێو ، بریندار‌یان تەداوی ئەکرد .

(أم عطيه)ی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : حەوت غەزام لە خذمەت پێغەمەرا کرد ـ ﷺ ـ کە ئەوان غەزایان ئەکرد لە مەنزڵەکەیانا ئەمامەوە طەعامم بۆ دروست ئەکردنو ، بریندارم تەداوی ئەکردو ، خذمەتی نەخۆشم ئەکرد .

١٣٦١/٤٢ عن يزيد بن هرمز ـ رحمه الله تعالى ـ قال : كتب نجدة بن عامر الحروري إلى ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال [فشهدت ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حين قرأ كتابه وحين كتب جوابه . وقال ابن عباس : [فقال ليزيد : أكتب إليه ، فلولا أن يقع في أحموقة ما كتبت إليه . أخرى م] والله لولا أن أرده عن نتن يقع فيه ما كتبت إليه ولا نعمة عين . م اخرى] يسأله عن خمس خلال ، فقال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لولا أن أكتم علما ما كتبت إليه . كتب إليه نجدة : أما بعد : فأخبرني هل كان رسول الله ـ ﷺ ـ .

١ ـ يغزو بالنساء [والعبيد . أخرى] ؟

٢ ـ هل كان يضرب لهن بسهم ؟

٣ ـ وهل كان يقتل الصبيان ؟

٤ ـ ومتى ينقضي يتم اليتيم ؟

٥ ـ وعن الخمس ؛ لمن هو ؟ [وعن ذوى القربى من هم ؟ أخرى]

فكتب إليه ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : كتبت تسألني : هل كان رسول الله يغزو بالنساء [والعبيد . اخرى] ؟ وقد كان يغزو بهن

فيداوين الجرحى ويحذين [أي يُعطَين الرَّضْخَ] من الغنيمة . وأما بسهم فلم يضـرب لهن [أي ولهم] . وإن رسـول الله ـ ﷺ ـ لم يكن يقتـل الصبيان ، فلا تقتل الصبيان [إلا أن تكون تعلم منهم ما علم صاحب موسى عليهما السلام من الغلام الذي قتله . أخرى م] .

وكتبت تسـألني متى ينقضي يتم اليتيم ؟ فلعمري ! إن الـرجـل لتنبت لحيته ، وإنه لضعيف الأخذ لنفسه ضعيف العطاء منها ؛ فإذا اخذ لنفسه من صالح ما يأخذ الناس [وأنه إذا ؛ بلغ النكاح ، وأونس منه رشد ، ودفع اليه ماله . اخرى م] فقد ذهب عنه اليتم .

وكتبت تسـألني عن الخمس لِمَنْ هو ؟ [وسـألت عن سهم ذوى القربى الذي ذكر الله مَنْ هم ؟ اخرى م] وإنا كنا نقول : هو لنا فأبى علينا قـومنا ذاك : [وإنـا كنا نـرى أن قرابـة رسول الله ـ ﷺ ـ هم نحن . أخرى م] م ـ ٧/٤٦٦ ـ ٤٧١ .

تەرجەمە :

یەزیدی کوڕی هورموز ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : نەجدەی کوڕی عـامیری حـەروورپی ـ خاریجی ـ نـووسی بۆ خـزمەت ئیبن وعـەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ یەزید ئەفەرموێ : لای ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ حـازر بووم کـە کاغـەزەکەی نـەجدەی خـوێندەوەو جوابی نووسیەوە ، فەرمووی : وەڵڵا ئەگەر لەوە نەترسامایە کـە کەتمی عیلم ئەکەم [لە ریوایەتێکا : لەوە نەترسامایە کە نەجدە ئەحـمـەقی یەك ئەکا . لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ : لەوە نـەترسـامایـە کە شتێکی پیس و بۆگەن ئەکا] جوابم بۆ نەئەنووسیەوە . نەجدە لە ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ی دەرحەق پێنج شت پرسی :

١ ـ (أما بعد) خەبەرم بدەرێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ژن و عەبدی لە خزمەت

خوّیا ئەبرد بۆ غەزا یان نا ؟

٢ ـ پێ بردنایە لە غەنیمەت سەهمی ئەدانێ یان نا ؟

٣ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە غەزادا منالّی ئەکوشت یان نا ؟

٤ ـ کەی هەتیوێتی هەتیو تەواو ئەبێ ؟

٥ ـ خومس هی کێیە ؟ لە روایەتێکا (ذوي القربى) کە لە قورئانایە کێن ؟

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بۆی نووسی [لە ریوایەتەکەی تریا : ئەمری پێ کردم بۆی بنووسە] : نووسیبووت : لێت ئەپرسم پێغەمەر ـ ﷺ ـ ژنان و عەبدانی ئەبرد بۆ غەزا یان نا ؟ ئەیبردن . بریندااریان تەدوای ئەکرد . لە غەنیمەت بەشی ئەدان ئەمما وەك غەزایی تر سەهمی نەدەدانێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ منالّی نەئەکوشت ، تۆیش مەیانکوژە ، مەگەرەکی تۆیش لەو منالاّنە ئەوە بزانی کە حەزرەتی (خضر) ـ علیه السلام ـ لەو منالّەی زانی کە کوشتی [یەعنی کێ کافر ئەبێ و کامیان موسوڵمان ئەبێ کە گەورە = بوون = لێکیان جوێ بکەیتەوە ئەو وەختە ئەوی کە ئەزانی کە گەورە بوو کافر ئەبێ بیکوژە ، ئەوی کە ئەزانی کە گەورە بوو موسوڵمان ئەبێ مەیکوژە . ئەمما تۆ ئەوە لە کوێ ئەزانی کە حەزرەتی مووسا ـ علیه السلام ـ نەیزانیوە ؟ !]

نووسیبووت : کەی هەتیوێتی هەتیو ئەبڕێتەوە ؟ قەسەم بە بەقای خۆم ! [کە هەر مەعلوومی خوایە . یەعنی قەسەم بە عیلمی خوا !] ئینسان ریشی ئەڕوێ لە ئەخذو عەطادا زەعیفە . کە وەك خەڵقی تر روشدی پەیدا کردو ، باڵغ بوو ، زانی ئەخذو عەطا بکاو ، سەفیهـ نەبێ و ، ماڵی خۆیی تەسلیم کرایەوە . . ئەو وەختە هەتیویی نامێنێ .

نووسیبووت : خومس بە کێ ئـەدرێ [لە ریـوایەتـەکەی تـرا : قەرابەتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ کێن] ؟ ئێمە وامان ئەزانی کە خزمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئێمەین و خومس بە ئێمە ئەدرێ ، ئەمما قەومەکەمان لەوە ئیبایان کرد . ئێمەیـان بەو (ذوي القـربى) ایە نـەزانی کـە (خمس الخمس)ی ئەدرێتێ و نەیاندایێ .

١٣٦٢/٤٣ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إشتد غضب الله على قوم فعلوا بنبيه يشير إلى رباعيته . إشتد غضب الله على رجل يقتله رسول الله ـ ﷺ ـ في سبيل الله [كأبي بن خلف] ح ـ ٢٩٥/٦ . م ـ ٤٣٣/٧ . وعن ابن عبـاس بتقـديم الثـاني عـلى الأول . وفيه : على قوم دمّوا وجه نبي الله . بدل الرباعية]

تەرجەمە :

ئەم حەدیثە مورسەلی صەحابی‌یە نە ئەبوهورەیرە نە ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حازری وەقعەی ئوحود نەبوون .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە ئوحودا بریندار بوو فەرمووی : غەزەبی خوا لەسەر ئەو قەومە بە شیددەت بێ کە وای لە پێغەمەری کرد . ئیشارەتی ددانی موبارەکی ی کرد . غەزەبی خوا لەسەر ئەو کەسە بەشیدەت بێ کە وەجهی شەریفی پێغەمەری ئەوی خوێناویی کرد . غەزەبی خوا لەسەر ئەو کەسە بێ کە پێغەمەری ئەو بیکوژێ لە غەزادا لە رێی خوادا . [ئەوی بە قیصاص یا بە حەددی شەرعیی ئەکوژرێ داخڵ نابێ] .

[ئەوی روباعیەی پێغەمەری ـ ﷺ ـ شەهیدکردو لێوی موبارەکی بریندار کرد عوتبەی کوڕی ئەبو وەقاص بوو برای سەعدی = کوڕی ئەبو وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ . ئەوی وەجهی شەریفی بریندار کرد (ابن قمیئة) بوو ، دوو حەلقەی زرێکەی بە ناوچـاوانی موبـارەکیا

چەقیبوو . ئەبو عـوبەیـدەی جەڕاح - رضي الله تعـالى عنه - بـە ددان دەری کێشا ، دوو ددانی ئەبو عوبەیدە - رضي الله تعالى عنه - کەوت ئەمجا لێی دەرهێنا ! مالیکی کوڕی سینان بـاوکی - باوکی ئـەبو سـەعیدی خدریی - رضي الله تعالى عنهما - خوێنی ناوچاوانی مـوبارەکی مـژی لە دواییدا بێزی لێ کردەوە . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هەرکەسێ خوێنی من تـەماسی[1] خـوێنی ئەو بکـا ئاگـری جەهـەنـنەمی لێ نـاکـەوێ . قسطلاني - ٦/٢٩٥ . ]

١٣٦٣/٤٤ عن عروة عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت : لما كان يوم أحد هزم المشركون فصرخ [فصاح . أخرى خ] إبليس - لعنة الله عليه - : أي عباد الله أخراكم ! فرجعت أولاهم [على أخراهم . اخرى خ] فاجتلدت هي وأخراهم ، فبصر حذيفة فإذا هو بأبيه اليمان [فنادى . أخرى خ] فقال : أي عباد الله أبي ! أبي ! قال [عروة] : قالت : فوالله ما احتجزوا [ما انفصلوا عنه] حتى قتلوه ! فقال حذيفة : يقضي الله لكم . قال عروة : فوالله ما زالت في حذيفة [منها . أخرى خ] بقية خير [من دعاء واستغفار لقاتل أبيه] حتى [لقي الله . أخرى] لحق بالله - عز وجل - ح - ٥/٢٨٨ . ح - ٦/١٦٤ ، ٢٨٩ .

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : کە ڕۆژی ئوحود واقیع بوو موشریکان شکان ئیبلیس - لعنه الله - هاواری کرد : ئەی عیبادی خوا ئاگاتان لە دواتانەوە بێ [یەعنی گاوران لە پشتەوە خەریکن

---

(١) تەماسی . . واتە خوێنی پێغەمەر - ﷺ - بەر خوێنی هەرکەسێ بکـەوێ و تێکڵاوی خوێنی ببێ ناچێتە جەهەننەمەوە .

هوجوومتان بۆ بێنن] لەشکری پێشووی ئیسلام گەڕانەوە سەر لەشکری دواوەی خۆیان ، دەستیان کرد بە حەرب لەگەڵیانا ، یەکتریان ئەکوشت . حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاوی پێکەوت کە موسوڵمانەکان دەورەی یەمانی باوکیان داوە خەریکن ئەیکوژن . حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ بانگی کرد : ئەی عیبادی خوا باوکمە ! باوکمە ! [یەعنی مەیکوژن] حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : وەڵڵاهی لێی جوێنەبوونەوە تا شەهیدیان کرد . حوذەیفە فەرمووی : خواتان لێ خۆش بێ ، عوروە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : لەوەکە موسوڵمانان یەمانی باپیرمیان شەهیدکرد حوذەیفەی باوکم هەر دوعای خێری ئەکرد بۆ ئەوانەی کە یەمانی باوکیان شەهید کرد تا لە دنیا چوە دەرێ و چوە حوزووری خوا ـ عز وجل ـ .

١٣٦٤/٤٥ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ [في سبب نزول قوله تعالى] : ﴿الذين استجابوا لله والرسول من بعدما أصابهم القرح للذين أحسنوا منهم واتقوا أجر عظيم﴾[1] قالت لعروة : يا ابن أختي كان أبوك منهم الزبير وأبو بكر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لما أصاب رسول الله ـ ﷺ ـ ما أصاب يوم أحد وانصرف المشركون خاف أن يرجعوا قال : من يذهب في إثرهم ، فانتدب سبعون رجلا ، قال كان فيهم أبو بكر والزبير . ح ـ ٢٩٦/٦ .

تەرجەمە :

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە سەبەبی نوزوولی ئەم ئایەتی ئالیعیمرانەدا کە ئەفەرموێ : ئەوانەی کە ئیجابەتی دەعوەتی خواو

(١) آل عمران / ١٧٢ .

پێغەمەریان کرد کە بچن بە شوێن موشریکەکانا لە دوای ئەمە کە چەندیان لێ کوژرابوو چەندیان لێ بریندار بووبوو بۆ ئەوانەیان کە عەمەلی چاکەیان کردبوو کە تەقوای خوایان کردبو [کە هەموویان وا بوون] . . ئەجرێکی زۆر گەورەیان هەیە . حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بە عوروەی فەرموو : ئەی کوڕی خوشکی خۆم هەردوو باوکت کە زوبەیرەو ئەبوبەکرە [چونکی ئەبوبەکر باوکی ئەسمای دایکی عوروە بوو] لەوانەن کە ئەم ئایەتەی ئالی‌عیمرانیان دەرحەق نازڵ بوە ، کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ئوحودا تووشی ئەوە بوو کە تووشی بوو [ددانی ئەهیدکراو لێوو ناوچاوانی بریندارکراو غەیری خۆی‌و چواردە ئەصحابی ئەبێ لەشکرەکە هەموو هەڕایان کرد] موشریکەکان گەڕانەوە بۆ مەکە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ترسی ئەوەی بوو کە بگەڕێنەوە سەریان فەرمووی : کێ بە شوێنیانا ئەچێ ؟ [کە بزانێ ئەگەڕێنەوە یان نا ؟ هەم تێیان بگەیێنێ کە بەو کوشتارە لەشکری پێغەمەر ـ ﷺ ـ زەعیف نەبوون‌و ئەتوانن کە شوێن دوشمن بکەون] بەو فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەفتا کەس لەو ئەصحابەی کە حازری وەقعەی ئوحود بوون ئیجابەتی ئەو دەعوەتەیان کردو چوون . عوروە ئەفەرموێ : لە ناو ئەوانەدا ئەبوبەکرو زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ مەوجوود بوون .

[لە طەبەرانیایە : کە ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ناوی بەعزێکی بردوە ، ئەبوبەکرو ، عومەرو ، عوثمان‌و ، عەلی‌و ، عەمماری کوڕی یاسیرو ، طەلحەو ، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص‌و ، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف‌و ، ئەبو حوذەیفەو ، ئیبن‌و مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنهم ـ مەوجوود بوون . ئیبن‌و ئیسحاق ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : کە گەیینە (حمراء الأسد) کە سێ چارەك سەعات لە

مەدینەوە دوورە خوا ترسی نایە دڵیانەوە نەیانوێرا بگەڕێنەوە ، لەوەپێش ئەبوسوفیان گەییە (روحا) (لە واز)[1] لە حەرب پەشیمان بووبوەوە تەمای بوو بگەڕێتەوە بۆ مەدینە .

١٣٦٥/٤٦ عن قتادة بن دعامة - رضي الله تعالى عنه - قال : ما نعلم حيا من أحياء العرب أكثر شهيدا أعزَّ يوم القيامة من الأنصار = قال قتادة : = وحدثنا أنس بن مالك - رضي الله تعالى عنه - أنه قتل منهم يوم أُحد سبعون ، ويوم بئر معونة سبعون ، [يقال لهم : القراء] ويوم اليمامة سبعون . قال [قتادة] : وكان بئر معونة على عهد رسول الله - ﷺ - ، ويوم اليمامة على عهد أبي بكر - رضي الله تعالى عنه - يوم مسيلمة الكذاب . ح - ٢٩٧/٦ .

تەرجەمە :

قەتادە - رحمه الله - ئەفەرموێ : لە هیچ طائیفە لـە عەشیـرەتانی عەرەب هیچ کەس نازانین کە لە ئەنصار شەهیدی زیاتر بووبێ و ، لـە ڕۆژی قیامەتا لای خوا عەزیزی زیاتر بێ . ئەنەسی کوڕی مالیك - رضي الله تعالى عنه - خەبەری داوینێ کە لە ڕۆژی ئوحودا حەفتایان ، لە ڕۆژی بیری مەعوونەدا حەفتایان ، لە ڕۆژی یەمامـەدا حەفتـایان لێ شـەهید کرا . قەتادە - رحمه الله - ئەفەرموێ : ڕۆژی بیری مەعوونە لە زەمانی پێغەمەرا بوو - ﷺ - ، ڕۆژی یەمامە لە زەمانی ئەبوبەکری صەدیقا بـو - رضي الله تعالى عنه - لـە ڕۆژی موسـەیلیمەی کـەذابا - لعنه الله - [خیلاف لە عەدەدیانا هەیە . راجع قسطلاني ٢٩٧/٦] .

(١) ئەوەی نێو کەوانەکانم بۆ نەخوێنرایەوە .

## شهادة حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١٣٦٦/٤٧ عن جعفر بن عمرو بن أمية الضمري ، قال : خرجت مع عبيد الله بن عدي بن الخِيار ، فلما قدمنا حمص قال لي عبيد الله بن عدي : هل لك في وحشي نسأله في قتل حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ؟ قلت : نعم ، وكان وحشي يسكن حِمصَ ، فسألنا عنه ، فقيل لنا : هو ذاك في ظل قصره كأنه حَميت [زق كبير للسمن] قال : فجئنا حتى و قفنا عليه بيسير ، فسلّمنا فردَّ السلام ، قال : وعبيد الله معتجر بعمامته ما يرى وحشيّ إلا عينيه ورجليه ، فقال عبيد الله : يا وحشي أتعرفني ؟ قال : فنظر إليه ، ثم قال : لا والله إلا أني أعلم أن عدي بن الخيار تزوج امرأة يقال لها : أم القتال بنت أبي العيص ، فولدت له غلاما بمكة ، فكنت أسترضع له ، فحملتُ ذلك الغلام مع أمه فناولتها إياه فلكأني نظرت إلى قدميك .

[وزاد إبن إسحاق : والله ما رأيتك منذ ناولتك أمك السعدية التي أرضعتك بذي طوى ، فإني ناولتكها وهي على بعيرها ، فأخذْتُك ، فلمعت لي قدمك حين رفَعتُك فما هو إلا أن وقفت عليَّ فعرفتهما] قال : فكشف عبيد الله عن وجهه ، ثم قال : ألا تخبرنا بقتل حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ؟ قال : نعم ، إن حمزة قتل طُعَيمْة بن عدي بن الخيار ببدر ، فقال لى مولاي جبير بن مطعم : إن قتلت حمزة بعمي فأنت حر . قال : فلما أن خرج الناس عام عينين [وهو عام أحد] وعينين جبل بحيال أُحد ، بينه وبينه وادٍ . . خرجت مع الناس إلى القتال ، فلما أن اصطفوا للقتال خرج سباع فقال : هل من مبارز ؟ قال : فخرج إليه حمزة بن عبدالمطلب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : يا سباع يا ابن أم أنمار مقطعة البظور أتحادّ

الله ورسوله ـ ﷺ ـ ؟ قال : ثم شد عليه فكان كأمس الذاهب ! قال : وكَمَنْتُ لحمزة تحت صخرة فلما دنا مني رميته بحربتي فأضعها في ثنته [عانته] حتى خرجت من بين وركيه ، قال : فكان ذاك العهد به . فلما رجع الناس رجعت معهم فأقمت بمكة حتى فشا فيها الاسلام . ثم خرجت إلى الطائف [هاربا] فأرسلوا إلى رسول الله ـ ﷺ ـ رسولا ، فقيل لي : إنه لا يهيج الرسل .

[وعند ابن إسحاق : فلما خرج وفد أهل الطائف إلى رسول الله ـ ﷺ ـ ليسلموا ضاقت عليّ الأرض ، وقلت : ألحق بالشام أو باليمن أو ببعض البلاد فإني لفي ذلك إذ قال رجل : ويحك إنه والله ما يقتل رجلا دخل في دينه]

قال : فخرجت معهم حتى قدمت على رسول الله ـ ﷺ ـ فلما رآني قال : آنت وحشي ؟ قلت : نعم . قال : آنت قتلت حمزة ؟ قلت : قد كان من الأمر ما قد بلغك . قال : فهل تستطيع أن تغيب وجهك عني . قال : فخرجت . فلما قبض رسول الله ـ ﷺ ـ فخرج مسيلمة الكذاب ، قلت : لأخرجنَّ إلى مُسَيلمة لعلِّي أقتله فأكافئ حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : فخرجت مع الناس فكان من أمره ما كان . قال : فإذا رجل قائم في ثَلْمة جدار كأنه جمل أورَق [أسمر كالرماد] ثائر الرأس . قال : فرميته بحربتي [التي قتلت بها حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] فأضعها بين ثدييه حتى خرجَتْ من بين كتفيه ، قال : ووثب إليه رجل من الأنصار [عبد الله بن زيد بن عاصم] فضربه بالسيف على هامته قال [عبدالعزيز بن عبدالله بن أبي سلمة] قال عبدالله بن الفضل : فأخبرني سليمان بن يسار أنه سمع عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : فقالت جارية على ظهر بيت : وا أمير المؤمنين ! قتله العبد الأسود . ح ـ ٦/٢٩٣ .

**تەرجەمە :**

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمەریی ئەفەرموێ : لەگەڵ عوبەیدوڵڵای کوڕی عەدیی کوڕی خیار لە مەدینە چووینەدەرێ بۆ سەفەر ، کە گەیینە حیمص عوبەیدوڵڵا پێی وتم . نایێی بچینە لای وەحشیی ؟ کە چۆنی حەزرەتی حەمزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ شەهیدکرد ؟ وتم : با بێم : وەحشي لە حیمصا ئیقامەتی ئەکرد ، پرسیمان : لەکوێیە ؟ وتیان : ئەوەتانێ لە ژێر سێبەری کۆشکەکەیا دانیشتوە ، وەك هیزە رۆن رەش و هەڵاوساو بوو .

چووینە لای ، کەمێ بەسەریەوە وەستاین ، سەلامان لێ‌کرد ، جوابی سەلامی دایەوە ، عوبەیدوڵڵا سەروچاوی خۆی بە سەرپێچەکەی خۆی داپۆشیبوو ، وەحشیی غەیری کونی چاوی و پێی هیچ جێیێکی نەئەبینی . لە وەحشیی پرسی : ئەمناسیت ؟ وەحشیی تێی فکری وتی : خەیر وەڵڵا ئەوە نەبێ عەدیی کوڕی خیار ژنێکی هێنا ناوی (أم قتال) بوو کچی (أبو العيص) لە مەککە کوڕێکی بە وەلەد هێنا ، بۆ کەسێك ئەگەڕام کە شیری بداتێ ، ئەو منالەم هەڵگرت لەگەڵ دایکیا دامە دەست دایکی (كأنه) ئێستە تەماشای پێی تۆ ئەکەم [یەعنی وەك پێی ئەو منالەیە] .

[ئیبن وئیسحاق ئەفەرموێ : وەحشیی وتی : وەڵڵاهی لەو وەختەوە کە تۆم داوەتە دەست دایکە سەعدی‌یەکەت کە شیری داویتێ لە (ذو طوى)دا تۆم نەدیوە ، ئەو بەسەر وشترەکەیەوە بوو تۆم دایە دەستی و وەری‌گرتی ، لەو وەختەدا کە بەرزم کردی‌یەوە پێتم دی ئیتر هیچی تر نەبوە تا ئێستە ، کە چاوم بە پێت = کەوت = پێم ناسیتەوە . لە بەینی ئەو وەختەداو ئەو وەختە کەلەگەڵ جەعفەرا چوە لای پەنجا ساڵ رابوردبو] .

جەعفەر ئەڵێ : ئەو وەختە عوبەیدوڵڵا دەم و چاوی خۆیی دەرخست . لەپاشا عوبەیدوڵڵا بە وەحشیی وت : خەبەری ئەوەمان نادەیتێ کە حەمزەت - رضي الله تعالى عنه - چۆن شەهیدکرد ؟ وەحشیی وتی : بەڵێ خەبەرت ئەدەمێ : حەمزە - رضي الله تعالى عنه - طوعەیمەی کوڕی عەدیی [کوڕی خیاری] کوڕی نەوفەلی لە بەدرا کوشت ، مەولام کە جوبەیری کوڕی موطعیمە [لە فەتحا موسوڵمان بوو] پێی وتم : ئەگەر لە باتی مامم = حەمزە = بکوژی تۆ ئازاد بی . کە خەڵق لە ساڵی (عینین)ا چوونەدەرێ . عەینەین : شاخێکە بەرابەر ئوحود لە بەینی ئەوو ئوحودا دەشتێ هەیە ، منیش کە لەگەڵ خەڵقا چووم بۆ ئوحود بۆ شەڕ لەگەڵ موسوڵمانانا کە هەردوو لەشکر صەفیان بەست بۆ شەڕ سەباعی کوڕی (عبدالعزی)ی خەزاعیی چوە مەیدان وتی : کەسێ هەیە موبارەزەم لەگەڵ بکا ؟ حەزرەتی = حەمزە = - رضي الله تعالى عنه - چوە مەیدانی ، فەرمووی : ئەی سەباع ، ئەی کوڕی (أم أنمار)ی قیتکەبڕ ! [دایکی قیتکەی ژنانی ئەبڕی و خەتەنەی ئەکردن] بۆ تۆ عیناد لەگەڵ خواو پێغەمەریا ئەکەی - ﷺ - و موحارەبەیان لەگەڵا ئەکەیت و دوشمنایەتییان ئەکەی ؟ لە پاشا هەڵمەتی دایێ و کوشتی وەك دوێنێی رابوردو رابورد . وەحشیی وتی : لە پەنا بەردێکا خۆم مات دا بۆ ، حەزرەتی حەمزە - رضي الله تعالى عنه - کە لێم نزیك بووەوە نێزەکەم بۆ هاویت ، دام لە خوار ناوکیەوە لە سێبەندەیەوە چوە دەرێ ، ئیتر ئەوە بوو حەمزەم نەدی - رضي الله تعالى عنه - یەعنی وەفاتی کرد .

کە خەڵق لە ئوحود بۆ مەکە گەڕانەوە لەگەڵیان گەڕامەوە ، لە مەککەدا ئیقامەتم کرد ، تا ئیسلامەتی لە مەککەدا بڵاویوەوەو فەتحی مەکە کرا . لە پاشا چووم بۆ طائیف ، خەڵقی طایف پیاویان نارد بۆ

خـزمەت پێغـەمەر - ﷺ - پێیـان‌وتم : کە پێغـەمەر - ﷺ - فـروستادە ناکوژێ ، منیش لەگەڵیـانا چـوومە خـزمەتی ، کـە چاوی پێم کـەوت فـەرمووی : تـۆ وەحشیت ؟ عەرزم‌کـرد : بـەڵێ . فـەرمـووی : تـۆ حەمزەت کوشت ؟ عەرزم‌کرد : چۆنت پێگەییوە وابوو . فەرمووی : ئەتوانی رووی خۆتم لێ ون‌بکەی تا نەتبینم ؟ لە خزمەتی چوومەدەرێ .

کە پێغەمـەر - ﷺ - ئەمـری حەقی بـەجێ هێناو مـوسەیلیمـەی کـەذذاب خورووجی کـرد وتم : ئەبێ بچم بـۆ حەربی مـوسەیلیمـەی کەذذاب بەڵکو بیکوژم لە موکافاتی حەزرەتی حەمزەدا،لەگەڵ خەڵقی کە حەزرەتی صەدیق ناردنی بۆ حـەربی موسـەیلیمە . منیش چـووم ، ئەو شەڕو شۆڕە بوو کە زۆر لە موسوڵمانان شەهیدکران‌و لە پاشا موسوڵمانان فەتحیان‌کرد ، کە دیم موسەیلیمە لە کەلەبەری دیوارێکا وەك وشتری بۆز وەستابوو ، سەروقژی پەرێشان بوو ، بەو نێزەیەی کە حەزرەتی حەمزەم پێ شەهید کـردبوو نێـزەیێکم بۆ هـاویت دام لە بـەینی هەردوو گـۆی مەمکی ، لە بەینی هەردوو شانیەوە چوە دەرێ ، پیاوێکیش لە ئەنصار [عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عـاصمی مازنـدیی] شیرێکی کێشـا بـەسەریـا . عـەبـدوڵـڵای کـوڕی عـومـەر - رضي الله تعـالى عنهـما - ئەفەرموێ : کە موسەیلیمە کوژرا جاریەیێ لە سەربـانی خانـوویێکەوە وتی : وای بۆ (أمير المؤمنين) ! عەبدە حەبەشی یەکە کوشتی .

[موسەیلیمە ئیددیعای پێغەمەرێتی ئەکـرد ، ئیددیعـای ئەمیـریی نەئەکرد ، ئەمما چونکی ئیشی ئەوانەی ئەکرد کە ئیمانیان پێ هێنابوو لای ئەو ژنەیش وابوو ؛ چونکی ئیمانیان پێ هێناوە بە موئمینی موسەیلیمە حسێبن بۆیە وتی : (أمير المؤمنين)] .

# غزوة خندق

شوال سنة أربع . غزوة قريظة سنة أربع ، غـزوة رجيع وبئـر معونة سنة أربع .

غزوة خندق سنة أربع

١٣٦٧/٤٨ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن النبي - ﷺ - عرضه [عرضني .م] يوم أحد وهو [وأنا . م] ابن أربع عشرة سنة فلم يجزه [ني . م] وعرضه [ضني . م] يوم الخندق وهو [أنا . م] ابن خمس عشرة سنة فأجازه [ني . م] ح - ٣٠٨/٦ ، م - ٦٧/٨ .

قال نافع : فقدمت على عمر بن عبدالعزيز - رضي الله تعالى عنه - وهو يومئذ خليفة ، فحدثته هذا الحديث ، فقـال : إن هذا الحـد بين الصغير والكبير . فكتب إلى عماله : أن يفرضوا لمن كان ابن خمس عشرة سنة ، ومن كان دون ذلك فاجعلوه في العيال . م - ٦٧/٨ .

تەرجەمە :

عەبدوڵلای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - رۆژی ئـوحود رای نـوانم بۆ غـەزا چوارده سـاڵ بووم قەبووڵی نەکردم . رۆژی خەندەق رای نوانم پانزەساڵ بـووم قەبـووڵی کردم .

نافیع - رحمه الله - ئەفەرموێ : چوومە خزمەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز - رضي الله تعـالى عنه - ئـەو وەختە خـەلیفە بـوو . ئەم حەدیثەم بۆ نەقڵ کرد فەرمووی : پانزەساڵی حەددێکە لە بەینی گەورەو بوچووکا . بۆ مەئموورانی خۆیی نووسی : کە ئەوانەی پانزە ساڵیان تەواو

کردبێ بچنە غەزا لە غەنیمەت حیصەیان بۆ جوێ بکەنەوە . ئەوانەی لە پانزە کەمتربن مەیانبەن بۆ غەزا لە ناو ئەهل و عەیالیان بهێڵنەوە .

١٣٦٨/٤٩ ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - قال : أول يوم شهدته يوم الخندق . ح - ٣١٢/٦ .

تەرجەمە :

= ئیبن و عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ .= ئەوەڵ غەزایێ کە چووم غەزای رۆژی خەندەق بوو .

١٣٦٩/٥٠ عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - [قالت في تفسير] : ﴿إذ جاؤكم من فوقكم ومن أسفل منكم ، وإذ زاغت الأبصار ، وبلغت القلوب الحناجر . . .﴾[1] قالت : كان ذلك يوم الخندق . ح - ٣١١/٦ . م - ٤٧١/١٠ .

تەرجەمە :

عائیشە - رضي الله تعالى عنها - لە تەفسیری ئەم ئایەتی سوورەتی ئەحزابەدا کە خوا - عز وجل - ئەفەرموێ : ئەی ئەوانە کە ئیمانتان هەیە ئەو نیعمەتە بێننەوە پێش چاوتان شوکری بکەن کە ئەحزاب لە سەرەوەو لە خوارەوە هاتنەسەرتان دەوریان دان ، لە ترسا چاوتان ئەبڵەق بوو ، رۆح گەیی یە قورقوڕاگەتان [بە ئەنواعی ظەن ظەنتان بە خوا ئەبرد ؛ لاتان وابوو کە نەصرەتتان داوە ؟] . . ئەفەرموێ : کە ئەو رۆژە رۆژی ئەحزاب بوو .

١٣٧٠/٥١ سليمان بن صرد - رضي الله تعالى عنه - يقول : سمعت النبي - ﷺ - يقول - حين أجلى [إفعال ، معلوم أو مجهول] الأحزاب

(١) الأحزاب / ١٠ .

عنه ـ : الآن نغزوهم ولا يغزوننا ، نحن نسير إليهم . [صدق رسول الله ـ ﷺ ـ ] ح ـ ٦/٣١٤ .

تەرجەمە :

سولەیمانی کوڕی صورەد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کە ئەحزاب لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوورکەوتنەوەو طەرد بوون لێم بیست ئەیفەرموو : ئیتر ئێمە ئەچین غەزایان لەگەڵ ئەکەین ئەوان نایێن غەزامان لەگەڵ بکەن ، ئێمە ئەچینە سەریان .

ساڵی دوایی تەشریفی چوو بۆ عومرە نەیانهێشت ، صوڵحی لەگەڵ کردن ، کە ساڵی دوایی تەشریفی بچێ و عومرە بکا ، تا سێ رۆژ لە مەککەدا تەشریفی بەند بێ و رۆژی چوارەم لێی بچێتە دەرێ ، دوای عومرە کە ئەوان عەهدیان هەڵوەشانەوە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە سەریان و فەتحی مەکەی کرد . ـ صدق رسول الله ـ ﷺ ـ .

١٣٧١/٥٢ عن إبراهيم التيمي عن أبيه قال : كنا عند حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال رجل : لو أدركت رسول الله ـ ﷺ ـ قاتلت معه وأبليت . فقال حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أنت كنت تفعل ذاك ؟ ! لقد رأيتنا مع رسول الله ـ ﷺ ـ ليلة الأحزاب وأخذتنا ريح شديدة وقُرٌّ [برد] ١ ـ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : ألا رجل يأتيني بخبر القوم جعله الله ـ عز وجل ـ معي يوم القيامة ؟ فسكتنا ، فلم يجبه أحد منا . ٢ ـ ثم قال : ألا رجل يأتيني بخبر القوم جعله الله ـ عز وجل ـ معي يوم القيامة ؟ فسكتنا ، فلم يجبه منا أحد ! ٣ ـ ثم قال : ألا رجل يأتيني بخبر القوم جعله الله ـ عز وجل ـ معي يوم القيامة ؟ فسكتنا ، فلم يجبه منا أحد ! فقال : قم يا حذيفة فأتنا بخبر القوم ! فلم أجد بُدًّا إذ دعاني باسمي أن أقوم . قال : إذهب فأتني بخبر القوم ولا تذعرهم عليَّ [لا تفزعهم ولا

تحركهم عليّ . والمراد لاتحركهم عليك ، فإنهم إن أخذوك كان ذلك ضررا عليّ] فلما ولَّيت من عنده . جعلت كأنما أمشي في حمّام حتى أتيتهم ! فرأيت أبا سفيان يَصْلىٰ ظهره بالنار ، فوضعت سهما في كبد القوس فأردت أن ارميه ، فذكرت قول الرسول ـ ﷺ ـ : ولا تذعرهم علي ، ولو رميته لأصبته . فرجعت وأنا أمشي في مثل الحمّام ، فلما أتيته فأخبرته بخبر القوم وفرغت قرِرت ، فألبسني رسول الله ـ ﷺ ـ من فضل عباءة كانت عليه يصلي فيها ، فلم أزل نائما حتى أصبحت ، فلما أصبحت قال : قم يا نَوْمان [كثير النوم] . ح ـ ٤٢٨/٧ .

تەرجەمە :

ئیبراهیمی تەیمی لە باوکیەوە ریوایەت ئەکا ئەفەرموێ : لای حوذەیفە بووین ـ رضي الله تعالى عنه ـ پیاوێ وتی : ئەگەر بگەیمایە زەمانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە خزمەتیا غەزام ئەکردو زۆر چاك شەڕم بۆ ئەکرد ، کە لە ناو ئەصحابا ناوم دەرکەوێ . حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە زانی ئەو پیاوە زۆر خۆی هەڵەکێشێ و موبالەغە ئەکا . . فەرمووی : تۆ وات ئەکرد ؟ ! لە شەوی ئەحزابا لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ چاوم بە خۆمان کەوت بایێکی زۆر بەشیددەت ئەهات و زۆرمان سەرما بوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ سێ دەفعە فەرمووی : کەسێ نی یە خەبەری قەومی ئەحزابمان بۆ بهێنێتەوە کە چی ئەکەن رۆژی قیامەت ئەو کەسە لەگەڵ من بێ ؟ لە هەر = سێ = جارەکەدا هەموو بێدەنگ بووین و هیچ کەس جوابی نەدایەوە ! دەفعەی چوارەم فەرمووی : ئەی حوذەیفە تۆ بچۆ خەبەری ئەو لەشکری ئەحزابەمان بۆ بهێنەرەوە .

کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە ناوی خۆمەوە منی بانگ = کرد = هیچ چارەم نەما ئەبوو هەڵسم فەرمووی : بچۆ خەبەرمان بۆ بهێنەرەوە ئەمما شتێکی

وا مەکە کە لە (علیه) ی من تەحریکیان بکەی [یەعنی موعامەلەییکی وا مەکە کە لێت خەبەردار بن‌و بتگرن ؛ چونکی ئەوە زەرەری منی تیا هەیە] کە لە خذمەتی پشتم هەڵکردو ڕۆییم ئەو باو سەرمایەم حیس نەئەکرد وەك لە ناو حەماما بڕۆم وا گەرمم بۆوە ! کە چووم ئەبوسوفیانم دی پشتی خۆی بە ئاگر گەرم‌ئەکردەوە تیرێکم خستە ناو جەرگەی کەوانەکەمەوە تەمام = بوو = تێی بگرم ، ئەو فەرموودەی پێغەمەرم هاتەوە فکر - ﷺ - کە فەرمووی : تەحریکیان مەکەرە سەرم ، ئەگەر تێم‌بگرتایە ئەم‌ئەنگاوت . گەڕامەوە وەك لە ناو حەماما بڕۆم ، کە هاتمەوە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - وخەبەرم دایێ و وەزیفەکەم بەجێ هێنا دوویارە ئەو سەرمایەم بۆ هاتەوەو تەزیم ! پێغەمەر - ﷺ - بە لاییکی ئەو عەبایەی کە لە بەریا بوو نوێژی پێوەئەکرد داپۆشیم ، تا وەختی سبەینێ لێی نوستم کە بەیانی دا پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەی خەواڵوّ هەڵسە .

ئەمیری لەشکر ئەبێ بە دەوام وریا بێ‌و جاسووس بنێرێ‌و کەشفی ئەحواڵی دوشمن بکا ، ئەوی بۆ ئەوە ئەمری پێکرد لازمە دەزبەجێ ئیطاعەی بکا ، ئاگاداری خۆی بێ فەرقی پێ نەکەن .

بەو سەرمایە کە حوذەیفە - رضي الله تعالى عنه - هیچ سەرمای نەبوە تا هاتۆتەوە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - هەر گەرمای بوە ئەوە موعجیزەییکی زۆر گەورەی پێغەمەرە - ﷺ - .

# غزوة بني قريظة عقيب الخندق

١٣٧٢/٥٣ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - قال : كأني أنظر إلى الغبار ساطعا في زقاق [سكة . اخرى خ] بني غنم موكبَ جبريل [الموكب نوع من السير وجماعة الفرسان يسيرون برفق] حين سار رسول الله - ﷺ - إلى بني قريظة ح - ٣١٦/٦ ، ح - ٢٥٩/٥ .

تەرجەمە :

ئەنەسی کوڕی مالیك - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : (كأنه) تەماشای ئەو تۆزە ئەکەم کە هەڵەستا لە ناو کۆڵانی بەنی غونما لەبەر ڕۆیینی ئەسپی جیبریل - عليه السلام - لەو وەختەدا کە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی چوو بۆ سەر قورەیظە .

١٣٧٣/٥٤ عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنه - قال : قال النبي - ﷺ - يوم الأحزاب : لايصلين أحد [منكم] العصر [وفي مسلم الظهر] إلا في بني قريظة ، فأدرك بعضَهم العصرُ في الطريق . فقال بعضهم : لا نصلي حتى نأتيها ، وقال بعضهم : بل نصلي ، لم يُرَد منا ذلك [بل الاستعجال في السير] فذكر ذلك للنبي - ﷺ - فلم يعنف واحدا منهم . ح - ٣١٦/٦ ، ح - ١٩٢/٢ . م - ٣٨٤/٧ . ولفظ مسلم عنه :

قال : نادى فينا رسول الله - ﷺ - يوم انصرف عن الأحزاب : أن لايصلين أحد الظهر إلا في بني قريظة . فتخوف ناس فوت الوقت فصلوا دون بني قريظة . وقال آخرون : لا نصلي إلا حيث أمرنا رسول الله - ﷺ - وإن فاتنا الوقت . قال : فما عنف واحدا من الفريقين . م - ٣٨٤/٧ .

**تەرجەمە :**

ئیبن‌و عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمبەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی لە ئەحزاب گەڕایەوەو چوو بۆ بەنی قورەیظە ئەمری فەرموو : هیچ کەس لە بەنی قورەیظەدا نەبێ نوێژی عەصری ـ لە موسلیما نوێژی نیوەڕۆی ـ نەکا . لە ڕێگە نوێژی عەصر داهات ، بەعزێ ترسان ، کە نوێژەکەیان بچێ ، لە پێش ئەمەدا کە بگەنە بەنی قورەیظە نوێژیان کرد ، بەعزێ وتیان : تا نەگەینە ئەوێ کە پێغەمبەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ کردووین نایکەین ، با وەختیش رابووڕێ ، خەبەریان دا بە پێغەمبەر ـ ﷺ ـ هیچ کامیانی لەوم نەکرد .

موسلیم ئەفەرموێ : نوێژی نیوەڕۆ . بوخاریی ئەفەرموێ : نوێژی عەصر . طەریق‌و شێخی هەردوکیان یەکێکە ، هیچ فەرقیان نی‌یە ، ئەم موخالەفەیان لە بەر چی‌یە ؟

نەوەویی‌و قەسطەلانی ئەفەرموون : ئەو وەختەی کە پێغەمبەر ـ ﷺ ـ ئەوەی فەرموو بەعزێ لە ئەصحاب نوێژی نیوەڕۆیان کردبوو بەوانەی فەرموو : نوێژی عەصرتان مەکەن تا لە بەنی قورەیظە ئەیکەن . بەعزێکیان نەیکردبوو ، بەوانەی فەرموو : نوێژی نیوەڕۆتان مەکەن تا لە بەنی قورەیظە ئەیکەین . ئەوانەی کە نەیانکردبو تا بەنی قورەیظەو تەئخیریان خست وا لە ئەمرەکەی پێغەمبەر ـ ﷺ ـ گەیبوون کە مەقصوودی (استعجال) کردنە لە ڕۆیینا .

۱۳۷٤/٥٥ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كان الرجل يجعل للنبي ـ ﷺ ـ النخلات حتى افتتح قريظة والنضير ، وإن أهلي أمروني أن آتي النبي ـ ﷺ ـ فأسأله الذين [الذي نسخة] كانوا أعطوه أو بعضه ، وكان النبي ـ ﷺ ـ قد أعطاها أم أيمن [بركة ـ رضي الله تعالى عنها ـ]

فجاءت أم أيمن فجعلت الثوب في عنقي تقول : كلاّ والذي لا إله إلا هو لا يعطيكم وقد أعطانيها ، أو كما قالت . والنبي ـ ﷺ ـ يقول : [يا أم أيمن أتركيه ولك كذا وكذا . م] لك كذا [من عندي] وتقول : كلا والله حتى أعطاها . [قال سليمان بن طرخان] حسبت أنه [أنسا] قال : عشرة أمثاله [أو قريبا من عشرة أمثاله . م] أو كما قال . ح ـ ٣١٦/٦ ، م ـ ٣٨٨/٧ . بفرق كما ترى .

١٣٧٥/٥٦ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لما قدم المهاجرون من مكة المدينة قدموا وليس بأيديهم شيء ، وكان الأنصار أهل الأرض والعقار فقاسمهم الأنصار على أن أعطوهم أنصاف ثمار أموالهم كل عام ويكفونهم العمل والمؤنة ، وكانت أم أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهي تدعىٰ أم سُلَيم وكانت أم عبدالله بن أبي طلحة كان أخا لِأنس لِأمه ، وكانت أعطت أم أنس ـ رضي الله تعالى عنها ـ رسول الله ـ ﷺ ـ عذاقا لها فأعطاها رسول الله ـ ﷺ ـ أم أيمن مولاته أم أسامة بن زيد .

قال ابن شهاب : فأخبرني أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ لما فرغ من قتال أهل خيبر وانصرف إلى المدينة رد المهاجرون إلى الأنصار منائحهم التي كانوا منحوهم من ثمارهم . قال : فرد رسول الله ـ ﷺ ـ إلى أُمّي عذاقها ، وأعطى رسول الله ـ ﷺ ـ مكانهن من حائطه . قال ابن شهاب : وكان من شأن أم أيمن ـ أم أسامة بن زيد ـ ـ رضي الله تعالى عنهم ـ أنها كانت وصيفة لعبد الله بن عبدالمطلب ، وكانت من الحبشة . فلما ولدت آمنة رسول الله ـ ﷺ ـ بعدما تُوفِّيَ أبوه ، فكانت أم أيمن تحضنه حتى كبر رسول الله ـ ﷺ ـ فأعتقها ، ثم أنكحها زيد بن حارثة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ثم تُوفِّيتْ بعد ما تُوفِّيَ رسول الله ـ ﷺ ـ بخمسة أشهر . م ـ ٣٨٦/٧ ،

ح ـ ٤/ ٣٥٤ .

مه‌عنای ئه‌م حه‌دیثانه :

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : كه‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ و موهاجیر له‌ مه‌كه‌وه‌ هیجره‌تیان كرد بۆ مه‌دینه‌ هیچیان نه‌بوو ، ئه‌نصار ئه‌راضیی و عه‌قاریان بوو ، له‌گه‌ڵ موهاجیره‌كان به‌شیان كرد ، به‌م شه‌رطه‌ كه‌ ره‌قه‌به‌كه‌ی[1] هی ئه‌نصار بێ و موهاجیر به‌خێوی بكه‌ن و نیوه‌ی حاصلاته‌كه‌یان بێ . (ام سلیم) ی دایكی ئه‌نه‌س و عه‌بدوڵلای كوڕی ئه‌بوطه‌لحه‌ ـ رضي الله تعالى عنهم ـ به‌عزێ دارخورمای دا به‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ دای به‌ (أم أيمن) ی دایكی ئوسامه‌ی كوڕی زه‌ید ـ رضي الله تعالى عنهم ـ . كه‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ فه‌تحی قوره‌یظه‌و به‌نی‌نه‌ضیرو خه‌یبه‌ری كرد موهاجیر ئه‌و ماڵه‌ی كه‌ ئه‌نصار دابوویێ ئیعاده‌یان كرده‌وه‌ بۆ ئه‌نصار . پێغه‌مه‌ریش ـ ﷺ ـ ئه‌وی كه‌ (ام سلیم) ـ رضي الله تعالى عنها ـ دابووی به‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ره‌دی كرده‌وه‌ بۆ (ام سلیم) .

ئه‌نه‌س ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : كه‌س و كارم یه‌عنی دایكم ئه‌مری پێكردم كه‌ بچمه‌ خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ داوای ئه‌وه‌ی لێ بكه‌م كه‌ دایكم دابویێ بۆی ئیعاده‌ بكاته‌وه‌ . (أم أيمن) ـ رضي الله تعالى عنها ـ هات جله‌كه‌می له‌ ملمه‌وه‌ ئالآن ئه‌یفه‌رموو : خه‌یر وه‌ڵلاهی قه‌سه‌م به‌وه‌ی غه‌یری ئه‌و مه‌عبوودی به‌حه‌ق نی‌یه‌ پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ داویه‌تی به‌ من ناتان‌داته‌وه‌ . پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌یفه‌رموو : ئه‌وه‌ت

(١) ره‌قه‌به‌كه‌ی : واته‌ سه‌ره‌كه‌ی ، واته‌ ماڵه‌كه‌ ده‌سمایه‌ بێ لای موهاجیره‌كان به‌ڵام به‌ قازانج به‌ نیوه‌یی و دوایی سه‌ره‌كه‌ هه‌ر ماڵی ئه‌نصاره‌كان بێ .

ئەدەمێ لە ماڵی خۆم ، ئەویش هەر ئەیفەرموو : وەڵڵاهی نـابێ . . تا پێغەمەر - ﷺ - دوو ئەوەندە ، یا فەرمووی : بە قەد دە ئەوەندە کە دایکم دابوویێ دای بە (أم أيمن) - رضي الله تعالى عنها - لە موڵکی خالیصی پێغەمەر - ﷺ - ئەمجا رازیی بوو .

ئیبن و شـەهاب بـەو ئیسنادە ئـەفەرمـوێ : (أم أيمن) ی دایکی ئوسامەی کوڕی زەید - رضي الله تعالى عنهم - جـاریەی عـەبدوڵـڵای باوکی پێغەمەر بوو - ﷺ - ورضي عنه - حەبـەشیی بوو ، کـە ئامینـە - رضي الله تعالى عنها - پێغەمەری بوو - ﷺ - دوای وەفاتی باوکی (أم أيمن) - رضي الله تعالى عنها - [لە دوای ئەمـە کە پێغـەمەر - ﷺ - لـە طەرەف حەلیمەی سەعدی‌یەوە - رضي الله تعالى عنها - ئیعادەکرایەوە بۆ لای دایکی] تەماشای پێغەمەری ئەکرد - ﷺ - و بەخێوی ئەکـرد ، تا پێغەمەر - ﷺ - گەورە بوو ئەو وەختە پێغەمەر - ﷺ - ئازادی کردو لـە زەیدی کوڕی حاریثەی مارەکرد - رضي الله تعالى عنه - بە پێنج مانگ دوای پێغەمەر - ﷺ - وەفاتی کرد - رضي الله تعالى عنها - .

# غزوة الرجيع سنة أربع ، وبني لحيان

١٣٧٦/٥٧ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بعث النبي ـ ﷺ ـ عشرة عينا [جاسوسا] وأمَّر عليهم عاصم بن ثابت الأنصاري ، وهو جد عاصم بن عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فانطلقوا حتى إذا كانوا بالهدأة ، وهو بين عسفان ومكة ، ذُكِروا لِحَيٍّ من هذيل يقال لهم : بنو لِحْيان فنفروا لهم قريبا من مائتي رجل كلهم رام ، فاقتصّوا آثارهم حتى وجدوا مأكلهم تمرا تزودوه من المدينة ، فقالوا : هذا تمر يثرب ، فاقتصوا آثارهم ، فلما رآهم عاصم وأصحابه ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لجأوا إلى فَدْفَدٍ [تهپۆلكه] وأحاط بهم القوم ، فقالوا لهم : إنزلوا واعطونا بأيديكم ولكم العهد والميثاق ولا نقتل منكم أحدا . قال عاصم بن ثابت ـ رضي الله تعالى عنه ـ ـ أميرُ السرية ـ : أما أنا فوالله لا أنزل في ذمة كافر، ألـلّهـم أخبر عنا نبيك ! فرموهم بالنبل فقتلوا عاصما في سبعة ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فنزل إليهم ثلاثة نفر بالعهد والميثاق ، منهم : خبيب الأنصاري ، وابن دثنة : زيد بن معاوية ، ورجل آخر [عبدالله بن طارق البلوي ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ] فلما استمكنوا منهم أطلقوا أوتار قسيهم [فربطوهم بها] فأوثقوهم فقال الرجل الثالث : هذا أول الغدر ، والله لا أصحبكم إن في هؤلاء لأسوة ـ يريد القتلى ـ فجرروه وعالجوه على أن يصحبهم فأبى ، فقتلوه [بمرِّ الظهران] فانطلقوا بخبيب وابن دثنة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حتى باعوهما بمكة بعد وقعة بدر ؛ فابتاع خبيبا بنو الحرث بن عامر بن نوفل بن عبدمناف . [واشترى ابن دثنة صفوان بن أمية وقتله بأبيه] وكان خبيب ـ رضي الله تعالى عنه ـ هو قتل الحرث بن عامر يوم بدر [فأخروه عندهم حتى تنقضي الأشهر

الحرم] .

فلبث خبيب عندهم أسيرا [حتى أجمعوا قتله إستعار موسى من بعض بنات الحرث استحد بها . ح - ٦/٣٠٢] .

[قال ابن شهاب] : فأخبرني عبيدالله بن عياض أن بنت الحرث [زينب] أخبرته أنهم حين اجتمعوا [لقتله] إستعار منها موسى يستحد بها فأعارته ، فأخذ إبنا لي وأنا غافلة حين أتاه ، قالت فوجدته مُجْلِسه على فخذه والموسى بيده ففَزِعْت فَزْعة عرفها خبيب في وجهي . فقال : تخشين أن أقتله ؟ ما كنت لأفعل ذلك . والله ما رأيت أسيرا قط خيرا من خبيب ، والله لقد وجدته يوما يأكل من قِطْف عنب في يده وإنه لموثَق في الحديد وما بمكة من تمر . وكانت تقول : إنه لرزق من الله رزقه خبيبا ، فلما خرجوا من الحرم ليقتلوه في الحل قال لهم خبيب : ذروني أركع ركعتين ، فتركوه فركع ركعتين ، ثم قال : لولا أن تظنوا أن ما بي جزع لطوّلتها ، اللهم احصهم عددا [واقتلهم بددا ، ولا تبق منهم أحدا ثم أنشأ يقول : ح - ٦/ ٢٥٠]

ولست أبالي حين أقتل مسلما
على أي شق كان لله مصرعي
وذلك في ذات الاله، وإن يشأ
يبارك على أوصال شِلْو [جسد] ممزع [مقطع]

[وزاد موسى بن عقبة : فلم يحل الحول ومنهم أحد حي] فقتله [أبو سِرْوَعة عقبة] بن الحرث . فكان خبيب هو سنّ الركعتين لكل امرئ مسلم قتل صبرا . فاستجاب الله لعاصم بن ثابت يوم أصيب ، فأخبر النبي - ﷺ - أصحابه خبرهم وما أصيبوا ، وبعث ناس من كفار قريش إلى عاصم حين حُدِّثوا أنه قتل ليؤتَوا بشيّ منه يعرف ، وكان قد قتل

رجلا من عظمائهم يوم بدر [هو عقبة بن أبي معيط] فبُعث على عاصم مثل الظُّلَّة [أي السحابة المُظِلَّة] من الدَّبْر [ذكور النحل أو الزنابير] فحمته من رسولهم ، فلم يقدروا على أن يقطعوا من لحمه شيئا .
ح ـ ٥/١٥٧ . ح ـ ٦/٢٤٩ ، ٣٠١ .

هذان البيتان[1] من قصيدة ذكرها ابن إسحاق أولها :

لقد جمع الأحزاب حولي وألّبوا
قبائلهم ، واستجمعوا كل مجمع
وقد قربوا أبناءهم ونساءهم
وقُرِّبت من جذع طويل ممنع
وكلهم يُبدي العداوة جاهدا
عليَّ لأني في وثاق بمضيع
إلى الله أشكو غربتي بعد كربتي
وما جمع الأحزاب لي عند مصرعي
فذا العرش صبرني على ما أصابني
فقد بضعوا لحمي ، وقد ضل مطمعي
وذلك في ذات الاله ، وإن يشأ
يبارك على أوصال شلو ممزع
وقد عرضوا بالكفر والموت دونه
وقد ذرفت عيناي من غير مدمع
ومابي حذار الموت إني لَميِّت

(١) مەبەستی دوو بەیتەکەیە کە لە پێشەوە نووسینی . دانەر ـ خ ـ مانای قەصیدەکەیشی نەکردوە .

ولكن حذاري حرًّ نار تلفع
فلست بمبد للعدوّ تخشعا
ولا جزعا إني إلى الله مرجعي
فلست أبالي حين أقتل . . . إلخ

**تەرجەمە :**

ئەبو هورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - دە کەسی بە جاسووسیی نارد ، عاصیمی کوڕی ثابیتی ئەنصاریی کرد بە رەئیسیان ، عاصیم باپیری عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی خەطاب بوو - رضي الله تعالى عنهما - . رۆیین تا گەیینە هەدئە کە جێیێکە لـە بەینی عەسفان و مەکەدا ، خەبەر درا بە قەومێ لە هوذەیل کە بەنی لیحیانیان پێ ئەڵێن . نزیکی دووصەد پیاویان بۆ ناردن ، هەموویان تیرانداز بوون ، شوێنیان هەڵگرتن تا ئەو دەنکە خورمایەیان دۆزی‌یەوە کە لە مەدینەوە هەڵیان گرتبوو کردبوویان بە تێشوو . وتیان : ئەمە خورمای مەدینەیە . دیسان شوێنیان هەڵگرتن تا پێیـان گەیـین . کە عـاصیم و رەفیقەکـانی چاویان پێیان کەوت ئیلتیجایان بە تەپۆڵکەیێ کرد ، ئیحاطەیان دان ، دەورەی تەپۆڵکەکەیان لێ‌گرتن ، پێیان‌وتن : بێنەخوارێ دەستی خۆتانمان بدەنێ ، عەهدو پەیمان بێ کە هیچتان لێ نەکوژین . عاصیم - رضي الله تعالى عنه - کە ئەمیریان بوو ، فەرمووی : من لەسـەر عەهـدی کافـر ناچمەخوارێ و تەسلیمیان نابم . فەرمووی : خوایا خەبەرمان بدە بـە پێغەمەری خۆت - ﷺ - موشریکەکان تیرەبارانیان کردن عاصیم و شەش رەفیقییان شەهید کردن - رضي الله تعالى عنهم - بە عەهدو میثاق سیانیان چوونە خوارێ ، خوبەیبی ئەنصاریی و ئیبن و دەثینە کە زەیدی کـوڕی موعاویەیەو ، پیاوێکی تریان [کە عەبدوڵڵای کوڕی طاریقی بەلەویی یە]

- رضي الله تعـالى عنهم - كه چـوون‌و تەسليم بـوون كافـره‌كـان ژێی كەوانەكەيان ترازان‌و توند بەستيان ، پياوەكەی تر كه عەبدوڵلايه - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : ئەمه ئەووەڵ غەدره كه كردتان . وەڵلاهی لـەگەڵتـان نايێم منيش وەك ئـەو حەوت رەفيقمـه كه شـەهيدكـران ، رايان كێشاو لەگەڵی خەريك بوون كه لەگەڵيانا بروا نەرۆيی . [دەستی له بەندەكەی دەركێشاو پەلاماری شيرەكەی خۆيی دا ، لێی دووركەوتنەوەو دەورەيان دا به بەرد شەهيديان كرد [له مر الظهران)ا ابن سعد] .

خوبەيب‌و زەيديان برد له مەكه فرۆتيانن ، خوبەيبيان به ئەولادی حەرثی كوڕی عامير فرۆت ؛ چونكی خوبەيب - رضي الله تعالى عنه - له بەدرا حەرثی كوشتبوو [ئيبن‌و دەئينەيان كه زەيده بـه صەفـوانی كوڕی ئومەييه فرۆت ، له باتی باوكی كوشتی . صەفوان - رضي الله تعالى عنه - خوا هيدايەتی دا له فەتحا موسوڵمان بوو] خوبەيبيان - رضي الله تعالى عنه - دەزبـەجێ نەكـوشت [دوايان خست تـا (أشهر الحرم) رابووروێ] بـه ئەسيريی لايان مايەوه ، كه عەزمی ئەوەيان كرد بيكوژن گوێزانێكی له زەينەبی كچی حەرث به ئەمانەت ويست كه خۆيی پێ پاك بكاتەوه . زەينەب گوێزانەكەی دايێ . زەينەب ئەڵێ : من غافڵ بووم كـوڕێكم چووبوه لای خوبەيب‌و لەسەر باوشی خۆيی دانابوو ، كه چاوم پێكەوت كوڕەكەم له باوەشياو گوێزانی بەدەستەوه ئەوەنده ترسام كه خوبەيب له سيمـام فەرقی پێكـرد ، وتی : ئەتـرسی كه بيكـوژم ، من قەط ئـەوه ناكەم ، زەينەب ئەڵێ : وەڵلاهی ! قەط ئەسيری له خوبـەيب چاتـرم نەديوه ؛ وەڵلاهی ! رۆژێ چاوم پێيكەوت هێشووێ ترێی به دەستەوه بوو ئەيخوارد ، توند به زنجير شەتەك درابوو ، له مەكەدا خورما نەبوو [چه جای ترێ !] ئەيوت : ئەوه رزقێ بوو له طەرەف خواوه - عز وجل -

پێی عەطا کرابوو .

که له حەرەم بردیانه دەرێ که له ئەرزی حیللا شەهیدی بکەن فەرمووی : مۆڵەتم بدەن دوو رکات نوێژ بکەم . مۆڵەتیان دا دوو رکات نوێژی کرد ، که سەلامی دایەوە فەرمووی : ئەگەر ئەوە نەبوایە ئێوە وا ظەن ئەبەن که بۆیە طوول بە نوێژەکەم ئەدەم که ترسی ئـەوەم هەیـە بمکوژن طوولم پێ ئەدا . له دواییدا فەرمووی : خوایا یەکە یەکە هەڵیان ژمێرە بە (متفرق) ی بیانکوژە هیچیان مەهێڵەرەوە ، له دواییدا ئەم دوو بەیتەی خوێنەوە که مەعنای وایە :

لەو وەختەدا که بە موسوڵمانیی ئەکوژرێم موبالات ناکەم بەوە که بەسەر هەر لایەکما بمخەن و بمکوژن ، ئەو کوژرانی منە صیرف بۆ ئەمەیە که ئیطاعەتی ذاتی خوام کـردوە . ئەگـەر خوا ـ عـز وجل ـ ئیـرادە بکا بەرەکەت ئەخاتە ئەعزای جەسەدێ که لەت لەت کراوە .

له پاشا (ئەبو سیروەعە) عەقەبەی کوڕی حەرثی بـرای زەینەب هەڵسا شەهیدی کرد .

عـاصیم ـ رضي الله تعالى عنـه ـ یەکێ لـە گەورەی قـورەیشی کـوشتبوو ، [بـە ئەمری پێغەمـەر ـ ﷺ ـ که عـەقەبـەی کوڕی ئـەبو موعەیطە ، ئەوەیە که پێغەمەر ـ ﷺ ـ = لـە = سوجـدەدا بوو ، چـوو ورگ و ریخۆڵەو پیسـایی وشتری دا بـەسەر شـانیا ! حـەزرەتی (فاطمـة الزهراء) ـ رضي الله تعالى عنها ـ تەشریفی چوو لەسەری لادا] قورەیش ناردیان که ئەعزایێ له عاصیم ـ رضي الله تعالى عنه ـ ببڕن و بۆ ناونیشانی ئەمە که شەهید کراوە پێنیشانیان بدەن تا باوەڕ بکەن بەوە که شـەهید کراوە . خوا وەك پەڵە هەور زەردەواڵەی نارد دەورەی عاصیمیان دا ، رێی فروستادەکەیان نەدا که پارچەیێکی لێ ببڕن !

[مووسای کوڕی عەقەبە کە یەکێکە لە راوییان ئەوەی لە راویەکانی = تر = لە حەدیثەکە زیاد کردوە : ئەو بەنیحەرثە کە خوبەیبیان شەهیدکرد ساڵ تێوەرنەسوورایەوە یەکێکیان نەما] .

ئەووەڵ کەسێ کە لە پێش قەتلا دوو رکات نوێژی کردوە بە سونەت خوبەیب بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ چونکی لە زەمانی پێغەمەرا بوو کە بیستی ئینکاری نەکردو بە جوانی زانی .

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوای فەتحی خەیبەر هات (ساڵی ٦) ئەم حادیثەیە (ساڵی ٤) واقیع بوە ، کە وابێ مورسەلی صەحابیە .

لە کەیفیەتی ئەم حادیثەدا هیچ موسوڵمانێ حازر نەبوە ، دە کەسەکەیش هەموو شەهیدکران هیچیان نەمایەوە کە بیگێرێتەوە . یا پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە وەحی خەبەری داوە ، وەك لە حەدیثەکەدا ئەفەرموێ : خوا ـ عز وجل ـ دۆعاکەی عاصیمی قەبووڵ کرد ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری دا بە ئەصحابی کە عاصیمو ئەصحابی چییان بەسەر هات ـ رضي الله تعالى عنهم ـ یا بەعزێ لەوانە کە حازر بوون موسوڵمان بوونو خەبەریان داوە وەك زەینەبو صەفوان .

(غزوة بئر معونة) حەدیثی دائیر بەو (إن شاء الله) لە روکووعو سوجوودا یێ ؛ چونکی مەبدەئی قونووتە (مع الرجيع سنة أربع) .

(غزوة عكل) حەدیثی لە (سیر)[1] رابورد .

خيبر بعد المريسيع سنة ست أحاديثها مرت ، ويأتي (إن شاء الله تعالى) غزوة مريسيع وبني المطلق سنة ست في شعبان ، وفيها حديث

(١) دانەر ـ خ ـ ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە نەنووسیوە .

الافك . أحاديثها مرت ويأتي - إن شاء الله تعالى - .

غـزوة ذات الرقـاع وهي غـزوة محـارب خصفـة وبني ثعلبـة من غطفان ، وهي بعد خيبر ؛ لأن أبا موسى - رضي الله تعالى عنه - جاء بعد خيبر سنة سبع ، وفيها صلاة الخوف .

**١٣٧٧/٥٨ عن جابر بن عبـدالله - رضي الله تعالى عنهـما - أن النبي - ﷺ - صلى بأصحابه في الخوف في غزوة السابعة ، غزوة ذات الرقاع .**

**ح - ٦/ ٣٢٠ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - لە غەزای حەوتەما کە غەزای (ذات الرقـاع) ە صەلاتی خەوفی بە ئەصحابی کرد .

**١٣٧٨/٥٩ جابر - رضي الله تعالى عنه - قال : صلى النبي - ﷺ - بهم يوم محارب وثعلبة [وهي ذات الرقاع] . ح - ٦/ ٣٢٠ .**

**١٣٧٩/٦٠ جابر - رضي الله تعالى عنه - (قال) : خرج النبي - ﷺ - إلى ذات الرقاع من نخل [موضع من أراضي غطفـان] فلقي جمعا من غطفان ، فلم يكن قتال ، وأخاف الناس بعضهم بعضا . فصلى النبي - ﷺ - ركعتي الخوف . ح - ٦/ ٣٢٠ .**

**عن سلمة[١] بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه - قال : غزوت مع النبي - ﷺ - يوم القرد . [قبل خيبر بثلاث . ربيع الأول سنة ٦][٢] .**

---

(١) دانەر - خ - لەسەر ئەمەی نووسیوە : (يكتب بعد خيبر) نەمزانی مەبەستی چیە ، تەماشای (ارشاد الساری) م کرد ، ریوایـەتی جیاجیـای تیایـە ؛ هەندێك ئەفەرموون : دوای خەیبەر ، هەندێکیش پێش خەیبەر .

(٢) دانەر - خ - ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە نەنووسیوە .

ح - ٦/٣٢٠ .

تەرجەمە :

جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - لە رۆژی (محارب)و (خصفة)و (ذات الرقاع) - کە یەکێکن - نوێژی خەوفی بە ئەصحابی کرد . جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی چوو بۆ (ذات الرقاع) کە جێیێکە لە نەخل کە ئەرازیی غەطفانە ، تووشی جەماعەتێ لە غەطفان بوو ، شەڕ نەکرا بەعزێ لە خەڵق بەعزێکی ترسان ، پێغەمەر - ﷺ - نوێژی خەوفی پێکردن .

٦١/١٣٨٠ عن أبي موسى - رضي الله تعالى عنه - قال : خرجنا مع النبي - ﷺ - في غزاة ونحن في ستة نفر ، بيننا بعير نعتقبه ، فَنَقَبت أقدامنا ونَقَب قدماي وسقطت أظفاري ، فكنا نَلُفُّ على أرجلنا الخِرَق ، فسمِّيت غزوة ذات الرقاع لما كنا نَعْصِب من الخرق على أرجلنا !

وحدث أبو موسى بهذا الحديث ، ثم كرِه ذلك ، قال : ما كنت أصنع بأن أذكره ! كأنه كره أن يكون شيٌ من عمله أفشاه .

ح - ٦/٣٢١ . م - ٧/٤٧٦ . وفي مسلم زيادة : والله يجزي به .

تەرجەمە :

ئەبو مووسای ئەشعەریی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - چووینە غەزایێ ، ئێمە شەش کەس بووین ، تەنها وشترێکمان بوو بە نۆبە سواری ئەبووین ، پێمان کون کون بوو . منیش پێم کون کون بوو نینۆکم هەڵوەری ، پەڕۆمان لە پێوە ئەپێچا ، بۆیە ئەو غەزایە ناونرا (ذات الرقاع) .

ئەبومووسا - رضي الله تعالى عنه - ئەم حەدیثەی ریوایەت کرد ، لە پاشا کەرهانی ، فەرمووی : من چیمە لەمە کە ذیکری ئەو حاڵەتە بکەم !

(كأنه) ئەیکەرهان کە شتێك لە عەمەلی خەیری فاش بکا . [چـونکی کەتمانی عەمەل لە ئیفشای ثەوابی زیاترە] .

## غزوة ذات قَرَد - قبل خيبر بثلاث - وحديبية ، وخيبر

١٣٨١/٦٢ سلمة بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه - [يقول : خرجت قبل أن يؤذن بالأولى ، وكانت لقاح رسول الله - ﷺ - ترعى بذي قرد ، م] قال : خرجت من المدينة ذاهبا نحو الغابة ، حتى إذا كنت بثنية الغابة لقيني غلام لعبدالرحمن بن عوف ، قلت : ويحك ! مابك ؟ قال : أُخِذت لقاح رسول الله - ﷺ - قلت : من أخذها ؟ قال : غطفان ، وفزارة . فصرخت ثلاث صَرخات : يا صباحاه ! يا صباحاه ! قال : فأسمعت مابين لابتي المدينة . ثم اندفعت حتى ألقاهم ، وقد أخذوها . فجعلت أرميهم وأقول : أنا ابن الأكوع ، واليوم يوم الرضع . [الذين رضعوا اللؤم من ثدي أمهم] فاستنقذتها منهم قبل أن يشربوا . فأقبلت بها أسوقها . فلقيني رسول الله - ﷺ - فقلت : يا رسول الله إن القوم عطاش ، وإني أعجلتهم أن يشربوا سِقْيَهم فابعث في أثرهم . فقال : يا ابن الأكوع ملكت فأسْجِح [فأرفقْ وأحسِنْ] إن القوم يُقْرَوْن في قومهم .

ح - ٦/١٥٥ . م - ٧/٤٥٢ ن . ح - ٦/٣٤٥ .

١٣٨٢/٦٣ سلمة [بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه -] قال : قدمنا الحديبية مع رسول الله - ﷺ - ونحن أربع عشرة مائة ، وعليها خمسون شاة لاترويها . قال : فقعد رسول الله - ﷺ - على جبا الركية [حول البئر] فإما دعا ، وإما بَسَق ، قال : فجاشتْ فسقينا واستقينا . قال : ثم إن رسول الله - ﷺ - دعانا للبيعة في أصل الشجرة ، قال : فبايعتهُ أول الناس ، ثم بايع وبايع حتى إذا كان في وسط من الناس قال : بايع يا سلمة ، قال : قلت : قد بايعتك يا رسول الله في أول الناس ، قال : وأيضا . ورآني رسول الله - ﷺ - عَزِلا [أو بضمهما] يعني ليس معه

سلاح . قال : فأعطاني رسول الله - ﷺ - جحفة أو درقة ، ثم بايع حتى إذا كان في آخر الناس قال : ألا تبايعني يا سلَمة ؟ قال : قلت : قد بايعتك يا رسول الله في أول الناس ، وفي وسط الناس ، قال : وأيضا . قال : فبايعته الثالثة . ثم قال : يا سلَمة أين جحفتك ، أو درقتك التي أعطيتك ؟ قال : قلت : يا رسول الله لقيني عمى عامر عَزِلا فأعطيته إياها . قال : فضحك رسول الله - ﷺ - وقال : إنك كالذي قال الأول : اللهم أبغني حبيبا هو أحبُّ إليَّ من نفسي .

ثم إن المشركين راسلونا الصلح حتى مشى بعضنا في بعض ، واصطلحنا ، قال : فكنت تبيعا لطلحة بن عبيد الله : أسقي فرسه ، وأحسه ، وأخدمه ، وآكل من طعامه . وتركت أهلي ومالي مهاجرا إلى الله ورسوله - ﷺ - . قال : فلما اصطلحنا نحن وأهل مكة واختلط بعضنا ببعض أتيت شجرة فكسحت شوكها فاضطجعت في أصلها . قال : فأتاني أربعة من المشركين من أهل مكة ، فجعلوا يقعون في رسول الله - ﷺ - فابغضتهم ، فتحولت إلى شجرة أخرى ، وعلقوا سلاحهم واضطجعوا فبينما هم كذلك إذ نادى منادٍ من أسفل الوادي للمهاجرين قتل ابن زُنَيم . قال : فاخترطت سيفي ثم شددت على اولائك الأربعة ، وهم رُقود ! فأخذت سلاحهم ، فجعلته ضغثا في يدي . قال : ثم قلت : والذي كرَّم وجه محمد - ﷺ - لايرفع أحد منكم رأسه إلا ضربت الذي فيه عيناه ! قال : ثم جئت بهم أسوقهم إلى رسول الله - ﷺ - قال : وجاء عمي عامر برجلٍ من العَبَلات يقال له : مكرز ، يقوده إلى رسول الله - ﷺ - على فرس مجفَّف [جل ليّكراو] في سبعين من المشركين ، فنظر إليهم رسول الله - ﷺ - فقال لهم : دعوهم يكن لهم بدء الفجور وثِناه

[أي : أوله وآخره] فعفا عنهم رسول الله - ﷺ - وأنزل الله : ﴿وهو الذي كف أيديهم عنكم وأيديكم عنهم ببطن مكة من بعد أن أظفركم عليهم . . .[1] الآية كلها﴾ .

قال : ثم خرجنا راجعين إلى المدينة فنزلنا منزلا بيننا وبين بني لحيان جبل ، وهم المشركون ، فاستغفر رسول الله - ﷺ - لمن رقيَ هذا الجبل الليلة كأنه طليعة للنبي - ﷺ - وأصحابه . قال سلَمة : فرقيت تلك الليلة مرتين أو ثلاثا ، ثم قدمنا المدينة فبعث رسول الله - ﷺ - بظهره مع رباح غلام رسول الله - ﷺ - وأنا معه ، وخرجت معه بفرس طلحة أُنَدِّيه [ابديه . نسخة] مع الظهر [ئەمبرد بۆ دەشت بیلەوەڕێنم و ئاوی بدەم] فلما أصبحنا إذا عبدالرحمن الفزاري قد أغار على ظهر رسول الله - ﷺ - فاستاقه أجمع وقتل راعيه ، قال : فقلت : يا رباح خذ هذا الفرس فأبلغه طلحة بن عبيد الله وأخبر رسول الله - ﷺ - أن المشركين قد أغاروا على سرحه .

قال : ثم قمت على أكمة فاستقبلت المدينة فناديت ثلاثا : يا صباحاه ! ثم خرجت في آثار القوم أرميهم بالنبل وأرتجزُ أقول :

أنا ابن الأكوع ، واليوم يوم الرضع .

فألحق رجلا منهم فأصك سهما في رحله حتى خلص نصل السهم إلى كتفه ، قال : قلت : خذها وأنا ابن الأكوع واليوم يوم الرضع ! قال : فوالله ما زلت أرميهم وأعقر بهم ، فإذا رجع إلي فارس أتيت شجرة فجلست في أصلها ثم رميته فعقرت به ، حتى إذا تضايق الجبل

---

(١) الفتح / ٢٤ .

فدخلوا في تضايقه علوت الجبل ، فجعلت أُردِّيهم بالحجارة ، قال : فما زلت كذلك أتبعهم حتى ما خلق الله من بعير من ظهر رسول الله ـ ﷺ ـ إلا خلفته وراء ظهري وخلّوا بيني وبينه ، ثم أتبعتهم أرميهم حتى ألقوا أكثر من ثلاثين بردة وثلاثين رمحا يستخفون . ولا يطرحون شيئا إلا جعلت عليه آراما من الحجارة [علامات ، واحدتها اِرَم] يعرفها رسول الله ـ ﷺ ـ وأصحابه . حتى أتوا متضايقا من ثنية فإذا هم قد أتاهم فلان بن بدر الفزاري ، فجلسوا يتضحون يعني يتغذَّوْن وجلست على رأس قَرْن [جبل صغير منفرد] قال الفزاري : ما هذا الذي أرى ؟ قالوا لقينا من هذا البَرْح [شدة] والله ما فارقنا منذ غلس يرمينا حتى إنتزع كل شيْ في أيدينا ! قال : فليقم إليه نفر منكم أربعة . قال : فصعد إليّ منهم أربعة في الجبل ، قال : فلما أمكنوني من الكلام قال : قلت : هل تعرفونني ؟ قالوا : لا ، ومن أنت ؟ قال : أنا سلمة بن الأكوع . والذي كرَّم وجه محمد ـ ﷺ ـ لا أطلب رجلا منكم إلا أدركته ، ولا يطلبني رجل منكم فيدركني . قال أحدهم : أنا أظن .

قال : فرجعوا ، فما بَرِحت مكاني حتى رأيت فوارس رسول الله ـ ﷺ ـ يتخللون الشجر . قال : فإذا أولهم الأخرم الأسدي وعلى إثره أبو قتادة الأنصاري ، وعلى إثره المقداد بن الأسود الكندي . قال : فأخذت بعنان الأخرم ، قال : فولوا مدبرين . قلت : يا أخرم إحذرهم لايقتطعوك حتى يلحق رسول الله ـ ﷺ ـ وأصحابه . قال : يا سلمة إن كنت تؤمن بالله واليوم الآخر وتعلم أن الجنة حق والنار حق فلا تَحُلْ بيني وبين الشهادة ! قال : فخليته فالتقى هو وعبدالرحمن قال : فعقر بعبدالرحمن فرسه وطعنه عبدالرحمن فقتله وتحول على فرسه . ولحق أبو

قتادة فارس رسول الله بعبدالرحمن فطعنه فقتله . فوالذي كرّم وجه محمد - ﷺ - لتبعتهم أعدو على رجلي حتى ما أرى من ورائي من أصحاب محمد - ﷺ - ولا غبارهم شيئا ، حتى يعدلوا قبل غروب الشمس إلى شعب فيه ماء يقال له : ذا قَرْد ليشربوا منه وهم عطاش ، قال : فنظروا إلي أعدو وراءهم فخليتهم عنه [أي طردتهم عنه] يعني أجليتهم عنه . فما ذاقوا منه قطرة . قال : ويخرجون فيشتدون في ثنية ، قال : فأعدو فألحق رجلا منهم فأصكه بسهم في نغض كتفه . قال : قلت : خذها وأنا ابن الأكوع ، واليوم يوم الرضع ! قال : يا ثَكَلْته أمه أكوعه بُكْرَة ؟ قال : قلت نعم يا عدو نفسه أكوعك بكرة . [دايكت روّله‌ڕوّت بوّ بكا توّ ئه‌و ئه‌كوه‌عه‌ى كه‌ به‌يانى شوێنمان كه‌وتى ؟ وتم : به‌لّێ .]

قال : وأَرْدوا [معجمة خلفوا ، ومهملة أهلكوا] فرسين على ثنية ، قال : فجئت بهما أسوقهما إلى رسول الله - ﷺ - . قال : ولحقني عامر بسطيحة فيها مَذْقة من لبن ، وسطيحة فيها ماء ، فتوضأت وشربت ، ثم أتيت رسول الله - ﷺ - وهو على الماء الذي حَلأتهم عنه ، فإذا رسول الله - ﷺ - قد أخذ تلك الابل وكلَّ شيْ استنقذته من المشركين ، وكل رمح وبردة ، وإذا بلال نحر ناقة من الابل الذي إستنقذته من القوم ، وإذا هو يشوي لرسول الله - ﷺ - من كبدها وسنامها .

قال : قلت : يا رسول الله خلني فأنتخب من القوم مائة رجل فأتبع القوم فلا يبقى منهم مخبر إلاّ قتلته ! قال : فضحك رسول الله - ﷺ - حتى بدت نواجذه في ضوء النار ، فقال : يا سلمة أتراك كنت فاعلا ؟ قلت : نعم والذي أكرمك ! فقال : إنهم الآن ليَقْرَوْن في أرض غطفان . قال : فجاء رجل من غطفان ، فقال : نحر لهم فلان جزورا فلما كشفوا جلدها

رأوا غبارا . فقالوا : أتاكم القوم فخرجوا هاربين . فلما أصبحنا قال رسول الله - ﷺ - : كان خير فرسانا اليوم أبو قتادة ، وخير رجالتنا سلمة .

قال : ثم أعطاني رسول الله - ﷺ - سهمين : سهم الفارس ، وسهم الراجل . فجمعهما لي جميعا ، ثم أردفني رسول الله - ﷺ - وراءه على العضباء راجعين إلى المدينة . قال : فبينما نحن نسير قال : وكان رجل من الأنصار لايُسبَق شدّا ، قال : فجعل يقول : ألا مسابق إلى المدينة ؟ هل من مسابق ؟ فجعل يعيد ذلك . . . قال : فلما سمعت كلامه قلت : أما تُكرِم كريماً ولاتهاب شريفا ؟ قال : لا إلاّ أن يكون رسول الله - ﷺ - قال : قلت : يا رسول الله بأبي أنت وأمي ! ذرني فلأسابق الرجل . قال : إن شئت . قال : قلت : اذهب إليك ، وثنيت رجلي فطفرت وعدوت ، قال : فربطت عليه [حبست نفسي] شرفا أو شرفين أستبقي نَفَسي [لئلا يقطعني] ثم عدوت في أثره فربطت عليه شرفا أو شرفين ، ثم إني رفعت حتى ألحقه ، قال : فأصكه بين كتفيه . قال : قلت : قد سبقت والله . قال : أنا أظن . قال : فسبقته إلى المدينة .

قال : فوالله ما لبثنا إلا ثلاث ليال حتى خرجنا إلى خيبر مع رسول الله - ﷺ - ، قال : فجعل عمي عامر يرتجز بالقوم :

تالله لولا الله ما اهتدينا
ولا تصدقنا ، ولا صلينا
ونحن عن فضلك ما استغنينا
فثبت الأقدام إن لاقينا
وأنزلن سكينة علينا

فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : من هذا ؟ قال : أنا عامر . قال : غفر الله لك ربك . قال : وما استغفر رسول الله ـ ﷺ ـ لانسان يخصه إلا استشهد . قال : فنادى عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهو على جمل له : يا نبي الله لولا متعتنا بعامر ! قال : فلما قدمنا خيبر قال : خرج ملكهم مرحب يخطِر بسيفه [يرفعه تارة ويضعه أخرى] ويقول :

قد علمت خيبر أني مرحب
شاكي السلاح ، بطل مجرب
إذا الحروب أقبلت تلهب

قال : وبرز له عمي عامر فقال :

قد علمتُ خيبر أني عامر
شاكي السلاح ، بطل مغامر

قال : فاختلفا ضربتين ، فوقع سيف مرحب في ترس عمي عامر ، وذهب عامر يسْفُلُ له فرجع سيفه على نفسه فقطع أكحله ، فكانت فيها نفسه .

قال سلمة : فخرجت فإذا نفر من أصحاب النبي ـ ﷺ ـ يقولون : بطل عَمَلُ عامر : قتل نَفْسَه ! قال : فأتيت النبي ـ ﷺ ـ وأنا أبكي . فقلت : يا رسول الله ـ ﷺ ـ بطل عمل عامر ، قال رسول الله ـ ﷺ ـ : من قال ذلك ؟ قال : قلت : ناس من أصحابك . قال : كذب من قال ذلك . بل له أجره مرَّتين . ثم أرسلني إلى علي وهو أرمدُ ، فقال : لَأعطين الراية رجلا يحب الله تعالى ورسوله ـ ﷺ ـ أو يحبه الله ورسوله . فأتيتُ عليا فجئت به أقوده وهو أرمدُ حتى أتيت به رسول الله ـ ﷺ ـ فبسق في عينيه فبرأ ، وأعطاه الراية . وخرج مرحب فقال :

قد علمت خيبر أني مرحب
شاكي السلاح ، بطل مجرَّب
إذا الحروب أقبلت تلهَّب

فقال علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ :

أنا الذي سمَّتني أُمِّي حيدره
كليث غابات كريه المنظره
أوفيهم بالصاع كيل السندره

[مكيال واسع . أي أقتل الاعداء قتلا واسعا]

قال : فضرب رأس مرحب فقتله ، فكان الفتح على يديه ـ رضي الله تعالى عنه ـ م ـ ٧/٤٥٢ إلى ٤٦٢ .

تەرجەمە :

ئەم حەدیثە سێ غەزای تیایە ، بەعزێ لـە صوڵحی حـودەیبییەو (بیعة الرضوان) ، غەزوەی (ذات القرد) ، غەزوەی فەتحی خەیبەر ، سێ موعجیزەیشی تیایە .

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ چـووینە حـودەیبییە ، چـوارده صەد بـووین [یەعنی هەزارو چوارصەد بووین] پەنجا مەڕ لەسەر ئەو بیری حودەیبییە بوو تێرئاوی نەئەکردن ، ئەوەندە ئاوەکەی کەم بوو . پێغـەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لەسەر لێـواری بیرەکـە دانیشت ، یا دوعـای کرد ، یـا تفی موبارەکی خۆیی تێکرد ، ئاوی بیرەکە جۆشی و ئـاومان لێ خـواردەوەو حەیوانمان لێ ئاودا . [ئەمە موعجیزەیێکە] .

لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ بانگی کردین بۆ بەیعەت لـە بن درەختی

ریضوانا ، لەگەڵ ئەووەڵی خەڵقا بەیعەتم لە خذمەتیا کرد ، لە پاشا بەیعەتی کردو کردی تا نیوەی خەڵق تەواو بوو . لە پاشا فەرمووی : یاسەلەمە بەیعەت ناکەی ؟ عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) لەگەڵ ئەووەڵی خەڵقا بەیعەتم لە خذمەتتا کرد . فەرمووی : دیسان . پێغەمەر ـ ﷺ ـ منی بێ سیلاح دی ، قەڵغانێکی دامێ ، لە پاشا موبایەعەی لەگەڵ خەڵقا کرد تا نیهایەتی خەڵق هات ، فەرمووی : یا سەلەمە موبایەعە ناکەی ؟ عەرزم‌کرد : لە ئەووەڵاو لە ناوەڕاستی خەڵقا موبایەعەم لە خذمەتتا کردی . فەرمووی : دیسان . دەفعەی سێیەمیش موبایەعەم لە خذمەتیا کرد . لە پاشا پێی فەرمووم : یا سەلەمە قەڵغانەکەت کوانێ ؟ عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) عامیری مامم پێگەیی قەڵغانی نەبوو دام بەو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێکەنیو فەرمووی : تۆ لەو پێشینە ئەچیت کە وتی : یارەببی دۆستێکم بدەرێ لە خۆم لە لام خۆشەویستر بێ !

لە پاشا موشریك ناردیانە لامان بۆ صوڵح ، خەڵق تێکەڵی یێك بوون ، صوڵحیان لە لا ناخۆش بوو ، صوڵحمان کرد . من لەو جێدەدا[1] تابیعی طەلحەی کوڕی عوبەیدیللا بووم ، ئاوم ئەدا بە ئەسپەکەیی و رنەکم ئەکردو خذمەتم ئەکردو ، لە طەعامی ئەوم ئەخوارد . تەرکی ئەهلو ماڵو منالم کردبوو هیجرەتم بۆ لای خواو (رسول الله) کردبوو ـ ﷺ ـ کە ئێمەو ئەهلی مەکە صوڵحمان کرد ئێمەیش چونکی صوڵحمان لەلا خۆش نەبوو تێکەڵو پێکەڵ بووین ، چووم بە لای دارێکەوە درکو مرکەکەم لێ کردەوەو ژێریم ماڵیو لە بنیا راکشام . چوار کەس لە

(١) مەبەستی جێگەیە ، بەڵام کە (د)ی یەکەم سووك بکرێو بە شێوەی ئەوسای سلێمانی بخوێنرێتەوە ، وەك خۆی لە سەرەتای بەرگی یەکەمدا نووسیویە .

موشریكی مەكە هاتن دەستیان كرد بە ناماقوولّی دەرحەق پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەزم لێ نەكردن ، چوومە بن درەختێكی ترەوە ، ئەوانیش سیلاحەكانیان بە درەختەكەدا هەلّاوەسی و لێی راكشان . لەو وەختەدا كە ئەوان لێی راكشابوون بانگكەرێ لە خوار وادی‌یەكەوە بانگی كرد : ئەی موهاجیرین (إبن زنیم) شەهید كرا . منیش شیرم لە كالان دەركێشاو چوومە سەر ئەو چوار كەسە ، خەویان لێ كەوتبوو ، سیلاحەكانیانم هەلّگرت و لە دەستما كۆمەلّم كرد ، لە پاشا پێم‌وتن : قەسەم بەوەی كە ذاتی محەمەدی ـ ﷺ ـ گەورەو موكەرەم كردوە ! هەركامێكتان سەر بەرز بكەنەوە لەوەی ئەدەم كە دووچاوی ئەوی تیایە [یەعنی لەسەری ئەدەم] لە پاشا پێش خۆمم دان و بردمنە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عامیری مامیشم پیاوێكی موكرەز ناوی لە عەشیرەتی عەبەلاتی سواری ئەسپێكی جل‌لێكراوی لەگەلّ حەفتا موشریكا بردە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەماشای كردن و فەرمووی : بەریان‌دەن وازیان لێ بێنن با ئەووەلّ و ئاخری خراپە لە طەرەف ئەوانەوە بێ . [یەعنی با ئەوان صولحەكە هەلّوەشێنن] . پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەفوی فەرموون . خوا ـ عز وجل ـ ئەو ئایەتەی نازلّ فەرموو كە مەئالی شەریفی وایە :

خوا ئەو خوایە كە لە دوای ئەوە ئێوەی ظەفەریاب كرد لە مەكەدا بەسەریانا دەستی ئەوانی لە ئێوە بەست نەیانتوانی زەرەرتان پێ بگەیێنن ، دەستی ئێوەیشی لەوان بەست كە عەفووتان كردن .

سەلەمە فەرمووی : لە پاشا لە مەكە چووینە دەرێ گەراینەوە بۆ مەدینە لە مەنزلّێكا دابەزین لە بەینی ئێمەو بەنی لەحیانا شاخێ بوو ، بەنو لەحیان موشریك بوون ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ (إستغفار)ی كرد بۆ ئەو كەسەی ئیمشەو سەر ئەم شاخە بكەوێ وەك جاسووسي بكا . من دوو

دەفعە یا سێ دەفعە سەرکەوتم ، لە پاشا گەیینەوە مەدینە . پێغەمەر - ﷺ - حەیوانی سواریی و وشترەکانی لەگەڵ رەباحا - کە غولامی پێغەمەر بوو - ﷺ - ناردە لەوەڕ ، منیش لەگەڵ رەباحا ئەسپەکەی طەلحەم برد[1] لەگەڵ حەیوانەکانی پێغەمەرا - ﷺ - بردە دەشتێ کە ئاوی بدەم و بی‌لەوەڕێنم ، کە سبەینێمان لێ بووەوە عەبدورەحمانی فەزاریی دابووی بەسەری حەیوان و وشترەکانی پێغەمەرا - ﷺ - و شوانەکەی شەهید کردبووو گەلەکەی بردبوو . ئەسپەکەی طەلحەم دا بە رەباح و پێم وت : ئەم ئەسپە بگەیێنەرەوە طەلحەو خەبەر بە بە پێغەمەر - ﷺ - کە موشریکان دایان بەسەر گەلەکەیاو بردیان .

لە پاشا خۆم هەڵسام چوومە سەر گردێ و رووم کردە مەدینە ، سێ دەفعە بانگم کرد : ئەی بۆ ئەم سبەینێیە ! [یەعنی بێن بە هاوارمەوە] لە پاشا خۆم شوێنیان کەوتم و تیرم تێ ئەگرتن و ئەموت : من (إبن الأكوع) م و ئیمرۆ رۆژی ئەوانەیە کە بە منالیی لە مەمکی دایکیان شیری رەزالەتیان مژیوە ! ئەگەییم بە پیاوێکیان و لە بارەکەییم ئەداو پەیکانی تیرەکە لە شانیەوە ئەهاتەدەرێ . وتم : بیگرە من (إبن الأكوع)م ، ئیمرۆ رۆژی ئەوانەیە کە شیری نامەردییان مژیوە ! فەرمووی : وەڵلاهی لێیان نەکەوتمەوە هەر تیرم تێ ئەگرتن و لێم ئەکوشتن . ئەگەر یەکێکیان بگەڕایەوە بۆم لە بن دارێ بۆی دائەنیشتم و تیرم تێ ئەگرت و ئەمکوشت . تا بەینی شاخەکە تەنگ بۆوە ، چوونە ناو تەنگەبەریی شاخەکەوە منیش چوومە سەر شاخەکە بەردم بەسەرا تلۆر ئەکردنەوە ، هەر بەم نەوعە شوێنیان کەوتم تا هەر وشترێکی پێغەمەر - ﷺ - کە خوا خەلقی کردبوو

(١) ئەم (برد) ە لێرەدا نەبێ باشترە .

پێم بەجێ هێشتن و خستمنە دوای خۆمەوە بۆیان بەجێ هێشتم هەر شوێنیان کەوتم و تیرم تێ ئەگرتن ، تا زیاتر لە سی عەباو رمیان فڕێ دا ، بەوە باری خۆیان سووك ئەکرد ، هەر شتێکیان فڕێ ئەدا بە بەرد نیشانەییکم لەسەر دائەنا تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەصحابی بیناسن .

تا هاتنە دەربەندێکی تەنگەوە ، فلانی کوڕی بەدری فەزارییان هاتەلا ، دانیشتن و دەستیان کرد بە نان خواردن ، منیش لەسەر شاخێکی جوێ لە شاخەکانی تر دانیشتم ، فەزاری یەکە لێی پرسین : ئەو پیاوە کێیە کە ئەیبینم ؟ پێیان وت : لە تاریکی شەوەوە لەمەوە تووشی ئەذیەت و مەشەقەت بووین . وەڵلاهی لە شەوێوە هەر بەردو تیرمان تێ ئەگرێ ، تا هەرچییێکمان پێ بوو لێی سەندین . پێی وتن : چوار کەستان بچێتە لای ، فەرمووی : چوار لەوان سەرکەوتن بۆ لام ، کە وابوو قسەیان لەگەڵ بکەم پێم‌وتن : ئەمناسن ؟ وتیان : خەیر تۆ کێی ؟ وتم : من سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم ، قەسەم بەوەی کە ذاتی پێغەمەری ـ ﷺ ـ عەزیزو موکەڕەم کردوە ! شوێن هەرکەسێکتان بکەوم ئەیگەمێ ، هەرکەسێ لە ئێوە شوێن من بکەوێ نامگاتێ . یەکێکیان وتی : منیش وا ظەن ئەبەم . ئەو چوارە گەڕانەوە لایان ، لە جێی خۆم نەجووڵام تا سوارەی پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بەچاوکرد ئەچوونە بەینی درەختەکانەوە ، لە پێشا ئەخرەمی ئەسەدیی هات ، لە دوای ئەو ئەبوقەتادەی ئەنصاریی هات ، لە دوای ئەو میقدادی کوڕی ئەسوەدی کیندیی هات . ئەوان پشتیان هەڵکردو ڕۆیین ، دەستەجڵەوی ئەخرەمم گرت وتم : خۆت بپارێزە مەبادا بڕت بدەن ، صەبر بکە تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەصحابی تەشریفیان بێ . ئەخرەم وتی : ئەی (إبن الأکوع) ئەگەر ئیمانت بە خواو ئاخیرەت و بەوە جەننەت حەقەو جەهەننەم حەقە = هەیە = مەکەوەرە

بەینی منو شەهیدبوون ، بەرەڵلام کرد لەگەڵ عەبدوڕەحمانی فـەزارییا گەیین بە یەك ؛ ئەخرەم ئەسپەکەی عەبدوڕەحمانی کوشت ، ئەویش دای لە ئەخرەم شەهیدی کردو سواری ئەسپەکەی ئەو بوو . ئەبوقـەتادەی سوارچاکیی پێغەمەر - ﷺ - گەیی بە عەبدوڕەحمانو لێیداو کوشتی .

قەسەم بەوەی کە پێغەمەری - ﷺ - گـەورەو موکـەڕەم کردوە ! شوێنیان کەوتمو بە پێیان هەڕام ئەکرد تا لە پشت خۆمەوە نە ئەصحابی پێغەمەرم - ﷺ - و نە تۆزیانم ئەدی لە پشت خۆمـەوە[1] . تا لـە پێش ڕۆژئاوابوونا لایان دا بۆ ناو شاخێ ئاوێکی تیا بو ، ناوی (ذو قەرد) بوو ، تا لە ئاوەکەی بخۆنەوە ، تینوویان بوو ، تەماشایان کرد کە بەشوێنیانەوەم هەڕا ئەکەم لە ئاوەکەم دوورخستنەوە ، قەترەییێکیان لێ تـام نەکـرد ، لەوێ چوونەدەرێو هەڕایان ئەکرد ، لە بەینی دوو شاخـا ئەگـەییم بە یەکێکیانو تیرێکم دا لە نـاوشانی وتم : وەری‌گـرە من (إبن الأكوع)م ئیمڕۆ ڕۆژی ئەو کەسەیە کە لە مەمکی دایکی شیری نامەردیی مژیوە ! وتی : ئەی دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکا ! تۆ ئەو ئەکوەعەی کە لە بەیانی‌یەوە بـەشـوێنمـانـەوەی ؟ وتم : بــەڵێ ئـەی دوشمنی نــەفسی خـۆی من ئەکوەعەکەم لە سبەینێوە بە شوێنتانەوەم .

دوو ئەسپیان لە کەلێکـا بەجێ هێشت لێم‌خـوڕین بۆ خـذمەت پێغەمەر - ﷺ - عامیری مامم پێگەیی مەتارەییێکی پێ‌بوو کەمێ شیری تیـابـوو ، مـەتـارەییێکیشی پێ بـوو ئـاوی تیـا بـوو دەزنــوێشم شتو خواردمەوە ، لە پاشا چوومە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی لەسەر ئەو ئاوە بـوو کە لێم دوورخستبـوونەوە نـەمهێشت لێی بخۆنـەوە . کە

(١) ئەم (لەپشت خۆمەوە) یا ئەوەی پێشوویان زیادە .

تێفکریم پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو وشترانەو ئەو شتانە کە لە موشریکەکانم سەندبوو هەموویی لە خذمەتیا هێنابوو ، بیلالیش وشترێکی لەو وشترانە کە لە موشریکەکانم سەندبووەوە سەربڕیبوو لە جگەرو کۆپارەکەی پشتی بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی ئەبرژان . عەرزم کرد : (یا رسول الله) بێڵە کە لە ئەصحاب صەد کەس هەڵبژێرم شوێنیان کەوم ، هیچیان نەیێڵم کە خەبەر بۆ عەشیرەتەکەیان بەرێتەوە هەموویان بکوژم ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ تا خڕێی موبارەکی لەبەر شوعلەی ئاگرەکەدا دەرکەوت پێکەنی . فەرمووی : یا سەلەمە وا تێئەگەی کە ئەوە ئەکەی ؟ عەرزم = کرد = : بەڵێ قەسەم بەوەی ئیکرامی تۆی گرتوە . فەرمووی : ئێستە ئەوان لە ئەرزی غەطفانا ضیافەتیان بۆ کراوەو ئەیخۆن ، پیاوێ لە غەطفان هات ، وتی : فلان وشترێکی بۆ سەربڕین ، کە پێستیان گوروو چاویان بە تۆز کەوت وتیان : خەڵقەکەتان بۆ هات لەوێ چوونەدەرێو هەڕایان کرد .

[ئەم خەبەردانی پێغەمەرەیش ـ ﷺ ـ بەمە کە ئەوانە گەییونە ئەرزی غەطفانو ضیافەتیان بۆ کراوە موعجیزەیە]

سەلەمە ئەفەرموێ : کە رۆژمان لێ بووە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیمرۆ چاترینی سوارەی ئێمە ئەبوقەتادەیە ، چاترینی پیادەی ئێمە سەلەمەیە . سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوو سەهمی دامێ : سەهمی سوارەی دامێو ، سەهمی پیادەیشی دامێ هەردووکی بۆ جەمع کردمەوە . [سەهمی سوارە سیانە : دوو بۆ ئەسپەکەی ، یەکێ بۆ خۆی ، هی پیادەیش یەکێکە ، کە وابێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەبێ چوار سەهمی پێ عەطا فەرمووبێ] لەپاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ سواری پاشکۆی خۆیی کردم لەسەر (عضباء) بۆ مەدینە . سەلەمە ئەفەرموێ : لەو وەختەدا کە ئەڕۆیین پیاوێ بوو لە ئەنصار زۆری هەڕا

ئەكرد ، لە هەڕاكردنا كەس نەیەگەیێ ، دەستی پێكرد ، هەر ئەیوت : كەسێ نی‌یە موسابەقەم لەگەڵ بكا ؟ كەسێ نی‌یە موسـابەقـەم لەگـەڵ بكا ؟ هەر نەیبری‌یەوە ئەیوت‌و ئەیوتەوە ! كە ئەوەم لێ بیست پێم‌وت : تۆ ئیكرامی پیاوێكی كەریم ناكەی ؟ یا لە پیاوێكی گەورە ناترسی ؟ [كە لێت پێشكـەوێ] وتی : خەیـر مەگـەر پێغەمـەر بێ - ﷺ - . عـەرزی پێغـەمەرم كـرد - ﷺ - : (یا رسـول الله) باوك‌و دایكمت بـەفیدا بێ ! موساعەدەم بفەرموو كە موسابەقە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بكەم . فەرمووی : ئەگەر‌ا هەوەست هەیە بیكە .

فەرمووی : پێم‌وت : دەسا هەی پێكە هەڕا كە ! پێم لێ جووت كردو بازدم بردو هەڕام كرد ، دوو سێ سەر خـۆم لێ هێواش كـرد [تا پشـووم بەبـەرا بێتەوە] بـەوە نەفـەسی خۆمم مـوحافـەظە ئـەكـرد لـە تەنگبوون . لە دواییدا كەوتمەوە شوێنی ، هەڕام كرد تاوێ یـا دوو تاو پشووی خۆمم دا ، لە پاشا تاوی خۆمم دا تا كە پێی گەییم دەستم ماڵی بە ناوشانیا ، وتم : وەڵڵاهی وا لێت پێشكەوتم . وتی : لام وایە ، ئەمجا لێی پێشكەوتم تا مەدینە .

سەلەمە فەرمووی : وەڵڵاهی سێ ڕۆژ نەبێ لە مەدینە نەوەستاین تا لە خزمەت پێغـەمەرا - ﷺ - چـووین بۆ خـەیبەر . عـامیری مـامم رەجەزی بۆ ئەصحاب ئەوت ؛ ئەیوت : تەڵڵاهی ئەگەر ئیرادەی خوا نەبوایە رێی راستمان نەئەدۆزی‌یەوەو تەصدیقمان نەئەبوو بە خـواوبە پێغەمەری‌و فەرموودەیان‌و ، نوێژمان نەئەكردو ئێمە لە فەضلی تۆ خوایا (إستغنا) مان نی‌یە . كە وابێ لەگەڵ دوشمنا كە مولاقاتمان = بو = پێمان لە جێێ خۆی ثابت بكە [دڵمان بەقووەت بكە هەڕا نەكەین] سوكوونەت‌و قووەی مەعنەویمان بەسەرا بنێرە خوارێ . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی :

ئەمە کێ یە ؟ عامیر وتی : منم عامیرم . پێغەمەر - ﷺ -= فەرمووی = : خوای خۆت لێت خۆش بێ .

سەلەمە فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - بە خوصووصیی ئیستیغفاری بۆ هەرکەسێ کردبێ بە هەمەحاڵ ئەو کەسە ئەبێ شەهید بووبێ .

عومەری کوری خەطاب - رضي الله تعالی عنه - بە سواری وشترێکی خۆیەوە بانگی کرد : (یا رسول الله) کاشکی بە عامیر (متلذذت) بکردینایە ! کە گەیینە خەیبەر مەرحەبی مەلیکی خەیبەر هاتەدەرێ و شیرەکەی بەفەخرەوە هەڵبری و دای ئەنەوان ، ئەی فڵتان : بە تەحقیق ئەهلی خەیبەر ئەزانێ کە من مەرحەبم و سیلاح تیژم و ، لە حەربا تەجرەبەکراوم کە حەرب هەڵەگیرسێ . عامیری مامم بۆی چوە مەیدان ئەیفەرموو : بە تەحقیق هەموو خەیبەر ئەزانێ کە من عامیرم سیلاح تیژم و تێ هەڵکوتم ، ئەخزێمە ناو شەدائیدو خۆم ئەهاومە ناو ئاگری حەربەوە ! شیریان بۆ یەکتر داهێنا شیری مەرحەب لە قەڵغانەکەی عامیری دا ، عامیر خەریکی ئەوە بوو کە شیرەکەی خۆی بدا لە لای خوارووی مەرحەب ، شیرەکەی گەڕایەوە بۆ خۆی دای لە رەگی رۆحی خۆی ، بەوە شەهید بوو .

سەلەمە فەرمووی : کە چوومەدەرێ بەعزێ لە ئەصحاب ئەیانوت : عەمەلی عامیر بەتاڵ بوەتەوە ، خۆیی کوشت ! بەگریانەوە چوومە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزم کرد : (یا رسول الله) ئایا عەمەلی عامیر بەتاڵ بوەتەوە ؟ فەرمووی : کێ وا ئەڵێ ؟ عەرزم کرد : بەعزێ لە ئەصحابی تۆ . فەرمووی : هەرکەسێ وای وتوە درۆی کردوە ، عامیر دوو ئەجری هەیە .

دوای ئەوە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردمی بە شوێن عەلیدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاوی ئەیێشا . فەرمووی : بەیاخەکە ئەدەم بە یەکێ خوای خۆشەوێ و رەسوولی خوای خۆشەوێ ـ ﷺ ـ ، یا فەرمووی : خواو رەسوولی خوا ـ ﷺ ـ ئەویان خۆشەوێ . [....]

سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : چوومە لای عەلی ـ رضي الله تعالى عنه وقهر أعداءه في الدنيا والآخرة ـ چاوی ئەیێشا ، دەستم راکێشا تا بردمە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ تفی موبارەکی خۆیی کردە ناو چاوی ئەو مەحبووبی خواو پێغەمەرە ـ ﷺ ـ ، بەو موعجیزەی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ چاوی چاك بۆوەو بەیاخەکەی پێ عەطا فەرموو . مەرحەب هاتە مەیدان و فلتانی و رەجەزەکەی پێشووی خوێنەوە . حەزرەتی عەلیی شێری خوا ـ رضي الله تعالى عنه ـ بۆی چوە مەیدان و فەرمووی : من ئەوەم کە دایکم حەیدەری ناو ناوم وەك شێری بێشە وام و مەنظەرەییکی بەهەیبەت و ترسناکم هەیە ، موکافاتی کافران ئەدەمەوە ، بە کەوێکی گەورە بۆیان ئەپێوم . ئەوەی فەرموو لە سەری مەرحەبی داو کوشتی .

ئەمجا بە تەرتیب صوڵحی حودەیبییەو خەیبەر ئەنووسم . ـ ان شاء الله تعالى ـ (ذو القرد) لەو بەینەدا بوە ، ئەم حەدیثە بۆ ئەو کافی یە .

# صلح الحديبية
## المصالحة على ثلاثة أيام

١٣٨٣/٦٤ حدث البراء - رضي الله تعالى عنه - أن النبي - ﷺ - لما أراد أن يعتمر [يوم الحديبية] أرسل إلى أهل مكة يستأذنهم ليدخل مكة ، فاشترطوا عليه : ألا يقيم بها إلا ثلاث ليال ، ولا يدخلها بسلاح إلا بجُلُبّان [وبضم فسكون] السلاح . ولا يدعو منهم أحدا . قال : فأخذ يكتب الشرط بينهم علي بن أبي طالب - رضي الله تعالى عنه - فكتب : هذا ما قاضى عليه محمد رسول الله ، فقالوا : لو علمنا أنك رسول الله لم نمنعك ولَبايعناك ، ولكن أكتب هذا ما قاضى عليه محمد بن عبدالله . فقال : والله أنا محمد بن عبدالله ، وأنا والله رسول الله . قال : وكان لايكتب [أي ولا يقرأ] قال : فقال لعلي ، - رضي الله تعالى عنه - : أمْحُ رسول الله . فقال علي - رضي الله تعالى عنه - : والله لا أمحاه [لغة في أمحوه] أبدا ، قال : فأرنيه فأراه فمحاه النبي - ﷺ - بيده ، فلما دخل ومضى الأيام أتوا عليا - رضي الله تعالى عنه - فقالوا : مر صاحبك فليرتحل ، فذكر ذلك لرسول الله - ﷺ - فقال : نعم ثم إرتحل ح - ٥/٢٣٦ . م - ٧/١٩ ٤ . ح - ٤/٤٠٦ ولفظه :

١٣٨٤/٦٥ عن البراء - رضي الله تعالى عنه - قال : لما صالح رسول الله - ﷺ - أهل الحديبية كتب علي بن أبي طالب - رضي الله تعالى عنه - بينهم كتابا ، فكتب : محمد رسول الله ، فقال المشركون : لاتكتب محمد رسول الله ، لو كنت رسولا لم نُقاتلك . فقال لعلي - رضي الله تعالى عنه - : أمحه ، فقال علي - رضي الله تعالى عنه - : ما أنا بالذي أمحاه ، فمحاه رسول الله - ﷺ - ، وصالحهم على أن يدخل هو وأصحابه ثلاثة

أيام ولا يدخلوها إلا بجُلْبان السلاح ، فسألوه ما جلبان السلاح ؟ فقال : القراب بما فيه . ح ـ ٤/٤٦ . م ـ ٧/٤١٩ د .

٦٦/١٣٨٥ عن البراء ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : إعتمر النبي ـ ﷺ ـ في ذي القَعدة فأبى أهل مكة أن يدَعوه يدخل مكة حتى قاضاهم على أن يقيم بها ثلاثة أيام ، فلما كتبوا الكتاب كتبوا : هذا ما قاضى عليه محمد رسول الله ، فقالوا : لا نُقرُّ بها ، فلو نعلم أنك رسول الله ما منعناك ، لكن أنت محمد بن عبدالله . قال : أنا رسول الله وأنا محمد بن عبدالله . ثم قال لعلي ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أمح رسول الله . قال : لا والله لا أمحوك أبدا ! فأخذ رسول الله ـ ﷺ ـ الكتاب فكتب [أي فمحاه وأمره بأن يكتب] هذا ما قاضى محمد بن عبدالله : لا يَدْخُل مكة سلاح إلا في القراب ، وأن لايخرج من أهلها بأحد ـ إن أراد أن يتبعه ـ ، وأن لا يمنع أحدا من أصحابه أراد أن يقيم بها .

فلما دخلها ومضى الأجل أتوا عليا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقالوا : قل لصاحبك أخرج عنا ، فقد مضى الأجل . فخرج النبي ـ ﷺ ـ فتبعتهم إبنة حمزة [عمارة ، أو أمامة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] : يا عمّ ! يا عمّ ! فتناولها علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ فأخذ بيدها وقال لفاطمة ـ عليها السلام ـ [المناسب رضي الله تعالى عنها] دونكِ إبنة عَمِّكِ حملتها فاختصم فيها علي ، وزيد ، وجعفر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ فقال علي : أنا أحق بها وهي إبنة عمي . وقال جعفر : إبنة عمي وخالتها تحتي . وقال زيد : إبنة أخي [لأن رسول الله ـ ﷺ ـ آخى بين زيد وحمزة ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] فقضى بها النبي ـ ﷺ ـ لخالتها ، وقال : الخالة بمنزلة الأم . وقال لعلي : أنت مني وأنا منك . وقال لجعفر : أشبهتَ خَلْقي

وخُلُقي . وقال لزيد : أنت أخونا ومولانا . ح - ٤/٤٠٦ ت ، خ - ٦/٣٦٥ .

**تەرجەمە :**

سێ حەدیث یەك حادیثەیە .

بەراء - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - لە (ذي القعدة)دا کە ئیرادەی عومرەی کرد ناردی‌یە لای ئەهلی مەکە ئیذنی لێ‌خواستن کە تەشریفی بچێتە مەکەو عومرە بکا ، ئەهلی مەکە ئیبایان کرد مەگەر بەو شەرتە کە : سێ رۆژی زیاتر تیا دانەنیشێ . هیچ کەس لە ئەهلی مەکە لەگەڵ خۆی نەباتە دەرێ . بە کالانەو کیفەوە نەبێ سیلاح نەباتە مەکەوە . ئیمامی علی - رضي الله تعالى عنه - دەستی پێکرد کە بەو شەرتە موصالەحەنامە بنووسێ . نووسی : ئەمە ئەوەیە کە محەمەد کە رەسوولوڵڵایە صوڵحی لەسەر کردوە . موشریکەکان وتیان : ئێمە ئیقرار بەوە ناکەین ، ئەگەر بمانزانیایە کە تۆ رەسوولوڵڵای شەڕمان لەگەڵ نەئەکردی‌و مەنعمان لە عومرە نەئەکردی . بنووسە : محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا . فەرمووی : وەڵڵاهی من رەسوولوڵڵام‌و محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵام . ئەمری بە ئیمامی عەلی فەرموو : رەسوولوڵڵا مەحو بکەرەوە . ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : وەڵڵاهی من تۆ مەحو ناکەمەوە ! فەرمووی : پێنیشانم بدە کامەیە ، پێنیشانی دا ، بە دەستی خۆی ئەو لەفظەی مەحو کردەوە . ئەمری پێ فەرموو نووسیی : ئەمە ئەوەیە کە محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا موصالەحەی لەگەڵ قورەیش کردوە کە بە بێ کیف‌و کالان بە سیلاحەوە نەچێتە مەکەوە . کە چوو لە سێ رۆژی زیاتر تیا دانەنیشێ ، کە لێی چوە دەرێ کەس لە ئەهلی مەکە - با لەسەر دینی ئەویش بێ - نەباتە دەرێ . کەسێکیش لە تەبەعەی ئەو

ئيرادەی بوو کە لە مەکەدا بمێنێتەوە مەنعی نەکا .

کە تەشریفی چوە مەکەو عومرەی بەجێ هێناو موددەتەکە رابورد موشریکەکان چوونە خزمەتی ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - عەرزیانکرد : بچۆ بە رەفیقەکەت بڵێ : موددەتەکە تەواو بوە ئیتر لە ناومان بچێتە دەرێ ، ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - چوە خزمەتی عەرزیکرد ، فەرمووی : بەڵێ . کە تەشریفی لە مەکە چوە دەرێ کچێکی ئیمامی حەمزەی - رضي الله تعالى عنها - شوێن کەوت ، مامە مامەی دەست پێکرد ، ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - هەڵی گرت و دای بە حەزرەتی فاطیمە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : لەگەڵ خۆت هەڵی بگرە . لە مەدینە عەلی و ، جەعفەرو ، زەیدی کوڕی حاریثە نیزاعیان لەسەر کرد ، ئیمامی عەلی فەرمووی : ئامۆزای خۆمە من (أحقم) بەو . جەعفەر فەرمووی : ئامۆزامەو خوشکی دایکی لە لای منە . زەید وتی : کچی برامە ؛ چونکی پێغەمەر - ﷺ - دەستە برایەتیی لەگەڵ ئەوو حەزرەتی حەمزەدا گرتبو . پێغەمەر - ﷺ - حوکمی فەرموو : بدرێ بە خوشکی دایکی ؛ چونکی = خوشکی دایکی = وەك دایك وایە . وە پێغەمەر - ﷺ - بە عەلیی فەرموو : تۆ لە منی و من لە تۆم . بە جەعفەری فەرموو : خیلقەت و خولقی تۆ بە من ئەشوبهێ . [ئەمە مەنقەبەیێکی زۆر گەورەیە بۆ جەعفەر - رضي الله تعالى عنه - ] . بە زەیدی فەرموو : تۆ برای ئێمەیی و مەولامانی .

١٣٨٦/٦٧ أبو الزبير سمع جابرا يسأل : كم كانوا يوم الحديبية ؟ قال : كنا أربع عشرة مائة ، فبايعناه وعمر آخذ بيده تحت الشجرة ، وهي سمرة . فبايعناه غير جد بن قيس الأنصاري إختبأ تحت بطن بعيره ! م - ٥٧/٨ .

١٣٨٧/٦٨ وعنه أيضا سمع جابرا - رضي الله تعالى عنه - يُسأل : هل بايع النبي - ﷺ - بذي الحليفة ؟ فقال : لا ولكن صلى بها ، ولم يبايع عند شجرة إلا الشجرة التي بالحديبية . وسمع جابرا - رضي الله تعالى عنه - يقول : دعا النبي - ﷺ - على بئر الحديبية . م - ٥٧/٨ .

١٣٨٨/٦٩ عن معقل بن يسار - رضي الله تعالى عنه - قال : رأيتني يوم الشجرة والنبي - ﷺ - يبايع الناس وأنا رافع غصنا من أغصانها عن رأسه ، ونحن أربع عشرة مائة . قال : لم نبايعه على الموت ، ولكن بايعناه على أن لا نفرَّ . م - ٥٩/٨ .

تەرجەمە :

ئەبوزوبەیر - رحمه الله - ئەفەرموێ : گوێم لێ بوو لە جابیر - رضي الله تعالى عنه - یان پرسی : ئەصحابی کیرام لە رۆژی حودەیبییەدا چەند بوون ؟ فەرمووی : چواردە دەفعە صەد بووین [یەعنی هەزارو چوارصەد بووین] بەیعەتمان لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - کرد ، عومەر - رضي الله تعالى عنه - دەستی موبارەکی گرتبوو ، لە ژێر دارێکی مۆردا غەیری جیددی کوڕی قەیس کە لە ژێر زگی وشترێکا خۆی شاردبووەوە بەیعەتی نەکرد . . هەموو بەیعەتمان لە خزمەتیا کرد .

هەم ئەفەرموێ : لە جابیر - رضي الله تعالى عنه - م بیست لێیان ئەپرسی : پێغەمەر - ﷺ - لە (ذي الحليفة) بەیعەتی کرد یان نا ؟ فەرمووی : لەوێ نوێژی کرد ، بەیعەتی هەر لە ژێر ئەو داری حودەیبییەدا کرد . لێم بیست فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - دوعای خوێن بەسەر بیرێ حودەیبییەدا .

مەعقەلی کوڕی یەسار ئەفەرموێ : چاوم لە خۆمە لە ژێر شەجەرەی حودەیبییەدا بووم پێغەمەر - ﷺ - بەیعەتی لەگەڵ خەڵقا ئەکرد

لقیّ لە لقی ئەو دارەم هەڵبریبوو لەسەر سەری موبارەکی لێی نەکەوێ ، ئێمە چواردە کەرەت صەد بووین . لەسەر مردن موبایەعەمان نەکرد ، لەسەر ئەمە موبایەعەمان کرد کە فیرار نەکەین . [چونکە مەقصوود لە غەزا خۆبەکوشتدان نیە ، مەقصوود مەنعی کوفروغەڵەبەی ئیسلامەو نەشریەتی با بەخۆبەکوشتدانیش ئەو مەقصەدە پێك بێ] .

١٣٨٩/٧٠ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال لنا : قال رسول الله ـ ﷺ ـ يوم الحديبية : أنتم خير أهل الأرض ، وكنا ألفا وأربعمائة ، ولو كنت أبصر اليوم لأريتكم مكان الشجرة . ح ـ ٦/٣٣٤ معلق وصله الاسماعيلي . م ـ ٨/٥٧ بتقديم وتأخير .

١٣٩٠/٧١ عبدالله بن أبي أوفى ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كان أصحاب الشجرة ألفا وثلاثمائة . وكانت أسلم ثُمُنَ المهاجرين [وجزم الواقدي بأن أسلم كانت في غزوة الحديبية مائة] ح ـ ٦/٣٣٤ . م ـ ٨/٥٩ .

تەرجەمە :

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : رۆژی حودەیبییە پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرمووین : ئیمرۆ ئێوە چاترینی هەموو ئەهلی ئەرزن . ئێمە هەزارو چوارصەد بووین ئەگەر چاوم ببینایە جێی ئەو درەختەم پێ نیشان ئەدان . عەبدوڵلای کوری ئەبو ئەوفا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەصحابی شەجەرە هەزارو سێصەد بووین . ئەسلەم هەشت یەکی موهاجیر بوون [واقیدی ئەڵێ : ئەسلەم صەد کەس بوون] .

١٣٩١/٧٢ عن قتادة [بن دعامة] قلت لسعيد بن المسيب : بلغني أن جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنه ـ كان يقول : كانوا أربع عشرة مائة . فقال سعيد : حدثني جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : كانوا خمس

عشرة مائة . . الذين بايعوا النبي - ﷺ - يوم الحديبية . ح - ٦/٣٣٤ .

تەرجەمە :

قەتادە - رحمه الله - ئەفەرموێ : بە سەعیدی کوڕی موسەییبم وت : وام پێگەییوە کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا - رضي الله تعالى عنهما - فەرموویەتی : کە ئەصحابی شەجەرە چواردە صەد بوون . سەعید - رحمه الله - پێی فەرمووم : جابیری کوڕی عەبدوڵڵا - رضي الله تعالى عنهما - وای قسە بۆ کردووم ئەوانە لە ڕۆژی حودەیبییەدا بەیعەتیان لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - کرد پانزە کەرەت صەد بوون .

١٣٩٢/٧٣ عن سعيد بن المسيب - رضي الله تعالى عنه ورحمه الله - عن أبيه أنه كان فيمن بايع تحت الشجرة ، فرجعنا إليها العام المقبل فعُمِّيت علينا . ح - ٦/٣٣٧ .

تەرجەمە :

موسەییب - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لەناو ئەوانەدا بووم کە لە ژێر دەرەختی حودەیبییەدا بەیعەتیان بە پێغەمەر - ﷺ - کرد . ساڵی دوایی [کە بۆ (عمرة القضا) چووینەوە] شوێنەکەمان لێ ون بووبوو .

١٣٩٣/٧٤ عن طارق بن عبدالرحمن [البجلي] قال : إنطلقت حاجا فمررت بقوم يصلون . قلت : ما هذا المسجد ؟ قالوا : هذه الشجرة حيث بايع رسول الله - ﷺ - بيعة الرضوان ، فأتيت سعيد بن المسيب - رحمه الله ورضي عنه - فأخبرته ، فقال سعيد : حدثني أبي أنه كان فيمن بايع رسول الله - ﷺ - تحت الشجرة ، قال : فلما خرجنا من العام المقبل نسيناها فلم نقدر عليها . فقال سعيد : إن أصحاب محمد - ﷺ - لم يعلموها وعلمتموها أنتم ؟ فأنتم أعلم . ح - ٦/٣٣٧ .

**ئەرجەمە :**

طاريقى كوڕى عەبدورەحمانى بەجەلى ئەفەرموێ : چووم بۆ حەج بە لاى قەومێكا رابوردم نوێژيان ئەكرد ، لێم‌پرسين : ئەم مزگەوتە چە مزگەوتێكە ؟ = وتيان = : ئەمە مزگەوتى ئەو درختەيە كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ (بيعـة الرضـوان)ى لە ژێـرا كردوە . چـوومە لاى سـەعيـدى كـوڕى موسەييب ـ رضي الله تعالى عنه ورحمه الله ـ عەرزم‌كرد ؛ فەرمووى : باوكم قسەى بۆكردووم كە خۆى لە ناو ئەوانەدا بوو كە لە ژێر شەجەرەى ريضوانا بەيعەتيان لە خذمەت پێغەمەرا كرد ـ ﷺ ـ . ساڵى دوايى كە چووينەوە لە فكرمـان چۆوە نـەمان‌دۆزى‌يـەوە . سەعيـد ـ رحمه الله ـ فەرمووى : ئەصحابى محەمەد ـ ﷺ ـ (شجرة الرضوان) يان نەزانيوە ئێوە ئەيزانن ؟ كە وابێ ئێوە لەوان عالمترن !

١٣٩٤/٧٥ زيد بن أسلم [رحمه الله] عن أبيه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : خرجت مع عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ إلى السوق فلحقتْ عمرَ ـ رضي الله تعالى عنـه ـ إمرأةٌ شـابة ، فقـالت : يا أمـير المؤمنين هلك زوجي وترك صبية صغارا ، والله ما يُنضجون كُراعا ، ولا لهم زرع ولا ضرع ، وخشيت أن تأكلهم الضبع ، وأنا بنت خُفاف بن أيماء الغِفاري [ولأبيه وجده صحبة] وقد شهد أبي الحديبية مع رسول الله ـ ﷺ ـ . فوقف معها عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ولم يمضِ ، ثم قال : مرحبا بنسب قريب . ثم إنصرف إلى بعـير ظهير [قـوي الظهـر] كان مربوطا في الدار ، فحمل عليه غِرارين ملأهما طعاما ، وحمل بينهما نفقة وثيابا ، ثم ناولها بخطامه . ثم قال : إقتاديه ، فلن يفني حتى يأتيكم الله بخير . فقال رجل : يا أمير المؤمنين أكثرت لها ! قال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ثَكِلَتكَ أمك ! [دايك رۆڵەڕۆت بۆ بكا !] والله إني لأرى

أبا هذه وأخاها قد حاصرا حصنا زمانا ، فافتتحاه ، ثم أصبحنا نستفيئ سهمانهما فيه .

ح ـ ٦/٣٣٦ .

**تەرجەمە :**

زەیدی کوڕی ئەسلەمی ئازادکراوی ئیمامی عـومەر ـ رضي الله تعالى عنه ، ورحمهما الله تعالى ـ ئـەفەرمـوێ : باوکم فـەرمووی : لـە خزمەت ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوومە بازاڕ ، ژنێکی جەهێڵی پێگەیی ، وتی : (یا امیر المؤمنین) مێردەکەم مردوە ، چەند منالی بچکۆلانەی بەجێ هێشتوە ، وەڵڵاهی پێچکەییێکیـان نی یە بی کـولێنن ، زەراعەتێکیان نی یە ، دۆشندەییێکیان نی یە ، ئەترسم کەمتیار بیـانخوا . منیش کچی خـوفافی کـوڕی ئیمای غیفـاریم ، باوکیشم لـە خزمـەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ حازری حودەیبییە بوە . ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەوێدا بۆی راوەستا نەرۆیی ، لە پاشا فەرمووی : مەرحەبابێ لە نەسەبێکی نزیك ، لە پاشا گەڕایەوە بۆ لای وشترێکی پشت بەقووەت [کە شت زۆر هەڵبگرێ] لە خانوەکەی ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەسترابووەوە ، دوو خەراری پڕ لە طەعامی بۆ لێکرد لەسەر باریشی نـەفەقـەو لیباسی بـۆ دانا ، لـە پاشـا هەوسـارەکـەیی دایـە دەست ، فەرمووی : رایکێشە نابرێتەوە تا خوا خێرتان بۆ ئەنێرێ .

پیاوێ وتی : (یا أمیر المؤمنین) زۆرت دایێ ! فەرموزی : دایکت رۆڵـەڕۆت بۆ بکـا ! وەڵڵاهی من بـاوكو بـرای ئـەمـەم دی مـوددەتێ قەلاییێکیان موحاصەرە دا فەتحیان کرد ، لە پاشا سبەینێ ئێمـە سەهمی خۆمان لەو فەتحی ئەوانا بەش ئەکرد .

٧٦/١٣٩٥ المسيب بن رافع [رحمه الله] قال : لقيت البراء بن عازب

ـ رضي الله تعالى عنها ـ فقلت : طوبى لك صحبت النبي ـ ﷺ ـ وبايعته تحت الشجرة ، فقال : يا ابن أخي إنك لاتـدري ما أحـدثنا بعـده . [....] ح ـ ٦/٣٣٨ .

تەرجەمە :

موسەیيبی کوڕی رافيع ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : بە بەرای کوڕی عازیب گەییم ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عەرزم کرد : خوا هەر چاکیی و خێرتان بۆ بکا ؛ صوحبەتی پێغەمەرتان کرد ـ ﷺ ـ ، لە ژێر شەجەرەی ریضوانا بەیعەتتان پێکرد . فەرمووی : ئەی کوڕی برای خۆم تۆ نازانی دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە چیمان کرد !

١٣٩٦/٧٧ عن أبي قلابة [رحمه الله] أن ثابت بن الضحاك أخبره أنه بايع النبي ـ ﷺ ـ تحت الشجرة . ح ـ ٦/٣٣٨ .

تەرجەمە :

ثابیتی کوڕی ضەحاك ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەبەری داوە بە ئەبو قەلابە ـ رحمه الله ـ کە لە ژێر درەختی ریضوانا بەیعەتی کردوە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ .

١٣٩٧/٧٨ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ﴿إنا فتحنا لك فتحا مبينا﴾[1] قال : الحديبية . قال أصحابه ـ ﷺ ـ ورضي عنهم] هنيئا [لا إثم فيه] مريئا [لاداء فيه . يا رسول الله غفر الله لك ماتقدم من ذنبك وما تأخر] فما لنا ؟ فأنزل الله [عز وجل] ﴿ليدخل المؤمنين والمؤمنـات جنات تجري من تحتها الأنهار﴾[2] قال شعبة : فقدمت الكوفة فحدثتُ

(١) الفتح / ١

(٢) الفتح / ٥

بهذا كُلِّه عن قتادة ، ثم رجعت فذكرت له [القتادة] فقال : أما ﴿إنا فتحنا لك . . .﴾ فعن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ وأما هنيئا مريئا فعن عكرمة . ح ـ ٦/٣٣٨ . ن

تەرجەمە :

شوعبە لە قەتادەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ـ رحمهما الله ورضي عنه ـ ریوایەت ئەکا کە فەرمووی : ﴿انا فتحنا لك فتحا مبينا﴾ [یەعنی ئێمە فەتحێکی باشمان بۆ کردی ، ئەو فەتحە فەتحی مەکە نی‌یە] فەتحی حودەیبییەیە [یەعنی (بيعة الرضوان)ە] ، ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی پێغەمەریان کرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) هیچ گوناهی تیا نەبێ عافیەتت بێ ، هیچ دەردی بۆ تۆ تیا نەبێ [خوا گوناهی ئەووەڵ و ئاخری تۆی عەفوکردوە] ئەی بۆ ئێمە چی هەیە ؟ ئەو ئایەتەکەی دوایی نازڵ بوو کە مەئالی شەریفی وایە : ئەو فەتحەمان بۆ کردی کە خوا موسوڵمانان پیاویان و ژنیان بخاتە بەهەشتێکەوە کە بە ژێر درەختەکانیا ئەنهار جاریی ئەبێ . شوعبە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : چوومە کووفە ئەم حەدیثەم بە تەواوەتی لە قەتادەوە ریوایەت کرد ، کە گەرامەوە بۆ لای قەتادە پێم‌وت ، قەتادە فەرمووی : (إنا فتحنا لك . .) لە ئەنەسەوەیە . (هنيئا مريئا) لە عەکرەمەی مەولای ئیبن‌وعەباسەوەیە . [یەعنی هەمووم لە ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ نەبیستوە]

١٣٩٨/٧٩ عن عروة بن الزبير ـ رحمه الله تعالى ورضي عنه ـ عن المسور بن مَخْرُمة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ومروان بن الحكم [. . . . .] يزيد أحدهما على صاحبه ، قالا : خرج النبي ـ ﷺ ـ عام الحديبية في بضع عشرة مائة من أصحابه ، فلما أتى ذا الحليفة قلد الهدي وأشعره ، وأحرم منها بعمرة ، وبعث عينا له من خزاعة ، وسار النبي ـ ﷺ ـ حتى

كان بغدير الأشطاط أتاه عينه [بسر بن سفيان] قال : إن قريشا جمعوا لك جموعا ، وقد جمعوا لك الأحابيش ، وهم مقاتلوك ، وصادوك عن البيت ومانعوك . فقال : أشيروا أيها الناس عليَّ ؛ أترون أن أميل إلى عيالهم وذراري هؤلاء الذين يريدون أن يصدونا عن البيت ؟ فإن يأتونا كان الله - عز وجل - قد قطع عينا من المشركين [يعني الذي بعثه - عليه الصلاة والسلام - أي غايته ، انا كنا كمن لم يبعث الجاسوس ولم يعبر الطريق وواجههم بالقتال] وإلا تركناهم محروبين . قال أبو بكر : يا رسول الله خرجتَ عامدا لهذا البيت ، لا تريد قتل أحد ، ولا حرب أحد ، فتوجَّهْ له ، فمن صدَّنا عنه قاتلناه . قال : امضوا على اسم الله .
ح - ٦/٣٤٠ .

تەرجەمە :

عورووەی کوڕی زوبەیر - رحمە الله تعالى ، ورضي عنه - لە میسوەری کوڕی مەخرومە - رضي الله تعالى عنهما - و مەروانی کوڕی حەکەم . . . ریوایەت ئەکەن ، لە ریوایەتەکەیانا لە یەکتری زیادو کەم ئەکەن ؛ ئەڵێن : پێغەمەر - ﷺ - لە ساڵی حودەیبییەدا تەشریفی لە مەدینە چوە دەرێ هەزارو ئەوەندەی لە ئەصحابی کیرام لە خزمەتا بوو کە گەیینە (ذو الحليفة) بە ملی وشترەکانیانا عەلامەتی هەدیان هەڵاوەسی و پشتیان بریندار کردن و ئیحرامیان بە عومرە دابەست ، لە خوزاعە بوسری کوڕی سوفیانی بە جاسووسیی نارد . پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی حەرەکەتی کرد تا گەیی یە گۆلی ئەشطاط ، جاسووسەکەی هاتەوە عەرزی کرد : قورەیش گەلێ جەماعەتی لە قەبائیلی موختەلیفە بۆ کۆکردوونەوە حەربت لەگەڵا ئەکەن و مەنعت ئەکەن لەچوونە بەیتەوە . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەی خەڵقینە تەدبیرتان چیە پێم بڵێن ؟ ئەگەر

ئەڵێن بگەڕێمەوە سەر ماڵو منالی ئەوانەی کە ئیرادەیان وایە رێی بەیتمان لێبگرن و مەنعمان بکەن لە عومرە ؟ ئەگەر هاتنەسەر رێمان بۆ شەڕ خوا قەطعی جاسووسی لە موشریکین کردوە .

ئەگەر نەیشهاتن ئێمە بێ ماڵو منال ئەیان هێڵینەوە . ئـەبوبـەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : (یا رسول الله) تۆ بۆیێ هاتووی ئەم بەیتە طەواف بکەی ، بۆیە نەهاتووی کە کەس بکوژیو حەرب بکەی ، تەشریفت روو بکەرە بەیت ، ئەوی رێی بەیتمان لێبگرێ شەڕی لەگەڵ ئەکەین [یەعنی رێیشیان لێ نەگرتین طەوافی خۆمان ئـەکەین] پێغـەمەر - ﷺ - فەرمووی : بە ناوی خواوە برۆن بۆ بەیت .

٨٠/١٣٩٩ عن أبي وائل شقيق قال : قام سهل بن حنيف يوم صِفِّين فقال : يا أيها الناس إتهموا أنفسكم ، لقد كنا مع رسول الله - ﷺ - يوم الحديبية ، ولو نرى قتالا لقاتلنا ، وذلك في الصلح الذي كان بين رسول الله - ﷺ - وبين المشركين ، فجاء عمر بن الخطاب - رضي الله تعالى عنه - فأتى رسول الله - ﷺ - فقال : يا رسـول الله أَلَسْنا عـلى حق وهم على باطل ؟ قال : بلى . قال : أليس قتلانا في الجنة وقتلاهم في النار ؟ قال : بلى . قال : ففيم نُعطي الدَّنية في ديننا ونرجع ولما يحكم الله بيننا وبينهم ؟ فقـال : يا ابن الخـطاب إني رسول الله ولن يضيعني الله أبـدا . قال : فانطلق عمر - رضي الله تعالى عنه - فلم يصبر متغيـظا فأتى أبـا بكر ، فقال : يا أبا بكر ألسنا على حق وهم على باطل ؟ قال : بلى . قال : أليس قتلانا في الجنة وقتلاهم في النار ؟ قال : بلى . قال : فعلى م نعطي الدنية في ديننا ونرجع ولما يحكم الله بيننا وبينهم ؟ فقال : يا ابن الخطاب إنه رسول الله - ﷺ - ولن يضيعه الله أبدا . قـال : فنزل القـرآن على

رسول الله ـ ﷺ ـ بالفتح فأرسل إلى عمر فأقرأه إياه . فقال : يا رسول الله أوَ فتح هو ؟ قال : نعم . فطابت نفسه ورجع . ح ـ ٥/٢٣٥ . م ـ ٧/٤٢٤ .

٨١/١٤٠٠ وعنه سمعت سهل بن حنيف ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول بصفين : أيها الناس إتّهموا آراءكم ، والله لقد رأيتني يوم أبي جندل ولو أني أستطيع أن أردَّ أمر رسول الله ـ ﷺ ـ لرددته . والله ما وضعنا سيوفنا على عواتقنا إلى أمر [قط] إلا أسهلن بنا إلى أمر نعرفه إلا أمركم هذا . ح ـ ٥/٢٣٥ ، م ـ ٧/٤٢٤ .

تەرجەمە :

شەقیق ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ڕۆژی صیففین [کە موعاویەو حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ صوڵحیان لەسەر ئەوە کرد کە حەکەم تەعیین بکەنو حەرب نەکەن ، سەهلی کوڕی حەنیفیش طەرەفداری صوڵح بوو ، ئەوانەی کە طەرەفداری حەرب بوون طەعنیان لە سەهلو ئەصحابی دا] سەهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هەڵسا فەرمووی : ئەی خەڵقینە ئێوە طەعن لە من مەدەن [کە حەز ناکەم خوێنی موسوڵمانان بڕێژرێ] طەعن لە خۆتان بدەن [کە طەرەفداری فیتنەو خوێن ڕژانن] لە ڕۆژی حودەیبییەدا لە خزمەت پێغەمەرا بووین ـ ﷺ ـ ئەگەر بمتوانیایە ئەمری پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە صوڵحی ئەکرد لە بەینی خۆیانو کوففار [وخەڵق بە صوڵح رازیی نەبوون]ڕەد بکەمەوەو حەرب بکەین ئەمکرد . [ئەمما نەمتوانی ئەمری ئەو ڕەد بکەمەوە] .

عومەری کوڕی خەطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ وعەرزی کرد : (یا رسول الله) بۆ ئێمە لەسەر حەق نینو

ئەوان لەسەر باطیل ؟ فەرمووی : بەڵێ . عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیکرد : بۆ شەهیدی ئێمە لە بەهەشتا نیـەو تۆپیـوی ئەوان لـە جەهەننـەما ؟ فـەرمووی : بـەڵێ . عومـەر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ عەرزیکرد : کە وابێ بۆچی لە دینا دەنائەت قەبووڵ بکەین و بێ ئەمە خوا حەق و باطیـل لە یـەك جویێ بکـاتەوە بگـەڕێینەوە ؟ پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (یـا ابن الخطاب) من رەسـووڵی خوام [یـەعنی وام ئەمـر پێکراوە] خوا قەت من بە ضایع نادا . عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ چوە دەرێ صەبـری نەکـرد ، بە رقـەوە چوە خزمەت حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ چی عەرزی پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردبوو عەرزی ئەویشی کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ چە جەوابێکی دابووەوە ئەویش عەینی ئەو جوابەی دایەوە . ئەو وەختە سوورەتی (إنـا فتحنا) نازڵ بوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردی بەشوێن ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ سوورەتەکەی بۆخوێنەوە . عەرزیکرد : (یا رسول الله) بۆ ئەوە ، یـەعنی صوڵحی حـودەیبییە ، فـەتحە ؟ فـەرمووی : بـەڵێ .

[چونکی لە طەرەف ئەوانەوە صوڵحەکە هەڵەوەشێنرێ و پێغەمەر ـ ﷺ ـ رێی ئەبێ بچێتە سەریان و مەکە فەتح بکا] ئەو وەختە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دڵی رەحەت بوو گەڕایەوە .

لە حەدیثە دوەمەکەدا سەهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەی فیتنەفرۆشینە ! ئێمە بۆ هیچ شتێ شیرمان نەناوەتە سـەرشان ئـەو شیرسەرشان نانە ئێمەی نەبردبێ بۆ ئیشێکی مەشرووع و باش . ئەمما ئێوە شیرتان ناوەتە سەرشان بۆ ئەمری مونکەرو غەیرەمـە شرووع و بـۆ خوێنڕشتنی موسوڵمانان .

[ئەم دوو حەدیثەم ئەگەر لە فیتنەدا نووسیبێ لێرە مەینووسن][1]

١٤٠١/٨٢ عروة بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ورحمه الله ـ عن المِسور بن مَخْرمة [الصحابي ابن الصحابي] ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ومروان يصدق كل منهما صاحبه . . . . . . قالا : خرج رسول الله ـ ﷺ ـ زمن الحديبية [يوم الاثنين لهلال ذي القعدة سنة ست] حتى كانوا ببعض الطريق قال النبي ـ ﷺ ـ : إن خالد بن الوليد [ولم يسلم بعد] بالغميم [بوزن عظيم ، ومصغرا] في خيل لقريش طليعة فخذوا ذات اليمين .

فوالله ما شعر بهم خالد حتى إذا هم بقَتَرة الجيش [غبارهم] فانطلق يركض نذيرا لقريش وسار النبي ـ ﷺ ـ حتى إذا كان بالثنية [أي ثنية المِرار] التي يُهبَط عليهم منها بركت به راحلته ، فقال الناس حَلْ حَلْ [زجر للراحلة] فألحّت ، فقالوا : خلأت القصواء ، خلأت القصواء [حرنت وتصعبت . به كوردى : گەدەی گرت] فقال النبي ـ ﷺ ـ : ما خلأت القصواء وما ذاك لها بخلُق ، ولكن حبسها حابس الفيل . ثم قال : والذي نفسي بيده ! لايسألوني خطّةً [خصلة] يُعظّمون فيها حرمات الله إلا أعطيتهم إياها ، ثم زجرها فوثبت .

قال : فعدل عنهم حتى نزل بأقصى الحديبية على ثمد قليل الماء يتبرَّضه الناس تبرضا . [يأخذون منه الماء بالكف قليلا قليلا] فلم يُلَبِّثه الناس حتى نزحوه . وشُكِيَ إلى رسول الله ـ ﷺ ـ العطش ، فانتزع سهما من كنانته ، ثم أمرهم أن يجعلوه فيه . فوالله ما زال يجيش بالرِّي حتى صدروا عنه [وزاد ابن سعد حتى اغترفوا بآنيتهم جلوسا على شفير البئر]

---

(١) گەڕام لە فیتنەدا نەمدۆزینەوە .

فبينا هم كذلك إذ جاء بديل بن ورقاء الخزاعي في نفر من قومه من خزاعة ، وكانوا عَيبة نصح رسول الله ـ ﷺ ـ [موضع سره وأمانته ووعائه لايفشونه] من أهل تهامة ، فقال : إني تركت كعب بن لؤي وعامر بن لؤي نزلوا أعداد مياه الحديبية ومعهم العوذ [النوق الحديثات النتاج ذات اللبن] المطافيل [بيّچوو لەبەر] وهم مقاتلوك وصادّوك عن البيت . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : إنا لم نجئ لقتال أحد ، ولكنا جئنا معتمرين ، وإن قريشا قد نهكتهم الحرب [هزلتهم] وأضرَّتْ بهم ، فإن شاؤا ماددتهم مدَّةً يُخلُّوا بيني وبين الناس ، فإن أظهرْ فإن شاؤا أن يدخلوا فيما دخل فيه الناس فعلوا . وإلا فقد جموا [إستراحوا . ولابن عائذ عن الزهري ، فإن ظهر الناس عليَّ فذلك الذي يبغون] وإن هم أبوا فو الذي نفسي بيده ! لأقاتلنهم على أمري هذا حتى تنفرد سالفتي [رقبتي] وليُنفِذن الله أمره . فقال بديل : سأُبلِّغُهم ما تقول .

قال : فانطلق حتى أتى قريشا ، قال : إنا قد جئناكم من هذا الرجل وسمعناه يقول قولا ، فإن شئتم أن نعرضه عليكم فعلنا . فقال سفهاؤهم [عكرمة بن أبي جهل والحكم بن أبي العاص] : لاحاجة لنا أن تخبرنا عنه بشيئ . وقال ذو الرأي منهم : هات ما سمعته . يقول : قال : سمعته يقول كذا وكذا . . . فحدثهم بما قال النبي ـ ﷺ ـ . فقام عروة بن مسعود [الثقفي أسلم ورجع إلى قومه ودعاهم إلى الاسلام ، فقتلوه ! ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] فقال : أي قوم ألستم بالوالد ؟ قالوا : بلى . قال : فهل تتهموني ؟ قالوا : لا . قال : ألستم تعلمون أني إستنفرت أهل عكاظ [نصرة لكم] فلما بلَّحوا عليَّ [امتنعوا أو عجزوا] جئتكم بأهلي وولدي ومن أطاعني ؟ قالوا : بلى . قال : فإن هذا قد عرض لكم خُطَّة رُشد [خصلة خير وصلاح] إقبلوها ودعوني آتيه . قالوا:إئته . فأتاه ،

فجعل يكلم النبي ـ ﷺ ـ فقال النبي ـ ﷺ ـ نحوا من قوله لِبُدَيل . فقال عروة عند ذلك : أي محمد أرأيت إن استأصلت أمر قومك هل سمعت بأحد من العرب إجتاح [أهلَك] أهله قبلك ؟ ! وإن تكن الأخرى فإني والله لا أرى وجوها [أي أشرافا] وإني لأرى أشوابا [أخلاطا] من الناس خليقا أن يفرُّوا ويدعوك ! فقال له أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : امْصَصْ [من باب علم] ببَظر اللات ! أنحن نَفِرُّ عنه ونَدَعه ؟ ! فقال : من ذا ؟ قالوا : أبو بكر . قال : أما والذي نفسي بيده لولا يدٌ [نعمة] كانت لك عندي لم أجْزِك بها لأجبتك [وهي أن عروة تُحمِّل بدية فأعانه فيها أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بعشر قلائص] .

قال : وجعل يكلم النبي ـ ﷺ ـ فلما تكلم أخذ بلحيته [الشريفة] والمغيرة بن شعبة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قائم على رأس النبي ـ ﷺ ـ ومعه السيف ، وعليه المِغفر . فكلما أهوى عروة بيده إلى لحية النبي ـ ﷺ ـ ضرب يده بنعل السيف [ما يكون اسفل القراب من فضة أو غيرها] وقال له : أخِّر يدك عن لحية رسول الله . [زاد عروة بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لاينبغي لمشرك أن يمسه] فرفع عروة رأسه ، فقال : من هذا ؟ قالوا : المغيرة بن شعبة [إبن اخيك] فقال : أي غُدَر ! ألست أسعى في غدرتك ؟ وكان المغيرة صحب قوما في الجاهلية [زائرين المقوقس] فقتلهم [لما قصر به المقوقس] وأخذ أموالهم ، ثم جاء فأسلم . [فقال له أبو بكر : ما فعل المالكيون الذين كانوا معك ؟ قال : قتلتهم وجئت بأسلابهم إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فكان سعى عروة عمّه حتى أخذوا منه دية ثلاثة عشر رجلا] فقال النبي ـ ﷺ ـ : أما الاسلام فأقبل ، وأما المال فلست منه في شيْ ؛ [لأنه أخذه غدرا] .

ثم إن عروة جعل يرمُقُ أصحاب النبي ـ ﷺ ـ بعينيه . قال :

فوالله ماتنخم رسول الله ـ ﷺ ـ نخامة إلا وقعت في كف رجل منهم فدلك بها وجهه وجلده ، وإذا أمرهم إبتدروا أمره . وإذا توضأ كادوا يقتتلون على وَضوئه ، وإذا تكلم خفضوا أصواتهم عنده ، وما يُحِدُّون إليه النظر تعظيما له .

فرجع عروة إلى أصحابه ، فقال : أي قوم والله ! لقد وفدتُ على الملوك ، ووفدت على قيصر وكسرى والنجاشي ، والله إنْ رأيت ملكا قط يعظمه أصحابه ما يعظم أصحاب محمدٍ محمداً ـ ﷺ ـ . والله إن تنخم نخامة إلا وقعت في كف رجل منهم فدلك بها وجهه وجلده . وإذا أمرهم إبتدروا أمره ، وإذا توضأ كادوا يقتتلون على وَضوئه ، وإذا تكلم خفضوا أصواتهم عنده . وما يُحِدُّون إليه النظر تعظيما له . وإنه قد عرض لكم خُطَّة رشد فاقبلوها .

فقال رجل [حليس] من بني كنانة : دعوني آتيه . فقالوا : ائته . فلما أشرف على النبي ـ ﷺ ـ وأصحابه قال رسول الله ـ ﷺ ـ : هذا فلان [حليس بن علقمة سيد الأحابيش] وهو من قوم يعظمون البُدْن ، فابعثوها له ، فبعثت له ، واستقبله الناس بلبون ، فلما رأى ذلك قال : سبحان الله ما ينبغي لهؤلاء أن يصدوا عن البيت !

فلما رجع إلى أصحابه قال : رأيت البدن قد قُلِّدت وأُشعِرت [طعن في سنامها] فما أرى أن يصدوا عن البيت [زاد إبن إسحاق : وغضب وقال : يا معشر قريش ! ما على هذا عاقدناكم ، أَيُصدُّ عن بيت الله من جاء معظما له ؟ ! فقالوا : كُفَّ عنا يا حليس حتى نأخذ لأنفسنا ما نرضى] .

فقام رجل منهم يقال له : مِكْرز بن حفص ، فقال : دعوني آتيه ، فقالوا : إئته فلما أشرف عليهم قال النبي ـ ﷺ ـ : هذا مكرز وهو رجل

فاجر [غادر ناقض عهد] فجعل يكلم النبي ـ ﷺ ـ فبينما هو يكلمه إذ جاء سهيل بن عمرو . قال معمر : فأخبرني أيوب عن عكرمة أنه لما جاء سهيل بن عمرو قال النبي ـ ﷺ ـ : لقد سَهُل لكم من أمركم . [هذا القدر مرسل وصله ابن أبي شيبة من حديث إبن الأكوع ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] .

قال الزهري في حديثه : فجاء سهيل بن عمرو [وفي رواية ابن إسحاق : فلما انتهى إلى النبي ـ ﷺ ـ جرى بينهما القول حتى وقع بينهما الصلح على : أن توضع الحرب عشر سنين . وأن يؤمِّن بعضهم بعضا . وأن يرجع عنهم عامَهم] فقال : هات أكتب بيننا وبينكم كتابا . فدعا النبي ـ ﷺ ـ الكاتب [عليا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] فقال النبي ـ ﷺ ـ أكتب :

بسم الله الرحمن الرحيم . قال سهيل : أما الرحمان فوالله ما أدري ماهو ! ولكن أكتب : باسمك اللهم ، كما كنت تكتب [وكنا نكتب . فلما نزلت آية النمل كتب بسم الله الرحمن الرحيم . فأدركتهم حمية الجاهلية . ] فقال المسلمون : والله لانكتبها إلا بسم الله الرحمن الرحيم . فقال النبي ـ ﷺ ـ : أكتب باسمك اللهم . ثم قال : هذا ما قاضى عليه محمد رسول الله ـ ﷺ ـ فقال سهيل : والله لو كنا نعلم أنك رسول الله ما صددناك عن البيت ولا قاتلناك . ولكن أكتب محمد بن عبدالله . فقال النبي ـ ﷺ ـ والله إني لرسول الله ـ وان كذَّبتموني ـ أكتب محمد بن عبدالله .

قال الزهري : وذلك لقوله : لايسألوني خطة يعظمون فيها حرمات الله إلا أعطيتهم إياها .

فقال النبي ـ ﷺ ـ : على أن تُخلُّوا بيننا وبين البيت فنطوف به .

فقال سهيل : والله لاتتحدث العرب أنا أُخِذنا ضُغطة ، ولكن ذلك من العام المقبل ، فكتب ، فقال سهيل : وعلى أنه لا يأتيك منا رجل ـ وإن كان على دينك ـ إلا رددته إلينا . قال المسلمون [منهم : عمر ، وأسيد بن حضير ، وسعد بن عبادة ، وسهل بن حُنيف . . . ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] : سبحان الله ! كيف يُردُّ إلى المشركين وقد جاء مسلما ؟ !

فبينما هم كذلك إذ دخل أبو جندل ابن سُهيل بن عمرو [وكان أسلم وحُبس وعُذِّب في الله] يَرْسُفُ في قيوده [يمشي فيها] وقد خرج من أسفل مكة حتى رمى بنفسه بين أظهُرِ المسلمين . فقال سهيل : هذا يا محمد أول ما أُقاضيك عليه أن تردَّه إليَّ ! فقال النبي ـ ﷺ ـ : إنا لم نقض الكتاب بعد . قال : فوالله إذاً لم أُصالحك على شيءٍ أبدا . قال النبي ـ ﷺ ـ : فأَجِزه لي . قال : ما أنا بمجيزه لك . قال : بلى فافعل . قال : ما أنا بفاعل . قال مكرز : بل قد أجزناه لك . قال أبو جندل ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أي معشر المسلمين أُرَد إلى المشركين وقد جئت مسلما ! ألا ترون ما قد لقيت ؟ وكان قد عذب عذابا شديدا في الله [زاد ابن إسحاق : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : يا أبا جندل إصبر واحتسب فإنا لا نغدر وإن الله جاعل لك فرجا ومخرجا . . وإجازة مكرز لم تكن في أن لا يرده إلى سهيل ، بل في تأمينه من التعذيب . وأخذ أبا جندل هو وحويطبُ فأدخلاه فسطاطا وكفّا أباه عنه . ]

فقال عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فأتيت نبي الله ـ ﷺ ـ فقلت : ألستَ نبي الله حقاً ؟ قال : بلى . قلت : ألسنا على الحق وعدونا على الباطل ؟ قال : بلى . قلت : فلِمَ نعطي الدَّنِيَّة في ديننا إذاً ؟ قال : إني رسول الله ـ ﷺ ـ ولستُ أعصيه وهو ناصري . قلت : أوليس

كنت تحدثنا أنا سنأتي البيت فنطوف به ؟ قال : بلى ، فأخبرتك أنا آتيه العام ؟ قال : قلت : لا . قال : فإنَّك آتيه ومطوِّفٌ به ! قال : فأتيت أبا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقلت : يا أبا بكر أليس هذا نبي الله حقّاً ؟ قال : بلى . قلت : أَلسنا على الحق وعدونا على الباطل ؟ قال : بلى . قلت : فلم نعطي الدَّنية في ديننا إذاً ؟ قال : أيها الرجل إنه لرسول الله ـ ﷺ ـ وليس يعصي ربه وهو ناصره ، فاستمسك بغرزه [بركابه] فوالله إنه على الحق . قلت : أليس كان يحدثنا أنا سنأتي البيت ونطوف به ؟ قال : بلى ، أفأخبرك أنك تأتيه العام ؟ قلت : لا . قال : فإنـك آتيه ومطوف به !

قال الزهري : قال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فعملت لذلك أعمالا [صالحة] قال : فلما فُرِغ من قضية الكتاب قال رسول الله ـ ﷺ ـ لأصحابه : قوموا فانحروا ثم احلقوا ، قال : فوالله ما قام منهم رجل حتى قال ذلك ثلاث مرات . فلما لم يقم منهم أحد دخل على أم سلمة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فذكر لها ما لقي من الناس . فقالت أم سلمـة ـ رضي الله تعالى عنها : يا نبي الله أتحب ذلك ؟ أخرج ثم لاتكلم منهم أحدا حتى تنحر بدنك وتدعو حالقك فيحلقك . فخرج فلم يكلم أحدا منهم حتى فعل ذلك ؛ نحر بُدْنه ودعا حالقه [خِراش بن أمية ـ رضي الله تعالى عنه ـ فحلقه] فلما رأوا ذلك قاموا فنحـروا وجعل بعضهم يحلق بعضا ، حتى كاد بعضهم يقتل بعضا غمًّا [أي إزدحاما . . ما أوقـر أم سلمة ـ رضي الله تعالى عنها ـ عقلا وفضيلة !]

ثم جاءه نسوة مؤمنات ، فأنزل الله ـ تعالى ـ : ﴿يا أيها الذين آمنوا إذا جـاءكم المؤمنـات مهـاجـرات فـامتحنـوهن . . (حتى بلغ) بعصم

الكوافر . . ﴾[1] فطلق عمر يومئذ إمرأتين كانتا له في الشرك ، فتزوج إحداهما [قريبة] معاوية بن أبي سفيان ، والأخرى صفوان بن أمية ، ثم رجع النبي ـ ﷺ ـ إلى المدينة . فجاءه أبو بصير ـ رضي الله تعالى عنه ـ رجل من قريش [اسمه عتبة بن أسيد] وهو مسلم فأرسلوا في طلبه رجلين [خنيس بن جابر وأزهر بن عوف] فقالوا : العهد الذي جعلت لنا . فدفعه إلى الرجلين ، فخرجا به حتى بلغا ذا الحُلَيفة ، فنزلوا يأكلون من تمر لهم ، فقال أبو بصير ـ رضي الله تعالى عنه ـ لأحد الرجلين : والله إني لأرى سيفك هذا يا فلان جيدا ، فاستلّه الآخر فقال : أجل والله إنه لجيّد لقد جرَّبت به ثم جربت . فقال أبو بصير ـ رضي الله تعالى عنه ـ : أرني أنظر إليه ، فأمكنه منه . فضربه حتى برد ، وفرّ الآخر حتى أتى المدينة فدخل المسجد يعدو . فقال رسول الله ، حين رآه : لقد رأى هذا ذعرا [خوفا] فلما انتهى إلى النبي ـ ﷺ ـ قال : قُتل والله صاحبي ، وإني لمقتول . فجاء أبو بصير ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : يا نبي الله قد والله أوفى الله ذمتك ؛ قد رددتني إليهم ثم أنجاني الله منهم . قال النبي ـ ﷺ ـ : وَيْلُمِّهِ مِسْعَر حرب لو كان له أحد . فلما سمع ذلك عرف أنه سيردّه إليهم ، فخرج حتى أتى سِيف البحر [ساحله] .

قال : وينفلت منهم أبو جندل بن سهيل فلحق بأبي بصير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فجعل لايخرج من قريش رجل قد أسلم إلا لحق بأبي بصير حتى اجتمعت منهم عصابة ، فوالله ما يسمعون بعير خرجت لقريش إلى الشام إلا اعترضوا لها . فقتلوهم وأخذوا أموالهم . فأرسلت قريش إلى النبي ـ ﷺ ـ تناشده بالله والرَّحِم لما أرسل [إلى أبي بصير

(١) الممتحنة / ١٠

وأصحابه ـ رضي الله تعالى عنهم ـ]فمن أتاه فهو آمن . فأرسل النبي ـ ﷺ ـ إليهم . فأنزل الله تعالى : ﴿وهو الذي كف أيديهم عنكم وأيديكم عنهم ببطن مكة من بعد أن أظفركم عليهم . . . (حتى بلغ) الحمية حمية الجاهلية . . .﴾[1] وكانت حميتهم أنهم لم يُقرُّوا أنه نبي الله ، ولم يقروا ببسم الله الرحمن الرحيم . وحالوا بينهم وبين البيت . ح . ٤/٤٢٦ .

وقد مرَّ في حديث سلمة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أنه نزل في الذين أرادوا من قريش أن يأخذوا المسلمين غرة فظفروا بهم فعفا عنهم النبي ـ ﷺ ـ كما في م ـ ٧/٤٥٢ .

تەرجەمە :

عورووەی کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ، ورحمه الله ـ لە میسوەری کوڕی مەخرومە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ و مەروانی کوڕی حەکەم [ . . . ] ریوایەت ئەکا میسوەرو مەروان کوللێکیان تەصدیقی حەدیثی ئەوی تریان ئەکا ، ئەڵێن : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە زەمانی صوڵحی حودەیبییەدا [لە (ذی القعدة) ی ساڵی شەشەما] تەشریفی لە مەدینە چوە دەرێ ، کە تەشریفی بەعزێ رێی قەطع کرد [گەیی یە (ذو الحليفة) عەلامەتی هەدیی کردە ملی وشترەکانیەوەو کۆپارەی پشتیانی بریندارکردو خوێناویی کردن ، هەزارو چوارصەد تا هەزارو پێنج صەد ئەصحابی کیرامی لە خذمەتا بوو] فەرمووی : خالیدی کوڕی وەلید لەگەڵ دەستەیێ سوارەی قورەیش [کە میقداری دووصەد سوار بوون عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلیشیان لە ناوا بوو] پێشەنگی لەشکری

---

(١) الفتح / ٢٤ ـ ٢٦ .

قورەیشن ، لای راست بگرن پیّ نەزانن . وەڵلاهی خالید پێی نەزانین تا لەشکری پێغەمەر ـ ﷺ ـ تێپەڕ بوو ، خالید دووراودوور تۆزی بینین ، ئەو وەختە چوارناڵە گەڕایەوەو خەبەری برد بۆ قورەیش کە وا پێغەمەر ـ ﷺ ـ تە شریفی یێتە سەریان .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ = ویارانی = لێیان دا ڕۆیین تا گەیینە (ثنیة المرار) کە بەسەر قورەیشا ئەچێتەخوارێ . لەوێدا وشترەکەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەدەی گرت ، چۆکی دادا . خەڵق بۆ هەڵسانني وشترەکە حەل‌حەلیان دەست پێکرد ، وشترەکە مانی گرت لە جێی خۆی نەبزووت . وتیان : قەصواء مانی گرتووەو سەرڕەق بوە . دوو جار وایان وت ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : گەدەی نەگرتووەو مانی نەگرتوە ، قەت عادەتی وا نەبوە کە مان بگرێ . ئەمما ئەوی کە فیلی ئەبرەهەی حەبس کرد لە مەکە ئەوەیە کە وشترەکەی لە ڕۆیین حەبس کردوە . [چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەو لەشکرەوە تەشریفی بچێ بۆ مەککە قورەیش مومانەعەتی ئەکەن ، ئەمانیش موقابەلەیان ئەکەن ، ئەوەیش (منجرّ)[1] ەبێتە سەر شەڕو خوێن‌ڕژانن لە مەککەدا ، لە عیلمی ئەزەلی خوادا وا نووسراوە کە گەلێ کەس لەو موشریکانە موسوڵمان ئەبن] .

لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەو ذاتەی کە نەفسم بە دەستی قودرەتیەتی ! هەرچییێکم لێ طەلەب کەن کە لەوەدا تەعظیمی حورماتی ، یەعنی ئەوامیرو نەواهی ، خوای تیابێ [بە واسیطەی ئەوەوە شەڕ لە مەککەدا نەکرێ‌و خوێنی تیا نەڕژێ] ئەیاندەمێ . لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەنگی لە وشترەکە کردو وشترەکە تەکانی خۆیی داو

(١) واتە ئەکێشێتە سەر شەڕو کوشتار .

هەڵسا . پێغەمەر - ﷺ - دەستەجڵەوی وەرگێرا لە مەککەو تا تەشریفی چوو لە ژوور حودەیبییەوە لەسەر سەرچاوەیێکی کەمئاو دابەزی . ئاوەکەی ئەوەندە کەمبوو خەڵق بە لوێچ ئاویان لێ هەڵەهێنجا ، ئەوەندەیان پێ نەچوان تا هەموو ئاوەکەیان دەردا تنۆکێکیان تیا نەهێشت . لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - شکاتی تینوێتی کرا . پێغەمەر - ﷺ - تیرێکی لە تیرکەشەکەی دەرکێشا ئەمری پێ فەرموون بیخەنە ناو ئاوەکەوە ، وەڵڵاهی ئەو ئاوە کەمە دەستی کرد بە هەڵقوڵان تا ئەو لەشکرە هەموویان بە تێراویی خۆیان وماڵیاتیان گەڕانەوە !

لەو وەختەدا کە ئەوان مەشغووڵی ئەوە بوون بودەیلی کوڕی وەرقای خوزاعیی هات لەگەڵ چەند کەسێ لە قەومەکەی لە خوزاعە . بودەیل و رەفیقەکانی سیرپۆشی پێغەمەر بوون - ﷺ - لە ناو ئەهلی ئەطرافی مەکەدا . [هەر خەبەرێکی مەکەیش بوایە بۆ پێغەمەریان - ﷺ - بە راستیی ئەهێنا] بودەیل عەرزی پێغەمەری کرد - ﷺ - کە کەعبی کوڕی لوئەیو عامیری کوڕی لوئەییم وا بەجێ هێشت کە لەسەر هەموو سەرچاوەکانی حودەیبییەدا دابەزیون وشتری تازەزاوی شیرزۆری بێچوداریان لەگەڵە [کە بە شیری ئەوانە ئیدارە بکەن و مەجبوور نەبن بە گەڕانەوە تا مەنعتان ئەکەن لە طەوافی بەیت] هەموو شەڕت لەگەڵ ئەکەن مەنعت ئەکەن لە بەیت . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئێمە بۆیە نەهاتووین کە لەگەڵ هیچ کەسێکا شەڕ بکەین ، بۆیە هاتووین کە عومرە بکەین ، قورەیشیش ئەوەندەیان حەرب کردوە کە حەزب زەعیفی کردوون [نە قووەتی هێشتوون نە ماڵیانی هێشتوە] حەرب زەرەری پێگەیانوون . . ئەگەر هەوەسیان هەیە موددەتێکیان بۆ دائەنێم لەو موددەتا حەربیان لەگەڵ نەکەم ، واز لە من و کوففاری عەرەب بێنن

دەخڵمان نەکەن ، نەبن بە مانیع کە حەربیان لەگەڵ بکەین ، ئەگەر من غاڵب بووم بەسەریانا ئەو وەختە هەوەسیان پێێ ئەوانیش وەك خەڵق بێنە ژێر ئیطاعەمەوە ، ئەگەر غاڵب نەبووم ئێوە لە حەرب‌کردن لەگەڵ منا رەحەت ئەبن .

[ئیبن و عائیذ لە زوهری‌یەوە ریوایەت ئەکا کە پێغـەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەگەر عـەرەب غاڵب بـوون بەسـەرما ئـەوە مەقصـوودی ئەوانەو بەجێ بێت] ئەگەر ئەوان هەر ئیصرار بکەن‌و مەنعم بکەن لە طەوافی بەیت قەسەم بەوەی کە نەفسی من بە دەستی قودرەتیەتی لەسەر ئەم ئیشی خۆمە ، کە تەبیلغی ریسالەت‌و ئەوامیـرو نەواهی خـوایە ، حەربیان لەگەلا ئەکەم تا رۆح لەسەرما بێ‌و سەرم لێ جوێ ئەبێتەوە . بە تەحقیق خوا ئیشی خۆی ئەباتەسەر [دینی خۆی نوصرەت ئەدا] .

بـودەیل عـەرزی پێغەمـەری کـرد : ئـەم فـەرمـوودەی تـۆیـان بێ ئەگەیێنم . بودەیل لێیدا رۆیی تا چوە ناو قورەیشەوە ، پێی وتن : لای ئەم پیاوەوە هاتووم قسەیێکم لێ بیست کە ئەیفەرموو ، ئەگەر هەوەستان یێێ پێتان بڵێم ؟ سوفـەهای قـورەیش [وەك عەکـرەمەی کـوڕی ئەبـو جەهل‌و حەکەمی باوکی مەروان ، مەروان لێرەدا ئیعتیـرافی کردوە بـە سەفاهەتی باوکی] = وتیان = : ئێمە ئیحتیاجیمان بەوە نی‌یە کە لەوەوە خەبەری هیچمان بدەیتێ . صاحیب عەقڵەکانیان بە بودەیلیـان وت : چیت لێ بیستـوە کە فـەرمـوویـەتی بیلێ . ئـەوی کە پێغـەمەر - ﷺ - فەرمووبووی هەمووی پێ وتن .

عوروەی کوڕی مەسعوودی ثەقەفی هەڵسا وتی : ئەی قەومی من بۆ ئێوە باوك نین ؟ وتیان : بەلێ . بۆ ئێوە کوڕی باوکتان نین ؟ وتیان :

بەڵێ . وتی : هیچ توهمەتم پێ ئەبەن [کە لەگەڵتان راست نەبم] ؟ وتیان : خەیر . وتی : بۆ ئێوە نازانن کە من خەڵقی عوکاظەم هەڵتاوان کە بێن موعاوەنەتتان بکەن کە ئیمتیناعیان لەوە کرد کە بە قسەم بکەن ئەهل و ماڵ و مناڵ و ئەوانەی کە بە گوێیان کردم هەڵسانو و هاتمە ناو ئێوە ؟ وتیان : بەڵێ . وتی : ئەم پیاوە [کە پێغەمەرە ـ ﷺ ـ] رێیێکی خێری پێ نیشان داون کە صوڵحە قەبووڵی بکەن بێڵن بچمە لای . وتیان : بچۆ .

هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستی کرد بە قسەکردن لە خزمەتیا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەك بە بودەیلی فەرموو بوو بەویشی فەرموو . ئەو وەختە عوروە عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : ئەی محەمەد ئەگەر تۆ قەومەکەی خۆت لە بێخ دەرهێنی هیچ کەسێکت لە عەرەب بیستوە لە پێش خۆتەوە کە کەس و کارو خزمی خۆی لە بێخ دابێ ؟ ئەگەر بە نەوعێکی تر بێ [یەعنی قەومەکەت بەسەر تۆدا غالب ببن مەپرسە کە چیت بەسەرا بێنن !] وەڵڵاهی من لەگەڵ تۆدا ئەشرافی خەڵق نابینم ! لە قەبائیلی موختەلیفە بەعزێ کەست لەگەڵا ئەبینم لایەقن بەوە کە هەموو فیرار بکەن و بە تەنها بتهێڵنەوە . ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : قیتکەی لات بمژە ! ئێمە فیرار ئەکەین و بە تەنها بە جێی بێڵین ؟ ! عوروە پرسی : ئەمە کێیە ؟ فەرموویان : حەزرەتی ئەبوبەکرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ عوروە وتی : قەسەم بەوەی کە نەفسی من بە دەستی قودرەتیەتی ئەگەر نیعمەتێکت بەسەرمەوە نەبوایە کە ئێشتا پاداشم نەداویتەوە جوابم ئەدایتەوە . [ئەو نیعمەتە ئەوەیە کە عوروە خوێنێکی گرتبوە سەر خۆی کە بیدا . حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ یاریدەییێکی باشی دا دە وشتری بۆ بژارد] .

عورروه هەر قسەی لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ئەکرد هەر قسەیێکی ئەکرد [بە عادەتی عەرەب بە مولاطەفە] ریشی موبارەکی پێغەمەری ئەگرت ـ ﷺ ـ موغیرەی کوڕی شوعبەی برای عورروە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ژوور سەری پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ [بۆ موحافەظە] دەست بەشیرەوە راوەستابوو کڵاوزرێی لەسەرا بوو [خۆی لە عورروەی مامی شاردبووەوە] هەر وەختێ کە عورروە دەستی ئەهێنا بۆ ریشی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ موغیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ [بۆ تەعظیم و ئیجلالی پێغەمەر ـ ﷺ ـ] بە قەبزەی شیرەکەی لە دەستی عورروەی ئەدا پێی ئەفەرموو : دەستت لادە لە ریشی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ [لایەق نی یە بۆ موشریك دەستی لێدا] . عورروە سەری هەڵبڕی وتی : ئەمە کێیە ؟ پێیان فەرموو : موغیرەی کوڕی شوعبەیە [ئیبن وئیسحاق ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ . زەردەخەندەی کرد . عورروە عەرزی کرد : ئەمە کێیە ئەی محەمەد ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەوە = موغیرەی = کوڕی = شوعبەیە = موغیرەی براتە !]

عورروە بە موغیرەی وت ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ئەی غەدداری عەهدشکێن بۆ من لەو غەدرەدا کە کردت هەوڵم بۆ نەدای تا لەوە نەجاتم دای ؟ موغیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە زەمانی جاهیلییەتا لە ثەقیف بوو بە رەفیقی چەند کەسێ ، هەمووی کوشتن و ماڵەکەی بردن . لە پاشا هاتە خزمەتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و موسوڵمان بوو .

[مەسئەلەکە وایە : چەند کەسێ لە ثەقیف ئەچن بۆ میصر بۆ لای (مقوقس) ، موقەوقەس حورمەتیان ئەگرێ و خەلاتیان ئەکا ، دەرحەق موغیرە بێموبالاتیی ئەکا ؛ چونکی موغیرە لەو زائیرانە نەبوو ، ئەوان لە بەنی مالیکی ثەقەفی ی بوون ، موغیرە ئەوەی بەدڵەوە گرت کە وەختێ لە

ڕێدا دائه‌به‌زن و شه‌راب ئه‌خۆنه‌وه‌و سه‌رخۆش ئه‌بن ئه‌نوون . . موغیره ئه‌یانکوژێ و ماڵه‌کانیان ئه‌با ، که ئه‌و خه‌به‌ره ئه‌گا به ثه‌قیف که‌س و کاری مه‌قتوله‌کان ته‌مای شه‌ڕکردنیان ئه‌بێ له‌گه‌ڵ قه‌ومی موغیره‌دا . عورو‌ه‌ی مامی بۆی تێ‌ئه‌که‌وێ ، تا خوێنی سێنزه که‌سیان لێ سه‌ندو صوڵحیان کرد ، که موغیره - رضي الله تعالى عنه - به موسوڵمانیی ئه‌چێته خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کر - رضي الله تعالى عنه - لێی ئه‌پرسێ : مالیکی یه‌کانت چی لێ‌کرد ؟ عه‌رزی‌کرد : کوشتمن و ماڵه‌کانیانم هێناوه‌ته خزمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - که ته‌خمیسی بکاو ، چی لێ ئه‌کا بیکا] پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : ئیسلامه‌تی قه‌بووڵ ئه‌که‌م ، ئه‌مما ماڵه‌کانیانم ناوێ و ئیشم پێی نی‌یه [چونکی به غه‌در لێی سه‌ندوون ، ماڵی موشریك هه‌ر له حه‌ربا تالاّن ئه‌کرێ . پێغه‌مه‌ر - ﷺ - ماڵه‌که‌ی به ده‌ست موغیره‌وه هێشت به ئومێدی ئه‌وه که قه‌ومی مه‌قتوله‌کان موسوڵمان ببن و بیانداته‌وه] .

له دواییدا عوروه - رضي الله تعالى عنه - هه‌ردوو چاوی بریبوه ئه‌صحابی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - ، عوروه وتی : وه‌ڵلاهی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - هیچ به‌ڵغه‌مێکی فڕێ نه‌ده‌دا که نه‌که‌وێته ناو ده‌ستی صه‌حابه‌یێکه‌وه‌و له سه‌رو چاوی خۆیی و به‌ده‌نی هه‌ڵنه‌سوێ ! که ئه‌مرێکی پێ ئه‌فه‌رموون ده‌زبه‌جێ به‌جێیان ئه‌هێنا ، که ده‌زنوێژی ئه‌شت له‌سه‌ر ئاوی ده‌زنوێژی نزیك بوو که له‌گه‌ڵ یه‌کتریدا شه‌ڕ بکه‌ن ! که قسه‌ی ئه‌فه‌رموو له خزمه‌تیا ده‌نگی خۆیان په‌ست ئه‌کرد ، له‌به‌ر ته‌عظیمی چاویان تێ‌نه‌ئه‌بری . عوروه گه‌ڕایه‌وه بۆ لای ره‌فیقه‌کانی پێی‌وتن : ئه‌ی قه‌ومی من وه‌ڵلاهی چوومه لای پادشایان ، چوومه لای قه‌یصه‌رو ، کیسراو ، نه‌جاشیی . وه‌ڵلاهی هیچ پادشایێکم نه‌دیوه که ئه‌صحابی ته‌عظیمی

بکەن بەو نەوعەی کە ئەصحابی محەمەد ـ ﷺ ـ تەعظیمی محەمەد ئەکەن ـ ﷺ ـ . وەڵلاهی هیچ بەڵغەمێ فڕێ نادا کە نەکەوێتە ناو دەستی یەکێ لە ئەصحابیو لەسەرو چاوو بەدەنی خۆیی هەڵنەسوێ ، کە ئەمرێکیان پێ بکا دەزبەجێ بەجێی بێنن ، نزیکە لەسەر ئاوی دەزنوێژی شەڕ بکەن ، کە قسەی فەرموو دەنگی خۆیان پەست ئەکەنەوە لە خزمەتیا لەبەر تەعظیمو ئیجلالی ، چاوی لێ وردناکەنەوە . . ئەو شتێکی چاكو باشی پێ نیشان‌داون [کە صوڵحە] قەبووڵی بکەن .

[عوڕوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ موسوڵمان بوو گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی دەعوەتی کردن بۆ ئیسلامەتی شەهیدیان کرد] .

پیاوێ لە بەنی‌کەنانە [کە حولەیسە] وتی : وازم لێ‌بێنن بچمە لای ، وتیان : بچۆ . کە نزیك بۆوە لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەصحابی ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەمە فلانی کوڕی فلانە [حولەیسی کوڕی عەلقەمەیە] لە قەومێکە کە تەعظیمی وشتری حەج ئەکەن ، وشترەکانی بەن بەپیرەوە . وشترەکانیان برد بە پیرەوەو بە (لبيك لبيك) چوون بە ئیستیقبالیەوە . حولەیس وتی : (سبحان الله) دروست نی‌یە ئەمانە مەنع بکرێن لە طەوافی بەیت . کە گەڕایەوە بۆ لای قورەیشی رەفیقی وتی : چاوم پێکەوتن قەلادەیان بە ملی وشترەکانیانا هەڵاوەسیوە ، کۆپارەی وشترەکانیان بریندار کردوە ، خوێنیان تێ‌هەڵسوە . رەئیم وا نی‌یە کە ئەمانە لە طەوافی بەیت مەنع بکرێن .

[ئیبن‌و ئیسحاق ئەفەرموێ : وتی : ئەی جەماعەتی قورەیش من وام موقاوەلە لەگەڵ نەکردوون ! چۆن کەسێ تەعظیمی بەیت بکاو بۆ طەوافی بەیت بێ مەنع ئەکرێ لە طەواف ؟ ! قورەیش پێیان‌وت : ئەی حولەیس واز لەم نەوعە قسانە بهێنە تا ئێمە شتێکی وا ئەکەین کە لێی

رازیی ببین] .

پیاوێکی تریان که میکرەزی کوڕی حەفصی پێ ئەڵێن وتی : وازم لێبێنن من بچمە لای . وتیان : بچۆ . کە لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ نزیك بووەوە فەرمووی : ئەمە میکرەزی فاجیری عەهدشکەنە [فەقەط لە حودەیبییەدا عەهدی نەشکان] دەستی کرد بە قسەکردن لە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو وەختەدا کە قسەی عەرزئەکرد سوهەیلی کوڕی عەمر هاتە خزمەتی [سوهەیلیش لە غەزای فەتحا موسوڵمان بوو] .

موعەممەر کە یەکێکەلەراویی ئەم حەدیثە ئەفەرموێ : عەکرەمە وتی : کە سوهەیل هات پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیشتان بۆ سەهل بوو . [ئەم میقدارە مورسەلە ، شاهیدێکی مەوصوولی هەیە ، ئیبن وئەبی شەیبە لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ریوایەت ئەکا کە قورەیش سوهەیلی کوڕی عەمرو حوەیطیبیان ناردە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە صولحیان لەگەڵ بکا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە چاوی بە سوهەیل کەوت فەرمووی : ئیشتان بۆ سووك بوو] . موعەممەر لە زوهرییەوە ریوایەت ئەکا فەرمووی : سوهەیل هات . [ئیبن و ئیسحاق ئەفەرموێ : کە سوهەیل گەیی یە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە بەینیانا قسە کرا ، تا صوڵحیان کرد لەسەر ئەوە : کە دە ساڵ حەرب نەکەن ، لە یەکتر ئەمین بن ، ئیمساڵ بگەڕێنەوە] سوهەیل عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : بێنە صوڵحی بەینی ئێمەو ئێوە بنووسە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ کاتبی بانگ‌کرد [کە حەزرەتی عەلی یە ـ کرم الله وجهه ـ ] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بنووسە : (بسم الله الرحمن ارحیم) ، سوهەیل وتی : وەڵڵاهی نازانم کە رەحمان چیە (باسمك اللهم) بنووسە ، وەك لەمەوپێش ئەتنووسی . موسوڵمانان فەرموویان :

وەڵڵاهی ئەوە نانووسین ، هەر (بسم الله الرحمن الرحیم) ئە نووسین .[1] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : (باسمك اللهم) بنووسە . لە پاشا پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەمە ئەوەیە کە محەمەدی رەسوولی خوا صوڵحی لەسەر کردوە . سوهەیل وتی : وەڵڵاهی ئەگەر بمانزانیایە کە تۆ رەسوولوڵلای لە طەوافی بەیت مەنعمان نەئەکردی‌و حەربمان لەگەڵ نەئەکردی ، بنووسە محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : وەڵڵاهی بە تەحقیق من رەسوولوڵلام با ئێوەیش پێم باوەڕ نەکەن‌و تەکذیبم بکەن ، محەمەدی کوڕی عەبدوڵلا بنووسن .

محەمەدی کوڕی موسلیمی کوڕی شەهابی زوهری ئەفەرموێ : بۆیە پێغەمەر - ﷺ - هەرچی سوهەیل وتی ئەوەی نووسی چونکی لەو وەختەدا کە وشترەکەی مانی گرت و نەڕۆیی فەرمووی : هەر شتێکی تەعظیمی حورمەتی خوای تیابێ‌و بەوە مەنع ئەبن لەوە کە لە حەرەما شەڕو شۆڕ نەبێ‌و لێمیان بوێ ئەیاندەمێ . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : لەسەر ئەوە بەینی ئێمەو بەیت بەرەڵڵا بکەن کە طەوافی بکەین . سوهەیل وتی : وەڵڵاهی نابێ عەرەب بڵێن کە ئێمە بە زۆرو قووەت گیرراوین ، طەوافی ئێوە هی بەیتساڵی دوایی بێ . عەلی - رضي الله تعالی عنه - ئەوەی نووسی . سوهەیل وتی : لەسەر ئەوەیش هەر پیاوێ لە ئێمە - با لەسەر دینی ئێوەیش بێ - کە هاتە لای ئێوە بۆمان رەد بکەنەوە . موسوڵمانان فەرموویان : (سبحان الله) چۆن پیاوێ بە

---

(١) لە دەقە عەرەبی‌یەکەدا هەندێك جیاوازیی لەگەڵ ئێرەدا هەیە ، واتە دانەر هەندێ شتی کورت‌کردوەتەوە ، وەك باسی نازڵبوونی ئایەتی سوورەتی نەمل .

موسوڵمانەتی بێتە لای ئێمە ئەدرێتەوە بە موشریکان ؟ !

لەو وەختانەدا ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل زنجیری رائەکێشاو ئەڕۆیی هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی لە خوار مەکەوە لە مەکە هاتبوە دەرێو خۆی هاویتە بەینی موسوڵمانانەوە . سوهـەیل وتی : (یـا محمد) ئەمە ئەووەڵ کەسێکە کە صوڵحی لەسەر ئەکەم کـە بۆم ئیعـادە بکەیتەوە . پێغەمەر فـەرمووی : ئێمـە ئێشتا صـوڵحنامـەکەمـان تەواو نەکردوە [یەعنی هاتنی ئەبوجەندەل لە پێش نووسینی صوڵحنامەکەدا بوە ، داخڵ نابێ] سوهەیـل وتی : کە وابێ وەڵـڵاهی ئیتر لـەسەر هیـچ شتێ صوڵحت لەگەڵ ناکـەم . پێغەمـەر - ﷺ - فەرمـووی : ئەمـە [یەعنی ئیعادەنەکردنەوەی ئەبوجەندەل] بۆ من راببوێرە . سوهەیل وتی : خەیر رای‌نابوێرم . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خەیر بیکە . سوهەیل وتی : هیچ نایکەم . میکرەز وتی : بەڵێ وا ئێمە ئەوەمان بۆ تۆ بـەجێ هێنا .

[پێغەمەر - ﷺ - چونکی موعاهەدەتنامەکەی لە بەینی ذاتی سەعـادەتی ئەوو سوهەیلا بوو ئیعتیباری بە ئیجازەکەی میکرەز نەکردو رازیی بوو بە ئیعادەی ئەبو جەندەل][(1)]

ئەبوجەندەل - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : ئەی جەماعەتی موسوڵمانان بۆ من رەدئەکرێمەوە بۆ موشریکان ؟ من بە موسوڵمانەتی هاتووم

---

(۱) دانەر -خ- لەسەر ئەمە - لە دەقە عەرەبی‌یەکەدا - نووسیویـە : ئیجازەی میکرەز بۆ ئەوە نەبوو کە نەیدەنەوە بە سوهەیـل ، تەنها بـۆ ئەوە بـوو کە بردیانـەوە مەکـە - وەك پێشوو- سزای نەدەن . جـا لەگـەڵ حوەیـطیبدا ئەبوجەندەلیان برد لە شوێنێکدا دایان‌ناو دەستی باوکیان لە سزادانی کۆتـا کرد .

نابینن كە تووشی چی بووم ؟ ئەبو جەندەل - رضي الله تعالى عنه - لەبەر ئەمە كە دینی خوای قەبووڵ كردبوو موسوڵمان بووبوو زۆر عەذابیان دابوو ، بە عەذابێكی قورس عەذابدرابوو [ئیبن وئیسحاق ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - بە ئەبوجەندەلی فەرموو : ئەی ئەبوجەندەل صەبر بكەو بەو صەبرە ئەجر لە خوا طەلەب بكە ، ئێمە غەدر ناكەین صوڵح هەڵناوەشێنین ، خوایش فەرەجێك و رێگەی نەجاتێ بۆ تۆ هەڵەخا . . . - ئەم فەرموودەی پێغەمەرە - ﷺ - زۆر زوو تەحەقوقی كرد . صدق رسول الله . ﴿وما ينطق عن الهوى﴾][1] .

ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : چوومە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزم كرد : بۆ تۆ پێغەمەری بە حەقی خوا نیت ؟ فەرمووی : با . عەرزم كرد : بۆ ئێمە لەسەر رێی حەق و ئەوان لەسەر رێی باطیل نین ؟ فەرمووی : با . عەرزم كرد : ئەی بۆچی ئێمە لە خوصووصی دینا ذیللەت قەبووڵ بكەین و هەرچی ئەوان لێمان طەلەب بكەن پێیان عەطا بكەین ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : بە تەحقیق من رەسوولی خوام لەوانە نیم كە عیصیانی لێ بكەم . ئەو نەصرەتم ئەدا . عەرزم كرد : بۆ تۆ خەبەرت نەداینێ كە ئەچینە بەیت طەوافی ئەكەین ؟ فەرمووی : بەڵێ بۆ من خەبەری ئەوەم داویتێ كە ئیمساڵ ئەچینە بەیت ؟ عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : عەرزی كرد : خەیر . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : بە تەحقیق تۆ ئەچیتە بەیت و طەوافی ئەكەی .

عومەر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : چوومە خذمەت

(١) النجم / ٤ .

ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - عەرزم كرد : ئەی ئەبوبەكر . . . (والحاصل) چی عەرزی پێغەمەر - ﷺ - كردبوو عەینی ئەوەیشی عەرزی حەزرەتی ئەبوبەكر كرد ، چە جوابێكی لە پێغەمەر - ﷺ - وەرگرتبوو بێ كەم و زیاد ئەو جوابەیشی لە حەزرەتی صەدیقی ئەكبەر - رضي الله تعالی عنه - وەرگرت .

زوهریی - رحمه الله - هەر بەو ئیسنادە ئەفەرموێ : عومەر - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : بۆ ئەو قسانەی كە لە خـزمەت پێغـەمەرا - ﷺ - و لە خزمەت ئەبوبەكرا - رضي الله تعالی عنه - كردبـووم گەلێ ئەعمالی صالیحەم كـرد . [ئیبن و ئیسحاق - رحمـه الله - ئەفـەرموێ : عومەر - رضي الله تعالی عنه - ئەیفەرمـوو : بۆ كـەفارەتی ئـەو قسانـە صەدەقەم ئەكردو ، نوێژم ئـەكرد ، رۆژووم ئـەگرت ، عـەبدم ئـازاد ئەكرد . . - ئیمامی عومـەر - رضي الله تعالی عنـه - ئەو قسـانەی كـە فەرموویووی بۆیە فەرموویووی كە لە حیكمەتی ئەو موصالەحەیە بگاو ، لەسەر حیرصی بوو كە كافران ذەلیل بكا . حەزرەتی ئەبوبەكر چونكی ئیمانی لە ئیمانی هەموو ماسیوای پێغەمەر - ﷺ - كاملترو بەقووەتتر بوو تەسلیمی بۆ ئەوامیری پێغەمەر - ﷺ - زیاتر بوو ، لێی یەقـین بوو كـە پێغەمەر - ﷺ - هیچ بێ حیمكەت و بێ ئەمری خوا ناكا . . هیچ شەقی شەفەی[1] نەكردو ئیعتیرازی نەگرت - رضي الله تعالی عنهم أجمعین - . راویی ئەفەرموێ : كە صوڵحنامـەكە تـەواو بوو [لـە موسـوڵمانـان وەك ئەبوبەكرو عومەرو عەلی و گەلێ ریجالی تر - رضي الله تعالی عنهم - و گەلێ لە موشریكان وەك میكرەز شەهادەتیان لەسەر دا] .

(١) واتە لێوی نەكردەوەو دەمی نەدڕییەوە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری بە ئەصحابی کیرامی فەرموو هەڵسن هەدیەکانتان سەرببڕن و سەرتان بتاشن . وەڵڵاهی پیاوێکیان هەڵنەسا [مونتەظیری نوزووڵی وەحی بوون] سێ دەفعە ئەو ئەمرەی تیکرار کردەوە هەر هەڵنەسان . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە لای (أم سلمة) ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەو موعامەلەی ئەصحابەی پێ فەرموو . ئومموسەلەمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ عەرزی کرد : حەزەکەی کە ئەصحاب لە ئیحرام بێنەدەرەوەو هەدیەکانیان سەرببڕن و سەر بتاشن . [ئیبن و ئیسحاق لە ریوایەتی خۆیا ئەفەرموێ : (أم سلمة) ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : (یا رسول الله) لەومی ئەصحابت مەکە بەوە کە لە مەسئەلەی صوڵحا زۆر زەحمەتت کێشاو بێ ئەمە فەتحی مەکە بکەی بگەڕێیتەوە زۆر دڵ مەحزوون بوون] تەشریفت بچێتەدەرێ و قسە لەگەڵ هیچ کەسا مەکەو هەدیەکانت سەر ببڕەو دەلاکت بانگ کە سەرت بتاشێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەك (أم سلمة) ـ رضي الله تعالى عنها ـ عەرزی کردبوو تەشریفی چوەدەرێ و وشترەکانی خۆیی سەربڕی و ، دەلاکەکەی [کە خیراشی کوڕی ئومەییەی خوازعیی بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] بانگ کردو سەری موبارەکی تاشی . کە ئەصحاب ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ئەوەیان دی هەموو هەڵسان وشترەکانیان سەربڕی و سەری یەکتریان تاشی . لەبەر زۆرییان وەخبوو کە یەکتری بکوژن و بپلیشێننەوە . [تەماشای عەقڵ زۆری و زەکاوەتی (ام سلمة) بکەن ـ رضي الله تعالى عنها ـ !] .

لە موددەتی ئەو صوڵحەدا چەند ژنێکی مەککەیی موسوڵمان بوون و هیجرەتیان کرد بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ [موافیقی عەهدنامەکە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیرادەی وابوو ئیعادەیان بکاتەوە] خوا ـ عز وجل ـ ئەو

ئایەتی سوورەتی مومتەحینەی نازڵ فەرموو کە ئەفەرمویٚ : ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هەیە کە ژنی موسوڵمان هیجرەتیان کردو هاتنە لای ئیٚوە ئیمتیحانیان بکەن تا بزانن کە بە تەواویی موسوڵمان بوون یان‌نا . تا (بعصم الکوافر) نازڵ بوو .

[ئایەتەکە بە تەواویی مەعنای وایە : ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هەیە کە ژنانی موسوڵمان‌بوو بە موسوڵمانەتیی هیجرەتیان کرد بۆ لای ئیٚوە ئیمتیحانیان بکەن . خوا عیلمی هەیە بەمە کە بە دڵ موسوڵمان بوون یان نا . ئەگەر ئەوانتان بە موسوڵمان زانی ئیعادەیان مەکەنەوە بۆ کافران ، نە ئەو ژنانە بۆ کافران حەلاڵن ، نە کافران کە میٚردەکانیانن بۆ ئەو ژنانە حەلاڵن . ئەو مارەیی‌یەی کە میٚردە کافرەکانیان داویانیٚ بیاندەنەوە ، گوناە نیە بۆ ئیٚوە ئەو ژنانە لە خۆتان مارە بکەن ؛ چونکی بە ئیسلام‌بوونیان لە میٚردەکانیان جویٚ‌ئەبنەوە . بەو شەرتە دروستە مارەیان بکەن کە مارەیی بدەنیٚ ، ئەو ژنە کافرانە کە لە لاتانن بەو نیکاحەی کە کردووتانە لای خۆتان رایان‌مەگرن . ئەو مارەیی‌یەی کە داوتانیٚ وەری‌بگرنەوە ، ئەوانیش ئەو مارەیی‌یەی کە داویانە بەو ژنانە کە موسوڵمان بوون‌و ئیٚوە مارەیان ئەکەن . . لە ئیٚوە پستیٚننەوە . ئەم رەددو بەدەڵە حوکمی خوایە ، خوا بەو نەوعە لە بەینتانا حوکم ئەکا .] ئەو رۆژە ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - دوو ژنی تەلاق دا کە لە زەمانی موشریکیدا هیٚنابوونی . [یەکیٚکیان (قريبة) ی کچی ئەبوئومەییە بوو ، یەکیٚکیان کچی حەروەلی خوزاعیی بوو] . موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان قەریبەی مارەکرد ، صەفوانی کوڕی ئومەییە ئەوی تری مارە کرد .

لە پاشا پیٚغەمەر تەشریفی گەڕایەوە بۆ مەدینە . ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - کە پیاویٚکە لە قورەیش بە موسوڵمانی هات بۆ خزمەت

پێغەمەر - ﷺ - دوو پیاویان نارد بە شوێنیا [خونەیس و ئەزهەر] عەرزی پێغەمەریان - ﷺ - کرد : بەو عەهدەی لە حودەیبییەدا لەگەڵ ئێمەت کرد ئەبوبەصیرمان بدەرەوە . پێغەمەر - ﷺ - ئەبوبەصیری تەسلیم کردنەوە ، بردیانە دەرێ تا گەیینە (ذو الحليفة) لەوێ دابەزین ، خورما یان پێ بوو بیخۆن . ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - بە یەکێ [خونەیس] لەو دوو پیاوەی وت : بە خوا لام وایە شیرەکەت زۆر باشە ، ئەوی تریان [ئەزهەر] شیرەکەی لە کالان دەرکێشاو تێی فکری وتی : بەڵێ وەڵڵا زۆر شیرێکی باشە ، تەجرەبەم کردوەو ، تەجرەبەم کردوە . ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : ئا بمدەرێ تەماشای بکەم . کە شیرەکەی دایەدەستی و وەری گرت ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - شیرێکی لێداو کوشتی و مردو بەلادا هات ، ئەوی تریان هەرای کرد ، تا گەیی یە مەدینەو چوە ناو مەسجیدی نەبەوی یەوە - عليه الصلاة والسلام - پێغەمەر - ﷺ - کە چاوی پێی کەوت فەرمووی : ئەمە ترسێکی دیوە . کە گەیی یە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی کرد : رەفیقەکەم کوژراو وەڵلاهی منیش ئەکوژرێم ! ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - هاتەوە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی کرد : (يا نبي الله) وەڵلاهی خوا وەفای بە عەهدی تۆ کرد ، منت تەسلیم کردنەوەو خوا لە دەستیان نەجاتی دام . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : دایکی بۆی بلاوێنێتەوە چە شەرهەڵگیرسێنەرێکە ئەگەر کەسێکی ببێ موعاوەنەتی بکا ؟ !

ئەبوبەصیر - رضي الله تعالى عنه - کە ئەوەی لە پێغەمەر بیست - ﷺ - تێگەیی کە پێغەمەر - ﷺ - ئیعادەی ئەکاتەوە . لە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - چوەدەرێ و چوو بۆ ساحیلی بەحر [بەینی شام و مەککە کە

(عيص)ی ناوه] ئەبوجەندەلیش [وەك پێغەمەر - ﷺ - پێی فەرمو بوو] لە دەست موشریکان نەجاتی بووبوو ، ئیلتیحاقی کرد بە ئەبوبەصیر ، هەرچی لە قورەیش موسوڵمان ببوایە ئەچوو بۆ لای ئەبوبەصیر . . تا جەماعەتێکی بەقووەت کۆبوونەوە . وەڵڵاهی هیچ کاروانێکی قورەیشییان نەئەبیست کە لە مەککە بچێتە دەرەوە بۆ شام بە تیجارەت کە ئەبوبەصیرو رەفیقەکانی رێیان پێ نەگرن و نەیان کوژن و ماڵەکانیان بە تالان نەبەن .

قورەیش ئەبو سوفیانیان ناردە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - بە خواو بە رەحمێ کە لە بەینیاندا بوو ، پێغەمەریان - ﷺ - سوێن ئەداو طەڵەبی ئەوەیان لێ ئەکرد کە بنێرێتە لای ئەبوبەصیر کە قورەیش ئەذیەت نەداو رێی کاروانیان نەگرێ و نەیان کوژێ و تالانیان نەکا ، بەو شەرتە هەرکەسێ کە موسوڵمان بێ و بچێتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - ئەمین بێ لەوە کە ئیعادەبکرێتەوە بۆ قورەیش . پێغەمەر - ﷺ - ناردی بۆ لای ئەبوصیر کە ئیتر دەخڵیان نەکا . خوا ئەو وەختە ئەم ئایەتەی نازڵ کرد کە مەئالی شەریفی وایە : خوا ئەو خوایەیە کە دەستی کافرانی لە ئێوە بەست و دەستی ئێوەیشی لەوان مەنع کردوە لە مەککەدا لە دوای ئەمە کە ئێوەی بەسەرا (مظفر) کردن . . تا (الحمية حمية الجاهلية) . حەمییەتی ئەوان ئەوە بوو ئیقراریان نەکرد بە پێغەمەریی پێغەمەر - ﷺ - و بە (بسم الله الرحمن الرحيم) و بوون بە مانیعی ئەمە کە طەوافی (بيت الله) بکەن .

[لە حەدیثەکەی ئەنەسدا - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : دەرحەق ئەوانە نازڵ بوو کە تەمایان بوو فرصەت لە پێغەمەر - ﷺ - بزانن و بیکوژن . پێغەمەر - ﷺ - گرتنی و عەفوی کردن] [. . . .] .

١٤٠٢/٨٣ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - أن ثمانين رجلا من أهل

مكة هبطوا على رسول الله ـ ﷺ ـ من جبل التنعيم متسلحين ، يريدون غرة النبي ـ ﷺ ـ [أي غفلته] وأصحابه ، فأخذهم سَلْماً ، فاستحياهم . فأنزل الله ـ عز وجل ـ ﴿وهو الذي كفَّ أيديهم عَنكم وأيديكم عنهم ببطن مكة ، من بعد أن أظفركم عليهم . . . ﴾[1] ببطن مكة .

م ـ ٤٦٣/٧ .

ئەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : هەشتا كەس لە ئەهلی مەككە لە شاخی تەنعیمەوە بە سیلاحەوە هاتنەخوارێ كە بدەن بەسەر پێغەمەر ـ ﷺ ـ داو بە غەفڵەت خۆیو ئەصحابی بگرن . پێغەمەر ـ ﷺ ـ [لە دوای ئەمە كە هیچیان نەكردو عاجز بوون] بە صوڵح گرتنیو كردنی بە ئەسیر . پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەیكوشتنو عەفوی كردن . ئەووەختە ئەو ئایەتە نازڵ بوو كە ئەفەرموێ : خوا ئەو خوایەیە كە دەستی كافرانی لە ئێوە بەستو نەیانتوانی زەرەرتان پێ بگەیێنن ، دەستی ئێوەیشی لەوان مەنع كردو عەفوتان كردن ، لە دوای ئەمە كە لە مەككەدا ئێوەی بەسەر ئەوانا غاڵب كرد .

١٤٠٣/٨٤ عن نافع أن الناس يتحدثون أن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أسلم قبل عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وليس كذلك . ولكن عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يوم الحديبية أرسل عبدالله إلى فرس له عند رجل من الأنصار يأتي به ليقاتل عليه ، ورسول الله ـ ﷺ ـ يبايع عند الشجرة وعمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لايدري بذلك ، فبايعه عبدالله ، ثم ذهب إلى الفرس فجاء به إلى عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وعمر يستلئم للقتال

(١) الفتح / ٢٤ .

فأخبره أن رسول الله - ﷺ - يبايع تحت الشجرة . قال : فانطلق فذهب معه حتى بايع رسول الله - ﷺ - فهي التي يتحدث الناس ان ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أسلم قبل عمر - ح - ٦/٣٤٢ .

٨٥/١٤٠٤ نافع عن ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن الناس كانوا مع النبي - ﷺ - يوم الحديبية تفرقوا في ظلال الشجر ، فإذا الناس محدقون بالنبي - ﷺ - فقال : يا عبدالله أنظر ما شأن الناس قد أحدقوا برسول الله - ﷺ - ؟ فوجدهم يبايعون ، فبايع ثم رجع إلى عمر - رضي الله تعالى عنه - فخرج فبايع . ح - ٦/٣٤٢ .

ته‌رجه‌مه :

نافیع - رحمه الله - ئه‌فه‌رموێ : خه‌ڵق ئه‌ڵێن كه ئیبن‌وعومه‌ر له پێش عومه‌را - رضي الله تعالى عنهما - موسوڵمان بوه وا نی‌یه . ئه‌مما رۆژی حوده‌یبییه عومه‌ر عه‌بدوڵلای نارد بۆ ئه‌سپێكی لای پیاوێكی ئه‌نصار بوو بۆی بێنێ كه حه‌ربی له سه‌ر بكا پێغه‌مه‌ر - ﷺ - لای شه‌جه‌ره‌ی ریضوان به‌یعه‌تی له‌گه‌ڵ خه‌ڵقا ئه‌كرد ، عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - خه‌به‌ری له‌وه نه‌بوو ، عه‌بدوڵلا به‌یعه‌تی كرد ، له پاشا چوو ئه‌سپه‌كه‌ی بۆ هێناو ئه‌ویش زرێی ئه‌پۆشی بۆ حه‌رب ، خه‌به‌ری دایێ كه پێغه‌مه‌ر - ﷺ - له ژێر (شجرة الرضوان)ا به‌یعه‌ت له‌گه‌ڵ خه‌ڵقا ئه‌كا . عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - ته‌شریفی چوو بۆ خذمه‌ت پێغه‌مه‌ر - ﷺ - عه‌بدوڵلایش - رضي الله تعالى عنه - له خذمه‌تیا چوو ، عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - به‌یعه‌تی كرد ، عه‌بدوڵلایش - رضي الله تعالى عنه - دووباره به‌یعه‌تی كرد . ئه‌وه‌یه كه خه‌ڵق ئه‌ڵێن عه‌بدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - له پێش باوكیا موسوڵمان بوه

ئيبن وعـومـەر - رضي الله تعـالى عنهما - ئـەفـەرمـوێ : رۆژی حودەيبيە پێغەمەر - ﷺ - لەگەڵ ئەصحابا بوو ، خەڵق لە ژێر سێبەری درەختانا بڵاوبوونەوە ، ئەوەندەی پێ نەچوو خەڵق لە دەوری پێغەمەر - ﷺ - كۆبوونەوە ، عومەر - رضي الله تعالى عنـە - فەرمـووی : ئەی عەبدوڵڵا بچۆ تێفكرە كە بـۆچ خەڵق كـۆبوونـەوە لە دەوری پێغـەمەر - ﷺ - ؟ عەبدوڵـڵا چوو تێفكـری خەڵق مـوبايـەعە ئـەكەن ئـەويش موبايەعەی كرد ، گەڕايەوە خەبەری دا بە عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەويش چوو موبايەعەی كرد [دووبارە عەبدوڵڵایش موبايەعەی كرد] .

لەم دوو ريوايەتەوە وا دەرەكەوێ كە لەو وەختەدا عومەر - رضي الله تعالى عنه - عەبدوڵڵای نارد بۆ ئەسپەكەی چاوی كەوت بە خەڵق كە دەورەی پێغەمەريان - ﷺ - دابوو ئەمری پێكرد كە ئەسپەكەيشی بۆ بێ‌و ئەوەيش تەحقيق بكا كە بۆچ خەڵق لە پێغەمـەر - ﷺ - كۆبـوونەوە ؛ چونكی حاديثە هەر يەكێكە ، كە وابێ موبايەنەت لە بەينی ريوايەتەكانا نابێ .[1]

(١) ئەم حەديثە لە بەرگی سێ‌يەمدا بە ژمارە (١٨٧ / ١٠٦٤) لەگەڵ كەمێك جياوازيدا رابورد .

# غزوة بني المصطلق هي والمريسيع واحدة ، وفيها وقع الافك .

قال إبن إسحاق : سنة ست ، وقال موسى بن عقبة سنة أربع .

١٤٠٥/٨٦ ابن عون [عبدالله] قال : كتبت إلى نافع فكتب إليَّ أن النبي - ﷺ - أغار على بني المصطلق وهم غارّون [غافلون] وأنعامهم تُسقى على الماء ، فقتل مقاتلتهم ، وسبى ذراريهم ، وأصاب يومئذ جويرية - رضي الله تعالى عنها - . ح - ٣٠٦/٤ . م - ٣٠٩/٧ . وفيه : كتبت إلى نافع أسأله عن الدعاء [إلى الاسلام] قبل القتال ، قال : فكتب إليَّ : إنما كان ذلك في أول الاسلام . قد أغار رسول الله - ﷺ - . . . الخ .

قال نافع : حدثني به عبدالله بن عمر - رضي الله تعالى عنه - وكان في ذلك الجيش . ح - ٣٠٦/٤ . م - ٣٠٩/٧ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عەون ئەفەرموێ : نووسیم بۆ لای نافیع ، لێم پرسی : پێغەمەر - ﷺ - لە پێش ئەمەدا کە لەگەڵ قەبیلەیێ حەرب بکا ئەو قەبیلەی دەعوەت کردوەتە سەر ئیسلامەتیی یان نا ؟ بۆی نووسیمەوە : کە ئەوە لە پێش ئەمەدا = بوە = کە ئیسلامەتیی ظوهوور بکاو شویووع ببێ لە ناو خەڵقا ، لە ئیبتیدای ظوهووری ئیسلامەتیدا بوە . عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - لە غەزای (بنی المصطلق)ا لە خزمەت پێغەمەرا بوە ، قسەی بۆ کردووم کە پێغەمەر - ﷺ - دای بەسەر بەنی موصطەلەقا غافڵ بوون ، حەیوانیان لەسەر ئاو بوو ئاو ئەدران ، ئەوانەیانی کوشت کە حەربیان پێ ئەکرا ، ژن و

منالّەکانی کرد بە ئەسیر ، ئەو رۆژە جوەیری یەی حەرەمی پێغەمەر - ﷺ ، ورضي عنها - لە ناو ئەو ئەسیرانەدا بوو . [کچی رەئیسەکەیان بوو ، پێغەمەر - ﷺ - ئازادی کردو لە خۆیی مارەکرد . بە بەرەکەتی موصاهەرەی پێغەمەرەوە - ﷺ - ئەو ئەسیرانە بە دەست هەر کەسێکەوە بوون ئازادیان کردن . جوەیری یە - رضي الله تعالى عنها - چە بەرەکەتێکی گەورە بوو بۆ قەومەکەی !] .

# غزوة خيبر بعد المريسيع سنة ست

١٤٠٦/٨٧ عن سلمة بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه - قال : خرجنا مع النبي - ﷺ - إلى خيبر ، فسرنا ليلا ، فقال رجل من القوم [أسيد بن حضير - رضي الله تعالى عنه - ] لعامر - رضي الله تعالى عنه - : يا عامر ألا تسمعنا من هنيهاتك ؟ وكان عامر رجلاً شاعرا ، فنزل يحدو بالقوم ، يقول :

اللهم لولا أنت ما اهتدينا
ولا تصدقنا ، ولا صلينا
فاغفر فداء لك ما أبقينا [من الآثام]
وثبت الأقدام إن لاقينا
وألقِينْ سكينة علينا
إنا إذا صيح بنا [دعينا إلى الباطل] أبينا
وبالصياح عوّلوا علينا [إستغاثوا علينا](١)

فقال رسول الله - ﷺ - : من هذا السائق ؟ قالوا عامر بن الأكوع . قال : يرحمه الله .

[وعند أحمد من رواية إياس بن سلمة ، فقال : غفر لك ربك . قال : وما استغفر رسول الله - ﷺ - لانسان يخصه إلا استشهد] قال رجل من القوم : [هو عمر بن الخطاب . م - - رضي الله تعالى عنه -] :

---

(١) نزيك بەم ريوايەتە لە حەديثى ٦٣/١٣٨٢دا رابوردو ، لەويْدا باسى ئەوەيشى تيايە كە عامير لە شەڕى مەرحەبا، شەهيدكرا . هەروەها باسى شيعرى عاميرو مەرحەبيشى تێدايە . سەرەتاى شيعرەكانيش لەوێ لە باتى (اللهم) (تالله) يە.

وجبت ، يا نبي الله لولا أمتعتنا به ؟ فأتينا خيبر فحاصرناهم حتى أصابتنا مخمصة شديدة ، ثم إن الله فتحها عليهم . فلما أمسى الناس مساء اليوم الذي فتحت عليهم أوقدوا نيرانا كثيرة . فقال النبي - ﷺ - : ما هذه النيران ؟ على أي شيً توقدون ؟ قالوا : على لحم . قال : على أي لحم ؟ قالوا : لحم حمر الانسية . قال النبي - ﷺ - : أهريقوها واكسروها . فقال رجل : يا رسول الله أو يهريقوها ويغسلوها ؟ قال : أو كذلك . فلما تصاف القوم كان سيف عامر قصيرا ! فتناول به ساق يهودي ليضرب به ويرجع ذباب سيفه فأصاب عين ركبة عامر ، فمات منه .

قال : فلما قفلوا قال سلمة رآني رسول الله - ﷺ - وهو آخذ بيدي ، قال : مالك ؟ قلت له : فداك أبي وأمي ! زعموا أن عامرا حبط عمله . قال النبي - ﷺ - : كذب من قاله . إن له لأجرين ، وجمع بين أصبعيه ، إنه لجاهد مجاهد قلَّ عربي مشى بها مثله . - نشأ بها أخرى - م - ٧/٤٤٦ ، ح - ٦/٣٤٦ .

تەرجەمە :

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - چووین بۆ خەیبەر بە شەو ڕۆیین پیاوێ لە قەومەکە ، کە ئوسەیدی کوڕی حوضەیرە - رضي الله تعالى عنه - بە عامیری مامی وت : ئەی عامیر بۆچی شتێکمان بۆ ناڵێی لەوەی کە ئەیزانی گوێی لێ بگرین ؟ عامیریش پیاوێکی شاعیر بوو ، دابەزیو دەستی کرد بە گۆرانی بۆ خەڵقەکە ئەیفەرموو : خوایا تۆ ئیرادەت نەبوایە ئێمە نە هیدایەتمان ئەبوو نە نوێژمان ئەکرد نەصەدەقەمان ئەدا . ئێمەت بە فیدا بین ، ئەو گوناهەی کە پاشەکەوتمان کردوە لێمان خۆش ببە ، قووەی مەعنەویمان بۆ بنێرە ، کە موقابەلەمان لەگەڵ دوشمن کرد (ثابت

قلم) مان بکە فیرار نەکەین ، ئێمە کە دوشمن بەسەرمانا بنەڕێنێ کە لە ڕێی حەق لادەین ئیبای لێ ئەکەین . لە وەختی سبەینێدا ئەوان بۆ ئەمە کە خەڵق بە ئیمدادیانەوە بێن بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئێمە هاواریان کردنێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەم گۆرانی بێژەکێیە ؟ عەرزیان کرد : عامیری کوڕی ئەکوەعە . فەرمووی : ڕەحمەتی خوای لێ بێ ، [لە ریوایەتی ئەحمەدا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خوای خۆت لێت خۆش بێ . ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە خوصووصی دوعای مەغفیرەتی بۆ هەرکەسێ کردبێ ئەو کەسە شەهید بوە] .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : بە واجب گەڕا [یەعنی عامیر ئەبێ شەهید ببێ] (یا نبي الله) بۆچ بە عامیر (متلذذ)ت نەکردین ؟ بۆچ ئەو دوعایەت بۆ کرد ؟ ئیتر شەهید ئەکرێ و لە کیسمان ئەچێ . هاتینە خەیبەر موحاصەرەمان دا ، تا تووشی برسێتی بووین . [چونکی موحاصەرەکە طوولی کێشاو طەعامان نەبوو بیخۆین] لە پاشا خوا بۆی فەتح کردین . ئێوارێی ئەو ڕۆژە کە بۆمان فەتح کرا خەڵق ئاگرێکی زۆریان کردەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەو ئاگرەیان بۆ کردۆتەوە ؟ لە ژێر چیا کردوویانەتەوە ؟ عەرزیان کرد : لە ژێر گۆشتا . فەرمووی : گۆشتی چی ؟ عەرزیان کرد : گۆشتی کەری ماڵیی . فەرمووی : بیڕێژن و زەرفەکانی بشکێنن . پیاوێ عەرزی کرد : (یا رسول الله) یاخۆ بیڕێژن و زەرفەکانی بشۆن ؟ فەرمووی : یا وا بکەن .

سەلەمە ئەفەرموێ : کە خەیبەری و ئەصحابی کیرام بەرابەر بە یەك صەفیان بەست شیری عامیری مامم کورت بوو ، تەمای بوو لە قاچی جوولەکەیێکی بدا [مەرحەب] کە بۆی داهێنا دەمی شیرەکەی گەڕایەوە بۆ قاچی خۆی . دای لە ئەژنۆی خۆی بەوە مرد . کە پێغەمەر

ـ ﷺ ـ وئەصحابی کیرامی تەشریفیان گەرِایەوە [خەڵق دەستیان کرد بە قسەکردن دەرحەق عامیر کە خۆی کوشتوەو هەمـوو عەمـەلی چاکـەی کردوویەتی بەتاڵ بۆتەوەو ! پێم ناخۆش بـوو دەستم کرد بـە گریـان ، چوومە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ] کە دیمی دەستی گرتم و فـەرمووی : چیت لێ روودراوە ؟ عەرزم کرد : (یا رسول الله) باوك و دایکم بە فیدات بێ ! ئەڵێن : عامیر هەموو عەمەلی بەتاڵ بوەتەوە ! فەرمووی : ئـەوی وای وتوە درۆی کردوە . دوو پەنجەی موبارەکی کۆکردەوەو فەرمووی : دوو ئەجری هەیە ، ئەو جاهیدەو موجاهیدە ، کەم کەس هەیە وەکوو ئەو بەسەر ئەرزا رۆییبێ ! لە ریوایەتێکا ئەفـەرموێ : لـە ئەرزا وەك ئـەو پێگەییبێ .

١٤٠٧/٨٨ عن أنس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ جاءه جاءٍ ، فقال : أكلتِ الحُمُر ، فسكت . ثم أتاه الثانيـة ، فقال : أكلتِ الحُمُر ، فسكت . ثم أتاه الثالثة فقال : أُفنِيت الحُمُر ! فأمر مناديا فنادى في الناس : أن الله ورسوله ينهـاهم عن لحوم الحمـر الأهلية ، فأكفئت ، وإنها لتفور باللحم . ح ـ ٦/٣٤٨ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ یەکێ هاتـە خذمـەتی عەرزی کـرد : کەرەکـان خـوران . پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بێدەنـگ بوو ، دەفعـەی دوەمیش هاتـەوە خذمەتی عەرزی کرد : کەر هەمـوو خوران ، دووبـارە بێدەنـگ بوو . دەفعەی سێیەم هاتەوە خذمەتی عـەرزی کرد : کـەر [یان نـەهێشت ، هـەموو خـوران و] بە فـەنادا بـران ![1] = پێغەمـەر ـ د ـ فـەرمـانی بـە

(١) دانەر ـ خ ـ لێرە بەدواوە تەرجەمەی حەدیثەکەی نەنووسیبوو ، وەك بیری چووبێت وایە ، ئێمە هەر لەسەرەوەو لە شوێنی خۆیدا تەواومان کرد .

بانگکەرێك دا - کە ئەبوطەلحە بوو - ئەویش بانگەوازی کرد : خواو پێغەمەری خوا نەهێتان لێ ئەکەن لە خواردنی گۆشتی کەری ماڵیی . خەڵکەکە مەنجەڵەکانیان لە کاتێکدا ئەکوڵان و قوڵپیان ئەدا قلپ کردەوە . =

١٤٠٨/٨٩ یزید بن أبي عبید قال : رأیت أثر ضربة في ساق سلمة [بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه -] فقلت : یا أبا مسلم ما هذه الضربة ؟ قال : هذه ضربة أصابتني یوم خیبر ، فقال الناس : أُصیب سلمة ، فأتیت النبي - ﷺ - فنفث فیه ثلاث نفثات [وهي فوق النفخ ودون التفل] فما اشتكیتها حتى الساعة . ح - ٦/٣٥٢ .

تەرجەمە :

یەزیدی کوڕی ئەبوعوبەید - رحمه الله - ئەفەرموێ : جێ‌دەمی شیرێکم لە قاچی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعا - رضي الله تعالى عنه - دی ، عەرزم‌کرد : ئەی ئەبو موسلیم ئەم شوێنە شوێنی چیە ؟ فەرمووی : لە رۆژی خەیبەرا ئەم برینەم لێ‌کرا ، خەڵق وتیان : سەلەمە ئەنگێورا ، چوومە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - بەسووکەوە تفێکی لێ‌کرد ئیتر تا ئێستە ئێشم لێ نەبینیوە .

تفی پێغەمەر - ﷺ - تریاقە بۆ هەموو دەردێ ، ئاخ بۆ تۆزێکی !

١٤٠٩/٩٠ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - أن النبي - ﷺ - غزا خیبر ، فصلینا عند صلاة الغداة بغلس ، فركب نبي الله - ﷺ - وركب أبو طلحة وأنا ردیف أبي طلحة - رضي الله تعالى عنه - فأجرى نبي الله - ﷺ - في زقاق خیبر ، وإن ركبتي لتمس ركبة رسول الله - ﷺ - ثم حسر الازار عن فخذه حتى أنظر إلى بیاض فخذ نبي الله - ﷺ - فلما دخل القریة قال : الله أكبر خربت خیبر إنا إذا نزلنا بساحة قوم ﴿فساء صباح

المنذرين﴾[1] قالها ثلاثا . قال : وخرج القوم إلى أعمالهم فقالوا : محمد والخميس ، قال عبدالعزيز : وقال بعض أصحابنا : والخميس يعني الجيش قال : فأصبناها عنوة [قهرا] فجمع السبي ، فجاء دَحية ، فقال : يا نبي الله أعطني جارية من السبي ، قال : إذهب فخذ جارية . فأخذ صفية بنت حيي ، فجاء رجل إلى النبي - ﷺ - فقال : يا نبي الله أعطيت دِحية صفية بنت حُييٍّ سيدة قريظة والنضير ؟ لاتصلح إلا لك [لأنها من بيت النبوة من ولد هارون . عليه السلام والرياسة] قال : أدعوه بها . فجاء بها ، فلما نظر إليها النبي - ﷺ - قال : خذ جارية من السبي غيرها [لئلا يتميز بها دحيةُ مع أن في الجيش من هو أفضل منه] قال : فأعتقها النبي - ﷺ - وتزوجها . فقال له ثابت [البناني] : يا أبا حمزة ما أصدقها ؟ قال : نفسها ؛ أعتقها وتزوجها . حتى إذا كان بالطريق جهزتها له أم سليم ، فأهدتها له من الليل . فأصبح النبي - ﷺ - عروسا .

فقال : من كان عنده شيٌ فليجئ به ، وبسط نِطْعا ، فجعل الرجل يجيئ بالتمر ، وجعل الرجل يجيئ بالسمن . قال [عبدالعزيز] وأحسبه [أنسا] قد ذكر السويق فحاسوا حَيْسا [خورماو رِوْنى به پەنير] فكانت وليمة رسول الله - ﷺ - [من الوَلم ، وهو الجمع لاجتماع الزوجين] ح - ١/٣٩٠ . ح - ٦/٣٤٩ . م - ٦/١٧٢ . م - ٧/٤٤٣ . د ، ن . ح - ٦/٣٤٨ . مختصرا . وفيه : فأصبنا من لحوم الحمر ، فنادى منادي النبي - ﷺ - : إن الله ورسوله ينهيانكم عن لحوم الحمر فإنها رجس . وليس فيه قصة صفية - رضي الله تعالى عنها - بل في حديث منفرد .

---

(١) الصافات / ٧٧ .

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ غەزای خەیبەری کرد ، نوێژی سبەینێمان بە تاریکیی کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ سوار بوو ، ئەبوطەلحەیش لە خزمەتیا سواربوو ، منیش لە پاشکۆی ئەبوطەلحەدا بووم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ناو کۆڵانی خەیبەرا لنگی دا ، ئەژنۆم لە ئەژنۆی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەکەوت ، لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیزارەکەی لەسەر رانی لادا تا چاوم بە سپێتی رانی موبارەکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ کەوت . کە تەشریفی چوە ناو دێی خەیبەرەوە سێ دەفعە فەرمووی : (الله أكبر) خەیبەر وێران بوو ، ئێمە [بەحەرب] کە چووینە سنووری قەومێکەوە چە خراپ ئەبێ رۆژلێبوونەوەی ئەو قەومەی [کە ئێمە بە هەیبەت] ئەیان ترسێنین !

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : جوولەکەکانی خەیبەر بە خاکەناز و پاچ و بێڵەوە بۆ ئیش و فرمان ئەچوون ، کە ئێمەیان دی وتیان : وەڵلاهی محەمەد و لەشکری ئەوە ! بە زۆر و قووەت خەیبەرمان گرت . ئەسیرەکانیان کۆکرایەوە . دەحیە هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد : (یا نبي الله) جاریەیێکم لەم ئەسیرانە پێ عەطا بفەرموو . فەرمووی : بچۆ جاریەیێ هەڵبگرە ، دەحیە صەفیەی کچی حویەیی هەڵگرت .

یەکێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد : (یا رسول الله) صەفیەت داوە بە دەحیە[1] کە گەورەی قورەیظە و نەضیرە ؟ هەر لایەق بە تۆیە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : دەحیەم لەگەڵ جاریەکە بۆ بانگ

(١) صەفیە گەورەی قورەیظە و نەضیرە نەك دەحیە .

بکەن . دەحیە جاریەکەی هێنایە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - کە پێغەمەر - ﷺ - چاوی بە صەفیە کەوت و تەماشای کرد بە دەحیەی فەرموو : بچۆ جاریەیەکی تر هەڵبگرە .

[بۆیە پێغەمەر - ﷺ - وای کرد چونکی صەفیە - رضي الله تعالى عنها - لە ئەولادی حەزرەتی هاروون بوو ، لە گەورەی ئەو قەومە بوو ، لە ناو ئەصحابیشا لە دەحیە گەورەتر بوو ، ئەو نازەنینەجوانەو پێغەمەرزادە ئەصیلە لە بەینی ئەصحابا بدا بە دەحیە موناسبی نەزانی] .

ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - صەفیەی ئازادکردو لە خۆی مارەکرد . ثابیتی بەنانی کە لە ئەنەسەوە ریوایەت ئەکا فەرمووی : عەرزی ئەنەسم کرد : ئەی ئەبو حەمزە ! چی کرد بە مارەیی ؟ ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : نەفسی صەفیەی کرد بە مارەیی ؛ ئازادی کردو لە خۆی نیکاح کرد تا لە رێ گەیینە جێیێ لەوێدا (أم سليم) - رضي الله تعالى عنها - تەدارەکی کردو بە بووکیی بردی بۆ پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - بە زاوایەتی رۆژی کردەوە . لە پاشا فەرمووی : هەرکەسێ شتێکی پێیە بیهێنێ و سفرەیێ چەرمی راخست . یەکێ خورمای هێناو ، یەکێ رۆنی هێناو ، یەکێ کەشکی هێنا . . ظەننم وایە کە ئەنەس بەحثی لە قاوتیش کرد . فەرمووی : خورماو رۆنێکیان[1] دروستکرد ، ئەوە نانی شایی پێغەمەر بوو - ﷺ - [کە بۆ صەفیەی کرد - رضي الله تعالى عنها - ] .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی :

(١) لە کاتی نووسینی عەرەبیەکەدا نووسیی : (خورماورۆنی بەپەنیر) . بەڵام لێرەدا وای نووسیوە .

دەستمان‌کرد بە گۆشتی کەر لێنان ، لە پاشا مونـادیی پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بـانگی کـرد : خــواو رەسـوولی خــوا نــەهیتــان لێ ئــەکــەن لــە گۆشتی‌کەرخواردن ؛ چونکی پیسە .

**ئەحکامی ئەم حەدیثە :**

- ئەو وەختە ران عـەورەت نەبـوە ، دەرخستن‌و تێفکرینی دروست بوە .
- دووپشتەکیی سواربوون دروستە .
- گۆشتی کەر حەرامەو پیسە .
- ژنی غەیرەدینی ئەسیر بکرێ عیددەی ناوێ .
- چێشتی شلیی سوننەتە لە دوای زەفاف .
- ئەمیری لەشکر بۆی دروستە مەنع‌و ئیعطاو ئیستیرداد = بکا = .

# غزوة الفتح

في رمضان لنقض أهل مكة صلح الحديبية سنة سبع ونصف ، أو ثمان .

٩١/ ١٤١٠ عن عروة قال : لما سار رسول الله - ﷺ - عام الفتح فبلغ ذلك قريشا خرج أبو سفيان : صخر بن حرب ، وحكيم بن حزام ، وبديل بن ورقاء يلتمسون الخبر عن رسول الله - ﷺ - فأقبلوا يسيرون حتى أتَوْا (مرّ الظهران) فإذا هم بنيران كأنها نيران عرفة ! فقال أبو سفيان : ما هذه ؟ فقال بديل بن ورقاء : نيران بني عمرو . فقال أبو سفيان : عمرو أقل من ذلك . فرآهم ناس من حرس رسول الله - ﷺ - فأدركوهم فأخذوهم فأتوا بهم رسول الله - ﷺ - فأسلم أبو سفيان . فلما سار [عليه الصلاة والسلام] قال للعباس : إحبس أبا سفيان عند حَطْم الخيل [أي إزدحامها] حتى ينظر إلى المسلمين . فحبسه العباس - رضي الله تعالى عنه - فجعلت القبائل تمرُّ مع النبي - ﷺ - كتيبةً - كتيبةً على أبي سفيان ، فمرت كتيبة ، قال : يا عباس من هذه ؟ قال : هذه غفار . قال : ما لي ولغفار ! ثم مرَّتْ جهينة قال مثل ذلك . ثم مرت سعد ابن هذيم فقال مثل ذلك . ومرت سليم فقال مثل ذلك . حتى أقبلت كتيبة لم ير مثلها . قال : من هذه ؟ قال : هؤلاء الأنصار ، عليهم سعد بن عبادة - رضي الله تعالى عنه - معه الراية . فقال سعد بن عبادة : يا أبا سفيان اليوم يوم الملحمة . اليوم تُستحل الكعبة . فقال أبو سفيان : يا عباس حبذا يوم الذِّمار [أي الهلاك] .

[وفي مغازي الأموي : أن أبا سفيان قال للنبي - ﷺ - لما حاذاه : أمرتَ بقتل قومك ؟ قال : لا . فذكر له ما قال سعد بن عبادة ، ثم

ناشده الله والرحمَ . فقال : يا أبا سفيان اليوم يوم المرحمة . اليوم يُعز الله قريشا . وأرسل إلى سعد فأخذ الراية منه ودفعها إلى ابنه قيس] .

ثم جاءت كتيبة وهي أقل الكتائب فيهم رسول الله وأصحابه ، وراية النبيِّ - ﷺ - مع الزبير بن العوام - رضي الله تعالى عنه - . فلما مرَّ رسول الله - ﷺ - بأبي سفيان قال : ألَم تعلم ما قال سعد بن عبادة ؟ قال : ما قال ؟ قال : قال كذا وكذ . فقال : كذب سعد . ولكن هذا يوم يعظم الله فيه الكعبة ، ويوم تكسى فيه الكعبة . قال : وأمر رسول الله - ﷺ - أن تركز رايته بالحجون [موضع قريب من مقبرة مكة] ح - ٣٧٦/٦ .

قال [عروة] : وأخبرني نافع بن جبير بن مطعم . قال : سمعت العباس يقول للزبير بن العوام - رضي الله تعالى عنهما - : يا أبا عبدالله ههنا أمرك رسول الله - ﷺ - أن تركُز الراية . قال : وأمر رسول الله - ﷺ - يومئذ خالد بن الوليد أن يدخل من أعلى مكة من كداء . ودخل النبي - ﷺ - من كُدىٰ . فقتل من خيل خالد يومئذ رجلان حبيش بن الأشعر ، وكُرْز بن جابر الفِهري - رضي الله تعالى عنهم - ح - ٣٧٧/٦ .

تەرجەمە :

ئەم حەدیثە مورسەلی صەحابی‌یە ؛ چونكی عوروە تابیعی‌یە ، ئەبێ لە زوبەیری باوكی بیستبێ یا لە صەحابەیێكی تر .

عوروە - رحمه الله - ئەفەرموێ : كە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی چوو بۆ مەككە لە ساڵی فەتحاو ، ئەو خەبەرە گەیی بە قورەیش ئەبوسوفیان و ، حەكیمی كوڕی حیزام و ، بودەیلی كوڕی وەرقاء لە مەككە چوونە دەرێ بۆ تەحقیقی خەبەری پێغەمەر - ﷺ - روویان كردە دەشت و ئەڕۆیین ، تا

گەیینە (مر الظهران) چاویان کەوت بە ئاگرێ زۆر کرابوەوە ، وەك ئاگری عەرەفە وا زۆر بوو . ئەبو سوفیان وتی : ئەم ئاگرە چیە ؟ بودەیلی کوڕی وەرقاء وتی : ئاگری بەنی عەمرە . ئەبوسوفیان وتی : عەمر لەوە کەمترە .

بەعزێ لە پاسەوانانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ چاویان پێیان کەوت ، پێیان گەیین و گرتنیانن و بردنیانن بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ . ئەبو سوفیان موسوڵمان بوو . کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی رۆیی ئەبوسوفیانی لە لای ئەو جێیەی کە کۆمەڵی سوارەکانی بەلادا ئەڕوا حەبس کرد ، تا لە شکری موسوڵمـان ببینێ . عەبـاس ـ رضي الله تعالى عنـه ـ لەوێـدا وەستانی . قەبائیل دەستە ـ دەستە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ بەسەر ئەبوسوفیانا رائەبوردن . دەستەیێ رابورد ئەبوسوفیان وتی : یاعەباس ئەم دەستەیە کێن ؟ فەرمووی : ئەمە غیفارە . وتی : من و غیفـار دەخڵمان بـەسەر یەکەوە نی یە . لە پاشا جوهەینە رابوردو ، سەعدی بنی هوذەیم رابوردو ، سولەیم رابورد . یەکە یەکە ئەبوسوفیـان پرسی و جـوابی درایەوە . تـا لـەشکرێکی زۆر کـە میثلی نـەبینرابێ رابـورد ، وتی : ئەمـانـە کـێن ؟ فەرمووی : ئەنصارن . سەعدی کوڕی عوبادە ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەیاخی پێبوو ، سەرکـردەیان بـو ، بە ئـەبوسـوفیانی فـەرموو : ئـەی ئەبوسوفیان ئیمڕۆ رۆژی کوشتارە ، ئیمڕۆ رۆژێکە کە کەعبـە ئیباحـە ئەکرێ . ئەبوسوفیان وتی : ئەی عەباس چە رۆژێکی خۆشە کە قورەیش لە ریشە بێنرێتە دەرێ ! لە پاشا دەستەیێ هات لە هەموو دەستەکان کەمتر بوون ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان لە ناوا بوو ، بەیاخی پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بە دەست زوبەیری کوڕی عەوامـەوە بوو . کـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بە لای ئەبوسوفیانا تەشریفی رابورد ئەبوسوفیان عەرزی‌کرد : ئەزانی سەعدی

کوڕی عوبادە چی وت ؟ فەرمووی : چی وت ؟ عەرزی‌کرد : ئەوەو ئەوەی وت . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سەعد درۆی کردوە . ئیمرۆ رۆژێکە خوا لەو رۆژەدا تەعظیمی کەعبە ئەکا ، ئیمرۆ رۆژێکە لەو رۆژەدا بەرگی کەعبە ئەپۆشرێ .

عوروە فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری بە زوبەیر کرد بەیاخەکەی لە حەجووندا بچەقێنرێ . عوروە ئەفەرموێ : نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موطعیم خەبەری داومێ لە عەبباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ م بیست بە زوبەیری کوڕی عەوامی وتوە : ئەی ئەبو عەبدوڵلا لێرەدا پێغەمەر ئەمری پێ کردی کە بەیاخەکەی دابچەقێنی .

عوروە ئەفەرموێ : ئەو رۆژە ئەمری بە خالیدی کوڕی وەلید کرد لای سەرووی مەکەوە لە کەدائەوە بچێتە ناو مەکە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ خۆیشی تەشریفی لە کوداوە چوە مەکە . [ئەمە موخالیفە بۆ ئەو حەدیثانەی کە پێن ئەفەرموێ : خالیدی کوڕی وەلید لە لای خوارووی مەکەوە داخڵی مەکە بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لای ژووروی مەکەوە داخڵی مەکە بوو] ئەو رۆژە لە سوارەی خالید دوو کەس شەهید کرا : حوبەیشی کوڕی ئەشعەرو ، کورزی کوڕی جابیری فیهریی [کورز بوو دای بەسەر حەیوانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ و بردنی لە پاشا موسوڵمان بوو گەلێ هونەری نوان ـ رضي الله تعالى عنه ـ ]

١٤١١/٩٢ عبدالله بن رباح عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : وفدت وفودا إلى معاوية ، وذلك في رمضان ، فكان يصنع بعضنا لبعض الطعام ، وكان أبو هريرة مما يكثر أن يدعونا إلى رحله ، فقلت : ألا أصنع طعاما فأدعوهم إلى رحلي ؟ فأمرت بطعام يصنع ، ثم لقيت أبا

هريرة من العشي ، فقلت : الدعوة عنـدي الليلة . فقال : سبقتني ، قلت : نعم . فدعوتهم فقـال أبو هـريرة : ألا أُعلمكم بحـديث من حديثكم يا معشر الأنصار ؟ ثم ذكر فتح مكة ، فقال : أقبل رسول الله - ﷺ - حتى قدم مكة ، فبعث زبيرا على إحدى المجنبتين ، وبعث خالدا على المجنبة الأخرى . وبعث أبا عبيدة على الحُسَّر [البياذقة ، أخرى . بمعنى الحُسَّر] ، [بِنّ زرىّ] فأخذوا بطن الوادي ورسول الله - ﷺ - في كتيبة قال : فنظر فرآني ، فقال : أبو هريرة ؟ قلت : لبَّيك يا رسول الله - ﷺ - فقال : لا يأتيني إلا أنصاريٌّ . زاد غير شيبان : فقال : إهتف لي بالأنصار ، قال : فأطافوا به ، ووبشت قريش أو باشا لها [جمعت جموعا من قبائل شتى] وأتباعا ، فقالوا : تقدم هؤلاء ، فإن كان لهم شيٌ كنا معهم ، وإن أصيبوا أعطينا الذي سئلنـا . فقال رسـول الله - ﷺ - : ترون أوباش قريش وأتباعهم ، ثم قال بيديه إحداهما على الأخرى . [فقال : يا معشر الأنصار هل ترون أوبـاش قريش ؟ قـالوا : نعم . قـال : أنظروا إذا لقيتمـوهم غدا أن تحصـدوهم حصدا وأحفى بيـده ووضع يمينه على شماله ، وقال : مـوعدكم الصفـا . م أخرى] . ثم قال : حتى توافوني بالصفا ، قال : فانطلقنا فما شاء أحد منـا أن يقتل أحداً إلا قتله ، وما أحد منهم يوجه إلينا شيئا .

قال : فجاء أبو سفيان فقال : يا رسول الله أبيحت خضراء قريش [أبيدت . أخرى .م] لاقريش بعد اليوم ! ثم قال : من دخل دار أبي سفيان فهو آمن [ومن ألقى السلاح فهو آمن ، ومن أغلق بابه فهو آمن . م . اخرى] .

فقالت الأنصار بعضهم لبعض : أمـا الرجـل فأدركتـه رغبة في قريته ، ورأفة بعشيرته . قال أبو هريرة : وجاء الوحي ، وكان إذا جاء

الوحي لايخفى علينا ، فإذا جاء فليس (منّا) أحد يرفع طرفه إلى رسول الله - ﷺ - حتى ينقضي الوحي ، فلما انقضى الوحي قال رسول الله : يا معشر الأنصار ! قالوا : لبيك يا رسول الله . قال : قلتم : أما الرجل فأدركته رغبة في قريته . قالوا : قد كان ذلك . قال : كلا إني عبدالله ورسوله هاجرت إلى الله وإليكم ، المَحْيا محياكم والممات مماتكم ! فأقبلوا إليه يبكون ويقولون : والله ما قلنا الذي قلنا إلا الضنَّ بالله وبرسوله - ﷺ - قال : إن الله ورسوله يصدقانكم ويعذرانكم . قال : فأقبل الناس إلى دار أبي سفيان ، وأغلق الناس أبوابهم .

قال : فأقبل رسول الله - ﷺ - حتى أقبل إلى الحجر فاستلمه ، ثم طاف بالبيت ، قال : فأتى على صنم إلى جنب البيت كانوا يعبدونه ، قال : وفي يد رسول الله - ﷺ - قوس وهو آخذ بسية القوس [المنعطف من طرفيه] فلما أن أتى على الصنم جعل يُطعن في عينيه ويقول : جاء الحق وزهق الباطل فلما فرغ من طوافه أتى الصفا فعلا عليه حتى نظر إلى البيت ورفع يديه فجعل يحمد الله ويدعو بما شاء أن يدعو . م ـ ٤١١/٧ ـ ٤١٥ و٤١٦ بفرق اشير إليه .

١٤١٢/٩٣ عبدالله بن مطيع عن أبيه ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : سمعت النبي - ﷺ - يقول يوم فتح مكة : لايقتل قرشي صبرا [أي يسلمون كلهم ولا يرتد أحد منهم كما إرتد غيرهم بعده - ﷺ - ممن حورب وقتل صبرا . وليس المراد أنهم لايقتلون ظلما صبرا ؛ فقد جرى على قريش بعد ذلك ماهو معلوم . نووي . . .] بعد هذا اليوم إلى يوم القيامة . م ـ ٤١٨/٧ ذكر بهذا الاسناد وزاد : قال : ولم يكن أسلم أحد من عصاة [من سمي عاصا . نووي] قريش غير مطيع . كان اسمه العاص فسماه رسول الله - ﷺ - مطيعا . م ـ ٤١٨/٧ .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباح لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەت ئەکا کە فەرمووی : لە ڕەمەزانا چووین بۆ لای موعاویە بە نۆبە ضیافەتمان بۆ یەکتریی ئەکرد ، ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - زیاتر لە هەموومان ئێمەی بانگەکردە لای خۆی . لە دڵی خۆما وتم : بۆچ من ضیافەتێکیان بۆ نەکەم و بانگیان کەمە لای خۆم ؟ ئەمرم کرد طەعامێکمان بۆ دروست بکەن ، لە پاشا ئێوارێ بە ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - گەییم پێم وت : ئیمشەو دەعوەت لای منە . فەرمووی : دەست پێشەکیت لێکردم ؟ فەرمووی : بەڵێ . بانگم کردن چێشتەکەمان پێ نەگەییبوو ، عەرزم کرد : (یا أبو هريرة) تا چێشتەکەمان پێ ئەگا حەدیثێکی پێغەمەرمان - ﷺ - بۆبگێرەرەوە .[1] فەرمووی : ئەی مەعشەری ئەنصار حەدیثێکی ئێوە ئەگێڕمەوە . لە پاشا بەحثی فەتحی مەکەی کرد ، فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی رووی کردە مەکە تا تەشریفی گەیی یە مەکە زوبەیری کوڕی عەوامی کرد بە سەرکردەی لاییکی لەشکرەکە ، خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بە سەرکردەی لایەکەی تری . ئەبوعوبەیدەی جەڕاحی کرد بە سەرکردەی ئەوانەی کە بێ زرێ بوون ، خۆیشی - ﷺ - لەسەر دەستەیێ بوو ، تەماشای فەرموو دیمی فەرمووی : ئەبوهورەیرە ! عەرزم کرد : بەڵێ لە خزمەتتام (یا رسول الله) . فەرمووی : هەر ئەنصاری بێنە لام . ئەنصارم بۆ بانگ = بکە = بانگم کردن ، بە هەڕاکردن هاتن ، دەورەی پێغەمەریان - ﷺ - دا

---

(١) لە «بانگم کردن چێشتەکەمان . .» تا ئێرە لە دەقە عەرەبی یەکەدا نەنووسراوە . بەڵام لە ریوایەتێکی دیکەی (مسلم)دا ئەم زیادە هەیە .

قورەیشیش لە عەشائیری موختەلیفەی عەرەب چەند جەماعەتێکیان کۆکردبۆوە ، ئەو ئەوباشانە وتیان : وا ئەوانە [یەعنی پێغەمەر - ﷺ - و ئەصحابی] هاتن ئەگەر ئەوان شتێکیان کرد لەگەڵ ئەوان ئەبین ، ئەگەر شکان ئەوانەمان ئەدرێتێ کە ئەمان ئەوێ .

پێغەمەر - ﷺ - بە ئەنصاری فەرموو : چاوتان لە ئەوباشی قورەیش و تەبەعەیانە ؟ فەرموویان : بەڵێ . فەرمووی : کە سبەینێ مولاقاتتان بوو بەدروونەوە بیان دروونەوە ، دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی موبارەکی دانا ، لە پاشا فەرمووی : لە صەفادا بێنە لام . فەرمووی : ئێمە رۆیین ، ئیرادەی کوشتنی هەرکەسێکمان لەوان بکردایە ئەمانکوشت ، ئەوان هیچیان بە ئێمە نەئەکرد ، فەرمووی : ئەبوسوفیان هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی کرد : (یا رسول الله) زەردو سووری قورەیش بەربادکرا ، لە دوای ئیمرۆ ئیتر هیچ قورەیش نی یە ! پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هەرکەسێ بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان ئەو کەسە ئەمینە ، هەرکەسێ سیلاحی فرێ بدا ئەو کەسە ئەمینە ، هەرکەسێ دەرگا لەسەر خۆی دابخا ئەو کەسە ئەمینە . ئەنصار بەعزێکیان بە بەعزێکیانی وت : ئەم پیاوە [یەعنی پێغەمەر - ﷺ -] هەوەسی دێیەکەی خۆیی و شەفەقەتی عەشیرەتەکەی خۆیی هەڵساوە .

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : وەحی بۆ پێغەمەر - ﷺ - هات ، کە وەحیی بۆ بهاتایە لێمان خەفی نەئەبوو ، کە وەحی بۆ ئەهات تا تەواو نەئەبوو کەس سەری چاوی هەڵنەئەبری بۆ پێغەمەر - ﷺ - کە نوزوولی وەحیەکە برایەوە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەی جەماعەتی ئەنصار ! عەرزیان کرد : لە خزمەتتاین (یا رسول الله) فەرمووی : ئێوە وتتان : ئەم پیاوە حوببی وەطەن و قەوم و عەشیرەتی لێ

نیشتوه ؟ عەرزیانکرد : بەڵێ (یا رسول الله) وتمان . فەرمووی : ناوی من چیە ؟ حاشا ئەوی ئێوە وتووتانە وا نی یە . من عەبدی خوام و رەسوولی ئەوم ، هیجرەتم بۆ لای خواو ئێوە کردوە ، ژیانم لەگەڵ ئێوەیەو مردنم لەگەڵ ئێوەیە [یەعنی قەت لێتان جوێ نابمەوە] بە گریانەوە روویان کردە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەیانفەرموو : ئێمە ئەوەمان وەڵڵاهی بۆیە وت کە بەخیلیی ئەوەمان ئەکرد خواو پێغەمەری ـ ﷺ ـ مان لە کیس بچێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لەوەدا کە مەقصوودتان وا بوە خواو پێغەمەر تەصدیقتان ئەکەن و بە مەعزوور تان ئەگرن .

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : خەڵق چوونە ماڵی ئەبوسوفیانەوەو [ئەوی بۆ ماڵی خۆی چوو] دەرگای لەسەر خۆی داخست . پێغەمەر ـ ﷺ ـ رووی کرد بۆ طەرەفی (حجر الاسود) و تەشریفی چوو دەستی لێداو طەواقی کرد ، لە طەوافەکەیا هات بۆ سەر بتێ لە تەنیشت بەیتەوە بو ، کە قورەیش عیبادەتیان بۆ ئەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ کەوانێکی بە دەستەوە بوو ئەو جێیە کە ژێی تێ ئەخرێ گرتبووی کە تەشریفی هاتە نزیك صەنەمەکەوە سەری کەوانەکەی کرد بە هەردوو چاوی بتەکەدا ئەیفەرموو : حەق هات و باطیل هیلاك بوو ، کە طەوافەکەی تەواو کرد تەشریفی چوو بۆ صەفا ، سەرکەوت تا بەیتی لێ دەرکەوت ، تەماشای بەیتی کردو حەمدی خوای کردو بەوەی کە هەوەسی هێنا دۆعای کردو ، ئەو دۆعایەی کە ئارەزووی بوو کردی .

عەبدوڵڵای کوری موطیع لە باوکیەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکاکە فەرمووی : لە پێغەمەرم بیست ـ ﷺ ـ لە رۆژی فەتحی مەکەدا ئەیفەرموو : لە دوای ئیمرۆ هیچ کەس لە قورەیش بە زوڵم ناکوژرێ تا رۆژی قیامەت . لە ریوایەتی ئیبن ونەمیرا ئەوەی لێ

زیادکردوه : ئەو رۆژه لەوانەی که ناویان عاص بوو بێ غەیری موطیع ئێشتا کەسیانی لێ موسوڵمان نەبووبو . موطیع ناوی عاص بو ، پێغەمەر - ﷺ - ناوی نا موطیع .

[نەوەویی - رحمه الله - ئەفەرموێ : عاص بـه مەعنـا گونـاهکار نی‌یه ؛ چونکی زۆر گونەهکار لە دوای ئەو رۆژه موسوڵمان بوون . هەم ئەفەرموێ : مەعنـای ئەوە کـه پێغەمـەر - ﷺ - فەرمـوویەتی : هیـچ قورەیشێ لەمەولا به عەذابی شەدیدو به زوڵم ناکوژرێ . . مەعنای وایه هەموو موسوڵمان ئەبن و مورتەد نابن ، وەك گەلێ لە غەیری ئەوان لە دوای ئەمه که موسوڵمان بوون لە دین وەرگەڕان . . .

## غزوة حنين بعد الفتح

### لست خلون من شوال سنة ثمان

١٤١٣/٩٤ أياس بن سلمة ـ رضي الله تعالى عنه ، ورحمه الله ـ حدثني أبي قال : غزونا مع رسول الله ـ ﷺ ـ حنينا فلما واجهنا العدو تقدمت فأعلو ثنية ، فاستقبلني رجل من العدو فأرميه بسهم فتوارى عني ، فما دريت ما صنع ، ونظرت إلى القوم فإذا هم قد طلعوا من ثنية أخرى ، فالتقوا هم وصحابة النبي ـ ﷺ ـ ، فولى صحابة النبي ـ ﷺ ـ وأرجع منهزما ، وعلي بردتان متزرا بإحداهما مرتديا بالأخرى ، فأستطلق إزاري فجمعتهما جميعا ، ومررت على رسول الله منهزما وهو على بغلته الشهباء فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لقد رجع ابن الأكوع فزعا فلما غشوا رسول الله ـ ﷺ ـ نزل عن البغلة ثم قبض قبضة من تراب من الأرض ، ثم إستقبل به وجوههم ، فقال : شاهت الوجوه ! فما خلق الله منهم إنسانا إلا ملأ عينيه ترابا بتلك القبضة ! فولّوا مدبرين فهزمهم الله بذلك ، وقسم رسول الله ـ ﷺ ـ غنائمهم بين المسلمين . م ـ ٤٠٧/٧ .

ته‌رجه‌مه :

سه‌له‌مه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئه‌فه‌رموێ : له خذمه‌ت پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ غه‌زای حونه‌ینمان کرد ، که له‌گه‌ڵ دوشمنا رووبه‌ڕوو وه‌ستاین ، پێشکه‌وتم ، له که‌ڵێ سه‌ره‌که‌وتم پیاوێکم به‌ره‌وڕوو هات ، تیرێکم تێگرت لێم ون بوو نه‌مزانی چی لێ هات ، ته‌ماشام کرد دوشمن له که‌لێکی تر سه‌رکه‌وتن . ئه‌وان و صه‌حابه‌ی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ به‌یه‌ك گه‌یین ، صه‌حابه‌ی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پشتیان هه‌ڵکردو هه‌رایان کردو شکان ، منیش فیرارم کردو گه‌ڕامه‌وه ، دوو لیباسم بوو ؛ یه‌کێکم به‌شانما

دابـوو ، يەكێكيشم گـرتبۆوە ، ئـەوی وەك پەشتـەمـاڵ گـرتبـوومـەوە كرايەوە ، هەردووكم كۆكردەوە كە فيرارم ئەكرد بە لای پێغەمەرا - ﷺ - رابوردم ، پێغەمەر - ﷺ - سواری ئێستره بۆرەكەی بووبوو [ثابيت بوو فيراری نەكردبوو لە موددەی عومريشيا قەت فيراری نەكردوە] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : (إبن الأكوع) بە ترسەوە گـەڕايەوە ، دوشمن كـە دەوری پێغەمەريـان گرت - ﷺ - پێغـەمەر لـە ئێسترەكـەی تەشـريفی دابەزیی و لە ئەرزی مستێ خۆڵی هەڵگرت رووی كردە دوشمنەكە [و بۆی هاويتن] فەرمووی : روويان قەبيح و نـاشيرين بێ . هـەركەسێ خـوا خەلقی كردبوو لەو دوشمنانە هيچ كەس نەمايەوە كە هەردوو چاوی لەو خـۆڵە پـڕ نـەبێ ! پشتيـان هـەڵكـردو خـوا شكـانی پێغـەمـەر - ﷺ - غەنيمەتەكەيانی تەقسيم كرد لە بەينی موسوڵمانانا .

٩٥/١٤١٤ إسماعيل [بن أبي خالد] قـال : رأيت بيد ابن أبي أوفى - رضي الله تعالى عنهما - ضربة [على ساعده . إسماعيلي] ، [فقلت : ما هذه ؟ أحمد] قال : ضربتها مع النبي - ﷺ - يوم حنين . قلت : شهدت حنينا ؟ قال : قبل ذلك . ح - ٣٨٧/٦ .

تەرجەمە :

ئيسماعيلی كـوڕی خاليـد - رحمه الله - ئـەفەرمـوێ : جێ دەمی شيرێكم دی بە دەستی عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفاوە - رضي الله تعالى عنه - لێم پرسی : ئەوە چيە ؟ فەرمووی : لە ڕۆژی حونەينا لێم دراوە . وتم : بۆ تۆ لە حونەينا حازربووی : فەرمووی : لە پێش ئەوەيشا ! [وەك حودەيبييە] .

٩٦/١٤١٥ قال عباس - رضي الله تعالى عنه - : شهدت مع رسول الله - ﷺ - يوم حنين فلزمت أنا وأبو سفيان بن الحرث بن عبدالمطلب

رسول الله ـ ﷺ ـ فلم نفارقه ، ورسول الله ـ ﷺ ـ على بغلة له بيضاء ، أهداها له فروة بن نفاثة الجذامي [نعامة . أخرى . إسمها دلدل] فلما إلتقى المسلمون والكفار ولّىٰ المسلمون مدبرين ، فطفق رسول الله ـ ﷺ ـ يُركضُ بغلته قِبل الكفار . قال العباس : وأنا آخذ بلجام بغلة رسول الله ـ ﷺ ـ أكُفُّها إرادة أن لاتسرع ، وأبو سفيان آخذ بركاب رسول الله ـ ﷺ ـ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : أي عباس ناد أصحاب السَّمُرة . فقال عباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ وكان رجلا صيِّتاً : فقلت بأعلى صوتي : أين أصحاب السَّمُرة ؟ قال : فوالله لكأن عطفتهم حين سمعوا صوتي عطفة البقر على أولادها ! فقالوا : يا لبيك . يا لبيك . قال : فاقتتلوا والكفَّارَ والدعوة في الأنصار [أي إليهم] يقولون : يا معشر الأنصار ! يا معشر الأنصار ! قال : ثم قصرت الدعوة على بني الحرث بن الخزرج . فقالوا : يا بني الحرث بن الخزرج ! يا بني الحرث بن الخزرج ! فنظر رسول الله ـ ﷺ ـ وهو على بغلته كالمتطاول عليها إلى قتالهم ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : هذا حين حمي الوطيس [التنوّر] قال : ثم أخذ رسول الله ـ ﷺ ـ حصيات فرمىٰ بهن وجوه الكفار ، ثم قال : إنهزموا ورب محمد ! ـ ﷺ ـ قال : فذهبت أنظر فإذا القتال على هيئته فيما أرى [وكأني أنظر إلى النبي ـ ﷺ ـ يركض خلفهم على بغلته . أخرى] قال : فوالله ما هو إلا أن رماهم بحصياته فما زلت أُرى حدَّهم كَلِلا ، وأمرهم مدبرا . م ـ ٣٩٩/٧ . فيه معجزة أي معجزة !

تەرجەمە :

عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ حازری غەزای حونەین بووم ، من و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرثی

[مامی پێغەمەر - ﷺ - ئەو ئەبوسوفیانە کە هەجوی پێغەمەری ئەکرد - ﷺ - و حەسان ئیذنی لە پێغەمەر - ﷺ - خواست کە موقابەلەی بکا ئێستە بە موسوڵمانیی لە خذمەت پێغەمەرایە - ﷺ - موحافەظەی ئەکا !] هەردوکمان مولازیمی پێغەمەر بووین - ﷺ - لێی جوێ نەبووینەوە ، پێغەمەر - ﷺ - سواری ئەو دوڵدوڵە بوو کە فەروەی کوڕی نوفاثە - یا نوعامە - ی جوذامیی بە هەدی‌یە بۆی ناردبوو ، ئێستریکی سپی بوو کەمێ مووی رەشی تیا بوو . کە موسوڵمانان و کافران بەرابەر بە یەك وەستان موسوڵمانان هەڕایان کردو شکان ، پێغەمەر - ﷺ - تەمای بوو ئێسترەکەی غار بدا بۆ سەر کوففار من دەستەجڵەوی ئێسترەکەم گرتبوو کە خێرایی نەکاو ئەبو سوفیانیش ئاوزەنگی‌یەکەی گرتبوو . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەی عەباس ئەصحابی سەمورە [کە شەجەرەی ریضوانە] بانگ بکە . عەباس - رضي الله تعالى عنه - کە پیاوێکی دەنگ بەرز بوو فەرمووی : بە دەنگێکی زۆر بەرز تا تیاما بوو بانگم کرد : ئەصحابی سەمورە لە کوێن ؟ وەڵڵاهی هەر ئەوەندە بوو کە دەنگی منیان بیست وەك گاگەل چۆن بائەداتەوە بۆ سەر بێچوەکانیان وا بایان دایەوە سەرمان ! ئەیانوت : (یا لبیك ، یا لبیك !) .

ئەوان و کوففار دەستیان کرد بە حەرب . ئیتر بانگ کردن حەصر کرایە سەر ئەنصار ، ئەیانوت : ئەی جەماعەتی ئەنصار ! ئەی جەماعەتی ئەنصار ! لە دواییدا دەعوەت حەصرکرایە سەر بەنی حەرثی کوڕی خەزرەج ؛ بانگیان ئەکرد : ئەی بەنی حەرثی کوڕی خەزرەج ! ئەی بەنی حەرثی کوڕی خەزرەج ! پێغەمەر - ﷺ - بەسەر ئێسترەکەیەوە تێفکریوە لنگ بدا بۆ حەربیان ، فەرمووی : = ئەمە = وەختێکە تەنوور [یەعنی ئاگری حەرب] هەڵگیرساوەو گەرم بوە .

عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەختێ بەردە وردەی هەڵگرت و هاویتی بە روویانا ، لە پاشا فەرمووی : قەسەم بە خوای محەمەد شکان ! چووم تێفکریم وام دی کە حەرب هەر وەکوو خۆیەتی . وەڵڵاهی هەر ئەوە بوو کە وردەبەردەکانی بۆ هاویتن کە تێفکریم توندو تیژییان کول ئەبوو ، ئیشیان بەرەودوا ئەبۆوە .

ئەمە موعجیزەییێکی گەورەیە بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

**١٤١٦/٩٧ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن أم سليم إتخذت يوم حنين خنجرا ، فكان معها ، فرآها أبو طلحة ، فقال : يا رسول الله هذه أم سليم معها خنجر . فقال لها رسول الله : ما هذا الخنجر ؟ قالت : إتخذته إن دنا مني أحد من المشركين بقرت به بطنه ! فجعل رسول الله ـ ﷺ ـ يضحك . قالت : يا رسول الله آقتل من بعدنا من الطلقاء إنهزموا بك ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : يا أم سليم إن الله عزوجل قد كفى وأحسن . م ـ ٧/٤٦٤ .**

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئومموسولەیمی دایکی ـ رضي الله تعالى عنها ـ رۆژی حونەین خەنجەرێکی دروستکرد ، ئەبوطەلحە ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاوی پێکەوت عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : ئەمە ئوممو سولەیمە خەنجەری پێیە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی پرسی : ئەم خەنجەرە چیە ؟ عەرزی کرد : دروستم کردوە کە ئەگەر یەکێ لە موشریکان لێم نزیك بێتەوە بەو خەنجەرە زگی هەڵبدڕم ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێکەنی . ئومموسولەیم عەرزی کرد : (یا رسول الله) ئەو طولەقایانەی پێ ئەکوژم کە هەڕایان

كردو [لەشکـری] تۆیـان شکان ! پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : ئـەی ئومم‌وسولەیم خوا ـ عز وجل ـ کیفایەتی ئێمەی کردو زۆر چاك یاری‌یەی داین .

[طولەقا : ئەوانەن کە لە فەتحا موسوڵمان بوون‌و پێغەمەر ـ ﷺ ـ نـەیکردن بـە ئـەسیـرو بـەرەڵـلای کـردن . ئیمـانیـان زەعیف بـوو ، ئومم‌وسولەیم ـ رضي الله تعالى عنها ـ لای وابوو چونکی هەڕایان کردبوو کە مونافیقن ، کوشتنیان دروستە . . ]

# غزوة الطائف

## في شوال سنة ثمان بعد حنين

١٤١٧/٩٨ أم سلمة - رضي الله تعالى عنها - دخل عليَّ النبيُّ - ﷺ - وعندي مُخَنَّثٌ [أي : يتكسَّر ويتثنىٰ مقلدا للنساء] فسمعته يقول لعبد الله ابن أمية [ابن أبي أمية : كش] : يا عبدالله أرأيت إن فتح الله عليكم الطائف غدا فعليك بأم غيلان [أسلمت هي وأبوها] فإنها تُقْبِل بأربعٍ ، وتُدْبِر بثمان . فقال النبي - ﷺ - : لا يدخُلَنْ هؤلاء عليكن . المخنث هيت . ح - ٣٩٣/٦ . م - ٨/ ٤٨٠ . ن ، جه . عن عائشة . وفيه : فقال النبي - ﷺ - : ألا أرى هذا يعرف ما ههنا ؟ لايدخلن عليكن . قالت [عائشة - رضي الله تعالى عنها -] فحجبوه .

تەرجەمە :

ئومم و سەلەمە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هاتەلام ، موخەننیثێکم لەلا بوو ، گوێم لێ بوو بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی ئەوت : خەبەرم بدەرێ کە سبەینێ طائیفتان بۆ فەتح کرا (أم غيلان)ت لە کیس نەچێ ؛ کە ڕووی کردە ئینسان بە چوار لۆچ ڕووی تێ ئەکا ، کە پشتی کردە ئینسان بە هەشت لۆچ پشتی تێ ئەکا [یەعنی لۆچی زکی لە پێشەوە چوارن ، لۆچەکان لە پشتەوە هەر یەکێکی ئەبێ بە دوان کە ئەکا هەشت .] پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەمە کە ئەم شتانە ئەزانێ نەیێتە لاتان .

ئەو (مخنث)ە ناوی هیت = بوو = [یا هیت لەقەبی بوو ناوی (ماتع) بوو] .

١٤١٨/٩٩ عن عبدالله بن عمرو [بن العاص . أو ابن عمر - رضي

الله تعالى عنهم -] قال : لما حاصر رسول الله - ﷺ - الطائف فلم ينل منهم شيئا قال : إنا قافلون إن شاء الله [تعالى] فثقُل عليهم ، وقالوا : نذهب ولا نفتحه ! وقال : مرة نقفُل . فقال [عليه الصلاة والسلام] : اغدوا على القتال ، فغَدَوْا ، فأصابهم جراح ، فقال : إنا قافلون غدا إن شاء الله . فأعجبهم فضحك النبي - ﷺ - . ح - ٦/٣٩٤ . م - ٧/٤٠٨ . ن .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ، یا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهم - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - موحاصەرەی طائیفی دا هیچی پێ نەکردن ، فەرمووی : (إن شاء الله) ئەگەڕێینەوە ، ئەصحاب لەبەریان گران بوو ، فەرموویان : ئەڕۆین و فەتحی ناکەین ! پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : سبەینێ بچن حەرب بکەن ، چوون بۆ حەرب ، [کوففار لەسەر قەلعەکەوە تیرەبارانیان کردن] بریندار بوون . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : سبەینێ (إن شاء الله) ئەگەڕێینەوە ، پێیان خۆش بوو ، پێغەمەر - ﷺ - پێکەنی .

## وفد بني تميم

١٠٠/١٤١٩ قال ابن إسحاق غزوة عيينة [فاعل] = بن حصن = بن حذيفة بن بدر بني العنبر [مفعول] من بني تميم بعثه النبي - ﷺ - إليهم [لما أغاروا على ناس من خزاعة] فأغار وأصاب منهم ناسا [أحد عشر رجلا] وسبى منهم نساء [إحدى عشرة إمرأة] ، [فقدم رؤساؤهم بسبب ذلك] ح - ٦/٤١٥ .

تەرجەمە :

[لە بەنی تەمیم بەنی عەنبەر دابوویان بەسەر بەعزێ لە خوزاعەدا] پێغەمەر - ﷺ - عویەینەی کوڕی حوذەیفەی = کوڕی حیصنی = کوڕی بەدری ناردەسەریان تالاّنی کردن ، یانزە پیاوو یانزە ژنیان ئـەسیر کـرد [رەئیسەکانیان هاتنە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - کە نەجاتیان بدەن] .

## وفد بني حنيفة

١٠١/١٤٢٠ أبو هريـرة - رضي الله تعالى عنـه - قال : بعث النبي - ﷺ - خيلا قبل نجد ، فجاءت برجل من بني = حنيفة = يقال لـه : ثمامة ابن ثال ، فربطوه بسارية من سواري المسجد ، فخرج إليه النبي - ﷺ - فقال : ما عندك يا ثمامة ؟ فقال : عندي خير يا محمد ، إن تقتلني تقتل ذا دمٍ ، وإن تُنْعِم تُنْعِم على شاكرٍ . وإن كنت تريد المال فسَلْ منه ما شئت . فتُرِك حتى كان الغد ، ثم قال - عليه الصلاة والسـلام - : ما عندك يا ثمامة ؟ فقال : ما قلت لك ؛ إن تنعم تنعم على شاكر فتركه حتى كان بعد الغد ، فقال : ما عندك يا ثمامة ؟ قال : عندي ما قلت لك .

فقال : أطلقوا ثمامة .

فانطلق إلى نجل [نخل . نسخة] [ماء مستنقع] قريب من المسجد ، فاغتسل ، ثم دخل المسجد ، فقال : أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله . يا محمد والله ما كان على الأرض وجه أبغض إليّ من وجهك ، فقد أصبح وجهك أحب الوجوه إليّ . والله ما كان من دين أبغض إليّ من دينك فأصبح دينك أحب الدين إليّ . والله ما كان من بلد أبغض إليّ من بلدك ، فأصبح بلدك أحب البلاد إليّ . وإن خيلك أخذتني وأنا أريد العمرة فماذا ترى ؟ فبشره رسول الله ـ ﷺ ـ وأمره أن يعتمر ، فلما قدم مكة قال له قائل : صَبَوْتَ . قال : لا والله ولكن أسلمت مع محمد رسول الله ـ ﷺ ـ ولا والله لا يأتيكم من اليمامة حبة حنطة حتى يأذن فيها النبي ـ ﷺ ـ .

[زاد ابن هشام : ثم خرج إلى اليمامة فمنعهم أن يحملوا إلى مكة شيئا ، فكتبوا إلى النبي ـ ﷺ ـ : إنك تأمر بصلة الرحم . فكتب إلى ثمامة أن يُخلِّيَ بينهم وبين الحمل إليهم] ح ـ ٦/٤١٨ .

له (صبوت)ەوە تا ئاخرییەکەیی و زیادەکەی هیشام دەرەکەوێ کە ئەم حادیثەیە لە پێش فەتحی مەکەدا بوە ، موناسب وایە لەوێدا بنووسرێ .

تەرجەمە :

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستەیێ سوارەی نارد بۆطەرەفی نەجد ، لە بەنی = حەنیفە = ثومامەی کوڕی ثالیان بە ئەسیریی هێنا ، بە کۆڵەکەییکی مزگەوتەکەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان بەستەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە لای ، فەرمووی : ئەی ثومامە لات چۆنە دەرحەق ئەو موعامەلەیەی کە دەرحەق تۆی

ئەکەم ؟ عەرزی‌کرد : یا محەمەد ظەننی خێرم لایە ؛ ئەگەر بمکوژی خوێنکەرێك ئەکوژی ، ئەگەر عەفوم‌کەیی و ئینعامم بەسەرا بکەی بە عەفوو ئینعام بەسەر کەسێکا ئەکەی کە شوکرت ئەکا . ئەگەر ماڵم لێ داوا بکەی چیت ئەوێ طەڵەب کە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێی هێشت ، ڕۆژی دوایی دووبارە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێی پرسی : ئەی ثومامە ظەننت چۆنە بە من کە دەرحەقتی ئەکەم ؟ عەرزی‌کرد : ظەننم ئەوەیە کە عەرزم کردی ئەگەر بە عەفو ئینعامم بەسەرا بکەی بە عەفو ئینعام بەسەر کەسێکا ئەکەی کە شوکرت بکا پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێی هێشت . ڕۆژی سێیەم دیسان لێی پرسی ؛ عەرزی‌کرد : ئەوەیە کە عەرزم کردی . پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری فەرموو : ثومامە بەردەن ، بەریان دا .

چوو بۆ لای ئاوێ کە = لە = مزگەوتەوە نزیك بوو غوسڵی‌کردو هاتەوە مزگەوت بۆ خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (أشهد ان لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله) . ئەی محەمەد وەڵڵاهی هیچ ڕوویێ نەبوە لەسەر ئەرزا لە ڕووی تۆ لام مەبغووضتر بێ ئێستە ڕووی تۆ وای لێ هاتوە کە لە هەموو ڕووی تر لە لام مەحبووبترە . وەڵڵاهی هیچ دینێ نەبوە لە دینی تۆ لە لام مەبغووضتر بێ ئێستە دینی تۆ وای لێ هاتوە کە لە هەموو دینێ لە لام خۆشەویستترە . وەڵڵاهی هیچ شارێ لە شاری تۆ لام مەبغووضتر نەبوە ، ئێستە شاری تۆ لە هەموو شارێ لە لام خۆشەویستترە . من بۆ عومرە ئەچووم سوارەی تۆ گرتمیان ئەمرت چیە ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ موژدەی ئەوەی دایێ کە خوا لە هەموو گوناهی پێشووی خۆش بوە . ئەمری پێکرد کە عومرە بکا .

کە چوو بۆ مەککە یەکێ پێی وت : لە دین وەرگەڕاوی ؟ فەرمووی : خەیر وەڵڵاهی لە دین وەرنەگەڕام [چونکی دینم نەبوە تا لێی

وەربگەڕێم ؛ چونکی دینی ئێـوە دین نی‌یە] . (لکن) مـوسوڵمـان بووم لەگەڵ پێغەمەر ـ ﷺ ـ . خەیر وەڵڵاهی [دینی ئێوە کە پێی ئەڵێن دین دین نی‌یە قەت ناگەڕێمەوە سەری‌و] لە یەمامەوە دەنکە گەندمێکتان بۆ نایێ تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمر نەکا .

[ئیبن‌و هیشام لە ریوایەتی خۆیا ئەوەی لێ‌زیاد کردوە : کە ثومامە ـ رضي الله تعالى عنه ـ گەڕایەوە بۆ یەمامە مەنعی‌کرد نەیهێشت کە لـە یەمامەوە هیچ شتێك بچێ بۆ مەککە . مەککەیی نووسییان بۆخزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ : تۆ ئەمر ئەکەی بە صیلەی رەحم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ نووسی بۆ ثومامە کە رێیان بو بەرەڵڵا بکا] .

١٤٢١/١٠٢ مهدي بن ميمون قـال : سمعت أبا رجـاء العطاردي [رحمهما الله ، أسلم زمن النبي ـ ﷺ ـ ولم يره] يقول : كنا نعبد الحجر فإذا وجدنا حجرا هو أخير منه ألقيناه وأخذنا الآخر ، فإذا لم نجد حجرا جمعنا جُثْوةً [قطعة] من تراب ثم جئنا بالشاة فحلبنـاه عليه [حتى يلتئم كالحجر] ثم طفنا به ، فإذا دخل شهر رجب قلنا : مِنصل الأسنة ؛ فلا ندع رمحا فيه حديدة ولاسهما فيه حديدة إلا نزعناه وألقيناه شهر رجب .

وسمعت أبا رجاء يقول : كنا يوم بعث النبي [أي إشتهر أمره] ـ ﷺ ـ غلاما أرعىٰ الابل على أهلي ، فلما سمعنا بخروجه [أي ظهوره على قومه بفتح مكة] فـررنـا إلى النـار : إلى مسيلمـة الكـذاب .

ح ـ ٤٢٠/٦ .

تەرجەمە :

مەهدیی کوڕی مەیموون ئەفەرموێ : لە ئەبو رەجای عەطاریدیم بیست ئەیفەرموو : ئێمە بەردمان ئەپرست ، کە بەردێکی باشترمان لەو بەردە دەست‌کەوتایە ئەو بەردەمان فڕێ‌ئەدا ئەوی‌ترمان هەڵەگـرت بۆ

عیبادەت ، بەردمان دەستنەکەوتایە خۆلمان کۆئەکردەوەو مەرمان بەسەرا ئەدۆشی تا وەك بەرد رەق بیو طەوافیمان ئەکرد ، کە مانگی رەجەب ئەهات ئاسنی رمو تیرمان هەموو فرێ ئەدا هیچ رمو تیرمان نەئەهێشت کە ئاسنی پێوە بمێنێ دەرمانئەهێناو فرێمان ئەدا لە مانگی رەجەبا .

لێمبیست ئەیفەرموو : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری بیعثەتی شوهرەتی بەست ، منالْ بووم وشتری خۆمانم ئەلەوەڕان ، کە خەبەری ئەوەمان بیست پێغەمەر ـ ﷺ ـ غالْب بوو بەسەر قەومەکەیاو مەککەی فەتح کرد فیرارمان کردە ناو ئاگر بۆ لای موسەیلیمەی کەذذاب .

[ئەبو رەجاء ـ رحمه الله ـ لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ موسوڵمان بوو ئەمانەی دی] .

**١٤٢٢/١٠٣ عن علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : بعثَ النبي ـ ﷺ ـ سريةً فاستعمل عليها رجلا من الأنصار [عبدالله بن حذافة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ليس أنصاريا ، بل هو سهمي . والمعنى من الناصرين لدين الله] وأمرهم أن يطيعوه فغضب [فأغضبوه . م] فقال : أليس أمركم النبي ـ ﷺ ـ أن تطيعوني ؟ قالوا : بلى . قال : فأجْمعوا لي حطبا ، فجمعوا ، فقال : أوقدوا نارا فأوقدوها . فقال : أدخلوها .**

**[وفي رواية حفص بن غياث : عزمت عليكم لما جمعتم حطبا وأوقدتم نارا ثم دخلتم فيها] فهمّوا وجعل بعضهم يمسك بعضا ويقولون : فررنا إلى النبي ـ ﷺ ـ من النار ! فما زالوا حتى خمدت النار فسكن غضبه . فبلغ النبيَّ ـ ﷺ ـ فقال : لو دخلوها ما خرجوا منها إلى يوم القيامة . الطاعة في المعروف . ح ـ ٦/٤٠٢ .**

**تەرجەمە :**

ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ جەماعەتێکی نارد بۆ جێیێ پیاوێکی ئەنصاریی [کەعەبدوڵلای کوڕی حەذافەی سەهمی یە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ]ەکرد بە سەرکردەیان ئەمری پێ فەرموون کە ئیطاعەی بکەن رقیان هەڵسان . فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ نەفەرموون کە ئیطاعەم بکەن ؟ فەرموویان : بەڵێ . فەرمووی : کە وابێ دارم = بۆ = کۆبکەنەوە ، بۆیان کۆکردەوە . فەرمووی : هەڵی گیرسێنن ، هەڵیان گیرسان . فەرمووی : بچنە ناوی ، تەمایان بوو کە بچنە ناوی ، بەعزێکیان بەعزێکیانی ئەگرت نەیئەهێشت بچێتە ناوی ، ئەیانفەرموو : ئێمە لە ئاگر فیرارمان کردوە بۆ لای پێغەمەر ! ـ ﷺ ـ ئیتر هەر بەم نەوعە مەنعی یەکتری یان ئەکرد تا ئاگرەکە کووژایەوە . ئەو وەختە غەضەبی عەبدوڵلا دامرد .

ئەو خەبەرە گەیی بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر ئەچوونە ناوی تا رۆژی قیامەت لێی نەئەهاتنە دەرێ . ئیطاعەت لە ئەمری مەعرووفا لازمە .

[ئیبن وسەعد لە طەبەقاتا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو سریەی بۆیە نارد خەبەری ئەوەی پێگەیی کە ئەهلی جیددە بەعزێ خەڵقی حەبەشیان دیبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە (ربيع الآخر)ی ساڵی نۆیەمی هیجرەتا عەلقەمەی کوڕی (مجزز) ی لەگەڵ سێصەد کەس نارد بردنی تا جەزیرەیێ کە بە شوێنیانا چوە ناو بەحرەکەوە هەڕایان کرد ، کە گەڕایەوە بەعزێ لەوانەی کە لە خزمەتیا بوون عەجەلەیان کرد بۆ ناو ماڵو منالیان گەڕانەوە . ئەو وەختە عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەمری بەوانە کرد کە عەجەلەیان کردبوو .] ح ـ ٦/٤٠٢ .

م ـ ٨/٣٥ . د ، ن .

**١٤٢٣/١٠٤ عن أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رجالا من المنافقين على عهد رسول الله ـ ﷺ ـ كان إذا خرج رسول الله ـ ﷺ ـ إلى الغزو تخلفوا عنه ، وفرحوا بمقعدهم خلاف رسول الله ـ ﷺ ـ فإذا قدم رسول الله ـ ﷺ ـ إعتذروا إليه وحلفوا ، وأحبُّوا أن يحمدوا بما لم يفعلوا ، فنزلت : ﴿لاتحسبن الذين يفرحون بما أتوا ويحبون أن يحمدوا بما لم يفعلوا . .﴾[1] ح ـ ٧/٦٦ ، م ـ ١٠/٢٥٤ .**

**تەرجەمە :**

ئەبو سەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ بەعزێ لە موونافیقان کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی بچوایە بۆ غەزایێ لێی دوائەکەوتن ، بە دواکەوتنەکەیان دڵخۆش ئەبوون ، کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی ئەهاتەوە ئەچوونە خزمەتی عوذریان بۆ ئەهێنایەوەو سوێنیان ئەخوارد ، حەزیان ئەکرد بەو ئیشەی کە نەیانکردوە مەدح بکرێن . ئەو وەختە ئەم ئایەتی (آلی عمران)ە نازڵ بوو : ئەی محەمەد ظەن مەبە کە ئەوانەی بەوە کەیفخۆش ئەبن کە مەدح بکرێن بە ئیشێ کە نەیانکردبێ بەوە نەجاتیان ببێ لە عەذاب .[2]

**١٤٢٤/١٠٥ علقمة بن وقاص [وكان من أجلِّ التابعين] أخبر أن مروان قال لبوَّابه : إذهب يا رافع إلى ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فقل : لئن كان كل امرئ فرح بما أوتي وأحب أن يحمد بما لم يفعل . .**

---

(١) آل عمران / ١٨٨ .

(٢) (بەوە نەجاتیان ببێ لە عەذاب) تەواوکەری ئایەتەکەیەو لە عەرەبییەکەدا نەنووسراوەو دانەر ـ خ ـ خۆی تەواوی کردوە .

معذبا لنعذبن أجمعون ! فقال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : وما لكم ولهذه [المسألة] ؟ إنما دعا النبي ـ ﷺ ـ يهود فسألهم عن شيْ [عن صفة النبي ـ ﷺ ـ عندهم] فكتموه إياه وأخبروه بغيره فأروه أن قد استحمدو عليه بما أخبروه عنه فيما سألهم وفرحوا بما أوتوا من كتمانهم . ثم قرأ ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : ﴿وإذ أخذ الله ميثاق الذين أوتوا الكتاب [لتبيّننّهُ للناس ولا تكتمونه . . إلى آخر الآية الثانية . .]﴾[1] ح ـ ٧/٦٦ . م ـ ١٠/٢٥٥ . عن حميد بن عبدالرحمن بن عوف بفرق ما .

ئەرجەمە :

عەلقەمەی کوڕی وەقاص ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : مەروان بە دەرگاوانەکەی وت : ئەی رافیع بچۆرە خزمەت ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لێی بپرسە : ئەگەر هەرکەسێ کە دڵخۆش ئەبێ بەوەی کە خوا پێی عەطاکردوەو حەزەکا کە مەدح بکرێ بەوەی کە نەیکردبێ عەذاب بدرێ . . ئێمە هەمووومان عەذاب ئەدرێین ! ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : دەخڵیان چیە بەسەر ئەم مەسئەلەیەوە ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ جوولەکەی بانگ‌کرد شتێکی لێ پرسین لێیان کەتم‌کردو بە نەوعێکی تر جوابیان دایەوە ، بەوە دڵخۆش بوون کە بەو جوابە درۆیە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێیان مەمنون بوە حەمدیان ئەکا . لە پاشا ئیبن‌و عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەو دوو ئایەتی ئالی عیمرانەی خوێنەوە .

---

(١) آل عمران / ١٨٧ .

ئەم سەبەبی نوزووله موبایینی سەبەبی نوزوولی ئەبوسەعیده . نە له موسلیما نەوەویی ، نە له بوخاریدا قـەسطەلانی قسـەیان لیٚ نـەکردوه . رەنگه سوئال له یەهوودیو ئیعتیذاری مونافیق له وەختێکا بووبیٚ .

تمت الغزوات بحمد الله ـ تعالی ـ
پیٚنج شەنبە ٢٠ شوباط ٩٤١

که ئەفەرموێ (باب بدء الخلق) ئینسان وا تێئەگا کە لە ئیبتیدای خەلقی عالەمەوە خوا چی خەلق کردوە هەمووی یەکە یەکە کەیفییەتی خەلقی ئەرزو ئاسمان و مەلائیکەو جینن و ئینس و بەهەشت و جەهەننەم . . هەمووی بەیان ئەکا . ئەمما دائیر بەوانە یەك حەدیث نیە ، هەر ئەوەی تیایە کە مەلائیکەو جیننی و شەیطان چی ئەکەن هیچی تر . کەیفییەتی خەلقی ئەوانە بە موجمەلی لە قورئانا هەیە .

جومعە ٢١/٢/٩٤١

# بدء الخلق

## بسم الله الرحمن الرحيم

ما جاء في = بدء الخلق =

١ - قوله - تعالى - : ﴿وهو الذي يبدأ الخلق ثم يعيده ، وهو أهون عليه ، [وله المثل الأعلى في السماوات والأرض وهو العزيز الحكيم]﴾[١] ح - ٥/٢٣٨

٢ - ﴿الله يبدأ الخلق ، ثم يعيده ، ثم إليه تُرجَعون﴾[٢] الروم

٣ - ﴿أَوَلَمْ يروا كيف يبدئ الله الخلق ثم يعيده ؟ إن ذلك على الله يسير﴾[٣] عنكبوت .

٤ - ﴿قل : سيروا في الأرض فانظروا كيف بدأ الخلق ثم الله ينشئ النشأة الآخرة . إن الله على كل شئ قدير﴾[٤] عنكبوت .

**ئەرجەمە :**

خوا - عز وجل - ئەو خوايەيە كە ئەو لە ئينسانو هەموو ذی ڕۆح خەلق ئەكا ، كە بە هيلاك چوون لە دوای هيلاكبوونيان ، هەر وەختێ ئيرادە بكا ، ئيعادەيان ئەكاتەوە . بە نەظەر ئوصوولْو قاعيدەو قودرەتی ئێوەوە ئيعادەكردنەوەی لە سەر خوا - عز وجل - سووكترە لەمە كە = لە ئەوەڵەوە خەلقی بكا ؛ چونكی خەلقی ئيبتيدائی ئەصلێكو ئەساسێكو

---

(١) الروم / ٢٧ .

(٢) الروم / ١١ .

(٣) العنكبوت / ١٩ .

(٤) العنكبوت / ٢٠ .

میثالێکی نی‌یە کە لەسەری دروست بکا . فەقەط بۆ ئیعادەکـردنەوەی ئەساس‌و میثالێ هەیە . ئەمما بە نیسبەت قودرەتی قاهیری خواوە خەلق : ئیبتیدائی‌و ، ئیعادەکردنەوەی هیچ فەرقیان نی‌یە . هەردووکی سووکە ؛ چونکی = خوا = - عز وجل - صیفەتێکی عەجیبی هەیە وەك : قودرەتی عامە ، حیکمەتی تامە لە ژوور عیلم‌و قودرەتی هەموو ماسیوای خۆیا کە لە خەلقی سەماوات‌و ئەرزایە هەر خوایە کـە قادر بێ‌و غـالب بێ بەسـەر هەموو شتا ، عاجـز نەبێ لـە خەلق‌و ئیعـادەو کە هـەموو ئـەفعالی بـە موقتەضای حیکمەت بێ .

خوا - عز وجل - (إبتداءً) بە بێ میثال‌و نموونە خەلق دروست ئەکاو ئیعادەی ئەکاتەوە ، لە پاشا کە ئیعادەکرانەوە هەموو روجووع ئەبنە لای ئەو بۆ : حیساب‌و ، ثەواب‌و ، عیقاب .

کوففار کە ئینکاری بەعث ئەکەن ئایا تێ نافکرن کە چۆن ئیبتیدای خەلق ئەکاو کە بە هیلاك چوون ئیعادەیان ئەکـاتەوە ؟ خـەلق‌و ئیعادە لەسەر خوا زۆر ئاسانە .

ئەی محەمەد بە مونکیری بەعث بڵێ : سەیاحەتی ئەرز بکـەن ، تێفکرن ، نەظەر لە ئەنواعی مەصنووعاتی ئیلاهی‌یە بکەن ، چۆن خوا خەڵقی خەلق کردوەو عیلم‌و قودرەتی بوە بەسەر خەلقیانا بەو نەوعەیش خوا دووبارە ئیجادیان ئەکاتەوە .

دەلائیل‌و ئایات لە قورئانا زۆرە ئەم میقدارە کافی‌یە .

١٤٢٥/١ عن عمران بن حصين - رضي الله تعالى عنه - قال : دخلت على النبي - ﷺ - وعقلت ناقتي بالباب ، فأتاه ناس من بني تميم ، فقال : أقبلوا البشرى يا بني تميم . قالوا : قد بشرتنا ، فأعطنامرتين . ثم دخل عليه ناس من أهل اليمن [وهم الأشعرييون] ، فقال : إقبلوا البشرى يا

أهل اليمن إذ لم يقبلها بنو تميم . قالوا : قبلنا يا رسول الله نسألك عن هذا الأمر [العالَمِ] قال : كان الله ولم يكن شيٌ غيره . وكان عرشه على الماء [أي ثم كان] وكتب في الذكر ـ أي اللوح المحفوظ ـ كُلَّ شيٌ . وخلق السماوات والأرض . فنادى منـاد : ذهبتْ ناقَتُـك يا ابن الحصـين ! فـانطلقت فـإذا هي يقطع دونها السـرابُ . فوالله ! لَـوَدِدْتُ أنِّي كنت تركتها . [ليتني تركتها . أخرى . خ] خ/٥/٢٣٩ . ح ـ ٣٨٣/١٠ . ت ، ن .[1]

١٤٢٦/٢ عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : قام فينا النبي ـ ﷺ ـ مقاما ، فأخبرنا عن بدء الخلق حتى دخل أهل الجنة منازلهم ، وأهل النار منازلهم . حفظ ذلك من حفظه ، ونسيه من نسيه . ح ـ ٢٤١/٥ .

تەرجەمە :

عیمرانی کوڕی حصـەین ـ رضي الله تعالى عنـە ـ ئەفـەرموێ : چوومە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە بەردەرکی مزگەوتەکەدا وشترەکەم ئەشکێڵ کرد . بەعزێ کەس لە بەنـوتەمیم هـاتنە خـزمەت پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێی فـەرموون : مـوژدەی بەهـەشتو مەقـاماتی عـالیـەتـان ئەدەمێ ! عەرزیانکرد : موژدەت داوینێ [بۆیە هاتووین شتمان بدەیتێ] شتمان بدەرێ دوو دەفعەیان وت . [ڕووی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تێکچوو . أخرى] لە پاشانا بەعزێ لە ئەهلی یەمەن هاتنە خزمەتی [ئەبو مووسای ئەشعەریی و ڕەفیقـانی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموون : کە بەنوتەمیم موژدەیان قەبووڵ نەکرد ئێوە قەبووڵی بکەن . عەرزیانکرد : (یا رسول الله) قەبووڵمان کـرد . عەرزیـانکرد . بـۆیە

(١) سەرەتای ئەم حەدیثە نەختێك لە حەدیثی ژمارە (١١٢٩/٢٥٢) دەچێت .

هاتووینه خذمەتت كە ئەحوالْی ئەم عالەمەمان تیْبگەییْنی چۆن بوەو چۆن ئەبیْ . فەرمووی : خوا ـ عز وجل ـ مەوجوود بوەو هیچی تر نەبوە ، لە پاشا خوا ـ عز وجل ـ ئاوو عەرشی خەلق كرد ، عەرشی لەسەر ئاو بوو ، لە (لوح المحفوظ)ا هەموو شتیْك كە دروست ئەكریْ هەمووی نووسرا ، ئاسمانو ئەرز خەلق كرا ، لەو وەختەدا بانگكەریْ بانگی كرد : ئەی كوری حوصەین وشترەكەت رۆیی ! بە شویْنیا چووم ، تیْفكریم سەراب كەوتۆتە بەینمانەوە ریْی ئەوەی لیْگرتووم كە بی بینم . = خۆزگە وازم لیْبهیْنایەو گویْم پیْ نەدایە = .

عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویْ : پیْغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر مینبەر تەشریفی راوەستا خەبەری داییْ لە بەدئی خەلقەوە ، تا ئەهلی بەهەشت چوە بەهەشتەوەو ئەهلی جەهەننەم چوە جەهەننەمەوە ، تا بەهەشتیو جەهەننەمی چوونە مەنزلْی خۆیانەوە ، ئەوی حیفظی كردبیْ حیفظی كردوە ، ئەوی لە فكری چوو بیْتەوە لە فكری چۆتەوە .

**١٤٢٧/٣ [في حديث أبي زيد الأنصاري عند أحمد] ومسلم عن عمرو بن أخطب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : صلى بنا رسول الله ـ ﷺ ـ صلاة [الفجر . م] وصعد المنبر فخطبنا حتى حضرت الظهر . ثم نزل فصلى بنا الظهر ، ثم صعد المنبر فخطبنا ثم العصر كذلك [فخطبنا حتى غربت الشمس . م] حتى غابت الشمس ؛ فحدثنا بما كان وما هو كائن . فأعلمنا أحفظنا . م ـ ٣٥٥/١٠ . ح ـ ٢٤١/٥ .**

**تەرجەمە :**

[چی فەرمووەو چی نەفەرمووە ، حەرفیْكی هیچ كەس بەیانی نەكردوە ، رەنگە هەر ئەوانە بیْ كە = لە = فیتنەو ، ئەشراطو ، ئەحوالْی ئاخیرەتو ، سائیرەدا بەیان كرابیْ . والله أعلم] .

ئەبوزەید . . عەمری کوری ئەخطەب - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - نوێژی سبەینێی پێ کردین ، تەشریفی چوە سەر مینبەر ، خوطبەی بۆ خوێندین تا وەقتی نیوەرۆ . لە پاشا تەشریفی هاتە خوارێ نوێژی نیوەرۆی پێ کردین ، لە پاشا تەشریفی سەرکەوتەوە سەر مینبەر خوطبەی بۆ خوێندین تا عەصر ، تەشریفی هاتەخوارێ نوێژی عەصری بۆ کردین ، تەشریفی چوەوە سەر مینبەرەکە تا ئێوارێ رۆژ ئاوابوو . تا ئەو وەختە چی بوەو لەوەلایش چی ئەبێ خەبەری داینێ .

[چی ئەبوو بەعزێ ئەصحاب بەعزێکی لەو فەرموودەیان بۆ نەقڵ بکردینایە . رەنگە ئەوامیرو نەواهی هیچ تیا نەبووبێ . هەر خەبەردان بووبێ لە حەوادیث گینا ئەمری ئەکرد بە تەبلیغی .]

**٤/١٤٢٨ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - : أراه يقول الله : شتمني ابنُ آدم وما ينبغي له أن يشتمني ، ويكذبني وما ينبغي له . أما شتمه : فقوله : إن لي ولدا . وأما تكذيبه : فقوله : ليس يعيدني كما بدأني . ح - ٥/٢٤١ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : وا ظەن ئەبەم کە وای فەرموو : خوا - عز وجل - ئەفەرموێ : بەنی ئادەم جوێنیان پێدام ، لایەق نی یە بۆ ئەوان جوێنم پێ بدەن . تەکذیبیان کردم لایەق نی یە بۆ ئەوان کە تەکذیبم بکەن . جوێندانیان ئەوەیە کە ئەڵێن : وەلەدی هەیە ؛ [چونکی وەلەدی ببێ ئەبێ خۆیشی لە باوك و دایکێ بەوەلەد بووبێ ، ئەوە (مستلزم)ی حودووث و نەقصە] تەکذیبکردنیان ئەوەیە کە ئەڵێن : دووبارە دروستم ناکاتەوە وەك لەوەپێش کە خەلقی کردووم .

١٤٢٩/٥ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لما قضى الله ـ تعالى ـ الخلق كتب [على نفسه .م] في كتابه [وهو غير اللوح] فهو عنده فوق العرش ، [واللوح تحت العرش] : إن رحمتي سبقت [غلبت] غضبي . ح . ٢٤٢/٥ . ح ـ ٤١٠/١٠ . ن وفيه : سبقت بدل غلبت . م ـ ١٩٠/١٠ . في رواية منه : سبقت . وفي أخرى : تغلب .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە خوا لە خەلقکردنی خەلق بۆوە لە کتێبێکا کە مەخصووصە بە ذاتی خۆیەوە [لەسەر خۆیی . م] نووسی : کە رەحمەتی من پێش غەضەبم کەوتوە . [کە رەحمەتی من غاڵب بوە بەسەر غەضەبما . أخرى] ئەو کتێبە لە خذمەت خۆیایە لە ژوور عەرشەوە . [غەیری (لوح المحفوظ)ە ئومووری قەطعی یەی خوای تیایە . غەیری ئەوو ئەوانەی کە ئیرادەی ئەفەرموێ : هیچ کەس (مطلع) نی یە بەسەریا ، پاشکەوتن و پێشکەوتن و تەبدیلی نی یە ؛ چونکی هەمووی مەعلووماتی خوایە ناگۆڕرێ . (لوح المحفوظ) لە ژێر عەرشایە ئەگۆڕرێ . ئەو کتێبە قەدری ئەزەلی یە بە نەظەر ئەو کتێبەوە نوێژ و رۆژوو عیبادەت و دوعاو تەداویی هیچ تەئثیری نی یە ، تەئثیریان بە نیسبەت (لوح المحفوظ)ەوەیە . یەعنی خوا دوو کتێبی هەیە : یەکێکیان لەوحە ، ئەوی تریان (ام الکتاب)ە ] .

١٤٣٠/٦ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . . م ـ ٢٦٥/١٠ .

**تەرجەمە :**

ئەم حەدیثەم نەنووسی ، حەدیثی پێغەمەر نی یە ـ ﷺ ـ

(إسرائيليات) ی (كعب الأحبار) ه راویی لێی تێکچوه ، به غەلەطا چوه که ئیسنادی داوەته ئەلای پێغەمەر - ﷺ - چونکی موخالیفی قورئانه . (راجع قسطلاني ٥/٢٤٤ . نەوەویی قسەی لێ نەکردوه .[1]

**١٤٣١/٧ عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت : قال رسول الله - ﷺ - خُلِقت الملائكة من نور ، وخُلِق الجانُّ من مارج من نار . وخلق آدم - عليه السلام - مما وصف لكم . م - ١٠/٤٣٧ .**

**تەرجەمە :**

عائیشه - رضي الله تعالى عنها - ئـەفەرمـوێ : پێغەمـەر - ﷺ - فەرمووی : مەلائیکه له نوور خەلق کراوه ، جان له دووکەڵێکی تاریکی ئاگر دروست کراوه . حەزرەتی ئادەم - عليه الصلاة والسلام - لەوەی که له قورئانا بۆتان تەعریف کراوه خەلق کراوه .

---

(١) دانـەر - خ - هیچی له حـەدیثەکـه نەنـووسیـوەو بـه گـوێـرەی لاپـەڕەی دیاریکراوی موسلیم و قسەکەی قەسطەلانی ئەم حەدیثەیه :

(عن أبي هريرة ، قال : أخذ رسول الله - ﷺ - بيدي فقال : خلق الله التربة يوم السبت ، وخلق فيها الجبال يوم الأحد ، وخلق الشجر يوم الاثنين ، وخلق المكروه يوم الثلاثاء ، وخلق النور يوم الأربعاء ، وبث فيها الدواب يوم الخميس ، وخلق آدم - عليه السلام - بعد العصر من يوم الجمعة في آخر الخلق في آخر ساعة من ساعات الجمعة فيما بين العصر إلى الليل .)

قەسطەلانی قسەی لەم حەدیثه کردوەو ئەنجام ئەڵێ : به گوێرەی ئەمه زەوی له حەوت رۆژا خەلق کراوەو بەڵام به گوێرەی قورئان له چوار رۆژدا خەلق کـراوه . واته ئـەمەی ئێـره پێچـەوانـەی قـورئـانـه ، بـۆیـه دانـەر - خ - نەینووسیوه .

١٤٣٢/٨ عائشة - رضي الله تعالى عنها - زوج النبي - ﷺ - حدثت أنها قالت للنبي - ﷺ - : هل أتى عليك يوم كان أشد من يوم أُحد ؟ قال : لقد لقيت من قومكِ ما لقيت . وكان أشد ما لقيت منهم يوم العقبة [شوال سنة ١٠ ، التي بمنى] إذ عرضت نفسي على ابن عبد ياليل بن عبد كُلال فلم يجبني إلى ما أردت . [وعند موسى بن عقبة أنه - ﷺ - = توجه الى الطائف = رجاء أن يؤوه ، فعمد إلى ثلاثة نفر من ثقيف ، وهم سادتهم ، وهم إخوة عبد ياليل وحبيب ومسعود بنو عمرو ، فعرض عليهم نفسه ، وشكا إليهم ما انتهك منه قومه . فردوا عليه أقبح رد ، ورضخوه بالحجارة حتى أدْمَوْا رجليه] . فانطلقت ، وأنا مهموم ، على وجهي ، فلم أستفق إلا وأنا بقرن الثعالب ، فرفعت رأسي فإذا أنا بسحابة قد أظلَّتني فنظرت فإذا فيها جبريل ، - عليه الصلاة والسلام - فناداني ، فقال : إن الله قد سمع قول قومك وما ردوا عليك ، وقد بعث إليك ملك الجبال لتأمره بما شئت فيهم ، فناداني ملك الجبال فسلَّم عليَّ ثم قال : يا محمد ، فقال ذلك فيما شئت إن شئت أن أُطْبق عليهم الأخشبين [جبلي مكة : أبا قبيس ومقابله قُعَيقعان] فقال النبي - ﷺ - : بل أرجو أن يخرج الله من أصلابهم من يعبد الله وحده لايشرك به شيئا .

ح - ٢٦٥/٥ . م - ٤٣٦/٧ . ن .

**ته‌رجه‌مه :**

عائیشه - رضي الله تعالى عنها - ئه‌فه‌رموێ : عه‌رزی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - م کرد : هیچ رۆژێکت به‌سه‌را هاتوه که له رۆژی ئوحود به‌شیدده‌ت‌تر بووبێ ؟ فه‌رمووی : له قه‌ومی تۆ تووشی ئه‌وه بووم که تووشی بووم . به‌شیدده‌ت‌ترینی ئه‌وه‌ی که له‌وانه‌وه تووشی بووم ئه‌وه بوو که له عه‌قه‌به‌ی میندادا تووشی بووم : خۆمم رانوان به‌سه‌ر ئیبن و

عەبدی یالەیلی کوڕی عەبدی کولالا کە موحافەظەم بکا لە قورەیش جوابی موافیقی مەقصوودی نەدامەوە . [مووسای کوڕی عەقەبە ئەفەرمویٚ : پیٚغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوو بۆ طائیف بە ئومیٚدی ئەوەی کە پەنای بدەن ، تەشریفی چوە لای سیٚ کەس لە ئەقیف ، کە گەورەیان بوون ، ئەو سیٚ کەسە برابوون : عەبدی یالەیلو ، حەبیبو ، مەسعوودی کوڕی عەمر بوون . لە خوصووصی خۆیەوە کە قەبووڵی کەن ، تەشریفی بچیٚتە لایان ، قسەی لەگەڵ فەرموون ، شکایەتی ئەوەی لاکردن کە قەومەکەی ئەذیەتی ئەدەن و تەحقیری ئەکەن . جوابیٚکی زۆر قەبیح و ناشیرینیان دایەوە = دایانە بەر بەرد = پیٚی موبارەکیان بریندارکرد . فەرمووی : بە عاجزیی و غەمەوە ڕۆییم نەمەزانی کە بۆ کوێ ئەچم لەو غەمە ئیفاقەم نەبوو تا گەییمە (قرن الثعالب) [کە شەوو ڕۆژیٚ لە مەکەوە دوورە] سەرم هەڵبری هەوریٚکم دی ، سیٚبەری کرد بۆم ، تیٚفکریم جیبریل ـ علیه الصلاة والسلام ـ ی لە ناوا بوو ، بانگی کردم ، فەرمووی : کە خوا ئەوەی بیست کە قەومەکەت چییان جواب دایتەوەو چییان پیٚ وتی . خوا مەلائیکەی جیبالی بۆ ناردووی تا دەرحەق قەومەکەت چییان ئەمر پیٚ ئەکەی بیکەی .

مەلائیکەی جیبال بانگی کردم ، سەلامی لیٚکردم ، فەرمووی : ئەی محەمەد . . ئەوی جیبریل فەرمووی ئەویش فەرمووی . [فەرمووی : ئەی محەمەد خوا منی بۆ لای تۆ نارد ، من مەلائیکەی مەئمووری جیبالم تا چیم ئەمر پیٚ ئەکەی دەرحەق قەومەکەت بۆت بکەم] ئەگەر ئیرادە بکەی کە شاخی ئەبوقوبەیس و شاخی قوعەیقیعانیان بەسەرا بیٚنمەوە یەك ئەیکەم . فەرمووی : خەیر ، ئومیٚدم وایە کە لە صولبی ئەمانە خوا

كەسێ بێنێتەدەرێ کە هەر عیبادەتی خوا بکەنو هیچ کەس نەکەن بە شەریکی لە عیبادەتا .

# ذكر الجن وجنود إبليس

١٤٣٣/٩ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : إذا استجنح الليل أو كان جنح الليل [إذا دخل ظلامه] فكفُّوا صبيانكم ؛ فإن الشياطين تنتشر حينئذ ، فإذا ذهب ساعة من العشاء فَحلّوهم ، وأغلق بابك واذكر اسم الله [عليه] [فإن الشيطان لايفتح بابا مغلقا . أخرى ، ٢٩٨] وأطفئْ مصباحك واذكر اسم الله [عليه] وأوك سقاءك واذكر اسم الله ، وخمر إناءك واذكر اسم الله ولو تعرِض عليه شيئا .
ح ـ ٢٨٤/٥ ، ٢٩٨ . م ـ ٢٦٩/٨ بأخصر ، د ، ن . ح ـ ٣١٨/٨ .
تەرجەمە :

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە شەو داهات منالّتان لە چوونەدەرەوە مەنع بکەن ؛ چونکی شەیطانان لەو وەختەدا بلاّوئەبنەوە ، کە سەعاتێ لە شەو رۆیی بەرەڵلاّیان بکەن . دەرگات دابخەو ناوی خوای لەسەر ببە ؛ چونکی شەیطان دەرگای داخراو ناکاتەوە . چرات بکووژێنەرەوەو ناوی خوای لەسەر ببە . دەمەڵبێنی کونەت ببەستەو ناوی خوای لەسەر بێنە . سەری ظەرفت داپپۆشەو ناوی خوای لەسەر بێنە . بابەوەیش داپپۆشی کە شتێکی بەسەرا رائەنگێوی .

١٤٣٤/١٠ وعنه وعن عطاء ـ رضي الله تعالى عنهما ـ رفعه قال :

خمروا الآنية ، وأوكوا الأسقية ، وأجيفوا الأبواب [أغلقوها] وأكفتوا صبيانكم عند العشاء ، فإن للجن انتشارا وخطفة [فرانن] وأطفئوا المصابيح عند الرقاد ، فإن الفويسقه ربما إجترَّت الفتيلةَ فأحرقت أهل البيت . ح ـ ٣٠٢/٥ .

١٤٣٥/١١ وعنه قال سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : غطوا الاناء ، واوكئوا السقاء ؛ فإن في السَّنةِ ليلة فينزل فيها وباء لايمرُّ بإناء ليس عليه غطاء ، او سقاء ليس عليه وكاء إلا نزل فيه من ذلك الوباء م ـ ٢٧١/٨ .

وفي أخرى زيادة : قال الليث : فالأعاجم عندنا يتقون ذلك في كانون الأول . م ـ ٢٧٢/٨ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی : ظەرف داپۆشن ، کونە ببەستن ، دەرگا دابخەن ، منالٚ مەنع بکەن نەچنەدەرەوە لە وەختی ئێوارێدا ؛ چونکە شەیاطینی بلاٚوئەبنەوەو دەست ئەوەشێنن . کە نوستن چرا بکوژێننەوە چونکی مشك پلیتەکەی دەرەکێشێ و ئەهلی مالٚەکە ئەسووتێنێ ، لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : لە سالاٚ شەوێ هەیە وەبا نازلٚ ئەبێ لەو شەوەدا وەبا بە لای هەر ظەرفێکا راببوورێ کە سەری دانەپۆشرابێ بە لای هەر کونەیێکا راببوورێ کە دەرکی نەبەسترابێ ئەو وەبایە ئەچێتە ناوی .

لەیث ئەفەرموێ : عەجەم لە کانوونی ئەوەلاٚ لەوە خۆیان ئەپارێزن [فەقەط حەدیثەکە شموولی هەیە بۆ هەموو سالٚەکە] .

١٤٣٦/١٢ عن سليمان بن صرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت جالسا مع النبي ـ ﷺ ـ ورجلان يستبَّان ، فأحدهما إحمرٌ وجهه ،

وانتفخت أوداجه [عرق في المذبح] فقال النبي ـ ﷺ ـ : إني لأعلم كلمة لو قالها ذهب عنه مايجد ؛ لو قال : أعوذ بالله من الشيطان الرجيم ذهب عنه مايجد . فقالوا له : إن النبي ـ ﷺ ـ قال : تعوَّذْ بالله من الشيطان الرجيم ، فقال : وهل بي جنون ؟ ح ـ ٥/٢٨٦ . م ـ ١٠/٤٥ . د ، ن . ح ـ ٩/٦٨ .

**تەرجەمە :**

سولەیمانی کوری صورەد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ دانیشتبووم دوو پیاو شەرەجوێنیان ئەکرد ، یەکێکیان سووربووبووەوەو رەگی ملی ئاوسابوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کەلیمەیێك ئەزانم ئەگەر بیلێ ئەو غەضەبەی لێ دەفع ئەبێ . پێیان وت : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : بلێ : (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) وتی : بۆمن شێتم ؟

ئەو پیاوە هەر وای زانیوە کە هەر شێت لە شەیطان (إستعاذە) ئەکا ، نەیزانیوە کە شەیطان تەحریکی هەموو کەسێ ئەکا لەسەر خراپە . بۆیە ئینسان کە رقی هەڵسا ناپرسێتەوە ، دارو بەرد ئەدا بەسەر یەکاوماڵی خۆی بە تەلەف ئەداو ، پیاو ئەکوژێو ، لە ولاغی ئەداو ، لە ژنو کورو کچی خۆی ئەداو ، ژن تەلاق ئەدا . . ئەوانە هەمووی لە تەحریکی شەیطانە . ئەو پیاوە یا مونافیق بوە یا (جاف) بووە[1] یا لە بەر رق عەقڵی لە سەرا نەماوە بۆیە بەو نەوعە موقابەلەی ئەمری پێغەمەری کردوە .

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

---

(١) واتە : وشكو بێ دەمو دووو نەزانو نەفام .

# الأمر بقتل الحيَّات إلا الجانَّ لاحتمال انه من الجانِّ[1]

١٣/١٤٣٧ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أنه سمع النبي ـ ﷺ ـ يخطب على المنبر يقول : اقتلوا الحيَّات ، واقتلوا ذا الطفيتين [الذي على ظهره خطان أبيضان] والأبتر [الذي لا ذنَب له ، أو قصيره] فإنهما يطمسان البصر [يمحوان نوره] ويستسقطان [يسقطان . نسخة] الحَبَل [اي الولد بنظر أمه إليه] قال عبد الله ـ رضي الله تعالى عنه ـ : فبينا أنا طارد حية لِأقتلها ، فناداني أبو لُبابة : لا تقتلها ، فقلت : إن رسول الله ـ ﷺ ـ قد أمر بقتل الحيات . قال : إنه نهى بعد ذلك عن ذوات البيوت . قال الزهري : وهي العوامر . م ـ ٨١/٩ . ح ـ ٢٩٥/٥ .

١٤/١٤٣٨ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : أمر النبي ـ ﷺ ـ بقتل الأبتر . وقال : إنه يصيب البصر ، ويذهبُ الحَبَل أي الجنين . ح ـ ٣٠٠/٥ .

١٥/١٤٣٩ ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ كان يقتل الحيات ، ثم نهى . قال : إن النبي ـ ﷺ ـ هدم حائطا له فوجد فيه سلخ حية ، فقال : أنظروا أين هو ، فنظروا فقال : أقتلوه . فكنت أقتلها لذلك ، فلقيت أبا لبابة ، فأخبرني أن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا تقتلوا الجنان [الحية البيضاء ، أو الصغيرة] إلا كل أبتر ذي طفيتين ؛ فإنه يُسقط الولدَ ويذهب البصر . فاقتلوه . ح ـ ٣٠١/٥ .

---

(١) فەرماندانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە کوشتنی مار ، مارە وردە نەبێ ، نەوەك ئەو مارەوردانە لە جنۆکەکان بن .

**تەرجەمە :**

ئیبن و مولەیکە ئەفەرموێ : ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ماری ئەکوشت لە پاشا نەهی لێکرد فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ دیوارێکی تێك ئەدا ، کاژەمارێکی دی فەرمووی : تەماشا بکەن لە کوێیە ، تەماشایان کرد [دۆزییانەوە] فەرمووی : بیکوژن لەبەر ئەوە من مارم ئەکوشت ، ئەبولوبابەم پێگەیی خەبەری دامێ کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ماری ماڵیی مەکوژن ، ئەمما هەموو مارێ کە دوو خەط بەسەر پشتی یەوە هەیەو کوڵەوەیباب بکوژن ؛ چونکی چاوپێکەوتنی نووری چاو ئەبا ، بەر بە ژنی بەردار ئەخا ، ئیتر وازی لێ هێنا .

١٦/١٤٤٠ ابن السائب مولى هشام بن زهرة ـ رحمه الله ـ دخل على أبي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ في بيته ، قال : فوجدته يصلي ، فجلست أنتظره حتى يقضي صلاته ، فسمعت تحريكا في عراجين في ناحية البيت ، فالتفتت فإذا حية ، فوثبت لأقتلها ، فأشار إليَّ : أن اجلس ، فجلست ، فلما انصرف أشار إلى بيت في الدار ، فقال : أترى هذا البيت ؟ فقلت : نعم . فقال : كان فيه فتى منا حديث عهد بعرس ، قال : فخرجنا مع رسول الله ـ ﷺ ـ إلى الخندق ، فكان ذلك الفتى يستأذن رسول الله بأنصاف النهار ، فيرجع إلى أهله ، فاستأذنه يوما ، فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : خذ عليك سلاحك ؛ فإني أخشى عليك قريظة .

فأخذ الرجل سلاحه ثم رجع ، فإذا امرأته بين البابين قائمة ، فأهوى إليها بالرُّمح ليطعنها به ، وأصابته غيرة ! فقالت له : أكفف عليك رمحك وادخل البيت حتى تنظر ما الذي أخرجني ، فدخل فإذا بحية عظيمة منطوية على الفراش ! فأهوى إليها بالرمح فابتظمها به ثم خرج ،

فركزه في الدار فاضطربت عليه ، فما يدري أيهما كان أسرع موتا : الحيةُ ، أم الفتى ؟ ! قال : فجئنا إلى رسول الله ـ ﷺ ـ وذكرنا ذلك له . وقلنا له : أدع الله يحييه لنا . فقال : إستغفروا لصاحبكم . ثم قال : إن بالمدينة جنا قد أسلموا ، فإذا رأيتم منهم شيئا فآذنوه ثلاثة أيام ، فإن بدا لكم بعد ذلك فاقتلوه فإنما هو شيطان . م ـ ٩/٨٦ .

١٤٤١/١٧ وفي اخرى عنه مثله ، فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : إن لهذه البيوت عوامر فإذا رأيتم شيئا منها فحرجوا عليها ثلاثا ، فإن ذهب ، وإلا فاقتلوه فإنه كافر ، وقال لهم : إذهبوا فادفنوا صاحبكم . م ـ ٩/٨٧ .

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بوسائیبی مه‌ولای هیشام ئه‌چێته خزمه‌ت ئه‌بوسه‌عیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ له ماڵه‌وه ، ئه‌بوسائیب ئه‌فه‌رموێ : كه تێفكریم نوێژی ئه‌كرد ، دانیشتم مونته‌ظیری بووم تا له نوێژ ئه‌بێته‌وه ، گوێم له خشه‌یێ بوو له ژێر پووش و په‌لاشی ئه‌و لقه‌خورمایانه‌دا بوو كه له گۆشه‌یێكی ژووره‌كه‌دا بوو ، ئاورم دایه‌وه ، كه تێفكریم مارێ بوو ، په‌لامارم دا كه بیكوژم ، ئیشاره‌تی كردم : كه دانیشه . دانیشتم ، كه له نوێژ بووه‌وه ئیشاره‌ی ژوورێكی خانوه‌كه‌ی كرد ، فه‌رمووی : چاوت له‌و ژووره‌یه ؟ عه‌رزم‌كرد ؛ به‌ڵێ . فه‌رمووی : له‌وێدا كورێكی جه‌هێڵی ئێمه‌ی تیا بوو ، تازه‌زاوا بوو . له خزمه‌ت پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ چووین بۆ غه‌زای خه‌نده‌ق . ئه‌و جوانكه‌یه له وه‌ختی نیوه‌رۆیانا ئیذنی له پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئه‌خواست ئه‌چوه ماڵه‌وه لای عائیله‌كه‌ی ، رۆژێ ئیذنی لێ خواست ، پێی فه‌رموو : سیلاحت له‌گه‌ڵ خۆت ببه ، له قوره‌یظه ئه‌ترسم زه‌ره‌رت پێ بگه‌یێنن .

ئەو پیاوە سیلاحەکەی لەگەڵ خۆی بردو چوە ماڵەوە ، کە تێفکری ژنەکەی لە ناودوو دەروازەی دەرگاکەدا وەستابوو ، رمی بۆ داهێنایەوە کە لێی داو غیرەت گرتی ! ژنەکەی پێی وت : رمەکەت بگێرەرەوەو بچۆرە ژوورێ چاوت پێ بکەوێ کە چی منی هێناوەتە دەرێ ! کە چوە ژوورێ = دی = مارێکی گەورە گینڵەی خواردبوو لەسەر نوێنەکەی ، بە رمەکەی کوشتیو چوە دەرێ ، رمەکەیی داچەقان ، مارەکە بەسەریا هەڵبەزییەوە ، نەزانرا کامیان لە پێشا مرد : مارەکە ، یا جوانکەکە !

ئەبوسەعید - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : چووینە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزمانکرد کە : دۆعای بۆ بکە کە خوا زیندووی بکاتەوە بۆمان ، فەرمووی : (إستغفار) بۆ رەفیقەکەتان بکەن ، لە پاشا فەرمووی : لە مەدینەدا طائیفەیێ لە جنیی موسوڵمان بوون ، کە چاوتان بە بەعزێ لەوانە بکەوێ [لە شکڵی مارا] تا سێ رۆژ خەبەری بدەنێ کە بروا ، ئەگەر ئەمجا دیتان بیکوژن ، ئەوە شەیطانە [یەعنی لەو جنییانە نییە کە موسوڵمان بوون] .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەم خانوانە بەعزێ جینێ هەیە تیایانا ساکننو ئاوانیان کردۆتەوە ، هەر وەختێ لەم ماڵانەدا شتێکتان لەمانە دی ، سێ رۆژ سوێنیان بدەن ، ئەگەر رۆیی ظەریفە ، ئەگەر نەرۆییو دەرکەوت بیکوژن ؛ چونکی ئەوە کافرە . پێی فەرموون : بچن رەفیقەکەتان بنێژن . [یەعنی تا لێتان مەعلووم نەبێ کافرە یا موسوڵمان مەیکوژن] .

## وسوسة

١٤٤٣/١٨ عن عثمان بن العاص الثقفي - رضي الله تعالى عنه - أنه أتى النبي - ﷺ - فقال : يا رسول الله إن الشيطان قد حال بيني وبين صلاتي وقراءتي يلبسها عليَّ ، فقال رسول الله - ﷺ - : ذاك شيطان يقال له خِنْزَب ، فإذا أحسَسْته فتعوذ بالله منه واتفل عن يسارك ثلاثا ، قال : ففعلت ، فأذهبه الله عني . م - ٩/٣٤ .

تەرجەمە :

عوثماني كوڕی عاصی ثەقەفی - رضي الله تعالى عنه - تەشریفی چوە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی کرد : (یا رسول الله) شەیطان بێتە بەینی من و نوێژ و قیرائەتمەوە لێم تێك ئەدا . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەوە شەیطانێکە ناوی خینزەبە ، کە حیسی ئەوەت کرد کە هاتوە ، [یەعنی خستتی یە وەسوەسەوە] ئیستیعاذەی لێ بکە بە خواو سێ دەفعە تف بکە بە لای چەپتەوە . عوثمان - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کردم خوا - عز وجل - لێی دەفع کردم .

## باوێشك و پژمە

١٤٤٣/١٩[1] عن أبي سعيد الخدري - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - : إذا تثاوب أحدكم في الصلاة فليَكْظم ما استطاع ؛ فإن الشيطان يدخل . وفي أخرى : فليمسك بيده على فمه . م - ٤٣٦/١٠ .

---

(١) دانەر - خ - بە هەڵە ژمارە (١٤٤٣) ی دووپات کردوەتەوە .

تەرجەمە :

ئـەبوسـەعیدی خـدریی ـ رضي الله تعالی عنـه ـ ئەفـەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە یەکێ لە ئێوە لە نوێژا باوێشکی دا تـا ئەتوانێ بیگێڕێتەوە ؛ چونکی [باوێشك لە طەرەف شەیـطانەوەیـە] کە ئینسان باوێشکی دا شەیطان ئەچێتە ناو دەمیەوە . لە ریوایەتەکەی ترا : دەست بگرێ بە دەمیەوە .

**١٤٤٤/٢٠ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : التثاؤب من الشيطان ؛ فإذا تثاوب أحدكم فليرده ما استطاع ؛ فإن أحدكم إذا قال : ها ، ضحك الشيطان . ح ـ ٥/٢٨٨ .**

**١٤٤٥/٢١ وعنـه عن النبي ـ ﷺ ـ قال : إن الله يحب العـطاس ، ويكره التثاوب ، فإذا عطس فحمد الله فحق على كل مسلم سمعه أن يشمِّته [أن يقول له : يرحمك الله . ح أخرى] وأما التثاوب فإنما هو من الشيطان فليرده ما استطاع ، فإذا قال : ها ، ضحك منـه الشيطان . ح ـ ٩/١٢٢ .**

**١٤٤٦/٢٢ وعنه عن النبي ـ ﷺ ـ قال : إذا عطس أحدكم فليقل : الحمد لله ، وليقل له أخوه أو صاحبه : يرحمك الله ، فإذا قال له يرحمك الله فليقل يهديكم الله ويصلح بالكم . ح ـ ٩/١٢٢ . د ، ن .**

تەرجەمەکانیان :

١ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : باوێشك لە طەرەف شەیتانەوەیە ، کە = یەکێکیان = باوێشکی دا تا ئـەتوانێ بیگێـڕێتەوە . کـە ئینسان وتی : ها شەیطان پێی پێ ئەکەنێ .

٢ ـ ئەفەرموێ : خوا پژمین ئەحوبێنێ ، باوێشك ئەبوغضێنێ . کـە پژمی و حەمـدی خوای کـرد لە = سـەر = کولـلی موسـوڵمانێ کـە

حەمدەکەی گوێ لێ بێ حەق وایە کە تەشمیتی بکا ، پێی بڵێ : (یرحمك الله) . باوێشك لە شەیطانەوەیە ، تا ئەتوانێ ڕەدی بکاتەوە ، کە باوێشکی داو وتی : ها شەیطان پێی پێ ئەکەنێ .

٣ ـ ئەفەرموێ : کە پژمی بڵێ : (الحمد لله) برای دینیی ئەو ، یا فەرمووی : ڕەفیقەکەی پێی بڵێ : (یرحمك الله) کە پێی وت : (یرحمك الله) ئەویش بڵێ : (یهدیکم الله) خوا هیدایەتتان بدا (ویصلح بالکم) قەلبتان ئیصلاح بکا .

**١٤٤٧/٢٣** عن أبي مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : عطس رجلان [عامر بن الطفيل ، وابن أخيه] عند النبي ـ ﷺ ـ فشمَّت أحدهما [خوا دوشمنی پێ خۆش نەکا] ولم يشمِّت الآخر ، فقيل له ، فقال : هذا حمِد الله وهذا لم يحمد الله . ح ـ ٩/١٢٠ .

[عبادة ، مسلم : فقال الذي لم يُشَمِّته : عطس فلان فشمتته وعطست ولم تشمتني ؟ قال : إن هذا حمد الله ، وإنك لم تحمد الله . د ، ت ، ن ، جه] .

**١٤٤٨/٢٤** عن أبي بردة قال : دخلت على [أبي] أبي موسى ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهو في بيت ابنة الفضل بن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فعطست ، فلم يشمتني ، وعطست فشمَّتها ، فرجعت إلى أمي فأخبرتها ، فلما جاءها قال : عطس عندك ابني فلم تشمته وعطسَت فشمَّتها ! فقال : ابنك عطس فلم يحمد الله . فلم أشمته ، وعطستْ فَحمدت الله فشمَّتها . سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : إذا عطس أحدكم فحمد الله ، فشمِّتوه ، فإن لم يحمد الله فلا تشمِّتوه . م ـ ١٠/٤٣٥ .

**تەرجەمە :**

ئەبوبوردە - رحمه الله - ئەفەرموێ : چوومە لای ئەبوموسای باوکم - رضي الله تعالى عنه - لە ماڵی (أم كلثوم) ی کچی فەضلا بوو - رضي الله تعالى عنه - من پژمیم تەشمیتی نەکردم . (ام كلثوم) پژمی تەشمیتی کرد ، گەڕامەوە بۆ لای دایکم خەبەرم دایێ کە (نوبەیا)[1] باوکم هاتەوە لای پێی وت : کوڕەکەم لای تۆ پژمیوە تەشمیتت نەکردوە ، (أم كلثوم) پژمیوە تەشمیتت کردوە ! فەرمووی : کوڕەکەی تۆ پژمی حەمدی خوای نەکرد تەشمیتم نەکرد ، (أم كلثوم) پژمی حەمدی خوای کرد تەشمیتم کرد . لە پێغەمەر - ﷺ - م بیست ئەیفەرموو : یەکێ لە ئێوە کە پژمی ئەگەر حەمدی خوای کرد تەشمیتی بکەن ، ئەگەر نەیکرد تەشمیتی مەکەن .

تەشمیت : لە (شماتة) ە یەعنی دوشمن پێ خۆش بوون . نەقڵی بۆ بابی (تفعيل) بۆ ئیزالەیە وەك (جلدت البعير) یەعنی پێستم گوروو . تەشمیتیش بە مەعنا دۆعاکردنە بۆ لابردنی ئەو شتە کە دوشمن پێی دڵخۆش بێ .

(أم كلثوم) کچی فەضلی کوڕی عەباس بوو - رضي الله تعالى عنها - ژنی ئیمامی حەسەن بوو - رضي الله تعالى عنه - ئەو طەلاقی دا ئەبومووسا - رضي الله تعالى عنه - مارەی کرد ، مووسای لێ بوو ، کە ئەبومووسا - رضي الله تعالى عنه - وەفاتی کرد عیمرانی کوڕی طەلحە مارەی کرد ، ئەویش طەلاقی دا لە کووفە وەفاتی کرد .

۱٤٤۹/۲٥ سلمة بن الأكوع - رضي الله تعالى عنه - حدَّث أنه سمع

(۱) ئەم وشەیەم بۆ نەخوێنرایەوە ، وەك خۆی نووسیم .

النبيَّ ـ ﷺ ـ وعطس رجل عنده ، فقال : يرحمك الله . ثم عطس أخرى . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ له : الرجل مزكوم . م ـ ١٠/٤٣٥ .

تەرجەمە :

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ئەفەرموێ : پیاوێ لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ پژمی پێی فەرموو : (یرحمك الله) دەفعەییێکی تریش پژمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : ئەم پیاوە هەڵامەتیە .

٢٦/١٤٥٠ عن عبدالله [بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ] في قوله ـ عز وجل ـ : ﴿أولئك الذين يدعون يبتغون إلى ربهم الوسيلة﴾[1] قال : كان نفر من الانس يعبدون نفرا من الجن ، واستمسك الانس بعبادتهم . فنزلت .

وفي أخرى مثله قال : كان نفر من الجن أسلموا ، فكانوا يُعبدون ، فبقي الذين كانوا يَعبدون على عبادتهم ، وقد أسلم النفر من الجن . م ـ ١٠/٤٧٩ .

٢٧/١٤٥١ وعنه قال : نزلت في نفر من العرب كانوا يعبدون نفرا من الجن ، فأسلم الجنِّيون والانس الذين كانوا يعبدونهم لا يشعرون فنزلت . . م ـ ١٠/٤٨٠ .

تەرجەمە :

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەو ئایەتەی کە لە سوورەتی ئیسرادایەو مەعنای وایە : ئەوانەی کە موشریکان عیبادەتی بۆ ئەکەن و ئەیان پەرستن خۆیان بۆ وەسیلە ئەگەڕێن کە کامیان لە خواوە نزیکە رجایان بۆ بکا لە خزمەت خوادا کە عەفویان

(١) الاسراء / ٥٧ .

بكا ، ئومێدیان به ره‌حمه‌تی خوا هه‌یه‌و له عه‌ذابی ئه‌ترسن ، به ته‌حقیق عه‌ذابی خوا مه‌حذووره ؛ یه‌عنی به شیدده‌ته ئه‌بێ ئینسان خۆیی لێ بپارێزێ . . بۆیه نازڵ بوو به‌عزێ له عه‌ره‌ب عیباده‌تی به‌عزێ له جینی یان ئه‌کرد ، له پاشا جنی یه‌کان موسوڵمان بوون ئه‌وان پێیان نه‌زانیبوو له‌سه‌ر عیباده‌ت بۆکردنیان هه‌ر ده‌وامیان کرد لێیان لانه‌دا ، ئه‌مجا خوا - عز وجل -[1] مه‌عبووده‌کانیان خۆیان موحتاجن به مه‌رحه‌مه‌تی خواو بۆ شه‌فاعه‌ت کونه‌نده ئه‌گه‌ڕێن ئه‌و موشریکانه چۆن عیباده‌تیان بۆ ئه‌که‌ن ؟

**١٤٥٢/٢٨ عن جابر - رضي الله تعالى عنه - قال : سمعت النبي - ﷺ - يقول : إن الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون في جزيرة العرب ولكن في التحريش بينهم [بالخصومات والشحناء والحروب والفتن . . . وهذا من معجزاته - عليه الصلاة والسلام - من نووي] .**

**ته‌رجه‌مه :**

جابیر - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : له پێغه‌مه‌ر - ﷺ - م بیست ئه‌یفه‌رموو : شه‌یطان له‌وه مه‌ئیووس بوه که له (جزيرة العرب)ا عیباده‌تی بۆ بکه‌ن ، ئه‌مما فیتنه‌و فه‌ساد ئه‌خاته به‌ینیانه‌وه .

**١٤٥٣/٢٩ وعنه قال : سمعت رسول الله - ﷺ - يقول : إن عرش إبليس على الأرض فيبعث سراياه يفتنون الناس ، فأعظمهم عنده أعظمهم فتنة . م - ١٠/٢٨٩ .**

**ته‌رجه‌مه :**

پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : عه‌رشی ئیبلیس له‌سه‌ر به‌حره ،

(١) لێره‌دا ناته‌واوی و له‌بیرچوونێك هه‌یه ، به‌ڵام نه‌مزانی چیه . ره‌نگه ئاوا بێ : ئه‌مجا خوا - عز وجل - ئه‌م ئایه‌ته‌ی نارد که مه‌عناکه‌ی ئه‌مه‌یه : . . . .

لەشكری بەملاو بەولادا ئەنێرێ فیتنە بخەینە . بەینی خەڵقەوە ، گەورەترینیان لە لای ئەو ئەوەیانە کە فیتنەی گەورە بێ .

**١٤٥٤/٣٠ وعنه قال : قال رسول الله - ﷺ - : إن إبليس يضع عرشه على الماء ثم يبعث سراياه ، فأدناهم منه منزلة أعظمهم فتنة ، يجيئ أحدهم فيقول : فعلتُ كذا وكذا . فيقول : ما صنعتَ شيئا ! قال : ثم يجيئ أحدهم فيقول : ما تركته حتى فرَّقتُ بينه وبين امرأته . قال : فيدنيه منه ويقول : نعم أنت . م - ١٠/ ٢٩٠ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : شەیطان تەختی لەسەر ئاو دائەنێ ، لەشكری بڵاو ئەكاتەوە كامی فیتنەی گەورەیە ئەوە لە لای لە هەموویان لە پێشترە . یەكێكیان یێتەوە ئەڵێ : ئەوەم كردو ئەوەم كرد ! پێی ئەڵێ : هیچت نەكردوە . یەكێكیان یێتەوە دەڵێ : مۆڵەتم نەدا تا لەگەڵ ژنەكەی لێكم جویێكردنەوە . مەرتەبەی لە خۆی نزیك ئەخاتەوە ئەڵێ : چەندە باشی [كورِ وا ئەبێ بێتە جێی باوكی . دهلێژی[1] - رحمه الله - ]

**١٤٥٥/٣١ عن عبدالله بن مسعود - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - : ما منكم من أحد إلا وقد وكل الله به قرينه من الجن قالوا : وإيَّاك يا رسول الله ؟ قال : وإيَّاي إلا أن الله قد أعانني عليه ، فأسلم فلا يأمرني إلا بخير . م - ١٠/ ٢٩٠ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - ئەفەرموێ : هیچ كەسێ نیيە لە ئێوە كە خوا

(١) نازانم مەبەستی دانەر - خ - لەم (دهلێژی)یە كێیە ، رەنگە قسەی ناو كەوانەكە [كورِ . . . ] ی لە دێلێژەیی یەوە نەقڵ كردبێ .

شەیطانێکی نەکردبێ بە قەرین و رەفیقی و بەسەریا موسەللەط نەکردبێ .
عەرزیانکرد : تۆیش (یا رسول الله) ؟ فەرمووی : منیش ، ئەوەندەی
هەیە خوا موعاوەنەتی دام بەسەریا ، موسوڵمان بوو ، هەر بە خێر ئەمرم
پێ ئەکا .

**١٤٥٦/٣٢ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسـول الله ـ ﷺ ـ قال : لما صور الله آدم في الجنة تركه ما شاء الله أن يتركه . فجعل إبليس يُطيف به ينظر ماهو . فلما رآه أجوف عرف أنه خلق خلقا لايتمالك . م ـ ١٠/٤٦ .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە خوا = ئادەمی دروستکرد = لە بەهەشتا تەرکی کرد تا خوا حەزەکا ، ئیبلیس بەدەورەیا ئەهات تێی ئەفکری ئەمە چیە ؟ کە چاوی پێکەوت ناوەکەی هەڵۆڵە وتی : خەیر خوا خەلقێکی خەلق کردوە دەرەقەتی نەفس و نەوسنیی خۆی نایێ .

**١٤٥٧/٣٣ عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ زوج النبي ـ ﷺ ـ حدَّثت أن رسول الله ـ ﷺ ـ خرج من عندها ليلا ، قالت : فغِرت عليه ، فجاء فرأى ما أصنع . فقال : مالكِ يا عائشة أغِرْتِ ؟ فقلت : وما لي لا يغار مثلي على مثلك ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : أَقَدْ جاءكِ شيطانكِ ؟ قالت : يا رسول الله أوَ معيَ شيطان ؟ قال : نعم . قلت : ومع كلِّ إنسان ؟ قال : نعم . قلت : ومعك يـا رسول الله ؟ قـال : نعم ، ولكن ربي أعانني عليه حتى أسلم . م ـ ١٠/٢٩١ .**

**تەرجەمە :**

عائیشەی حەرەمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ . ورضي عنها ـ ئەفەرموێ : پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ شـەوێ تـەشـریفی لـە لام چـوە دەرێ ، غیـرەتم

جۆشی سەند ، پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی = هاتەوە = چاوی بەوە کەوت کە ئەمکرد ، فەرمووی : چی لێ روویداوی ؟ بۆ غیرەتت هاتۆتە جۆش ؟ وتم : چی یە بۆ من کە ژنی وەکوو من بـۆ یەکێکی وەکـوو تۆ غیـرەت نەیگرێ ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : بۆ شەیطانەکەت هاتۆتە لات ؟ وتم : (یا رسول الله) بۆ شەیطانم لەگەڵا هەیە ؟ فەرمـووی : بەڵێ . عـەرزم کرد : لـەگەڵ هـەموو ئینسـانا هـەیە ؟ فـەرمـووی : بـەڵێ . عەرزم کرد : لەگەڵ تۆیشا هەیە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ئەمما خوا ئیعانەی دام بەسەریا تا موسوڵمان بوو .

# الكُهَّان

١٤٥٨/٣٤ عن معاوية بن الحكم السلمي ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قلت : يا رسول الله أمورا كنا نصنعها في الجاهلية : كنا نأتي الكُهّان . قال : فلا تأتوا الكُهان . قال : قلت : كنا نتطير ، قال : ذلك شيٌ يجده أحدكم في نفسه ، فلا يصدنكم . م ـ ٩/٧٣ .

وفي أخرى عنه : قال : قلت : ومنا رجال يخُطّون ، قال : كان نبي من الأنبياء يخط فمن وافق خطه فذاك . م ـ ٩/٧٥ .

ئەرجەمە :

موعاويەی کوڕی حەکەمی سەلەمیی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : عەرزی پێغەمەرم کرد ـ ﷺ ـ : (يا رسول الله) ئێمە لە زەمانی جاهیلییەتا بەعزێ شتمان ئەکرد : ئەچووینە لای کوڵێنانی . فەرمووی : مەچنە لای کوڵێنانی . عەرزم کرد : ئێمە لە بەعزێ شتا بەدیومنی ئەکەین ، فەرمووی : ئەوە شتێکە ئینسان یێ بە دڵیا ، ئەوە مەنعتان نەکا لە ئیشکردن . ئەفەرموێ : عەرزم کرد : (يا رسول الله) بەعزێ پیاو هەن لە ئێمە خەط ئەکێشن . [یەعنی بەوە بەعزێ شت (إستخراج) ئەکەن] فەرمووی : پێغەمەرێ لە پێغەمەران خەطی ئەکێشا ، ئەگەر ئەو کەسەی کە خەط ئەکێشێ خەطەکەی موافیقی خەطی ئەو پێغەمەرە بێ باشە [عەمەلی پێ ئەکرێ (وإلا) هیچ] .

نەوەویی ئەفەرموێ : شەرحی ئەم حەدیثە لە صەلاتا رابورد ، من نەمدۆزیەوە .

١٤٥٩/٣٥ قالت عائشة ـ رضي الله تعالى عنها : ـ سأل ناس رسول الله ـ ﷺ ـ عن الكهان ، فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : ليسوا بشيٌ .

قالوا : يا رسول الله فإنهم يحدِّثون أحيانا الشيَ يكون حقا ! فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : تلك الكلمة من الحق يخطفها الجني فيَقرُّها في أُذن وليِّه قرَّ الدجاجة فيخلطون فيها أكثر من مائة كِذْبةٍ . ح ـ ٩/١١٦ . م ـ ٩/٧٦ . ح ـ ٨/٣٨٣ .

**تەرجەمە :**

عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : بەعزێ کەس لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان پرسی : کە کوڵێنانی چین ؟ فەرمووی : هیچ نین . عەرزیانکرد : (یا رسول الله) بەعزێ وەقت قسە لە بەعزێ شت ئەکەن بە حەق دەرەچێ ! فەرمووی : ئەو کەلیمە حەقە جینی لە مەلائیکەی ئەفرێنێ ئەیخاتە گوێی دۆستە کاهینەکەی ، دەنگی لێ ئێنێ وەك مریشك کە دەنگی لێوەبێ . ئەو کەلیمە حەقەی کە جینی لە مەلائیکەی ئەفرێنێ زیاتر لە صەد درۆی تێکەڵ ئەکا .

١٤٦٠/٣٦ عن صفية عن بعض أزواج النبي ـ ﷺ ـ [ورضي عنهن] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : من أتى عرَّافا فسأله عن شيَ لم تقبل لـه صلاة أربعين ليلة . م ـ ٩/٧٨ .

**تەرجەمە :**

صەفیە لە بەعزێ حەرەمانی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ ریوایەت ئەکا کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەرکەسێ بچێتە لای یەکێ لەوانەی کە تەعریفی جێی شتی دزراوو شتی ونبوو ئەکەن تا چل شەو نوێژی لێ قەبووڵ ناکرێ . [یەعنی ئەوابێ نابێ با فەرزیشی لەسەر لابچێ . نووي] .

١٤٦١/٣٧ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ زوج النبي ـ ﷺ ـ أنها

سمعت رسـول الله ـ ﷺ ـ يقول : إن الملائكة تنـزل في العنان وهـو السحاب فتذكر الأمر [الذي] قضي في السماء ، فَتَسْتَرِقُ الشياطين السمع [أي تختلسه منهم] فتسمعه فتوحيه إلى الكُهّان فيكذبون معها مائة كذبة من عند أنفسهم . ح ـ ٥/٢٥٨ .

**تەرجەمە :**

عائیشەی حەرەمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی بیستوە کە ئەیفەرموو : مەلائیکە یێنە ناو هەورەوە ، ئەو ئەمرە کە خوا ـ عز وجل ـ لە ئاسمانا حوکمی پێ کردوە کە ئەبێ ذیکری ئەکەن ، شەیاطینیش گوێی ئەدەنێ ئەیبیینۆ وەحیی ئەکەنە گوێی کاهینانەوە ، لەگەڵ ئەوە لە طەرەف خۆیانەوە صەد درۆی لەگەڵ ئەکەن .

وفي أخرى : فتقرُّها في أذن الكاهن كما تُقَرُّ القارورة ، فيزيدون معها مائة كذبة :

ئەی‌ئاخننە گوێی کاهینەوە وەك سەری شووشە ئەئاخنرێ ، لەگەڵ ئەوە صەد درۆی لە طەرەف خۆیانەوە لێ‌زیاد ئەکەن .

# القَدَر

ئەم ئەحادیثانە هی بەدئی خەلقە

١٤٦٢/٣٨ عبدالله [بن مسعود - رضي الله تعالى عنه - ] قال : حدثنا رسول الله - ﷺ - وهو الصادق المصدوق ، قال : إن أحدكم يجمع [خلقه م] في بطن أمه أربعين يوما ثم يكون علقة مثل ذلك ، ثم يكون مضغة مثل ذلك ، ثم يبعث الله [إليه . أخرى ح] ملكا . فيؤمر بأربع كلمات [ويقال له : ] أكتب : عمله ، ورزقه ، وأجله ، وشقي أو سعيد . ثم ينفخ فيه الروح . فإن الرجل ليعمل [بعمل أهل الجنة . أخرى] حتى ما يكون بينه وبين الجنة إلا ذراع ، فيسبق عليه كتابه فيعمل بعمل أهل النار [فيدخل النار - خ ] ويعمل [بعمل أهل النار . ح ] حتى مايكون بينه وبين النار إلا ذراع فسيبق كتابه فيعمل بعمل أهل الجنة فيدخل الجنة . ح - ٥/٣١٤ ، م - ٧٤/١٠ . ح - ٥/٣٣٠ . ح - ١/ ٣٥٠ . وليس فيه : إن الرجل يعمل . . إلخ .

١٤٦٣/٣٩ عن أنس - رضي الله تعالى عنه - عن النبي - ﷺ - قال : إن الله وكّل في الرحم ملكا فيقول : يا رب نطفة ، يارب علقة ، يا رب مضغة ، فإذا أراد أن يخلقها قال : يارب أذكر ، يارب أنثى ، يارب شقيٌ أو سعيد ؟ فما الرزق فما الأجل فيكتب كذلك في بطن أمه . ح - ٥/٣١٥ . ح - ٩/ ٣٣٠ .

١٤٦٤/٤٠ عن حذيفة بن أسيد - رضي الله تعالى عنه - يبلغ به النبي - ﷺ - قال : يدخل الملك على النطفة بعد ما تستقر في الرحم بأربعين أو خمسة وأربعين ليلة ، فيقول : يارب أشقيٌ أو سعيد ؟ فيكتبان .

فيقـول : أي رب أذكر أو أنثى ؟ فيكتبـان . ويكتب عمله ، وأثره ، وأجله ، ورزقـه ، ثم تـطوى الصحف فـلا يـزاد فيهـا ولا ينقص . م ـ ١٠/٧٨ .

١٤٦٥/٤١ عمران بن حصين ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ قـال : قال رجل [هو نفسه] : يا رسول الله أيعرف أهل الجنة من أهل النار ؟ قال : نعم . قال : فَلِمَ يعمل العاملون ؟ قال : كلٌ يعمل لما خلق له ، ولما يسر له . ح ـ ٩/٣٣١ . م ـ ١٠/٨٤ .

١٤٦٦/٤٢ عن أبي الاسود الديلي قال : قال لي عمران بن حصـين ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : أرأيت ما يعمل الناس اليوم ويكدحون فيه ؟ أشيٌ قضي عليهم ومضى عليهم من قدر ما سبق أو فيما يستقبلونه مما أتـاهم به نبيهم وثبتت الحجـة عليهم ؟ فقلت : بل شئٌ قضي عليهم ومضى عليهم . قال : فقال : أفلا يكون ظلما ؟ قال : ففزعت من ذلك فزعا شديدا ، وقلت : كل شيٌ خلق الله وملك يده ؛ فلا يسأل عما يفعل وهم يسألون . فقال لي : يرحمك الله إني لم أرد بما سـألتك إلا لأحـرز عقلك . إن رجلين من مزينة أتيا رسول الله ـ ﷺ ـ فقالا : يا رسول الله أرأيت ما يعمل الناس اليوم ويكدحون فيه ؟ أشيٌ قضي عليهم ومضى فيهم من قدر قد سبق أو فيما يستقبلون به مما أتاهم به نبيهم وثبتت الحجة عليهم ؟ فقال : لا بل شيٌ قضي عليهم ومضى فيهم ، وتصديق ذلك في كتـاب الله ـ عز وجـل ـ : ﴿ونفس وما سـواها ، فـألهمهـا فجـورهـا وتقواها﴾[1] م ـ ١٠/٨٤ .

١٤٦٧/٤٣ عن جابر قال : جاء سراقة بن مالك بن جعشم ـ رضي

(١) الشمس / ٩ ـ ١٠ .

الله تعالى عنهما - .

ئەرجەمە :

[ئەو سوراقەیە کە پێغەمەر - ﷺ - هیجرەتی فەرموو بۆ مەدینە ئەبوجەهل و ئەبوسوفیان و ئەمثالیان صەد وشتریان وەعد دا بەو کەسە کە پێغەمەر - ﷺ - و ئەبوبەکری صەدیق - رضي الله تعالى عنه - بگرێ یا بیانکوژێ . سوراقە - رضي الله تعالى عنه - ئەوەی (تعهد) کرد ، لە رێ پێیان گەیی ، ئەسپەکەی چوارپەلی داچوو بە ئەرزا تا سنگی ، هاواری کردە پێغەمەر - ﷺ - تا نەجاتی دا ، خوا هیدایەتی داو لە دوای بەینێ موسوڵمان بوو] هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزی کرد : (یا رسول الله) دینی خۆمانمان بۆ بەیان بکە (كأنه) ئێستە خەلق کراوین ، ئێمە لە چیبیا عەمەلی ئەقوا ئەکەین و چاکەو خراپە ئەکەین لەوەدا کە قەڵەمی قودرەت نووسیویەتی و مەرەکەبەکەی وشك بۆتەوەو قەزاو قەدەر وا رابووردوە ، یا خۆ لەمەولا هەرکەس بە کەیفی خۆی چاکەو خراپە ئەکا [ئەمجا بە پێی ئەوە خوا موعامەلەیان لەگەڵ ئەکا ، یەعنی قەدەری ئەزەلیی نی یە] ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خەیر بەڵکو لەوەدا عەمەلی چاکەو خراپە ئەکەین کە لە ئەزەلا نووسراوەو براوەتەوە ، قەدەر بەوە جاری بوە . سوراقە عەرزی کرد : کە وابێ بۆچی عەمەل بکەین ؟ زوهەیر ، کە یەکێکە لە راوییان ، ئەفەرموێ : (ابو الزبير) کە راوی یە لە جابیرەوە - رضي الله تعالى عنه - تەکەللومی بەشتێ کردو تێی نەگەییم ، پرسیم : کە (أبو الزبير) چی وت ؟ وتیان : وای وت کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئێوە عەمەلی چاکە بکەن کوللی کەسێ بۆچی خەلق کراوە ئەوەی بۆ ئاسان ئەکرێ . (1)

(١) دانەر - خ - لە ناوەڕاستدا تەرجەمەی حەدیثەکەی کردوە ، ئێمەیش وەك ←

قال : يا رسول الله بين لنا ديننا كأنا خلقنا الآن فيم العمل الآن ؟ أفيما جفت به الأقلام وجرت به المقادير ؟ أم فيما يستقبل ؟ قال : لا ، بل فيما جفت به المقادير . قال : ففيم العمل ؟ قال زهير : ثم تكلم أبو الزبير بشيءٍ لم أفهمه . فسألت : ما قال ؟ فقال : إعملوا فكل ميسر . [فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : كل عامل ميسر لعمله . أخرى .] م ـ ١٠/٨٣ .

١٤٦٨/٤٤ عن عبدالله بن عمرو بن العاص ـ رضي الله تعالى عنهما] قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : كتب الله مقادير الخلائق قبل أن يَخْلُقَ السماوات والأرض بخمسين ألف سنة . قال : وعرشه على الماء . م ـ ١٠/٨٩ .

١٤٦٩/٤٥ وعنه يقول أنه سمع رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : قلوب بني آدم كلها بين إصبعين من أصابع الرحمان كقلب واحد ، يصرفه حيث يشاء . ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ : أللهم مصرِّف القلوب صرِّف قلوبنا على طاعتك . م ـ ١٠/٩٠ .

١٤٧٠/٤٦ عن طاوس أنه قال : أدركت ناسا من أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ يقولون : كل شيءٍ بقدر ، قال : وسمعت عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : كل شيءٍ بقدر حتى العجز والكيس ، أو الكيس والعجز . م ـ ١٠/٩١ .

١٤٧١/٤٧ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جاء مشركو قريش يخاصمون رسول الله ـ ﷺ ـ في القدر ، فنزلت : ﴿يَوْمَ يُسحبونَ في النار على وجوهم : ذوقوا مس سقر ، إنا كل شيءٍ خلقناه بقدر﴾[1]

(١) القمر / ٤٨ .

خۆی نووسیمان ، نازانم مەبەستی چی بوە لەمەدا .

م ـ ١٠/٩١ . مرسل صحابي ؛ لأن أبا هريرة لم يدرك هذه الوقعة .

١٤٧٢/٤٨ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : ما من مولود إلا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه ، وينصرانه ، ويمجِّسانه ، كما تُنتج البهيمة بَهْمَةً جمعاء ، هل تُحسون فيها من جدعاء ؟ [حتى تكونوا أنتم تجدعونها . م أخرى . فإن كانا مسلمين فمسلمين . م ـ ١٠/٩٥] ثم يقول أبو هريرة : واقرؤا ، إن شئتم ، : ﴿فطرة الله التي فطر الناس عليها ، لا تبديل لخلق الله . . . الآية﴾[1] م ـ ١٠/٩٤ .

١٤٧٣/٤٩ وفي أخرى بدل ويمجّسانه ويشركانه . فقال رجل : يا رسول الله أرأيت لو مات قبل ذلك ؟ قال : الله أعلم بما كانوا عاملين . م ـ ١٠/٩٤ .

١٤٧٤/٥٠ عن أبي هريرة قال : سئل رسول الله ـ ﷺ ـ عن أطفال المشركين من يموت منهم صغيرا . فقال : الله أعلم بما كانوا عاملين .

وعن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عينُهُ . وفيه : إذ خلقهم . م ـ ١٠/٩٩ .

١٤٧٥/٥١ عن أبي بن كعب ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : إن الغلام الذي قتله الخضر [عليه السلام] طبع كافرا ، ولو عاش لأرهق أبويه طغيانا وكفرا . م ـ ١٠/٩٩ .

١٤٧٦/٥٢ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ = أم المؤمنين = قالت : توفي صبي ، فقلت : طوبى له عصفور من عصافير الجنة . فقال

---

(١) الروم / ٣٠ .

رسول الله ـ ﷺ ـ : أوَ لاتدرين أن الله خلق الجنة وخلق النار فخلق لهذه أهلا ولهذه أهلا ؟ م ـ ١٠/ ٩٩ .

١٤٧٧/٥٣ وفي أخرى عنها قالت : دُعي رسول الله ـ ﷺ ـ إلى جنازة صبي من الأنصار ، فقلت : يا رسول الله طوبى لهذا عصفور من عصافير الجنة ؛ لم يعمل السوء ولم يدركه . قال : أوَ غير ذلك يا عائشة . إن الله خلق للجنة أهلا وخلقهم لها وهم في أصلاب آبائهم ، وخلق للنار أهلا خلقهم لها وهم في أصلاب آبائهم . م ـ ١٠/ ١٠٠ .

١٤٧٨/٥٤ عامر بن واثلة حدث أنه سمع عبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ يقول : الشقي من شقي في بطن أمه ، والسعيد من وعظ بغيره . فأتى رجلا من أصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ يقال له : حذيفة بن أسيد الغفاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ فحدثه بذلك من قول ابن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : وكيف يشقىٰ رجل بغير عمل ؟ فقال له الرجل : أتعجب من ذلك ؟ ! فإني سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : إذا مرَّ بالنطفة إثنان وأربعون ليلة بعث الله إليها ملكا فصورها ، وخلق سمعها وبصرها وجلدها ولحمها وعظامها ، ثم قال : يـاربِّ أذكرٌ أم أنثىٰ ؟ فيقضي ربك ما شاء ويكتب الملَك ثم يقول : يا ربِّ أجله ، فيقول ربّك ما شاء ويكتب الملك ثم يقول : ياربِّ رزقه ، فيقضي ربّك ما شاء ويكتب الملك ، ثم يخرج الملك بالصحيفة في يده فلا يزيد على أمر ولا ينقص . م ـ ١٠/ ٧٩ .

١٤٧٩/٥٥ أبو الطفيل قال : دخلت على أبي سَريحة : حذيفة بن أسيد الغفاري ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ بأُذنيَّ هاتين يقول : إن النطفة تقع في الرحم أربعين ليلة ، ثم يتصور

عليها الملك . قال زهير : حسبته [أي عبدالله بن عطاء] قال : الذي يخلقها ، فيقول : يارب أذكرٌ أم أنثى ؟ فيجعله الله ذكرا أو أنثى . = ثم يقول : يارب أسويٌّ أم غير سويٍّ ؟ فيجعله الله سويا أو غير سويٍّ = ثم يقول : يارب ما رزقه ؟ ما أجله ؟ ما خلقه ؟ ثم يجعله الله شقيا أو سعيدا . م - ١٠/ ٧٩ .

١٤٨٠/٥٦ عن علي - رضي الله تعالى عنه - قال : كُنَّا في جنازة في بقيع الغرقد ، فأتانا النبي - ﷺ - فقعد وقعدنا حوله ومعه مخصرة ، فنكّس فجعل ينكت بمخصرته . ثم قال : ما منكم من أحد ، مامن نفس منفوسة إلا وقد كتب الله مكانها من الجنة والنار ، وإلا وقد كتبت شقية أو سعيدة ، قال فقال رجل [علي نفسه - رضي الله تعالى عنه - ] : يا رسول الله أفلا نتكل على كتابنا وندع العمل ؟ فمن كان منا من أهل السعادة فسيصير إلى عمل أهل السعادة ، وأما من كان منا من أهل الشقاوة فسيصير إلى عمل أهل الشقاوة ؟ قال : أما أهل السعادة فييسرون إلى عمل أهل السعادة ، وأما أهل الشقاوة فييسرون لعمل الشقاوة ، ثم قرأ : ﴿فأما من أعطىٰ واتقىٰ .. الآية﴾[1] . ح - ٢/ ٤٤٤ ، ح - ٧/ ٤٠٧ ح - ٩/ ١١٨ ، ٣٣٥ . م - ١٠/ ٨٠ . د ، ت ، جه .

تەرجەمەکانیان :

نۆزده حەدیث دائیر به (قەدەر) نووسراوه ، مەئالی هەموویان ئەوەیە کە : خوا - عز وجل - له عیلمی ئەزەلیدا له ئیبتیدای خەلقەوه تا مونتەهای - کە مونتەهای نی‌یە ئەبەدی‌یە - هەرچییێکی خەلق کردوەو خەلقی ئەکا هەموو ئەحواڵی عالەمی تا ذەڕەییێکی نووسیوه ، خیلافی ئەوه

(١) الليل / ٥ .

نابێ ، هەمووی بێتە وجوود ، ئەگەر نەیێتە وجوود خیلافی عیلمی خوا واقیع ئەبێ ئەوەیش مەحاڵە ، زوڵمیش نی‌یە ؛ چونکی خوا (مالك الملك) ە (لا يُسأل عما يَفعل) سوئالی لێ ناکرێ ، حیکمەتێکی ئەزەلیی کە مەخصووصە بە خواوە - عز وجل - لەوەدا هەیە ، هەم خوا عیلم و ئیرادەو قودرەتی بەسەر کردن و نەکردنا داوە بە ئینس و جین ، رێی چاك و خراپی پێ نیشان داوە ، هەرچی بکا بە ئیرادەو ئیختیاری خۆی ئەیکاو خوایش خەلقی ئەکا ، خوا - عز وجل - چونکی عیلمی ئەزەلیی ئەو لە ئەزەلا تەعەللوقی پێوەبەستوە موافیقی ئەو عیلمی خۆیە نووسیویەتی . چۆن ئاوێنە عەکسی ئەشیای تیایە عیلمی خوایش - عز وجل - میثالی ئاوێنەیە هەموو (ما کان و سیکون) ی تیایە . چۆن ئاوێنە هیچ تەئثیری لەو شتانەدا نی‌یە که تیا مونطەبیع بوە عیلمی خوایش وایە تەئثیر لە خەلق ناکا . (مؤثر) قودرەتە بە موافیقی عیلم و ئیرادە ، فەقەط تەعەللوقی قودرەتی خوا لە دوای ئەوەیە کە مەخلووق عەزمی جەزم ئەکا لەسەر کردنی ئەو شتە بە ئیختیار ، موافیقی ئەو عەزم و جەزمە ئیرادەو قودرەتی خوا تەعەللوقی پێوە ئەبەستێ ، لەوەدا چە زوڵمێ هەیە ؟

بەعزێ لەم حەدیثانە تەرجەمە ئەکەم (ومن الله التوفيق) :

١ - عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کە پێغەمەر - ﷺ - کە صادقە لە فەرموودەیاو مەصدووقە لەوەدا کە خوا وەعدەی پێداوە ، یەعنی بۆی بێنێتە جێ - فەرمووی : هەر یەکێ لە ئێوە خوا لە زگی دایکیا تا چل شەو خیلقەتی کۆ ئەکاتەوە لە پاشا ئەبێ بە پارچەیێ خوێن تا چل شەو ، لە پاشا ئەبێ بە دەمەجۆیێ گۆشت تا چل شەو [ئەمە چوار مانگ] لە پاشا خوا

مەلائیکەیێ ئەنێرێ ، بە چوار کەلیمە ئەمری پێ ئەکرێ کە بینووسێ : ئەمری پێ ئەکرێ کە عەمەلی ، رزقی ، ئەجەلی ، شەقی یە یا سەعیدە . لە پاشا رۆحی بەبەرا ئەکرێ . بە تەحقیق پیاوێ [یەعنی یەکێ] لە ئێوە ئەو ئیشانە ئەکا کە پێی بچێتە بەهەشتەوە تا ذیراعێکی ئەمێنێ کە بچێتە بەهەشتەوە ، ئەو کیتابەی کە بۆی نووسراوە لێی پێش ئەکەوێ دەست ئەکا بە ئیشی جەهەننەمی ئەچێتە جەهەننەمەوە . [أعاذنا الله وأحبّاءنا وأقرباءنا عن مثل هذه الحالة] = یەکێ لە ئێوە = عەمەلی ئەهلی جەهەننەمی ئەکا تا ذیراعێ لە بەینی ئەوو جەهەننەما ئەمێنێ کیتابەکەی لێی پێشەکەوێ دەست ئەکا بە ئیشی بەهەشتیی ، ئەچێتە بەهەشتەوە . [اللهم اجعلني منهم] .

٣ ـ [1] عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : إن الله وَكَّل في الرحم ملكا فيقول : يا رب نطفة ، يا رب علقة . . إلخ .
پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی : خوا ـ عز وجل ـ مەلائیکەیێکی (موکل) کردوە بەسەر رەحەما[2] عەرزی خوا ئەکا : یا رەببی نوطفەیە ، یارەببی عەلەقەیە ، یارەببی گۆشت پارەیە ، کە ئیرادەی کرد [موافیقی ئەمری خوا دروستی بکا] عەرزی ئەکا : نێر بێ یا مێ بێ ؟ شەقیی بێ یا سەعید بێ ، رزقی چیە ، ئەجەلی چیە . . . بەو نەوعە ئەنووسرێ لە زگی دایکیا .

٤ ـ حوذەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە

---

(١) دانەر بە هەڵە ژمارەی (٢) ی لەبیرچوە .

(٢) رەحەم : منداڵدان .

پێغەمەرەوە - ﷺ - ریوایەت ئەکا کە فەرمووی : لە پاش چل شەو کە نوطفە لە رەحەما قەراری گرت مەلائیکە ئەچێتە سەر نوطفە یا فەرمووی : لە دوای چل وپێنج شەو عەرزی خوا ئەکا : یارەببی شەقی یە یا سەعیدە ؟ ئەنووسرێن . عەرزی ئەکا : یارەببی نێرە یا مێیە ؟ عەمەلی ، ئاثاری ، ئەجەلی ، رزقی . . ئەنووسرێن ، لە پاشا صەحیفەکە ئەپێچرێتەوە نە لێی زیاد ئەکرێ نە لێی کەم ئەکرێ .

٥ - عیمرانی کوری حصەین - رضي الله تعالی عنهما - ئەفەرموێ : پیاوێ - کە خۆیەتی - عەرزی پێغەمەری کرد - ﷺ - : (یا رسول الله) ئەهلی جەنەت لە ئەهلی جەهەنەم فەرق ئەکرێ ؟ فەرمووی : بەڵێ . عەرزی کرد : کە وابێ بۆچ عیبادەت بکەین ؟ یەعنی بیکەین و نەیکەین جەهەنەمیی ئەچێتە جەهەنەمەوەو بەهەشتیی ئەچێتە بەهەشتەوە . فەرمووی : هەرکەسێ بۆچی خەلق کرابێ و چی بۆ ئاسان کرابێ ئەوە ئەکا .

٦ - ئەبوئەسوەدی دوئەلی - رحمه الله - ئەفەرموێ : عیمرانی کوری حصەین - رضي الله تعالی عنهما - پێی وتم : خەبەرم بدەرێ ئەوی ئێستە خەلق ئەیکاو خۆیی تیا ماندو ئەکا ئایا شتێکە خوا - عز وجل - حوکمی بەسەرا کردوون بە قەدەری ئەزەلی بەسەریانەوە رابوردوە یا بە کردن و نەکردنی حوججەتیان لەسەر ثابت ئەبێ و پێی مەسئول و یا موثاب ئەبن بە موجەررەدی ئەوەی کە پێغەمەرەکەیان خەبەری داوێ لە موستەقبەلا ، یەعنی قەدەری ئەزەلیی نی یە ؟ عەرزم کرد : خەیر شتێکە کە لە ئەزەلا لە سەریان

تـەقدیـر کراوەو بـەسەریـانـەوە رابـوردوە لـە کـردنو نـەکـردنی هەرکامێکی بۆ موقەددەر کرابێ هەر ئەوە ئـەبێو خیلافی مـومکین نی یە . فەرمووی : ئەمجا ئەوە زوڵم نابێ ؟ لەوە داچڵەکیمو ترسام ، وتم : هەموو شتێ موڵکی خوایەو مەخلووقی ئەوە ، سوئـالی لێ ناکرێ لەوە کە ئـەیکا ، ئـەوان سوئـالیان لێ‌ئـەکرێ لـە کردنو نەکردنیان . کە وام وت پێی فەرمووم : رەحمەتی خوات ێ بێ بەوە کە لێم پرسیت مەقصوودم هەر ئەوە بوو کە میقداری عەقڵی تۆی پێ تەخمین بکەم . دوو پیاو لە موزەینە هاتنە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەینی ئەو سوئالەی من لە تۆم کرد ئەوانیش لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان کرد ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەینی ئەو جوابەی دانەوە کە تۆ داتەوە . میصداقی ئەوە ئـەو ئایـەتەیـە کە لـە سوورەتی (والشمس) دایـە مەعنای وایە : قەسەم بەو نەفسەو بەو ذاتەی کە خەلقی کردوەو فوجوورو تەقوای پێ ئیلهام کردوە ! هەرکەسێ تەزکیەی نەفسی خۆی بکاو بە ئەعمالی صالیحە تەربیەي بکا ئەو کەسـە نەجـاتی ئەبێ ، هەرکەسێ کە بە ئەعمالی (سیئە) تەلویثی بکا ئەو کەسە خەسارەتمەند ئەبێ .

٧ ـ تەرجەمەی رابورد .

٨ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیست ئەیفەرموو : پەنجا هەزارساڵ لە پێش ئەمەدا کە خوا ـ عز وجل ـ مەخلووقاتی خەلق کردوە ، موقەددەراتی هەموویانی ، کە چۆن ئەبنو چۆن نابن ، هەمووی نووسیوە ، ئەو وەختە عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو .

٩ - ئەفەرموێ : كە لە پێغەمەر - ﷺ - م بیست كە ئەیفەرموو : قەلبی هەموو ئینسان وەك تەنها قەلبێ لە بەینی دوو پەنجەی خوادایە ، یەعنی لە بەینی ئیرادەو قودرەتی ئەوایە ، چۆن ئیرادە بكا وا ئـەو قەلبانە وەرەگێڕێ ، لە پاشا ئەیفـەرموو : خـوایا ئـەی (مصرف القلوب) قەلبی ئێمە وەرگێڕەرە سەر طاعەتی خۆت .

١٠ - طاوس ئەفەرموێ : بە گەلێ ئەصحابی پێغەمەر - ﷺ - گەییوم ، هەموو ئـەیانفـەرموو : كـوللی شتێـك بە قـەزاو قەدەرە . لـە عەبدوڵڵای كوڕی ئیمامی عومەرم بیست - رضي الله تعالى عنه - ئـەیفـەرمـوو : پێغـەمـەر - ﷺ - فـەرمـووی : هـەمــوو شتێ بەقەدەرە ، حەتتا عاجزبوون لە عەمەلو زیرەكیش .

١١ - ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - ئـەفەرمـوێ : موشـریكی عـەرەب هاتنـە خزمـەت پێغەمـەر - ﷺ - موجـادەلـەیـان لـە خوصووصی قەدەرا لە خزمەتا كرد ، ئەو ئایەتی (إقترب) نازڵ بوو كە مەعنای وایە : لەو رۆژەدا كە موشریكان لە جەهەننەما لـەسەر لـەپ[1] رائەكێشـرێن پێیان ئـەڵێن : عـەذابی سـەقـەر بچێژ ن ، ئێمە هەموو شتێكمان بە قەدەر خەلق كردوە .

ئەم سوورەتە لە مەككەدا نازڵ بوە ، ئەبوهـورەیرە - رضي الله تعالى عنه - حازری ئەو وە قعەیە نەبوە ؛ چونكی ئەو لە دوای فەتحی خەیبەر هاتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - كە وابێ حەدیثەكەی مورسەلی صەحابییە ، لە حوكمی مەرفووعایە .

(١) بە گوێرەی تەرجەمەی ئایەتەكە دەبوو بینووسیایە (لەسەر روو . . .) بەڵام رەنگە لەبەر ئەوە وای نووسیبێ كە لەكوردیدا دەڵێن : (لەپەو ڕوو) .

١٢ ـ ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هیچ مەولوودێ نىیە کە لەسەر فیطرەتی ئیسلام خەلق نەکرێ . لە دواییدا باوكو دایکیان ئەیانکەن بە جوولەکەو بە گاورو بە مەجووسو بە موشریك ، چۆن مەڕو بزن بێچوولەیان ببێ هەموو ساغن ، گوێبڕاوو کەلیان تیا نىیە ئێوە گوێیان ئەبرنو کەلیان ئەکەن ئەگەر دایكو باوکیان موسوڵمان بن ئەوانیش موسوڵمان ئەبن .

ئەبوهورەیرە ئەفەرموێ : ئەگەر هەوەستان یێنێ ئەو ئایەتە بخوێننەوە : ئەوە خەلقی خوایە کە خوا خەلقی لەسەر ئەوە خەلق کردوە ، خەلقی خوا ناگۆڕرێ ، یەعنی لە ئەزەلدا چۆنی تەقدیر کردبێ وا ئەبێ . یەکێ لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەپرسێ : (یا رسول الله) ئەگەر ئەو منالآنە لە پێش ئەمەدا بمرن کە ببن بە جوولەکەو گاورو مەجووس چۆنەبن ؟ فەرمووی : خوا عالمە پێیان ، لەو وەختەدا کە خەلقی کردوون ئەگەر بمێنن چی ئەکەن .

١٣ ـ ئوبەیی کوڕی کەعب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەو غولآمەی کە حەزرەتی خضر ـ علیه السلام ـ کوشتی بە کافریی خەلق‌کرابوو ، ئەگەر بمایە دایكو باوکەکەیی تووشی طوغیانو کوفر ئەکرد .

١٤ ـ عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەعوەت‌کرایە سەر جنازەی منالێکی ئەنصار ، عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) خۆشی لە خۆی چۆلەکەیێکە لە چۆلەکەی بەهەشت هیچ گوناهی نەکردوەو نەگەییوەتە ئەو وەختەی کە گوناه بکا !

فەرمووی : یا غەیری ئەوە ئەبێ . ئەی عائیشە خوا بۆ جەنەت
ئەهلێکی خەلق کردوە لەو وەختەدا کە لە صولبی باوکیانا بوون .
بۆ ئاگر ئەهلێکی خەلق کردوە کە لە صولبی باوکیانا بوون .

١٥ ـ عامیری بنی واثیلە لە ئیبن و مەسعوودەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکا کە شەقیی لە زگی دایکیا شەقی یە ، سەعید لە زگی دایکیا سەعیدەو = سەعید = ئەوەیە بە غەیر (متعظ) بێ .
عامیر ئەچێتە لای حوذەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاریی ، ئەم حەدیثی ئیبن و مەسعوودەی پێ ئەڵێ ، عەرزی ئەکا : ئینسان چۆن شەقیی ئەبێ ئێشتا هیچ ئیشی خراپەی نەکردبێ ؟ حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی ئەڵێ : بۆلەوە عەجایەبت ئەمێنێ ؟ ! من لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیست ئەیفەرموو : کە چل و دوو شەو بەسەر نوطفەدا رابورد خوا مەلائیکەیێکی بۆ ئەنێرێ تەصویری ئەکا ، گوێ و چاوو پێست و گۆشت و ئێسکی بۆ دروست ئەکا ، لە پاشا ئەڵێ : یارەببی نێرە یا مێیە ؟ خوا چۆنی ئیرادە کردبێ حوکمی پێ ئەکاو مەلائیکەکە ئەینووسێ ، ئەڵێ : یارەببی ئەجەلی ؟ خوا چی ئیرادەکردبێ مەلائیکەکە ئەینووسێ . لەپاشا ئەڵێ : یارەببی رزقی ؟ خوا ئیرادە ئەکاو مەلایکەکە ئەینووسێ . لە پاشا مەلایکەکە یێتە دەرێ صەحیفەکەی بە دەستەوەیە لێی زیاد ناکرێ و لێی کەم ناکرێ .

١٦ ـ عن علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : حازری جەنازەیێ بووین لە (بقیع الغرقد)ا ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتە لامان ، دانیشت ئێمەیش لە دەوری دانیشتین ، عەصاییکی بنباخەڵی پێ بوو ، وەك مەحزوون سەری موبارەکی دانەوان بە

عەصاکەی لە ئەرزی‌یەوە ئەژەن ، لە پاشا فەرمووی : هیچ کەسێ نی‌یە لە ئێوە ، هیچ نەفسێ نی‌یە کە نەفەس بدا ئیللا ئەو کەسە یا ئەو نەفسە جێی لە بەهەشتا یا لە جەهەننەمدا نووسراوە ، سەعید بێ یا شەقیی بێ نووسراوە . پیاوێ [کە ئیمامی عەلی خۆیەتی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ] عەرزی‌کرد : کە وابێ بۆ ئیعتیماد نەئەینە سەر ئەوەی کە بۆمان نووسراوەو تەرکی عەمەل نەکەین ؟ هەرکەسێ لە ئێمە لە ئەهلی سەعادەت بێ بۆ ئەو جێیە ئەچێ کە ئەهلی سەعادەت بە عەمەل بۆی ئەچن ، هەرکەسێ لە ئەهلی شەقاوەت بێ ئەچێتە ئەو جێگەیە کە ئەهلی شەقاوەت بە عەمەل ئەیچێتێ !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەهلی سەعادەت عەمەلی ئەهلی سەعادەتیان بۆ ئاسان ئەکرێ‌و ئەیکەن ، ئەهلی شەقاوەت عەمەلی ئەهلی شەقاوەتیان بۆ ئاسان ئەکرێ‌و ئەیکەن . لە پاشا ئەو ئایەتی (والليل) ەی خوێنەوە کە مەعنای وایە : ئەمما ئەو کەسەی کە ماڵ ببەخشێ‌و تەقوای خوا بکا ، یەعنی ئەوامیرو نەواهی بەجێ‌بێنێ‌و تەصدیقی ئاخیرەت بکا .. ئێمە رێی چاکە بۆ ئەو کەسە ئاسان ئەکەین ، ئەمما ئەو کەسەی کە بوخل بکاو ئیستیغنا بکاو تەقوا لە خوا نەکاو تەکذیبی ئاخیرەت بکا ئێمە رێگەی خراپەکردن بۆ ئەو کەسە ئاسان ئەکەین .

حەدیثی حەزرەتی عائیشەو ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ بە ظاهیر دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەمە کە منالی موسوڵمان مەعلووم نی‌یە کە ئەچنە بەهەشت . حەدیثی ئیبن‌و عەباس‌و حەدیثێکی تری ئەبوهورەیرە دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەوە کە منالی موشریك تابیعی عیلمی خوان ؛ ئەگەر خوا بۆ جەهەننەمی خەلق کردبێ ئەچنە جەهەننەم ، ئەگەر بۆ

بەهەشتی خەلق کردبن ئەچنە بەهەشت .

حەدیثی غولامەکەی کە حەزرەتی خضر - علیه السلام - کوشتی وا ئەگەیێنێ کە فەرق نی یە لە بەینی منالی موشریك و منالی موسولمانا ؛ چونکی دایك و باوکی ئەو منالە موسولمان بوو ، ئەویش (دون البلوغ) بوو . روئیاکەی پێغەمەر - ﷺ - کە بوخاریی لە روئیاداو لە جەنائیزا ذیکری کردوە . . لەو روئیایەدا حەزرەتی ئیبراهیمی پێ نیشان دراوە کە زۆر منالی لە دەور بوو ، جوبرەئیل - علیه السلام - پێی ئەفەرموێ : ئەوانە منالی ئەون . لە پێغەمەر - ﷺ - یان پرسی : کە منالی موشریکیشی لە خزمەتا بوو ؟ فەرمووی : منالی موشریکیشی لە خزمەتا بوو . لەوەیش وا دەرەکەوێ کە منالی موشریکیش ئەچنە بەهەشت .

نەوەویی - رحمه الله - تەوفیقی ئەم حەدیثانە ئەکا ، حاصلەکەی ئەمەیە کە (أصح) لە مەذهەبی عولەما وایە کە هەموو منال کە = لە = پێش تەکلیفا بمرێ موکەللەف نین ، کە موکەللەف نەبن گوناهیان نی یە ، کە وابێ ئەچنە بەهەشت باوك و دایکیان موسولمان بن یا کافر بن . ﴿ولا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أخرىٰ﴾[1] پێغەمەر - ﷺ - کە فەرموویە : خوا عالمە بەوەی کە لە دوای بلووغ ئەیکەن یەعنی لە عیلمی خوادا وابێ کە لە دوای بلووغ موسولمان ئەبن ئەچنە بەهەشتەوە . ئەگەر لە عیلمی خوادا وابێ کە لە دوای بلووغ کافر ئەبن ئەو وەختە مەعنای وا ئەبێ کە بمێنن بە کافریی بالغ ببن لەسەر کوفر بمێنن تا ئەمرن ئەچنە جەهەننەمەوە . ئەمما ئەو

(١) الانعام / ١٦٤ . الاسراء / ١٥ . الفاطر / ١٨ . الزمر / ٧ .
واتە : تاوانی کەس ناچێتە ئەستۆی کەس و ، هەرکەس کۆڵ و باری خۆی هابە کۆڵی خۆیەوە .

وەختە کە بە منالّی بمرن موکەللەف نین بێ گوناهن ، خوا ـ عز وجل ـ بە بێ گوناه کەس عەذاب نادا ئەچنە بەهەشتەوە .

غولآمەکەی کە حەزرەتی خضر ـ علیە السلام ـ کوشتی لەو ئایەتەدا کە ئەفەرموێ : بۆیێکم کوشت کە دایكو باوکی موسوڵمان بوون ، لەوە ترساین کە گەورە ببێ دایكو باوکەکە بخاتە کوفرو طوغیانەوە . . دەلالەت نی‌یە = لەسەر ئەوە = کە لەو وەختەدا کە کوژرا موستەحەقی جەهەننەمە ؛ چونکی ئەو وەختە منالّ بوو ، موکەللەف نەبوو ، هەر لەسەر ئەوە دەلالەت ئەکا ئەگەر گەورە ببێ کافر ئەبێ ، دایكو باوکەکەیشی ئەگێرێتە سەر کوفر . ئەمما گەورە نەبوو بە منالّیی کوژرا .

ئەو حەدیثەی کە ئەفەرموێ : بە کافریی مۆر بەسەر دڵیا نرابوو مەعنای وایە ـ والله أعلم ـ : وامۆر نراوە بەسەر دڵیا کە گەورە بوو کافر ئەبێ ، مەعنای وا نی‌یە کە لە وەختی کوژرانیا کافر بوە .

حەدیثەکەی حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ کە فەرمووی : خۆشیی لە خۆی چۆلەکەیێکە لە چۆلەکەی بەهەشت . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : ئەی عایشە خوا بۆ جەهەننەم خەلقێکی خەلق کردوە ، بۆ بەهەشت ئەهلێکی خەلق کردوە مەعنای وا نی‌یە کە ئەو منالّە ئەنصاری‌یە مەعلووم نی‌یە کە ئەچێتە بەهەشت . مەقصوودی پێغەمەر ـ ﷺ ـ وابوە کە زەجری حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ بکا لەوە بە بێ دەلیلی قەطعیی حوکم بەسەر شتا بکا . (نووي مختصرا) .

ئەحادیثی قەدەر دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەوە کە هیچ شتێ قەدەر

ناگیرێتەوە ، نە : دۆعا ، نە صەدەقە ، نە عیلاج ، نە تەدبیر . فەقەط لە (لوح المحفوظ)ا نووسراوە کە ئەو کەسە (مەثەلا) ئەگەر صەدەقە بکا حەفتا ساڵ عومری ئەبێ ، ئەگەر نەیکا بە سی ساڵیی ئەمرێ ، لە دەفتەری قەدەردا نووسراوە کە صەدەقە ئەکاو حەفتا ساڵ تەواو ئەکا ، یا صەدەقە ناکاو بە سی ساڵیی ئەمرێ . لە (لوح المحفوظ) ا ئەو جەزمە نیە ، نەتیجەی ئەو قیاسە نەنووسراوە ، کە وابوو هیچ فائیدەی ئەوە نیە کە ئینسان بڵێ : وام بکردایە وا ئەبوو ، وام نەکردایە ئەوەم بەسەرا نەئەهات .

## تم ما أردت نقله من القَدَر بعون الله وقدره
## أللهم أقدر لنا إكماله !

حەدیثێکی بەدئی خەلق ماوە .

**١٤٨١/٥٧ عن أبي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : الأرواح جنود مجنَّدة ؛ فما تعارف منها إئتلف ، وما تناكر منها إختلف . م ـ ١٠/٦٩ . ح ـ ٥/٣١٥ معلقا عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ومرفوعا في الأدب المفرد عن عبدالله بن صالح .**

**تەرجەمە :**

ئەفەرموێ : ئەرواح ئەو لەشکری خوایەیە بە پێی ئەخلاق و صیفاتیان تەرتیب کراون ؛ چاکیان هەیەو خراپیان هەیە ، ئەوانەی کە صیفاتیان موافیقی یەکتری بێ ، ئەخلاقیان موناسبی یەکتری بێ لە حینی خەلقیانا لە دنیادا ئولفەت بەوەوە ئەگرێ کە لە صیفاتا وەکوو ئەو بێ ، ئەوانە کە صیفات و ئەخلاقیان لە یەك جوێ بێ لە دینا ئیختیلافیان ئەبێ و ئولفەتیان لەگەڵ یەك نابێ . لە دنیادا ئینسانی چاك مەیلی ئینسانی چاك

ئەکا . ئینسانی خراپ مەیلی خراپ ئەکا ، خوا بە ئیلهام ئەخاتە دڵیانەوە ئەگەر موئمینێ لە ناو صەد مونافیقا بێ موئمینێکی تر بچێتە ئەو جێیە ئەچێ لە لای ئەو موئمینە دائەنیشێ ، مونافیقیش وایە .

هەرەمی کوڕی حیببان ـ رحمە اللە ـ کە ئەچێ بۆ عیراق ئیمـامی عومەر ـ رضي اللە تعالی عنە ـ ئـەمری پێ ئـەکا کـە حەزرەتی وەیسی قەرەنیی ببینێ ، کە ئەگاتە خزمەت وەیس وەیس ـ رحمە اللە ـ بە ناوی خۆی و باوکی یەوە خیطابی لەگەڵ ئەکا ! هـەرەم ـ رحمە اللە ـ عـەرزی ئەکا : نەمن تۆم دیوە نە تۆیش منت دیوە چـۆن ناوی خـۆم و باوکمت زانی؟ فەرمووی : رۆحم رۆحی تۆی ناسی .

تم بعون اللە بدء الخلق یوم السبت ١/٣/٩٤١ .

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|

# خوێنەری ئازیز !

لە کۆتایی بەرگی سێیەمدا گلەییم لە چاپخانە هەبوو ، نووسیم : چواردە مانگە ئەم بەرگە لە ژێر چاپدایە . بەڵام وەك دەڵێن خوا خراپتر نەدا . ئەم بەرگە کە ئێستە دەکەوێتە بەردەستی تۆ (٢٤) مانگ زیاترە لە چاپخانەدایەو منیش لە ئەمسەرەوسەردام . تەنها ئاواتم ئەوەیە کە خودا ئەم رەنجەم لێ وەربگرێ و لە تای ترازووی چاکەمدا بۆم دابنێ .

لەو کاتەوە بەرگی سێیەم دەرچوە خۆم بە چەند هەڵەیەکی چاپی کتێبەکەم زانیوەو مامۆستایان و برادەرانیش لە چەند هەڵەیەکی دیکەیان ئاگادار کردووم ، بە هیوای ئەوەی کە فەرمایشتەکانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و تەرجەمەکانیان لە هەڵە دوور بن . . وا لێرەدا هەڵەکان تۆمار دەکەم و تۆی ئازیزیش لە لای خۆتەوە نوسخەکەی خۆت راستبکەرەوە :

| لاپەرە | دێر | هەڵە | راست |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | ٢ | ریواتە | ریوایەتە |
| ٨٢ | ٨ | یستشرفە | تستشرفە |
| ٨٥ | ١٨ | ذوی | زوی |
| ٨٦ | ٤ | ٤٥٣ | ٣٥٤ |
| ٩١ | ٧ | نەوەی | نەوەوی |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٨٦ | ٨ | هەرچێیکیان | هەرچێیکیان |
| ١٩٠ | ١٦ | تحدد منه جمال اللؤلؤ | تحدر منه جمان كاللؤلؤ |
| ١٩٠ | ١٨ | بلدة | [بلدة] |
| ١٩١ | ٩ | مدٍ | مدرٍ |
| ٢١٣ | ١٢ | والمسكور | والمكسور |
| ٢٢٥ | ٧ | نضرة الخير | نضلة الخير |
| ٣٨٠ | ١٣ | ئيندنى | ئيذنى |
| ٣٩٣ | ٦ | عەزرى | عەرزى |
| ٤٠٢ | ٢٢ | (ام الرمان) | (أم الرومان) |
| ٤١٩ | ١٧ | لەگمەڵا | لەگەڵا |

# سوپاس

برای بە نرخم مامۆستا (أحمد عبد الوهاب) لە هەڵەگیریی ئەم بەرگەدا یارمەتی‌یەکی دڵسۆزانەی دام ، خودا وێنەی زۆربکات.

الجمهورية العراقية
وزارة الاوقاف والشؤون الدينية
إحياء التراث الاسلامي
- ٢٣ -

# إقتران النيرين في مجمع البحرين

تاليف

ملا رشيد بيگ بابان

تحقيق

محمد علي القره‌داغي

الجزء الرابع

چاپخانه‌ى ( دار الشؤون الثقافية العامة )